شلۆمۆ نکدیمۆن

# مۆساد له عێراق و ووڵاتانی دراوسێ

## داڕمانی ئومێدی ئیسرائیلی و کوردەکان







وەرگێڕانی

ڕەهەند عبدالغفور

# مۆساد
# لەعێراق و وولاتانی دراوسێ
# دارِمانی
# ئومێدی ئیسرائیلی و کوردەکان

نوسەر : شلۆمۆ نەکدیمۆن
وەرگێڕانی: ڕەهەند عبدالغفور

چاپی یەکەم
٢٠١١

# پێناسی کتێب

بابەت : بەڵگەنامەیی .

ناوی کتێب : مۆساد لەعێراق و وولاَتانی دراوسێ

داڕمانی ئومێدی ئیسرائیلی و کوردەکان .

نوسەر : شلۆمۆ نەکدیمۆن .

وەرگێڕانی: ڕەهەند عبدالغفور .

دیزاینی ناوەوە :

دیزاینی بەرگ :

نۆبەی چاپ : یەکەم .

ساڵی چاپ : ٢٠١١ .

تیراژ :

چاپخانە :

ژمارەی سپاردن : لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە () ی

ساڵی () وەرگرتووە .

# پێشەكی

كورد لەوەتەی هەیە، لەجەنگی وجوددایە ، جەنگی خۆسەلماندن، جەنگێك كە ئامانج لێی ئەوەیە ئەوانی دی دان بەوەدابنێن (كورد) گەلێكە ، كە تاكەكانی مرۆڤن، كورد جنۆكە نی یە، وەك هەندێ زانای مێژوو نوسی بە ناو موسوڵمان لە كتێبەكانیان دا تۆماریان كردووە، توركی شاخاوی نیە ، وەك هەندێ ڕۆژهەلاتناسی بێ ویژدان قەبلاندویانە ، ئەم جەنگە تا ئەمڕۆش درێژەی هەیە، هێشتا سەلماندنەكە سەرەڕای ئەم هەموو بەلگە و ئامازە مێژوویی و واقیعیانە ، سەرەڕای هەزاران پێدراوی زانستی و كۆمەلایەتی و سۆسیۆلۆژی ، سەرەڕای بونی زمانی جیاو نەریتی جیا و پۆشاكی جیا و چی و چی ، هێشتا تەواونەبووە، هەرچەندە ئێمە لەجەنگەكاندا ، لەیاداشت و داواكاری بەردەم ڕێكخراوە نێودەوڵەتی یەكان دا ، لە كتێب و دیالۆگ و سەفەر و لێدوانە سیاسیەكانمان چەندان جار سەلماندومانەو كاغەزی سەلماندنەكەمان خستۆتە بەردەمیان ، و لە ژێری ژێرەوە نوسیومانە (( ئەوەش داواكراوەكەیەتی )) كەچی ئەوان بە قەڵەمی سور دەنوسن ((هێشتا ماویەتی)) ، بەڵێ كورد لە بەرەبەیانی مێژووەوە خەریكی خۆسەلماندنە ، هەمو گەلانی دونیاش بەم قۆناغەدا تێپەڕیون ، بەلام ئاخۆ چ هۆكارێك هەیە وایكردوە كورد هێندە دوابكەوێت؟ چی ئەم هەموو بەلگەنەویستانەی كوردی پوچ كردوەتەوە؟ ئایا هۆكارەكەی ناگەڕێتەوە بۆ دەوروبەر ؟ بۆ گەل و ولاتە هاوسێكانی كە هەمیشە چاویان بڕیوەتە خاكەكەی، بەڵی وایە، بەلام ئەی خۆخۆری و خیانەت ؟ ئەی یەكتر نەخوێندنەوە؟ ئەی خۆ فرۆشی، ئەی بیر كردنەوەی هەڵە ، جگە لەمانەش ئەوەندەی تەماشای مێژوی كورد دەكەی ، هەست دەكەی كۆدەنگیەكی جیهانی هەیە بۆ پەراوێزخستنی كورد، هەركاتێك هەلێك ڕەخساوە بۆ كورد ، جگە لە هەڵپەهەڵپ و ناكۆكی نێوخۆیی ، دەستێكی نادیاری گەورە مەنجەڵەكەی بەسەری كورددا قلپ كردۆتەوە ، لەبەر ئەم

هۆکارانە کورد سەرقاڵ بوە بەو جەنگەوە ، نوسینەوەی مێژوەکەی ئەوانی دی کردویانە ، کەواتە گرنگە بزانین چیمان لەسەر نوسراوە و وتراوە ، لە زاری دۆستەکانمانەوە و لە زاری دوژمنەکانیشمانەوە .

دیارە کورد لەم خەباتەیدا وەك کەسێکی لێ هاتووە کە دەکەوێتە ڕوبارەوە و مەلە نازانێت ، ناچار هەرچی بەدەستەوە هاتبێت پەنای بۆبردوە ، لەمەدا لۆمەی ناکرێت ، چونکە ئەگەر براکەت دەستی نا بەڕوتەوە و هەقی خواردی ناچار تۆ ڕوو لە خەڵکی تر دەکەی ، یەکێك لە قوناغە هەستیار و گرنگەکانی جەنگی وجودیی کورد ، شۆڕشەکانی خوا لێخۆشبوو مستەفا بارزانی یە، کاروانی خەباتی ئەم پیاوە لە تەمەنی پانزە ساڵی خۆیەوە دەست پێ دەکات ، بەمنداڵی هەستی بەوەکردوە کە دەستێك دەیەوێت وجودی بخاتە ژێر پرسیارەوە کاتێك لەگەڵ دایکیدا لەبەندینخانە بوە ، باوکی لەسێدارەدراوە بۆیە دەستی بەخەبات کردوە و لە برابچوکی سەرۆکخێڵێکەوە بەرەبەرە بوەتە سەرۆکخێڵ و دواتر سەرکردەیەکی نەتەوەیی گەورە کە بەتەنیا لەبەرامبەر پێنج حکومەتی یەك بەدوای یەکی عێراق جەنگاوە بۆ دەستکەوتنی مافەکانی کورد ، بەڵام وەك هەر مرۆڤێك ئەم پیاوەش بەدورنەبوە لە هەڵە و کەموکورتی و بێ ئاوەزییە پیرۆزی بکەین ، دەبیت ڕێز لە خەبات و قوربانیدان و ئومێدە نەتەوایەتیەکانی بگرین ، بەڵام بەسەر هەڵەو کەموکورتیەکانیدا بازنەدەین ، گەورەترین هەڵەی ئەم سەرکردەیە کە من لەپاش خوێندنەوەو گەڕانی چەندان سەرچاوە لەسەری بۆم دەرکەوتوە نەخوێندنەوەی ئەوی دی بوە ، ئەو دەیویست کورد بە ئامانجەکانی بگات ، بەڵام لە ژێر سەرکردایەتی ئەودا ، هەمو بڕیارەکانی شۆڕش دەبو ئەو دەری بکات ، ئەوانەی بەڕایەکانی ئەویان بوتایە نابێت و ناکرێت ، دەبو لە حیزب و شۆڕش بڕۆنە دەرەوە !

یەکێك لەو خاڵانەی کە لە شۆڕشەکانی ئەم سەرکردەیەدا زۆر باسی لێوە دەکرێت ئەو یارمەتییە دەرەکیانەیە کە وەریگرتون و بوونی دەستی دەرەکی لەگەڵ شۆڕشەکەی بەتایبەت سێکوچکەی ئێران – ئیسرائیل – ئەمریکا.

ئەو وڵاتەی کە لەهەمویان زیاتر خزمەت و هاوکاری بەشۆڕش گەیاندوە ئیسرائیله ، هەرچەندە هاوکارییەکەی ئەوان گەورەترین هۆکاری بەردەوامی و بەهێزیی شۆڕش بووە ، بەڵام لەهەمان کاتدا گەورەترین نیشانەی پرسیاری خستۆتەسەر شۆڕشەکە لەلایەن سۆشیالست و شۆڤینیە عەرەبەکان لەلایەك و ئیسلامیە بێ هەڵوێستەکانیش لەلایەکی ترەوە ، چینی یەکەم واتە شۆڤێنیەکان لێی گەڕێ ، بەڵام ئیسلامیەکان دەبوایە بارودۆخ و ژینگە و هەل و مەرجیان لە بەرچاو بگرتایە کە بوونەهۆی دروستبونی ئەو پەیوەندییە ، بەڵێ ئیسرائیل دوژمنی موسوڵمانانە و بەشێکی خاکی موسوڵمانانی داگیرکردوە ، بەڵام کاتێك موسوڵمانان و دەوڵەتانی عەرەبی ئیسلامی پشت لە براکوردەکانیان دەکەن ، و بگرە بە دەستی دەوڵەتێکی ئیسلامی و عەرەبی تر دەچەوسێنرێنەوەو سەریان پان دەکرێتەوە ، کەچی لێی بێدەنگ دەبن و بگرە لەهەندێ حاڵەتدا ئەشەدو بیلاشی بۆ دەکێشن ، لەهەمان کاتدا ئیسرائیل دەستی هاوکاری و یارمەتی بۆ کورد درێژ دەکات ، بێ ئاوەزییە کورد ئەو هاوکارییانە ڕەتبکاتەوە، با دەوڵەتانی عەرەبی و ئیسلامی هەرچی دەڵێن بیڵێن ، من لەمەیاندا هیچ ناحەقی سەرکردە کوردەکان ناگرم بەڵام بەمەرجێك میکانیزمی هاوکارییەکان لەسەرحسابی ئوممەت وەك کۆی ئوممەتی ئیسلامی نەبێت ، جا ئایا ئەم پەیوەندیەی بارزانی لەسەر حسابی ئوممەت بووە یان نا ئەوەشیان خۆی پرسیارێکی جددی یە ، جگە لەوە بارزانی زوڵمێکی مێژوویی گەورەی دەرحەق کراوە لەلایەن نوسەرانی سەر بە ڕەوتە قەومیە عەرەبیەکان لە لایەك و سەرکردایەتی سیاسی و نزیکەکانی خۆیەوە لەلایەکی تر ، نوسەرە قەومیەکان زۆریان نوسیوە و وتوە و بارزانیان بە خیانەتکار و بە کرێگیراو تۆمەتبار کردوە کە مرۆڤی عاقڵ گوییان لێ ناگریت و

حسابیان بۆناکات ، بەڵام نزیکەکانی بارزانی و سەرکردایەتی سیاسی کورد لەجیاتی خستنەڕوی ڕاستیەکان و ئەو هۆکارانەی کە لەپشت دروستبونی ئەو پەیوەندییەوەبون هەوڵی شاردنەوە و نەهێشتنی بەڵگەکانیان داوە کەئەمەش بیانویەکی تری داوەتەدەست نەیارانی کورد و بارزانی.

ئەم کتیبەی لە بەردەستدایە کتێبێکی نوسەر و ڕۆژنامەنوسی دیاری ئیسرائیلی (شلۆمۆ نەکدیمۆن)ە بەبەڵگەوە سروشت و ئالیەتی پەیوەندی ئیسرائیلی کوردی دەخاتە ڕوو ، ئامانجی من لەوەرگیرانی ئەم کتێبەدا ڕون کردنەوەی لایەنە تاریکەکانی ئەو پەیوەندییە و کەمکردنەوەی قەبارەی ئەو ستەمەیە کە لە بارزانی دەکرێت ، دیارە ئەرکی من وەك وەرگێر ئاشکرایە و بەرپرسم بەرامبەر هەر هەڵەیەکی زمانەوانی و قرتاندنی پەرەگراف و نابابەتیبونیك کە لە وەرگێرانەکەیدا بێت بەڵام هەر ناهەقییەك لەم کتیبەدا بەرامبەر هەر کەسایە تییەك کرابیت ئەوابەرپرسیارێتییەکەی بۆ نوسەری کتێبەکە دەگەڕێتەوە داواکارم هەر کەسێك هەر تێبینییەکی هەبوو یان روداوێك بەناراست دەزانێت بەنوسین وەڵامی بداتەوە .

ماوەتەوە یەك دوو خاڵێك کە ئاماژەی پێ بکەم :
یەك : ئەم کتێبە لەعیبرییەوە لەلایەن "بدر عقیلی" کراوە بەعەرەبی ، دیارە ناوی هەندێك لەکەسایەتی و شوێنەکان بەهۆی جیاوازی گۆکردن"تەلەفوز" گۆڕانکاری بەسەرداهاتوە و ئەوەی کەمن ناسیبیتمەوە ، پەراوێزم لەسەر نوسیوە ، وە ڕونکردنەوەم داوە ، بەڵام هەشە کە ناوە ڕاستیەکەیم نەتوانیوە بیناسمەوە بۆ نمونە ناوی دوناوچەکە لەکتیبەکەدا بە "جر و عمرعرە، شافارکرونە"هاتون .

دوو/ له ناو سەرکردە کوردەکاندا ئازاد ناوێك باس دەکات کە سەرۆکی هەوالگری شۆڕش بوە من زۆر هەوڵمدا بزانم ئەم سەرکردەیە کێیە بەڵام زانیارییەکی ئەوتۆم دەست نەکەوت.

سێ/ بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە جگە لەباکگراوندی عەرەبی زانینی خۆم سودم لە "المنجد في اللغه ، الاب لويس معلوف"، وە "فەرهەنگی گیرفانی ئاسان - ئاکۆ فاتیح" وەرگرتوە ، هیوادارم بەم کتێبە کتێبخانەی کوردی و مێژووی کوردم دەوڵەمەندتر کردبێت ، دیارە بێ کەموکوڕی نابیت ، هەرکەسێك لە کەم و کوڕیەکان و خاڵی یەك و دو ئاگادارم بکاتەوە لە ڕێی ئیمیڵەکەمەوە مایەی ڕێزە.

Rahand.gaf@gmail.com

ڕەهەند عبدالغفور

مەنفا

٢٠١١/٧/٢٣

# دەروازە

## لەبەر ئەوەی ( جوو ) ین

چەپۆکی ترسناکی فریشتەی گیانکێشان لەکۆتایدا گەیشتەئەوەی ڕۆحی پەیوەندیەکانی ئیسرائیلی – کوردی بکێشێت ، ئەو پەیوەندییەی.کە بۆماوەی ١٢ ساڵ بەردەوام بوو بەهاوکارییەکی چڕوپڕەوە تا لە ٦ی مانگی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ گەیشتە کۆتایی و پەردەکە داکەوت ، ئەکتەرەکان هەمویان دابەشبون لەو شوێنەی کە بۆیان دیاری کرابوو ، یاخود بارودۆخەکە سەپاندبووی.

لەماوەی ئەو ١٢ ساڵەدا (مەلا مستەفای بارزانی) سەرکردایەتی یاخیبونی کوردەکانی دەکرد دژی حکومەتەکانی عێراق و سوپاکەی بەپشت بەستن بە وەفدەکانی ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکانی کە لێی جیا نەدەبونەوە لە خۆی و سەربازگەکەی ، لە ماوەی ئەو ١٢ ساڵەدا شاندی ئیسرائیلیەکان بە شێوەیەکی خولی ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرا ، هەر سێ مانگ جارێك هەمیشە پیاوێکی سەر بەموساد سەرۆکایەتی دەکرد لەگەڵیدا ئەفسەریکی سەر بەسوپای ئیسرائیل هەبوو ، لەگەڵ ڕاوێژکارێکی هونەری ، ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان یاریدەی کوردەکانیان دەدا بۆ خۆڕاگرتن لە بەرامبەر مەترسی ئەو خوێنڕشتن و وێرانکارییەی لەلایەن عێراقیەکانەوە دژیان دەکرا ، ئیسرائیلیەکان هەوڵیاندەدا شێوازی نوێ جەنگ فێری کوردەکان بکەن ، تا بتوانن ڕوبەڕوی ئەو فشارە زۆرە ببنەوە ، کە بەسەریاندا دەسەپێنرا ، زۆربەی کات ئیسرائیلیەکان بە هاوڕێیەتی شاندی پزیشکی دەهاتن کە یارمەتی چارەسەرکردنیانی دەدا ، وە چەند هەناسەیەکی ژیانی بەبەر یاخیبونی کوردەکاندا دەکردەوە ، تا تەمەنی درێژتربێت.

ئەو یارمەتیە ئیسرائیلیانەی کەپێشکەشی کوردەکان کرا تەنها پەیوەندی بە بەرژەوەندی ئیسرائیلەوە نەبوو ، بەڵکو لایەنێکی مرۆڤدۆستیشی لەخۆگرتبو ، لەمیانەی دانیشتنێکی لیژنەی دەرەکی و ئاسایشی ئیسرائیلی ، دکتۆر (زیرەح

فەرەهیفیچ) یەکێ لەسەرۆکەکانی کوتلەی پارتە ئاینیە نیشتمانیەکان لەسەر ئەو ڕاپۆرتەدوا کە سەرۆکی حکومەت (ئیسحاق ڕابین) سەبارەت بەو یارمەتیانەی پێشکەش بەکوردەکان کراوە ، پێشکەشی کردبو و ووتی : ( من پێم وایە کە یارمەتیەکانمان بۆ کوردەکان لەزەمینەی خواست و ڕێزگرتنی دەستی یارمەتیمانەوە بۆ کەمێتیەکانە لە شۆرشەکەیان) ، ئیسحاق ڕابین وەڵامی دایەوە لەسەر ئەو وتەیەو وتی : ئەمە لەبەر ئەوەی جوین.

یارمەتیەکانی ئیسرائیلیەکان بەڕادەی ئامادەگیی ئێرانیەکانەوە بەندبوو بۆ قبوڵکردنی ئەو هاوکارییە ، و ئاستی هاریکاری نێوان ئیسرائیل وئێران ، ئەم قبوڵ کردن و هاریکاریەش لەسەرئەو دوژمنکارییە بەردەوام و ئاگرینەی نێوان عێراق و ئێران وەستابوو، کە ئاشکرابوو بۆ ئیسرائیلیەکان تاسەر ناخایەنێت ، وە لەچرکەساتی گەیشتنی هەردو وڵاتەکە بەرێککەوتن کۆتایی یاخیبونی کوردی چاوەڕوان کراو بوو، هەر ئەمەش دەقاودەق لە جەزائیردا ڕویدا لە شەشی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ کاتێك شای ئێران (محمد رەزای پەهلەوی) ئیمزای لەسەر ڕێککەوتن کرد لەگەڵ صدام حسين ، کە بەڕوکەش بەکەسی دوهەمی ناو حکومەتی عێراق دەردەکەوت ، بەڵام لەڕوی کردارییەوە هەر ئەوپیاوە بەهێزەکە بو کە دەستی بەسەر هەموو کارەکاندا گرتبو لەناو حیزبی بەعسدا.

ڕێکەوتننامەی ناوبراو هەڵی دەستبەسەراگرتنی شەتوالعەرەبی بۆئێران ڕەخساند ، ئەو ناوچەیە کە لەکەنداودا لەڕووی بازرگانیەوە زۆر گرنگ و پڕبەها بوو ، ئەمە لەبەرامبەر دەستگرتنەوەی ئێرانیەکان لەپێشکەشکردنی یارمەتی بۆ یاخیبوان بەم شێوەیە پەردە لەسەر یاخیبونی ماوەدرێژی کوردەکان دادرایەوە، وە ئومێدی کوردەکان بە دەستکەوتنی نیمچە سەربەخۆییەك هەرەسی هێنا ، وە لە ٩ی ئازاری ساڵی ١٩٧٥ دا سەرۆکی حکومەت ئیسحاق ڕابین بە وەزیرانی کابینەکەی وت : (ئێرانی و عێراقیەکان گەیشتونەتە ڕێکەوتنێك ، جەخت دەکاتەوە لەسەر دەستبەردان لەکوردەکان) ، هاریکاری ئێرانی – کوردی – ئەمریکی – ئیسرائیلی

لەو کاتەدا لەلوتکەدا بوو ، بۆیە ڕێکەوتنەکە لەوکاتەدا موفاجەئە بوو بۆ هەمولایەنەکان بە مۆسادیشەوە ، کە بەڕێککارییەکی تەواوەوە لەگەڵ دەزگای (ساواك)ی ئێرانی کاری دەکرد ، کەلەڕوی ئامانجەوە بەهاوشێوەی مۆساد دادەنرا، بگرە ئەمریکیەکان کە (شا) خۆی پەنای بۆ دەبردن و لەهەموو بۆنەیەکدا دوای لێدەکردن تا یارمەتی پێشکەشی کوردەکان بکەن ، ئاگادار نەبون لە نهێنی ڕێڕەوی پەیوەندییەکانی نێوان صدام حسین و شا ، وە شا لەو ڕووەوە هیچ ئاماژەیەکی نەدابوو پێیان ، (بەرزانی)ش بەهەمان شێوە ئەو کاتە لەئێران بوو ، تەواو توشی شۆك بوبو بەو ڕێککەوتنە .

ڕێکەوتنامەی جەزائیر خاڵی کۆتایی لەسەر یاخیبونی کوردەکان دانا وە سوپای یاخیبوە کوردەکانی تواندەوە ، و سەرکردەی یاخیبونەکە ڕوی کردە ژیان لە مەنفا و لە ساڵی ١٩٧٩ پاش ئەوەی خانەکانی شێرپەنجە جەستەیان خوارد کۆچی دوایی کرد ، چەند مانگێك تێنەپەڕی بوو کە (شا)ش بەهەمان شێوە کۆچی دوایی کرد ، پاش ئەوەی شۆڕشی خومەینی لەوماوەیەدا لەسەر کار لایدابوو ، بەهەمان ئەو نەخۆشیەش کەبارزانی کوشت ...!

ئەم کتێبە بە ڕاشکاری لە دەرگای چیرۆکی هاریکاری ئیسرائیلیەکان بۆ یاخیبوە کوردەکان دەدات لە عێراق.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هیچ دەرچەیەکی دەریایی بۆ کوردستان نیە ، و ئەو کاتە هەمو فڕۆکەخانەکانی سەر زەوییەکەی لەژێر کۆنترۆڵی عێراقدا بون ، بۆیە چونەناوەوەی مەحاڵ بوو تەنها ئەگەر لەڕێگەی ئەووولاتانەوە نەبێ کە لە چواردەوری بوون، تورکیا یان سوریا یان عێراق یان ئەرمینیا یان ئێران ئەمەش وایدەکرد کە پێشکەش کردنی هاریکاری لە لایەن ئیسرائیلیەوە بە ڕازیبون و ئارەزووی ئێرانەوە بەندبێت ، شیاوی باسکردنە ئیسرائیل لە سەروبەندی ئیمزا کردنی ڕێککەوتننامەی جەزائیردا لێکۆڵینەوەی کردوە لەئیمکانیەتی پێشکەش

کردنی هاوکاری بەکوردەکان ، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەڵام هەر خێرا بۆی دەرکەوت کە ئەوە مەحاڵە.

گێڕانەوەی سەرەتاو دارمانی هاریکاری ئیسرائیلی کوردی لەماوەی نێوان ١٩٦٣ ١٩٧٥ وەك ئەوەی لەم کتێبەدا هاتوە لەمانەوە وەرگیراوە :

- چاوپێکەوتن لەگەڵ پیاوانی موسادی ئیسرائیلی کە ڕاسپێردراوبون بە سەرپەرشتیکردنی ڕاستەوخۆی ئەو کارانەی کە لەکوردستاندا دەگران ، وە لەگەڵ ژمارەیەکی تر لەپیاوانی موساد و ئەفسەرانی سوپای ئیسرائیلی و ئەو شاندە پزیشکیانەی لەوێ کاریان کردوە بەپێویستم زانی ناوی بەشێك لەوان بەنهێنی بهێڵمەوەو و تەنها بە پیتی یەکەمی ناوەکانیان ئاماژەیان بۆ بکەین .
- بەڵگەنامەگەلێك کە تا ئەم کاتە (کاتی نوسینی کتێبەکە) نهێنین و ناگونجێن ئاشکرایان بکەین.
- ژمارەیەکی زۆر کتێب.
- ئەو ڕاپۆرتانەی کە میدیا نێودەوڵەتیەکان سازیان کردوە.
- ئەرشیفە تایبەتی و گشتیەکان.
- یاداشتنامەی بەڵگەنامەیی و نامەگەڵێك کە ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان نوسیویانن کاتێك لەکوردستان بون، ئەمە جگە لە(دەیڤد کۆرن) کە توێژەرەوەیەکی ئەمریکیە و کاتێك کە پۆستێکی باڵای هەبو لە باڵوێزخانەی ئەمریکی لە ئیسرائیل ناسیم ، کە ٩ چاوپێکەوتنی خستە بەردەستم کە لەواشنتن لەگەڵ نزیکەکانی بارزانی ئەنجامی دابون ، ئەم چاوپێکەوتنانە هەلی پێداچونەوەو بینینێکی قوڵتری پێدام لەو هۆکار و شێواز و هەڵسەنگاندنانە کە سەرکردەکانی یاخیبونی کوردی لەبەرچاویان گرتوە.

نوسەر

شلۆمۆنکدیمۆن

## بەشی یەکەم کتێبە پیرۆزەکە نەتەقیەوە

مەلا مستەفای بارزانی لە ٢٩ ی ئەیلولی ١٩٧١ دا هێندە توڕەدیاربوو کە هەتا ڕادەی شێتی هاواری دەکرد : ئەمە هەوڵی دا بمکوژێت .... بارزانی بە خەمەوە لەو گوندەدا کە لێی نیشتەجێ بوو ڕاوەستابوو کە گوندی (حاجی نۆمەران) بوو لەوکاتەدا خۆڵ و ئەو وردەبەردانەی کە پۆشاکەکەیەوە بون دەیتەکاندن وە ئاماژەی بۆ برینێکی بچوك دەکرد لە ڕوومەتی ، گوتی : (لە سەعات چوارونیوی ئێوارەوە هاتن بۆلام وە لەناکاودا ..... ) دوان لە نزیکەکانی لێیان پرسی : کێ بوون؟ بارزانی وتی: ( ٩ پیاوی ئاینی بون لە بەغدادەوە هاتبون) ، پرسیارکەرەکان وەك ئەوانی دی جلوبەرگی پێشمەرگە یاخیبوەکانیان لەبەردابوو ، لەهەمان کاتدا ڕوخساریان تۆزێ نامۆ دیار بوو ، وە دەموچاویان ڕەشداگەڕاو نەبوو ، ئەمە پیشانی دەدا کە ئەمانە میوانن و جگە لە بارزانی و دوو تا سێ کەسی زۆر نزیك لێیەوە لە سەرکردایەتی یاخیبوان زیاتر ، کەسی تر نەیدەزانی کە ئەم دوانە موسادی ئیسرائیلین (زەفی زامیر) و (ناحوم ئەدمۆنی) ، بارزانی دیسان هاواری کرد (دەمویست چاوم بە چەند پیاوێکی ئاینی بکەویت کە پەیامێکیان بۆ من پێبوو سەبارەت بەڕێککەوتنی ئاگربەست لە ١١ی ئازاری ١٩٧٠ ، بەدوو ئۆتۆمبیلی مۆدێل بەرز هاتبون ، هاتنەژورەوە بۆلام قاوەمان بۆهینان لە ناکاودا قومبەلەیەك تل بویەوە و تەقیەوە ، ... بەڵێ لەبەینی من و مردندا چاو تروکانێك مابو ، دەست بەجێ پیاوانی پێشمەرگە تەقەیان لێ کردن و کوشتیانن ،پاش چەند چرکەیەك یەکێك لەئۆتۆمبیلەکانی دەرەوە تەقیەوە کە وەك کۆگایەکی تەقەمەنی وابو ، وە لەئۆتۆمبیلەکەی تردا دەستمان بەسەر چەند قومبەلەیەکدا گرت و چەند ساروخێکی ئامادەکراو بۆ تەقینەوە ، ویستیان بمکوژن دکتۆر مەحمود عوسمانیشمان لەگەڵ بوو خەریك بوو بیکوژن ، پاشان ئیدریسی کوڕم دەکوژن ئەمە یەکەم هەوڵدان نی یە بۆ کوشتنی ئیدریس ، ساڵی پێشوو لە بەغداد ویستیان بیکوژن هەروەها مەسعودیش دەکوژن) ، مستەفا

بارزانی تەنها مەبەستی (.........) بوو وە بە شێوەیەکی گشتیش ئێرانییەکان لە دیدگای ئەودا وەك سەگ وابون بارزانی زۆرتوڕە دیاربوو ، ئاگربەستێکی سادە لەنێوان هەردولادا هەبو ماوەی ساڵ ونیویك بوو گفتوگۆو دیالۆك لەنێوانیاندا دەگوزەرا لەپێناو گەیشتن بەچارەسەرێك بۆ کێشەی کورد هاوشان لەگەڵ خەونبینین بە وەرگرتنی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی و شارستانییەتی و زمان و فێرکردن و بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی و بەشداری لەسوپا و حکومەت دلە لەوماوەیەدا وادەردەکەوت کە ئەم خەونە بەرەبەرە دەبوکایەوە وکاڵدەبوەوە ، بەڵام خەوەکە بەشێوەیەکی کتوپڕ ڕەویەوە ، توڕەیی بارزانی ئەمجارە لەهەموو ئەوجارانەی تر زیاتر بوو کە کێشە دەکەوتە نێوانیانەوە وە لە زامیر و ئەدەمۆتی دەپرسی چی بکەین چی بکەین، لە کاتێکدا ئەوان دەیانویست هێوری بکەنەوە ، ئەو چرکەساتە باشترین کات بوو بۆ ئاژاوەنانەوە و کردنەوەی ئاگری دوژمنایەتی ، بەڵام زامیر پێی وت بڕیاری سەرەتاو کۆتایی بەدەستی خۆیەتی بەڵام پێویستە زۆرهیمن و لەسەرخۆ بێت وە زۆر بەباشی لەکاردانەوەکەی بکۆڵێتەوە بەرلەوەی هیچ هەنگاوێك بنێت چونکە هەمو ئەگەرەکان کراوەن لەبەردەمیدا.

★ ★ ★

هەواڵی هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی بارزانی وەك ئاگرکەوتنەوە لەناو پوش پەڵاشدا بەخێرایی هەورەبروسکە بڵاوبوەوە ، سەرکردەکانی یاخیبون یەك لەدوای یەك هاتنە بارەگای بارزانی ، خۆیان دەخواردەوە لەتوڕەییدا و دەیانوت پێویستە صدام حسین بزانێت کەخوێنی ئەو ئەوەندە گران نیە بۆ ئێمە (واتە کوشتنی ئەو هێندە گران نیە) ، پرۆسەی (بۆگڵ دەگەڕێتەوە )سپێردرا بە(صادق) کەشارەزایی بواری تەقینەوەبوو و کورد بوو، هەندێك لەهاوڕێ شارەزاکانی یانگهێشتکرد بۆ ئامادەبوون لەکۆبونەوەیەکدا لەیەکێ لە حەشارگە سروشتیەکان کە دەکەوتە

هەڵدێرەکانی یەکێك لەشاخەکانی گوندی حاجی ئۆمەران ، ئەو حەشارگەیە وەك کارگەیەکی بچوکی دروست کردنی کەلوپەلی تەقینەوەبوو ، (صادق) بەهاوڕێکانی وت ئێمە دەمانەوێت ئەوە بە صدام حسین بکەین کەئەو دەیویست بەسەرکردەکەمانی بکات ، (صادق) لەسەرەتایەکی زووی ژیانیەوە پەیوەندی بەریزەکانی پێشمەرگەوە کردبو ، لە قەناسێکی[1] زۆرچاك دەچوو ، توانایی تێگەیشتنی لەوەی کە لە چواردەوریدا دەگوزەرێ زۆرباش بوو ، گرنگیەکی زۆری بەکەلوپەلی تەقینەوە دەدا و زۆر بەخێرایی لەنهێنیە جیاوازەکانی تەقینەوەکانی کۆڵیەوەو لێیان فێربوو فێربووبوو جیاوازی لەنیوان جۆرەکانیدا بکات کارامەبوو لەدروست کردنی بۆمبی چێنراودا بارزانی متمانەی پێدەکرد ، وە لەو بەشە زۆرکەمەدادەنرا کەپێناسی ڕاستەقینەی زەفێر و نەدمۆنی دەزانی، (صادق) هەوڵی دا ئەو هۆکارانە بزانێ کەبونەهۆی سەرنەکەوتنی پرۆسەی تیرۆرکردنی بارزانی لە٢٩ی ئەیلولدا و هەوڵی دا سودی لێ وەربگرێت لەبەر ئەوەی هەموو زانا ئاینیەکان کوژرابون دەبێ هەر هەڵەیەکی هونەری ڕوی دابێت بۆمبەکە لەحەشارگەکەی خۆی کە جل و بەرگێکی زانایەکیان بوو بەر لەکاتی دیاریکراوی خۆی کەوتەخوارەوە ، بۆیدەرکەوت زاناائاینیەکان لە ڕاستی شتەکە یان ئاگادار نەبون تەنها کۆمەڵەی پاکتاو کردنەکە نەبێت کەیەکێك بون لەو دەیان کۆمەڵەی پاوکتاوکردنەکەی کە صدام حسین بەڕێوەی دەبردن ، (صادق) وتی (خوا سەرکردەکانی پاراست بەهەمان شێوەش یاریدەی ئێمەش دەدات ) لە ١٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧١ وەزیری مەعارفی[2] عێراق کە دکتۆر (أحمد عبدالسلام عبدالقادر) بوو لە بەغداوە سەردانی سەرکردایەتی بارزانی کرد و بەبارزانی ووت لەسەرەتای ڕودانی هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانیەوە جێگری سەرۆك صدام حسین بەبێ ماندوبون و بێزاری کاردەکات بۆ هەڵماڵینی دەمامکی ڕوی پلاندارێژەرانی

---

[1] (قەناس) ئەو کەسەیە کە چەکی قەناسە شارەزایە – وەرگێر

[2] وەزارەتی ڕۆشنبیری ئێستا – وەرگێر

ئەوكارە ، و ئەولايەنەی كەفەرمانی بەجێبەجێكردنی داوە ، جێگر فەرمانی بەهەمو لایەنەئەمنیەكان كردوە شەووڕۆژ كاری بۆبكەن ، دكتۆر عبدالقادر ووتیشی : صدام حسین پێی وایە كە ئەمە پیلانێكە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دایڕشتوە بۆتێكدانی پەیوەندییەباشەكانی نێوان عەرەب و كورد وە ڕایسپاردوم كەپێت بڵێم جێ بەخۆی ناگریت تاوەكو بكەرەكان نەدۆزێتەوە ، مەلاكەی بارزان دەیزانی هەرگیز بكەرەكان نادۆزرێنەوە بەلاّم ئەو لەو كاتەدا تەنها بیری لەو ڕۆژە دەكردەوە كە گەلەكەی سەربەخۆیی بەدەست دێنێت هەتا ئەگەر سەربەرخۆییەكی جوزئیش بێت ، بۆیە بە وەزیرەكەی گوت : (من ئەو لوتفە بەخشندانەیەی جەنابی جێگری سەرۆك بەرز هەڵدەسەنگێنم كە نێردراوێكی پایەبەرزی وەك تۆی ناردوە تاهەستی خۆشەویستی خۆی بەرامبەرم دەربڕێت) ، بارزانی ئەوەشی زیاد كرد (ئەم ڕاستیە دەلالەتە لەسەر بالاّدەستی و ڕاوەستاوی ئەو) ، وەك ڕێزێك كە لە ناخمدا بەرامبەر بە ئەو هەمە تكات لێدەكەم كەئەم دیاریەی پێشكەش بكەیت ، دكتۆر عبدالقادر دیارییە پێچراوەكەی وەرگرت و لەكاتی بەڕێكردنی بارزانی وتی: (لەناو خەزێنە گران بەهاكانی ئێمەدا كتێبێكی پیرۆزی كۆنت دەست كەوت كەكتێبی تەفسیری قورئانەو لاپەرەی كتێبەكەش بە وردەنوسینی عەرەبی كۆن پڕكراونەتەوە ).

* * *

وەزیری مەعارف لە گوندی حاجی ئۆمەرانەوە گەڕایەوە بەرەو بەغداد وە لە ١٤ی تشرینی یەكەمدا جێگری سەرۆك پێشوازی لێ كرد ، عبدالقادر بە صدام حسینی ووت: (بارزانی لوتفەكەی تۆی بەرزنرخاند كە بەتایبەتی منت بۆلای ناردبوو ، بەلاّم سەرەڕای ئەوە نەیتوانی ئەو هەستەی بشارێتەوە كە ئەو باوەڕی وایە پلانی تیرۆركردنەكە بەدەستی تۆ بوە ، هەرچەندە ئەو تەواو سنورداریی هێزەكەی

خۆی دەزانێت) ، ئەوەشی لێ زیادکرد (لەو ڕووەوەی کە بارزانی ئومیدی وایە ئەونەخشەی ئۆتۆنۆمیەی کە لە١١ی ئازار بڕیاری لەسەردرا بچێتەبواری جێبەجێکردنی کردارییەوە ئەو ئینتیباعەشی پێدام کە ئەو هەوڵ دەدات کە هەوڵی تیرۆر کردنەکەی لەیاد بکات و ڕێگەبدات کە کارەکان بەڕێرەوە کۆنەکەی خۆیدا بڕۆن ، بەلایەنی کەمەوە تا ئەوکاتەی کەدەرئەنجامەکانی ئەو لیژنەیەی پێ ڕادەگەیەنرێت کە من هەواڵم پێدا تۆ دروستت کردوە بۆلێکۆڵینەوە لەکێشەی هەوڵی تیرۆر کردنەکەی و پێویستە لێژنەی لێکۆڵینەوە بکاتە دۆزینەوەی گومان لێکراوێك بۆ ڕازی کردنی وە باشتروایە کەسایەتیەکی پایەبەرزی عێراقی لە گۆڕەپانی نێوەندی لەبەغداد هەڵبواسرێت و لەسێدارە بدرێت ، و بەمە کارەکە کۆتایی دێت )).

وەزیرەکە لەکاتێکدا دیاریە پێچراوەکەی دەخستە سەر مێزەکە وتیشی: ((بارزانی دیاریەکی بۆ ناردوی پێی وتم دیارییەکە بریتیە لەقورئانیکی کۆن و ناوازە لە ناوکاو لە چاوانی صدام حسین ەوە بریسکەی حەزەر دەرکەوت و ئاماژەی بۆ وەزیرەکە کرد کەدیارییەکە بکاتەوە بە پێکەنینەوە وتی : وا گومان مەبە مستەفا بارزانی گەمژە بێت لەوانەیە ....... )) لە چرکە ساتی ئەوەدا کە وەزیرەکە دەیویست کتێبەکە پێکەشی صدام حسین بکات دەنگی تەقینەوە بیسترا ، پاسەوانەکەی صدام بازیدایە ژورەکەوە دەست بەجێ دەست ڕێژێکی لە وەزیرەکە کرد ، صدام حسین لەشوێنەکەی خۆی هەستا ، دڵۆپ دڵۆپ خوێن لەو برینەبچوکەوە دەهاتە خوار کە لەسەر ڕوخساری بوو وتی: وتم مستەفا بارزانی گەمژە نی یە ، ئەو (......)ە .

★ ★ ★

له ١٥ی تەموزی ١٩٧٢ نێردراوی ئاژانسی هەواڵەکانی عێراق سەردانی بارزانی کرد تا چاوپێکەوتنی لەگەڵدابکات ،کاتێك ئامێری تۆمارکردنەکەی کردەوە دەستیکرد بەپرسیارکردن لە بارزانی جموجوڵەکانی بەهەر هۆکارێك بێت گومانی لای سەرکردەی ئەو پێشمەرگانە دروستکرد کە پاریزگارییان لەبارزانی دەکرد، داوای مۆڵەتی کرد بۆدەستگیرکردنی ڕۆژنامەنوسەکەو پشکنینی ، لەبەختیاشی بارزانی ڕون بوەوە کەگومانی سەرۆکی پاسەوانەکان لەجێی خۆیدابوە ، ڕۆژنامەنوسەکە دانی بەوەدانا کە نێردراوە بۆکوشتنی بارزانی ، بارزانی و نزیکەکانی جەختیان لەوە کردەوە کە زۆرهەوڵی تیرۆر کردنیان پوچەڵ کردۆتەوە ، هەروەها ئەوانەی کەژیانی صدام حسینیان نوسیوەتەوە نوسیویانە کە ئەو لەچەندەها هەوڵی تیرۆر کردن ڕزگاری بوە ، لە کاتێکدا ئاماژەیان بەوەنەکردوە کە هەرخۆی چەندەها جار پلانی بۆهەوڵی تیرۆرکردنەکان دارشتوە و ئەو ژمارە زۆرەی ئەو لەناوی بردون لەناو دژەکانیدا ئامارناکریت ، تەنانەت لەنێو پیاوەکانی خۆشیدا .

## بەشی دووەم : تاکە ئازادی ئەوەیە کە هەوا هەڵمژین

موقەدەم (یەهودا بن دیڤید) جێگری پاشکۆی سەربازی لەباڵوێزخانەی ئیسرائیل لەپاریس و بەرپرسی پەیوەندیەکان لەگەڵ لایەنەهەواڵگرییە نێوچەییەکان ئەورۆژە زۆر بێ برست چاوەڕوانی دیدارێکی چاوەڕوانکراوی دەکرد ، لەگەڵ کەسێکدا کەپێشتر نەیدەناسی ، و بە میسیۆدی پرینس (بەرێز ئەمیر) ناوزەدیان کرد ، بن دیڤید کەماوەیەکی کەم بوو ئەو پۆستەی وەرگرتبوو وای خەیاڵدەکرد ئەو ماڵەی کەبۆی دەچێت کۆشکێکی نازداری لەهەموو لایەکەوە ڕازاوەیە و خزمەتکاری زۆری تیدایە کە جلوبەرگی سپییان پۆشیوە ، شەرابیکی پاڵفتە لە ناو پەرداخ و توحفەو قاپ و قاچاخی دروستکراو لەزیو کەڕازێنراونەتەوە بە نەخشونیگاری بنەماڵەی مولکداری ئەمیرەکە ، سینیی بەریملەمی کۆنی سەدەی چواردەیەم.

بۆ بەلاڕێدابردنی ئەو کەسانەی کە ئەگەری ئەوە هەبوو شوێنی کەوتین ، بن دەیڤید ئۆتۆمبیلەکەی لەشەقامی ١٥ ڕاگرت کەنزیك بوو لە کۆشکەکەوە ، لەوێوە بەپێ و بە خێرایی کەوتە ڕێ تا لەکۆڵانێکی پڕ لەژاوەژاو لەو شوێنە کە میترۆ[1] دێتە سەرزەویی ، بن دیڤید هەستیکرد هەموو پێشبینیەکانی لەبەر پوکانەوەو نەمان لەشوێنیان هەستی بەبێئومیدی کرد ، لەیادەوەریەکانیدا نوسویەتی ( هاوکارە پێشوەکەم ڕێنمایی کردم بۆماڵێکی کۆن ، لەوێ دیتم کەسێك بەپێوە وەستاوە تێبینیم کرد هەمووجوڵەکانی ئاماژەیان دەدا بەخانەدانی ئەم پیاوە ، وە تێبینیم کرد کەپیری لاجانگی و سمیڵە وردەکەی سپی کردوە ، بەڵام جەستەی تا ڕادەیەك قورس و درێژبوو ، وە پێکەنینکی هەڵواسراو بەلێوەکانیەوە کە لەدەمی دەردەچوو وە بەسەر چەناگەیدا دەکەوتە خوارەوە ، بە جوڵەیەك ڕێگای بۆ چولکردین ك گوزارشتی لەوە دەکرد کە هونەری ئەتەکێت دەزانێت ، کۆشکی

---

[1] میترۆ : شەمەندەفەری تێژرەو کە لە ژێر زەوی دا دەڕوات و دەچێت و لە وولاتانی پێشکەوتوودا زۆرە – وەرگێر –

ناوبراو لەڕاڕەویکی بەشبەشکراو بە ستارەیەك و تاقە ژورێك و چێشتخانەیەکدا کورتبوەوە ، لەوحێکی پلاستیکی لێ بوو کە چێشخانەکەی دەکرد بە دوو بەشەوە لەگەڵ حەمامێك و تەنکیەکی ئاودا ، هیچ نیشانەیەکی خانەدانی و ڕەسەنایەتی لەوێدا بەدی نەدەکرا، جگە لەکەل وپەلە گرانبەهاکانی کە لەژورەکەدا ڕاخرابون . )

ئەو زانیاریانەی کە لە لای (دێڤید)ن جەخت لەوەدەکەنەوە کە خانەخوێکەی لەبنەماڵەیەکی ئەمیر زادەی کوردە، و خۆی نازناوی (میر) هەڵدەگرێت و لەپەنجاکانی تەمەنیدایە و ، نوێنەرایەتی کوردەکان دەکات لەئەوروپا ، ئەو گەلەی کەوڵاتەکەی دابەشکراوە بەسەر پێنج دەوڵەتدا ئەوانیش : عێراق ، تورکیا ، ئێران ، سوریا ، ئەرمینیای سۆڤیەتی ، وەڕۆڵەکانی شەڕ دەکەن لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆییدا ، ئەو ووتەبێژ بوو بەناوی ئەو ڕۆڵانەی کوردەوە کە ئاڵای یاخیبونیان هەڵدابوو .

گومان لەوەدانیە کە هەرئیسرائیلیەك تا ئەوکاتە لەگەڵ (ئەمیر بەدرخان)دا کۆبوبێتەوە گوێی لەبەسەرهات و بۆچونەکانی بوە، پاش ئەوەی لەگەڵ (بن دێڤید) دا سڵاوو چاکوخۆشیان کردو پەرداخێك شەربەتی پێشکەشکرد ، میر ووتی: (دەمەوێت ئەو هۆکارە بزانیت کەوای لێکردوم پەیوەندی بەئێوەوە بکەم ، ئێوەی ئیسرائیلیەکان ، ئێمە – ئێمەی کورد - تاڕاددەیەك لە ئێوە دەچین ، لێکچون لەنێوان ئێمەوئێوەدا ئەوەیە کەدابەشکراوین بەسەر پێنج دەوڵەتدا ، ئەو دەوڵەتانەش بەکاریان هێناوین ، هەلیان لێهێناوین بۆ مەبەستەتایبەتیەکانی خۆیان ، گومان لەوەدانیە کە هیچ کام لەو دەوڵەتانە تەنانەت یەك جاریش وای پیشان نەداوە کە (مافی ئۆتۆنۆمی) مان پێبدات چ جای سەربەخۆیی ، بەڕاستی لەسەرزەویەکانی خۆمان ماینەوە ، هەرچەندە زۆربەی کات وەدەرنراوین ، یەکمان گرتووە یان یەکمان چەوساندۆتەوە بە پێی بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانە)).

بن دێڤید قسەکەی پێ دەبڕێت و دەڵێت : ((بە پێی نەخشەکان بێت ، پەیوەستبونێکی هێمایەتی هەیە لەنێوان زەویەکانی کورد کە دابەش کراون بەسەر پێنج دەوڵەتەکەدا، وە ئێوە لەناوچەگەلێك دەژین کە ژمارەیەکی زۆر پێگەوڕێگای ستراتیژی لەخۆدەگرێ ، بەهەمان شێوە خەزێنەی ستراتیژیش ، وەك نەوت ، ئایا نەتانتوانیوە بەهێزی خۆتان بەسەر ئەوفشارانەدا زاڵ بن ؟؟))

(بەدرخان) وەڵامی دایەوە : (( بەڵی ، بەڵام ئێمە هێشتا بەنیسبەت گەلانی ترەوە دواکەوتوین ، لەوەدا کەپەیوەندی بەڕابونی نیشتمانی هاوچەرخەوە هەیە ، هێشتا لەهەموو بارودۆخێك دا پەیوەستین بە کۆمەڵێك نەریتی بۆماوەیی کۆن ، و چوارچێوەگەلێکی خێڵەکیانەی زەرەرمەند، ، کەهەرکاتێك پێویستی کردوە ، کە تێبکۆشێن و بجەنگێین کۆسپ بووە لە بەردەممان و زیانی زۆری لێداوین)).

بەدرخان پێی وابوو کە دادپەروەریی و خۆڕاگری و باوەڕ و هێزی ڕۆشنبیری بەس نین بۆ ڕاتەکاندنی وڵاتانی جیهان ، وادەردەکەوت توانای ئەوەی نەبێت دەست پێشخەرییەکی وابکات کە ڕێگەی بدات باوەڕ بەودەوڵەت یان ئەمیان بهێنێت کە تێبکۆشێت لەپێناو گەلی کورددا ڕوبەروی سوریەکان یان ئێرانیەکان ، یان تورکەکان یان عێراقیەکان ، چ جای یەکێتی سۆڤیەت، بۆیە هیچ چاری نەبوو جگە لەڕوبەڕوو بونەوەی هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نەبێت، ، بۆیە بەهەرکەسێك کە ئامادەبوایە گوێی بۆ بگرێت دەیگوت: (( واوەیلا بۆ ئێمە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستێکی پێکداچوودا کەبخرێتە ژێر کۆنترۆڵی بزووتنەوەیەکی عەرەبی یەوە، کە خێرا دەگۆڕێت بۆ ئابڕووچونیکی گەورە ، ئێمە و ئێوەی ئیسرائیلی دەبینە قوربانی ئەو بزوتنەوەیە)).

بن دەیڤید دەڵێ: (بەدرخان وێنای خۆرهەڵاتێکی ناوەڕاستی دەکرد کەدابەش بوبێت بۆ چەند یەکەیەکی سروشتی ، کە هەرکۆمەڵە یان تایەفەیەکی ئەتنی بەمافی چارەی خۆنوسین شاد بێت ، لە چوارچێوەی سنورێکی لۆژیکی دا کەتوانای بەرجەستکردنی سەربەخۆییەکی شارستانیانەی هەبێ)).

بەدرخان دەیزانی کە ئەم خەون و پێش بینیانە لە نێوان سپێدەو چێشتەنگاوەکەیدا بەدی نایەن ، بۆیە پێشنیاری کرد کە ئەم تایەفە و کۆمەڵە ئەتنی یانە لەخولگەیەکی فۆناغبەنددا مافی ئۆتۆنۆمی یان پێبدرێت لەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتەدا کە تێیدادەژین ، وە لەئاسۆی دووردا ، بەدرخان باوەڕی وابوو کەڕۆژێك لە کۆتایی دا ئۆتۆنۆمی هەر دێت ، درەنگ یان زوو ، ئەو کات خۆرهەلاتی ناوەڕاستێکی نوێ دروست دەبێت ، فرە دەوڵەت ، کە پێکەوە بەسراون لە شێوەی یەکێتیەکی کۆنفیدراڵی دا، و هەر دەوڵەتێك ڕێزوشکۆیەکی تایبەتی بۆئەوی تر دادەنێت ، و هەریەکێ لای خۆیەوە بەهاوکاری ئەوانی تر هەوڵدەدات بۆ بەرەوپێش بردنی ناوچەکە بە گشتی .

بەدرخان ئیسرائیلی بەهاوبەشێکی سروشتی دادەنا لەیەکێتیە کۆنفیدراڵیەکەدا لەبەرئەوەی دەوڵەتێکی ناعەرەبە ، و بچوکە و خاوەنی ئەو هێزە سەربازییە شکۆدارەیە کە عێراق و سوریای ترساندوە و پشکداردەەبێت لەبەهێزکردنی هێزی کوردەکاندا ، و بەدرخان دەیگوت کە بونی ئیسرائیل هۆکاری سەرەکییە کەعێراق ناتوانێت هەموو هێزەسەربازییەکەی بۆ تێکشکاندنی کوردەکان بەکاربهێنیت ، بە بن دێڤید وترابوو پەیوەندیەکانی ئیسرائیل لەگەڵ (میر)دا لەچلەکانەوە بەردەوامە ئەو دەیەوێت کۆمەك لە ئیسرائیل وەربگرێت بۆ بەرژەوەندی کوردەکان، بەلام لەهەمان کاتدا یاریدەی ئیسرائیلیشی داوە لە پەیوەندیگەلێکی نهێنی لەگەڵ وولاتە عەرەبیەکاندا لەمانگی ئاياری ساڵی ١٩٤٨ەوە و بگرە ماوەیەك پێشتریش .

* * *

شیاوی وتنە کەناوی تەواوی بەدر بریتیە لە(کامەران علی بەدرخان)و وەچەی سەرۆك خێزانێکە هەلگری ئەوناوە بوە ئەو سەرۆکە نازناوی (بێگ )ی هەبوە کە سەرکردایەتی چەند تیرەیەکی تورکیی کردوە لەدورگەی ئیبن عومەر[1] کەدەکەوێتە سەرسنوری تورکیا و سوریا و لەسەدەی‌نۆزدەهەمدا شەڕی لەگەڵ عوسمانیەکان کردوە و عوسمانیەکان یارمەتی خیانەتکارێکی کوردیان داوە ، بەرلەراپەڕینی کێشەی زۆری تری لەگەڵ سوپای سوڵتانی عوسمانی هەبوە ، سەبارەت بەباجدان و بەسەربازگردنی کوردەکان بۆسوپا ، جارێکی تر تێك شکاوە و تورکەکان خۆی و خێزانەکەیان ڕاگواستوە بۆ(کۆستا) ، ئەم لەناوچوارچێوەی چینێکی ڕۆشنبیری کورددا کە لەپایتەختی عوسمانیەکان کاری دەکرد گەورەبوو ، وە بە ڕۆحی پێشکەوتنخوازانەی ئەوروپا کاریگەربووە ، بەتایبەتیش لەفەرەنساو سویسرا (ئەمین عالی) ڕۆڵەی بەدرخان بەگ و باوکی کامەران کە پارێزەر بووە توانیویەتی بگاتە پۆستی دادوەری دادگای باڵا لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ، چوار لەحەوت منداڵەکەی ژیانی خۆیان تەرخان کردوە بۆ ژیاندنەوەی بارودۆخی کورد و شارستانیەتی کوردی و تەنانەت هەوڵیان داوە کە ڕۆژنامەیەك بەزمانی کوردی دەربکەن .

دەسەلاتی بنەماڵەی بەدرخان لەسەرەتای چارەکی یەکەمی سەدەی بیست دا بەرەو دارمان و لەناوچون چوو، لەکاتی کودەتا بەناوبانگەکەی کەبەسەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا کرا کە دەسەلاتی گواستەوە بۆدەستی (لاوە تورکەکان)[2] و ئەوانیش چەپۆکی خۆیان لە(کەمینەکان) گیرکرد وە بە تایبەتیش کەمینەی کوردی و فەرمانی لەسێدارەدانیان بۆ بەدرخان و سێ لە منداڵەکانی دەکرد ، کەئەوانیش (جەلادەت ، سورە یا، کامەران) بوون ، ئەمەش ناچاری کردن ڕابکەن

---

[1] نوسەر لێرە وادەڵێت نازانم بە ئەنقەست یان لە نەزانیەوە ن چونکە دواتر هەڵەکەی ڕاست دەکاتەو دەڵێت هۆزێکی کوردی بووە ( وەرگێر )

[2] مەبەستی بزوتنەوەی تورکیای لاوە ( وەرگێر )

بۆ قاهیره و لەویشەوە بۆ (لایبیزگ)ی ئەڵمانیا ، لەوێ جەلادەت کە ٧ زمانی دەزانی بڕوانامەی دکتۆرای لە ئەدەب و یاسادا بەدەستهێنا ، و کامەرانیش دکتۆرای لەیاسادا بەدەست هێنا ، لەسەروبەندی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەمدا کوڕانی بنەماڵەکە گەڕانەوە بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ، ناوەندە پێشکەوتوەکەی خۆیان لەسوریا و بەیروت دامەزراند کە ئەوسا ئەو دوو شوێنە لەژێر کۆنترۆڵی فەرەنسادا بوو ، لەوێ لیژنەیەکی نیشتمانیان بەناوی (خۆیبون) دروستکردو تۆڕێکی میدیایی کامڵیان لەسەرئاستی دەمەکی (شەفەوی) و چاپکراو دامەزراند وە کۆمەڵێك کتێبیان بەزمانی کوردی دانا ، و هەروەها فەرهەنگێکی کوردی - فەرەنسی و یەکێکی کوردی - ئەڵمانیان دانا . و پیتی لاتینیان لەگەڵ زمانی کوردیدا گونجاندن ، وە تەورات و ئینجیلیان وەرگێرا بۆسەر زمانی کوردی ، لەساڵی ١٩٥١ دا (جەلادەت) کۆچی دوایی کردو . کامەران بووە تاکەوتەبێژی گەلی کورد لەناوچەکە و بارەگاکەی گواستەوە بۆ پاریس لەوێ کاتی خۆی دارشت و تەرخان کردبۆ وتنەوەی وانەی زمانی کوردی لەزانکۆی (سۆربۆن) و ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی نیشتیمانیی کوردی دامەزراند بەئامانجی ڕاکێشانی سەرنجی جیهان بۆکێشەکانی گەلەکەی . هەوڵەکانی کاریگەری زۆر هەبوو، ئەو هەوڵی دەدا ئەو گوللە و تۆپانەی کەبەسەرلوتکەی چیاو حەشارگە و ڕێگەبەردینەکانی وڵاتەکەیدا دەفڕین و دەبارین وەربگێڕێت بۆزمانی وشەکان لەپێناوی ئەوەی بیانگوازێتەوە بۆ نێو بیرومێشکی سیاسیەکانی جیهان . کەدەیانتوانی چارەنوسی زۆربەی گەلان مسۆگەر بکەن، بەڵام قەدەر تەشتەکەی لێ هەڵگیرایەوە وڵاتانی ڕۆژئاوا هیچ گرنگیەکانیان بەچارەنوسی گەلی کوردنەدا . ئەمەش وای لێکرد بڵێ : تاکە ئازادییەك کە ئەمڕۆ ئێمە هەمان بێت بریتی یە لە ئازاد هەڵمژینی هەوا لە بەرزایی لوتکەی چیاکاندا.

* * *

زۆرێك له ئیسرائیلیەكان له قۆناغه جیاوازەكانی ژیاندا هاوڕێیەتی (بەدرخان)[1] یان كردوه ، و لەگەڵیدا ژیاون بەڵام (مۆریس فیشەر) یەكەم كەس بوو كەدۆزیەوه ، فیشەر خۆی لەدامەزرێنەرانی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیله و لەبەلجیكا لەدایك بوه ، خوێندنی كیمیای كشتوكاڵیی تەواوكردوه، فیكری زایۆنیزمی لەباوكیەوه وەرگرتوه ، كەماڵەكەی لەبرۆكسلّ وەك بارەگای لیژنەی بزوتنەوەی زایۆنزمی لێهاتبوو ، كه پاشان لەبواری كڕین و فرۆشتنی زەوی كاری دەكرد بەمەبەستی نیشتەجێكردنی (جوو)ەكان .

بەیروت... بەتایبەتیش لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەكەمەوه بووه بەپایتەختی سیاسی و نێودەوڵەتی خۆرهەلاتی ناوەڕاست و سیاسیەكانی سەرتاپای جیهان ئارەزویان لێی بوو و لەكاتی زەحمەتی ئیش وكاردا بۆ بەسەربردنی مۆڵەتی پشوویان لەگوند و لادێ ڕازاوەكانیدا لەخەیاڵیان دا بوو ، ئاساییه كه ئەم دەوڵەته بچوكه سەرنجی گەورەلێپرسراوانی وەكالەتی جولەكەش بۆخۆی ڕابكێشێت كەوەك حكومەتێك بۆدەوڵەتێك وابوو ، كه بەرەبەره تەپ و تۆزی لادەدا بەمەبەستی دەركەوتنی لەسەرزەوی ، ئەولێپرسراوانه لەبەیروت چەندەها دیداریان لەگەڵ سەركردەكانی عەرەب و سەرۆك و سەرۆك حكومەت و وەزیرانی دەرەوه وه باڵوێزەكان ئەنجامدا ، وەسوربون لەسەر ڕاكیشانی ژمارەیەكی زۆرتر لەو داوانەی كەدەبنه هۆی كۆچكردنی جولەكه بۆ سەرزەمینی ئیسرائیل ، فیشەر لەسەرداوای لیژنەی نیشتەجێكردنی جولەكه هەر لەسەدەكانی گەشەكردنیەوه پەیوەندی كرد به سوپای ئازادی فەرەنساوه ، و هەردوزمانی فەرەنسی و ئەڵمانی دەزانی ، سوپاكه ژەنەراڵ (شارل دیگۆڵ) ڕابەڕایەتی دەكرد ئەو لەچوارچێوەی سوپادا لەلقی توێژینەوەكان بەتایبەتیش توێژینەوەكان دەربارەی كەمینەكان لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست گیرسایەوه ، گرنگیەكی تایبەتی دا بەپەیوەندیەكانی نێوان ئەوكەمینانه

[1] لێره به دواوه بەدرخان نازناوی كامەران عالی بەدرخانه (وەرگێڕ).

، و پەیوەندی نێوان ئەو گەلە گەورە و بچوکانەی لەناوچەکەدا دەژیان و پەیوەندی توندوتۆڵی لەگەڵ سەرکردەکانیاندا دروستکرد ، لەنێوانیاندا سەرۆکی تایەفەی ئەرمەنەکان کە بە(میر بەدرخان)ی ناساند.

گومان لەوەدانیە خاڵێکی هاوبەش لەنێوان سەرکردەکوردیی و ئەرمەنیەکەدا هەبو ، ئەویش کۆنترۆڵ کردنی ولآتی بیانی بوو ، بەسەرزەوی گەلەکانیانەوە ، (حەیە فیشەر) ژنی مۆریس کەئاگاداری ژمارەیەکی زۆری پەیوەندی و چالاکیەکانی بوە لەخۆرهەلآتی ناوەڕاست دەڵێت : ( میربەدرخان میوانێکی هەمیشەیی بوە لەماڵەکەماندا لەبەیروت و پاشانیش لەئیسرائیل ، مێردەکەم زۆری بۆباسدەکرد سەبارەت بەژیاندنەوەی زمانی عیبری لەسەردەستی (یەعازر بن یهودا) میر زۆر هەستیار دەردەکەوت بۆئەم بابەتە ، بەجۆرێك جەختی لەوەدەکردەوە کەکێشەی جولەکەو زەویی ئیسرائیل نامۆنین بەلایەوە ، مێردەکەم هەستا بەئامادەکردنی توێژینەوەیەکی گشتگیر سەبارەت بەکوردەکان بەیارمەتی چەند ڕاهیبێکی مەسیحی نەخشیەکی ئامادەکرد کەهەموو سنورەکانی کوردستان ڕوون دەکاتەوە ، بەدرخان ئەم نەخشەیەی بەکاردەهێنا لەپێناو سەلماندنی ووتەکانی خۆی).

لەقۆناغی دوایی تەمەنی میردا یەکێك لەگەورە لێپرسیراوانی بەشی سیاسی لە وەکالەتی جولەکە کەناوی (ئەلیاهو ئیلات) بوو هاوڕێیەتی دەکرد و لەگەڵیدا بوو ، پاش ئەو باڵیوزی ئیسرائیل لەهەریەك لەواشنتن و لەندەن.

ئەلیاهو دەڵێت: ( میر بەدرخان کەئیسلامێکی سوننی بوو وازی لەئاینەکەی نەهێنا هەرچەندە لە هەوڵدابوو بۆزمانێکی هاوبەش لەگەڵ جولەکە ، بەڵکو شتەکە تەواو بەپێچەوانەوە بوو ، هەردوو گەلەکە ڕوبەڕووی هەمان دوژمنی هاوبەش بوبونەوە داهاتوو و پێشهاتێکی وێکچویان هەبوو کەهەوڵی دەدا بۆ دەستکەوتنی یارمەتی و پشتگیری نێودەوڵەتی تاڕێگەیان پێبدات بە دامەزراندنی نیشتمانێکی دانپیانراو ، وەدەستکەوتنی سیادە بەسەر زەمینەکانی خۆیان.

پێدەچێت کوردەکان لەڕوکاری دەرەکیاندا لە هەموو گەلەکانی چواردەوریان جیاوازتر بن ، مێژوی کوردەکان وەك ئەوەی زانراوە لەنیوەی هەزارەی سێهەمی پێش زاینیەوە دەست پێدەکات ، وە بە پێی خوونەریتەکانیان و ئەو مێژووەی نوسیویانەتەوە باوباپیرانیان دەگەڕێنەوە سەر (گۆتیم) و (ماد)ەکان کە لەکۆنترین پاشانشینەکانی سەرڕووی زەوین ، وەك دیارە لەسەرەتادا لەئەوروپای ڕۆژهەلآت بوون ، پاشان لەوێوە بەقەفقازدا هاتون بەرەو خۆرهەلآتی ناوەڕاست بەرەبەرە فراوان بون و بەرەو ناوچەشاخاویە جوان و قەشەنگەکان ملیان ناوە ، کە لوتکەی جوانیەکەی لەچیاکانی (زاگرۆس) و (تۆرۆس) و (ئارارات)دا خۆی دەبینێتەوە ، بەرزاییەکەی دەگاتە نزیکەی (چوارهەزار و پێنج سەد مەتر) هەربۆیە کوردەکان شاخێکی بلند کەجۆرێك لەپشتیەوە دەرکەوتوە کردویانەتە هێمایەك بۆخۆیان وە لە کتێبەکۆنەکانی یۆنان و ڕۆمانەکان کەلەدوای ئەمانەوە هاتون ناوی کوردەکان هاتووە بەچەند نازناوێك کەناویان ناون لەوانە : (کەردۆخیم ، گوردین ، کوردەوان ، کورد) وەهەروەها لە(تەلمۆدی بابلی) و ژیاننامەی (ئۆنیکلۆس)دا چەندجارێك ناویان هاتووە لەوانە (کاردۆیم ، کاردینا) هەروەها ناوەکەیان لەسەرگۆڕی شەلمانسەری پادشای ئاشوری هەلکۆلراوە چەندەها بەلگەش هەیە دەیسەلمێنیت کەئەوان دەستی یارمەتیان بۆ پادشا کۆرش درێژکردوە لەجەنگەکانیدا دژی مەملەکەتی بابل ، هەروەها نیشانگەلێك کەدەیسەلمێنیت شەڕیان کردوە لەدژی (سلۆقی) و (سەندەریەکان) و لەسەرو بەندی فەتحکردنی عەرەبی بۆ ناوچەکەیان ئەمان ئاینی ئیسلامیان وەرگرتوە و باوەڕیان پێ هێناوە ، زۆر سەیروسەرسوڕهێنەر لەوێرانکاری مەغۆلەکان لەسەدەی سیازدەهەمدا رزگاریان بووە ، سنوری کوردستان لەباکوری ڕۆژهەلآت هەتا باشوری ڕۆژهەلات بەرامبەر پێگەی درێژی کەنداوی عەرەبی درێژ دەبێتەوە ، لەباکورەوە ڕوباری (ئاراس) دەیبڕێت کەدەکەوێتە ڕۆژهەلآتی تورکیا ، هەروەها سنوری ئێران — ئەرمینیاش ، لەڕۆژئاواشەوە زەوییەکەی دەگاتە ڕوباری (کاراسۆ) و ڕێڕەوی

ڕوباری فوراتی گەورە کەدەکەوێتە تورکیا و عێراقەوە لەباشوریشەوە زەویەکانی دەگاتەسنوری نێوان ناوچەشاخاویەکان و گردەکەناراوییەکانی عێراق ، لەڕۆژهەلاتیشەوە سنورەکەی دەگاتە نەوهێڵەی کەوتۆتە نێوان هەمەدان و دەریاچەی (ڕەزاییە)و (ماکۆ)ی ئێرانی ، ناوچەدەشتاییەکانی نێوان چیادەولەمەندەکان بەپاوانگا و سەرچاوەئاوییەکان لەوانە ڕوبارەکانی زێی بچوک و زێی گەورەو عوزێم و سیروان و دیالە کە هەمویان دەرژێنە دیجلەوە.

کوردەکان بە شێوەیەکی گشتی لەسەرکشتوکاڵ دەژین وەك گەنم و جۆ و نیسك وتوتن ،ئەمەجگە لەولاخ بەخێوکردن.

ڕۆژهەلاتناسی فەرەنسی (سێرجی گانتنەر) لەکتێبەکەیدا بەناوی بزووتنەوەی نیشتمانی کورد دەلێت: (پێویستە مرۆڤ سنوری نێوان عێراق و ئێران لە باکوری عێراق ببڕێت ئەوکاتە دەستبەجێ هەست بەشێوازی ناوازەی سنوری کورد و ئەو یەکێتیە قوڵە دەکات کەکوردستان لەسەرئاستی ئەتنی و جوگرافی و زمانەوانی هەیەتی) ، سەرەڕای ئەوەش زمانی کوردی کەلقێکە لەهیندۆئەوروپیەوە گەشەی کردوە زمانێکی یەکگرتوو نیە بەلکو ژمارەیەکی زۆر شێوەزاری هەیە ، جگە لەوە ناوچەشاخاوییەکان وایکردوە لەیەك دابڕێن و ئەمەش بۆتەهۆی ئەوەی کوردەکان نەتوانن یەکێتیەکی گونجاو پێك بهێنن لەسەرئاستی سیاسی و ئابوری جوگرافی.

لێرەدا شیاوی وتنە کەپەرەسەندنی ڕۆشنبیری و تەکنەلۆژی شارستانی کوردەکان زۆر هێواش بووە جگەلەوە پێکهاتەی خێڵەکی و ئەوناکۆکیانەی لەنێوانیاندا ڕویداوە بۆتەهۆی ئەوەی لەچوارچێوەی گەلێکی یەکگرتودا کۆنەبنەوە ، هەر کێشەیەك لەنێوان دووهۆزدا خێرا تەنیویەتیەوە بۆجەنگێکی مالوێرانکەر ، هەرگیز کوردەکان باسیان لەنەتەوەی کورد نەکردوە بەلکو لەزۆربەی کاتدا جەنگەخێڵەکیەکان بونەتەهۆی ئەوەی کەئەم خێڵە یان ئەویان یارمەتی دوژمنی عێراقی داوە ، کە ئەمەش بۆتە هۆی توانەوە هەستی نەتەوایەتی کورد.

ئەوولاَتانەی کوردستانیان دابەشکردوە دەڵێن : سنوری زەوی کورد دەگاتە نزیکەی ٣٥٠ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە لەکاتێکدا کوردەکان خۆیان دەڵێن کەزەویەکانیان زیاترە لە پێنج سەد هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە بەهەمان شێوەی ژمارەی کوردەکانیش لەم کاتەدا کەئەم کتیبە لەبارەیەوە دەکۆلێتەوە ڕای جیاوازی لەسەرە ، هەیە کە دەڵێت ژمارەیان خۆی دەدات لە ١٠ ملیۆن ، هەشە دەڵی ژمارەیان دوو ئەوەندەیە بەم شێوەیەش دابەش بون ، دووملیۆن یان دوو ملیۆن و نیویان لە عێراق نیشتەجێن ، سێ یان چوار ملیۆنیان لە ئێرانن ، دووتا سێ ملیۆنیش لە تورکیا ، نزیکەی پینج سەد هەزارکەسیشیان لە سوریان ، زیاتر لە سەدوحەفتاوپێنج هەزار کەسیشیان لەئەرمینیان، هەرچۆنیك بێت ڕێژەی کوردەکان لەعێراقدا بەرزترە لەهەرولاَتیکی تر لەوانەی کەتێیدادەژین ، شانبەشانی کوردەکان لەسەرئەو زەویانە لایەن و نەتەوەی تر دەژی بەتایبەتیش عەرەب ، وە لە زۆربەی یاخیبونەکانی کورددا عێراقیەکان لەناوچەکانی خۆیان دەریانکردون و موڵکداری عەرەبیان لەشوێنەکانیان نیشەجێکردوە هەرئەمە وایکردوە زۆربەی کۆمەڵەکوردیەکاَن بە گەورە و بچوکەوە لە دەرەوەی کوردستاندا دەربکەون و چەندەها ناوی پرشنگدار هەن کە لەکوردەکانی تورکیادا دەرکەوتون وەك صلاح الدینی ئەیوبی (ئەمەش دیسان هەڵەیەکی ترە چونکە صلاح الدین ئەگەر ئەم پۆلێنبەندیە جوگرافیەی ئەمڕۆ هەیە حساب بکەین کوردی عێراق دەکات نەك تورکیا – وەرگێڕ -) کە خاچپەرستەکانی لە (بیت المقدس) دەرپەڕاند لەجەنگی حەتین ، لەساڵی ١١٨٧ پاش ئەوە ڕوبەرێکی فراوانی لەسەر زەمینی ئیسلامی داگیرکرد ، کتێبەکانی مێژوش ناوی ژمارەیەکی زۆر ئەفسەری پایەبەرز و زانای ئاینی ناوداری لەبنەچەدا کوردیان تۆمارکردوە کە پێگەیەکی بالاَیان لە تورکیا و سوریا و ئێران عێراقدا داگیرکردوە ، ئەمە ئەوەناگەیەنێت کە هەمووکوردەکان بەهەمان جۆر ڕوانینیان بۆنیشتمان هەبوە یاخود فەزڵی نیشتمانیانداوە بەسەرسیستمی ناوەندی ئەو ولاَتەی کەتیایدادەژین و

بەپێچەوانەوە لەزۆربەی جاردا دەسەلاتی ناوەندی کوردەکانی بەسەربازکردوە بۆ شەرپێکردنیان لەگەڵ براکوردەکانیان بە هۆی ڕەتکردنەوەی باجدانیان یان پەیوەندی کردن بەسوپاوە.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەکۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا ڕوخا ، پاش ئەوەرێکەوتنێکی نێودەوڵەتی لەساڵی ١٩٢٠ لەفەرەنسا مۆرکرا ، کەجەخت دەکاتەوە لەسەر پێدانی مافی خۆبەڕێوەبەری بۆکوردەکان لەرۆژهەلاتی ئەنادۆڵ و لیوای موصل لەگەڵ توانای هەڵبژاردنی سەربەخۆیی لەداهاتوودا ، بەلام حکومەتی (کەمال ئەتاتورك) کەلەوکاتەدا لەتورکیا دامەزرا کاری کرد بۆ ڕەتکردنەوەی ئەو رێکەوتننامەیە ، وە لەورێکەوتننامەیەی کە لەدوای ئەومۆرکرا لە لۆزان لە ساڵی ١٩٢٣ نە لەدوور و نە لەنزیك باسی ئەو مافی خۆبەڕێوەبەرییەو کێشەی کورد ناکات.

لەتێڕوانیندا لەسەر ئەوبارودۆخە لیوای یەدەك (ڕەحبعام زەئیفی) کەبەشداری کردوە لە پێشکەشکردنی هاریکاری بۆ کوردەکان لە ساڵانی شەستدا دەڵێت (ئەم بارودۆخە بەشێك بوو لەو فەرمانانەی کە دەوڵەتە کۆلۆنیالەکان بۆ حوکمکردن دایان نابوو ، وسنوری ناوچەکەیان وێنا دەکرد و دەکێشا لەنێوان بتلەکانی ویسکی و کافیاردا بە پێی بنەماو هەڵسەنگاندنی ساردو سڕ وبەرژەوەندی دڕندانە لەژێر کاریگەری هێزدا ، ئەو دەوڵەتە گەورانە هەستان بەچەوساندنەوەی ئەو گەل و خێلانەو ستەم لێکردنیان لەوانەش گەلی کورد).

شیاوی بیر خستنەوەیە ، کەهەرهەوڵدانێك بۆدامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ ، ڕاستەوخۆ ڕوبەڕوی بەربەرەکانی و ناڕازیبونی تورکیا و ئێران و عێراق دەبوەوە هەریەکەیان بەپێی خۆی و هەموشیان کۆکبون لەسەری ، ئەم کۆدەنگیەش ڕێکەوت نەبوو ، بەلکو ئەو دەوڵەتانە دەیانزانی کەدامەزراندنی هەر کیانێکی کوردی سەربەخۆ ناچاری دەکات بەوازهێنان لەزەوییەکی زۆروفراوانی

خاکەکەی و ئەو ناوچانەش دەوڵەمەند بوون لە کانزای سروشتی و بە تایبەتیش نەوت.

ئەم بەربەرەکانیە بێ ویژدانانەیە وای لەوڵاتەگەورەکانی خۆرئاوا کرد کە لەرێکەوتنامەی لۆزانەوە دەستیان بەردا لەهەرپشتگیرییەکی ڕاستەقینە لەسەربەخۆیی کورد و هیچ وێنەیەکی هاوسۆزی لەگەڵ کوردا نەما، جگە لەهەندی دەزگای هەواڵگری ڕۆژئاوا کەپەیوەندییان بەچەند لایەنێکی کوردییەوە دروستکردبوو، وەك بەدیلێك کە ئەگەری ئەوە هەیە لە قۆناغێکدا کاریان پێیان بێت.

*　　　*　　　*

کۆماری تورکیا بە شێوەیەکی مەنهەجی و ڕێکخراو کاری دەکرد لەسەر پاکتاوکردنی لایەنی چاك و کارای کورد لەسەرزەوییەکانی ، ئەتاتورك و شوێنگرەوەکانی لەحوکمدا گورزی بەئازار و گوڕ چکبڕیان لەپێکهاتەی خێڵەکانیانەی کورددا ، و هەموو ئەو تیرەوهۆزانەی بەئەوپەڕی دڕندانە چەوساندەوە کەلەسەر زەوی تورکیا مابونەوە ، فەرمانی لەسێدارەدانیان بەسەر زۆرینەی نوخبەی کوردیدادا ، ئەمەش وایکرد قورسایی خێڵەکی کورد بۆ کوردستانی عێراق بگوازرێتەوە .

شیاوی وتنە لێرەدا کەعێراق ساڵی ۱۹۲۰ بەبڕیاری ( عیسبەتولئومەم ) دروستکراو دامەزرا ، لە ژێر ئینتیدابی بەریتانی دا ، و ئەو شوێنەی کەئەمڕۆ ناودەبرێت بەعێراق هەرگیزنەخرابوە ژێر کیانێکی سیاسی یەکگرتوو و لەپێشتردا دابەشکرابوو بۆ سێ ویلایەتی عوسمانی هەروەها ئەو خەڵکەی تێیدا دەژیان جۆراوجۆربون لەڕوی ئەتنی و ئاینیەوە ، سوننە و شیعە ، بیابانئشین (بەربەری) ، کوردی ، ئاشوری ، ئەرمەنی ، کلدانی ، یعقوبی ، کاسۆلیکی و ئەرسۆدۆکسی ، و تورکمانی و یەزیدی و هەروەها (جوو)ش ، سەرەڕای ئەوەی بەریتانیەکان و

عێراقیەکان بەڵێنی ئۆتۆنۆمیان دابوو بەکوردەکان ، بەڵام لۆژیکی دروست ئەوە بەدەردەخات کە ئەو بەڵێننامەیە بە گرنتیەکی سنوردارەوە پێیان درابوو . بەریتانی و عێراقیەکان دەرکیان بەوەکردبوو کەپێدانی هەر حەقێك بەکوردەکان دەبێتەهۆی دروستبونی داواکاری تر لەلایەن کەمینەکانی ترەوە هەرچەندە بچوکیش بن ، کەزۆر بەهۆشیاریەوە چاودێری بارودخەکەیان دەکرد ، تا بزانن کەچی دەگوزەرێت لەگەڵ لایەنی کوردی گەورەدا.

رۆژهەڵاتناس (پرۆفیسۆر یعقوب شەمعونی) کە بەیەکێ لە سیاسەتدانەرانی سیاسەتی عیبری دادەنرێت لەماوەی پێش دامەزراندنی دەوڵەتی عیبری و بە یەکێك لەبەرێوەبەرانی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل دادەنرێت لەکتێبەکەیدا کە بەناونیشانی (وولاتەعەرەبیەکان) نوسیویەتی دەڵێت: (عیسبەتولئومەم مەرجێکی سەرەکی دانا بۆئەوەی لیوای موصل بخرێتەسەر عێراق ئەویش پێدانی ئۆتۆنۆمی نیشتمانی و رۆشنبیری بوو بەکوردەکان ، بەڵام ئەم مەرجە بەدی نەهات.

بەردەوام دەبێت و دەڵێت : (بەڵکو لەوەش خراپتر عیسبەتولئومەم پشتی تێکردن کاتێك داوای پێکهێنانی حکومەتێکیان کرد لەژێر سایەی عیسبەتولئومەمدا و ، تا عیسبەتولئومەم لەم ئاریشەیە خۆی رزگاربکات بڕیاریدا بەپێکهێنانی لیژنەیەك بۆلێکۆڵینەوە لەم مەسەلەیە ، ئەوەبو ئەو لیژنەیە بەپێی رۆڵی خۆی لەساڵی ١٩٣٢ بڕیاری دا کەتواناى بەردەوامی و چارەسەکردنی ئەو کێشەیەی نیە و کارەکە زیاتر ئاڵۆزبوو چونکە ڕوبەری زەویەکانی کورد لەعێراق بە ٧٤ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە مەزەندەدەکرێت کەبەشێکی فراوانی خاکی عێراق پێکدەهێنێت بەنزیکەی ١٧٪ جگەلەوەی ئەوزەویانە بەناوکی بازرگانی عێراق دادەنرێت ، بۆنمونە موصڵ لەڕوی قەبارەوە بەسێیەم شاری عێراق دادەنرێت ، هەروەك بەسەنتەری بازرگانی و کشتوکاڵی بۆهەموو باکوری عێراق دادەنرێت جگەلەوەی کەپێگەیەکی ستراتیژی لەکەرتی بازرگانی نێودەوڵەتی عێراقیدا هەیە ، لەبەرئەم هۆیانە عێراقیەکان بەهیچ شێوەیەك ئامادەنەبون وازی لێبهێنن ، موصڵ یان

ﻪﻫرشارێکی کوردی تر ج لەکاتێك کە لەژێر ئینتیدابدا بوون یان پاشتر کە سەربەخۆیی تەواویان لەساڵی ١٩٣٠ ز بەدەستهێنا .

★ ★ ★

بنەماڵەی بەدرخان لەوکاتەوەی کەلەزێدی خۆیان بوون - دورگەی ئیبن عومەر - ئاشنایەتیان لەگەڵ جولەکەدا هەبوە ، جولەکە لەکوردستاندا نیشتەجێ بون لەسەردەمی باپیری باپیریانەوە ، (یۆشەع ) پێغەمبەر سەبارەت بەونبووان لەسەر زەمینی ئاشور دواوە ، چەندەها لێکۆڵەری جولەکە سەردانی کوردستانیان کردوە لەچەرخەکانی پێشوودا لەوانە: (بنیامین مەتەوەدلە ، فەتاهیا مێرگنشبێرگ) و بینینی جولەکەیان لەو ناوچانە تۆمارکردوە ، دڵنیاییانداوە بەوەی کەئەوانە لەکۆچبەرە سەرەتاییەکان بوون کە پاشا شەلمانسەر هێناویەنیە ئەوێ و ئەوانە پاشماوەی ئەو ١٠ تیرە جولەکەیەن کەپادشاکانی ئاشور بەدیلی گواستویاننەوە بۆئەوێ ، لەماوەی سەدەی هەشتەمی بەر لەزایندا ، هەندێ لەرۆڵەکانی ئەم تیرانە بانگەشەی ئەوەدەکەن کە لەنەوەی (بنیامین)ن ، ئەمانە سەر بەهەرتایەفە و هەر کەسێك بن تاکە هۆز و تیرەن کە لەماوەی ئەو ١٧٠٠ ساڵەدا پاریزگارییان لەکەلتوری خۆیان کردوە وەك وێنەیەکی گەلی جولەکە ماونەتەوە لە سەردەمی (پەیکەری یەکەم)ەوە.

وە((ئیسحاق بن زەفی) دووەم سەرۆکی ئیسرائیل دەڵێت : (جولەکە لە١٢ شوێنی کوردستان بەفراوانی نیشتەجێ بون ئەوانیش: زاخۆ ، سلێمانی ، موصڵ ، نسێبین، ئورفە ، هەولێر ، کەرکوك ، ورمێ ، چەرقیلە، عەمادیە، نیرفە، ئەم تیرە جولەکەیە کە بە سەردەمی تاڵ و سەردەمی خۆش و شیرینیش دا تێپەڕیوە توانیویەتی چەندەها زانای ڕۆحی و بیرمەند و حاخام پەروەردە بکات ، لە ناو ئەوانیشدا کەسانی وەك سەرکردەی کۆچەران "ڕابی دێڤید" و "ڕابی شمۆئیل" و

(کوڕانی بارزانی) "حاخام نەتائیل هەلیڤی" و کوڕەکەی حاخام "شموئیل ئەدۆنی" وە کچەکەی (ئاسینات) وە حاخام ( شەمعون بن شموئیل ) دەرکەوتون .

پێویستە بڵێین هەندێك لەلێکۆڵەران دەڵێن: کەژمارەی تیرەو کۆمەڵە جولەکەکان لەکوردستان گەیشتۆتە ١٤٦ تیرە جولەکەی عێراق بەگشتی و ئەوانەی کوردستان بەتایبەتی لەلایەن سەرکردایەتی ئیسرائیلەوە گرنگی تایبەتیان پێدراوە مەبەستی بەکارهێنانیان بۆ چالاکی و بەئامانجی کۆچ پێ کردنیان بۆئیسرائیل نێردراوانی نیشتەجێ کردنی جولەکە لەسەرەتای ئینتیدابی بەریتانیەوە پەیوەندیان پێوەکردون و یەکێ لەسەرۆکی ئەو وەفدانە (ڕۆبین شیلۆح) گەورە کارمەندی بەشی سیاسەتی وەکالەتی جولەکە و دامەزرێنەری دەزگای موسادی ئیسرائیلی بۆ کاروبارە تایبەتەکان بووە ، هەن دەڵێن گوایە کە لەسەردانی یەکەمیدا بۆ کوردستان لەساڵی ١٩٣٤ لەگەڵ سەرکردەکوردەکاند کۆبوەتەوە.

لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٢ (مائیرمیریدۆر) وەك نێردراوی مۆساد سەردانی کوردستانی کردووە بۆکۆچپێکردنی دووەم لەراپۆرتەکەیدا نوسیویەتی کەپەیوەندی جولەکە لەگەڵ دراوسێکانیدا لەکوردستان بە شێوەیەکی گشتی باشە هەرچەندە عێراقیەکان هەمیشە هەوڵدەدەن بۆ نانەوەی جیاوازی و کێشە لەنێوانیاندا (مریدۆر) دەنوسێت (لەگوندەکانی باکوری (سۆندۆر) و (زاخۆ) جولەکەم دیتن کەچەکداربوون بەهەمان شێوەی دانیشتوانی تری ناوچەکە).

بەردەوام دەبێت ( بارودۆخی جولەکە لەو ناوچەیەدا خەریکە خراپ دەبێت چونکە عێراقیەکان خەریکن کوردەکانیان لێ هاندەدەن ، لەم ماوەیەی دوایدا ڕێگە لەجولەکەکانی سوندۆر گیراوە کە ڕوو لە پەڵەتوتنەکانیان بکەن بەمەبەستی پاراستنیان ترساون لەوەی توشی بەلایەکی نەخوازراو ببنەوە).

مریدۆر لەڕێگاکەی بەردەوام بوە بەرەو شارە گەورەکوردیەکانی باکوری وولآت وەك موسڵ و هەولێر لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت شاری هەولێر زۆرینەی ڕەهای کوردی تێدا نیشتەجێ یە کوردەکانیش کۆمەڵە و دەستەگەلێکی یاخین کە بەدوای ئازادیدا وێڵن ، وە کوردەکان لەڕوکاری دەرەکیدا بەڕەنگاو ڕەنگی جلوبەرگەکانیان و پێکهاتەی جەستەیی چاپوك و پڕهێز جیادەکرێنەوە بەپێچەوانەی عێراقیەکانەوە ، وە ئەو جولەکانەش کەلەوێ نیشتەجێن بەهەمانشێوەن بەهێز دەردەکەون ، دەگونجێ مرۆڤ لەم ناوچەیەدا ڕوبەروی جولەکەیەك بێتەوە کەسواری ئەسپەکەی بوبێ چەکەکەی بەشانیەوە بێ ، وە سەرۆکی جالیەی جولەکە بەزمانی عیبری دەدوێ و مێجەرێکی ئینگلیز سەردانی کردوە و لێی پرسیوە سەبارەت بە هەڵویستی جالیەی جولەکە سەبارەت بەزایۆنیزم و سەرۆکی جالیەش وەڵامی داوەتەوە هەموو جولەکەیەك زایۆنییە، وەئەندامانی جالیەکەش هەموو هاوڕان و دەشڵێت بەشێکی زۆرکەم لەکەسایەتییەنێوەندیەکانی جالیەی جولەکە لەعێراق دەتوانن لەکوبونەوە گشتیەکانیاندا بەشداربن و بەئاشکرا بانگەشە بۆهەڵوێستەنیشتمانەکانیان بکەن، سەردانەکەمان بۆ ماڵی سەرۆکی جالیە کاریگەری هەبوو کۆمەڵێك کتێبی ئیسرائیلیمان بۆ بەجێ هێشت و بەخێرایی ئەو شارەمان جێهێشت بەرلەوەی دەسەڵاتداری عێراقی لێپرسینەوە بکات لەوکارەی ئێمە لەوێ دەیکەین ، ئەمەش بەکردار ڕویدا لەکاتی گەڕانەوەماندا بۆ بەغداد لەڕێی چەندزانیاریەکەوە کە بە هەوالگری بەریتانی گەیشتبون ئاماژەیان بەوەدەدا کە دە کەس سەردانی سەرۆکی جالیەی جولەکەیان کردوە لەهەولێر ، یەکێکیان جلوبەرگی سڤیل و ئەوی تر هی سەربازی لەبەردا بوە).

بن زەڤی دەڵێت : (کۆچکردنی جولەکە بۆخاکی ئیسرائیل پێدەچێت لەسەدەی ١٦ هەمەوە دەستی پێکردبێت پێشەنگی ئەوانەی گەیشتنەجێ بە ئەنقەست لە(صفد) نیشەجێ بون پاشان ئەوانەی دوای ئەوان لە (متەسفیە) دانیشتن هەتا

پرۆسەی (عیزراو نحامیە) کە لەسالآنی سەرەتای سەرپێکەوتنی دەوڵەت ڕویدا پاشان بەرەبەرە جولەکە دەستیانکرد بە کۆچکردن بۆئیسرائیل لەوانە (یەهودا بارزانی) کە بەپێ کۆچیکرد بۆ ئیسرائیل پاش ئەوەی موسوڵمانێکی کوشتبوو کەئازاری ژنە جولەکەکانی دەدا، پێدەچێت (ئیسحاق مۆردخای) ڕۆڵەی یەکێك لە کۆچبەرە عێراقیەکان بێت کەگەشتە بالآترین پێگەیەك کە کۆچبەری عێراقی پێی گەیشتوە ، لە ساڵی ١٩٩٦ دا کرا بە وەزیری بەرگری ، (ئیسحاق مۆردخای) لەتەمەنی ٦ ساڵیدا سەردانی ئیسرائیلی کردوە ، پاش ئەوەی عێراقیەکان بۆیان دەرکەوت کەباوکی یەکێکە لەچالاکەکانی بزووتنەوەی زایۆنیزم مۆردخای خزمەتی سەربازی لەهێزی پەڕەشوتەوانیدا تەواوکردوە گەیشتۆتە ئەفسەری یەکەم بەپلەی لیوا لەسوپای ئیسرائیل دا و کراوە بەسەرکردەی هەرسێ کەرتی باکور و باشور ناوەڕاست.

زۆربەی کەسایەتیە پلەبەرزەکانی نیشتەجێکردنی جولەکە گرنگیەکی زۆریان بەخەباتەکانی کورددواە کەکۆششیان بۆ سەربەخۆیی دەکرد بەلآم ئەوکەسایەتیانە باوەڕیان وابووە کەبزوتنەوەی کورد لەهەوڵدانی بۆ گەیشتنەئامانج هاوشێوەی بزوتنەوەی جولەکە نیە.

وە لەڕادەربڕینی دوو لەسەرکردەکانی ڕێکخراوی (هاگانا) کەئەوانیش (ئەلیعازەر جەلیلی) و (ئەلیعازەر لێبنە)ن لەسەر چالاکیەکانی بزوتنەوەی کوردی هاتووە (بەبێ بونی هێزێکی سەربازی کارکردنی سیاسی مەحاڵە بەڵکو بوونی هێزی سەربازی دەگونجێ گرنتی بێت بۆ بەکارنەهێنانی ئەو هێزە) ، وە هەردوکیان لەیاداشتەکەیاندا کەلەساڵی ١٩٣٩ ئامادەیان کردوە ڕێنمایی ئەومیان داوە کەپشت بەو یاخیبونە نەبەسترێت کە لەناوچە کوردیەکان یان درزیەکان لەسوریا ڕویداوە لەبەرئەوەی کوردەکان لەسەر هەڵکێشانی خەنجەر ڕاهاتوون.

★ ★ ★

ئەوتەکنیکەی کەبەدرخان هانای بۆ برد دەیویست وێنەیەکی نوێ بۆ مرۆڤ کورد بخولقێنیت کە شانازی بکات بەوەی کە لەسەر کەلاوەی جەنگەکان دەژی ، بەدرخان دەڵێت ئەگەر جیهان دان بە سیادەی کوردا بنێت لەسەر خاکەکەیەوە وێنەی ڕاستەقینەی ئەو کوردە دەردەکەوێت کە کشت کاری زەویەکەی دەکات ، وە خێزانەکەی خۆش دەوێت و هەوڵ بۆ پەرپێدانی ڕۆشنبیریەکەی و فراوانکردنی شارستانیەتیەکەی دەدات ، بەمەش لە فیکری خۆی دەبەخشێ بە نەوەکانی داهاتوو ، کە ئارەزوی حەسانەوەیان هەیە لە ژێر دار هەنجیرەکاندا ، زایۆنیزم لە پێش چاوی بەدرخاندا وەك نمونەیەکی بەرچاوی ئەو بارودخۆ وابوو(یاهو ئیلات) دەڵێت : بەدرخان زۆر چاك شارەزایی لە نوسینەکانی (هرتزل)[1] هەبوو ، پێی وابو ئەو ڕستەیەکە دەڵێت ئەگەر ئارەزوتان لێ بو پەڕ جوو دەخولقێنن وەك ڕاپەڕینیك وایە نەك تەنها بۆ گەلی جو بەڵکو بۆ تەواوی ئەو گەلانەی دونیا کە باوەڕێکی قوڵیان بە داهاتویان هەیە وە مل کەچ نابن بۆ واقیع وە ترسیان لە هیچ ڕێگرێەك نی یە لەسەر ڕێگای بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان .

ئیلات بەردەوام دەبێت بەدرخان و براکەی بێ ئومیدی خۆیان نەدەشاردەوە ئەوەی کە هۆزی کوردی پەندی لە جولەکە وەرنەگرتوە تا یەك بگرێت لە چرکە ساتی نەهامەتی بەردەوامی داوە بە جەنگ و ناکۆکیە خێلەکیە نێوخۆییەکان ئیلات دەڵێت ناکۆکی نێو خۆیی کە بوەتە خویەکی کوردەکان تاکە هۆکار نەبوە وای کردبێت نەتوانین وەك جولانەوەی زایۆنی بکەین ، لە کۆنگرەی دامەزراندنی نەتەوە یەکگرتوەکاندا ئیلات کە ئەندامی شاندی وەکالەتی جولەکە بوو ، هەوڵی داوە یارمەتی شاندی بچوکی کورد بدات ، بەلام لە کۆتایی ڕیدا هەستی کردوە کە ناتوانێت هیچ یارمەتیەکیان پێشکەش بکات ، ئیلات دەڵێت سەرۆکی وەفدی کورد و دکتۆرێکی ئەمریکی بە ڕەگەز کوردی دانیشتوی ویلایەتی (فیلالفیا) هەوڵی

---

[1] خاوەنی بیرۆکەی زایۆنیزم دامەزراندنی دەوڵەتی جولەکە (تیۆدۆرهرتزل).

زۆری دانا پشتگیری زۆرینەی وڵاتان بە دەست بهێنێت بۆ سەربەخۆی کورد و وە هەوڵی دەدا کارەکان بەرەو پێك هێنانی لیژنەیەکی نێو دەوڵەتی بڕوات بۆ باس کردنی کێشەی کورد و لێکۆڵینەوەی وە ئەنجام دانی دیالۆگ لەسەر مافی ئەو گەلانەی هێشتا بە سەربەخۆی شاد نەبون ، لەوێ کارمەندێکی باڵای ئەمریکی بە دکتۆری ناویراوی وت ، سەرە ڕای ئەو هاو سۆزییەی کە کێشەکەتان لە خۆی دەگرێت پێویستە لەسەرتان چاوەڕێی ئەوە نەکەن کە ویلایەتە یەکگرتوەکان یاریدەتان بدات ، چونکە نایەوێت خۆی و پەیوەندیەکانی لە کێشەوە بگلێنێت ، لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی خۆرهەلاتی نێوەند کە هەستیارێکی زۆریان بەرامبەر پێگەی ئەو کەمیانە هەیە کە لە ناویاندا دەژین ، ئیلات دەڵێت تاقە یەك وڵاتیش ئامادەی ئەوەی تیدا نەبوو کە مامەڵە لەگەڵ ئەو کێشەیەدا بکات ، هەرچەندە هەمویان دەیان زانی کە کێشەیەکی داد پەروەرانەیە ، ئەمەش لە ترسی ئەوەی کە ئەو یارمەتی دانە نەبێتە هۆی بەریەك کەوتنیان لەگەڵ تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا و یەکێتی سۆفیەت، لە هەمبەر ئەم بارودۆخە ڕوخێنەرەدا شاندی کورد بەر لە کۆتایی کۆنگرەکە (سانفرانسیسکۆ)ی جێهێشت بەر لەوەی کۆنگرەکە کۆتایی بە کارەکانی بهێنیت بەر لە ڕوشتنی دکتۆری ناو براو بە (ئیلاتی) ووت شاندی کورد مەبەستی پارتی دیموکراتی کورد بوە چی لە توانایدایە بیکات تا بتوانیت خەباتی چیاکانی کوردستان بگۆڕێت بۆ کارتێکی سیاسی بەرهەم دا دیبۆلماتە زایۆنیەکە دەڵێت نەمتوانی وەلامی پرسیارەکەی بدەمەوە تاکە شتێك کە ئەوسا وەکالەتی جولەکە توانی بیکات بۆ کوردەکان وەك یارمەتی پیدانی ، بڕی پەنجا لیرەی فەلەستینی بوو مانگانەی بۆ بەدرخان کە ئەو بڕە پارەیە وەك بوجەیەکی بنەڕەتی وابوو بۆ ئەو .

لە سەرتای ساڵی١٩٤٦ لیژنەیەکی بەریتانی – ئەمریکی پێکهات بۆ تویژینەوە لەسەر زەمینی ئیسرائیل ئەمە وای کرد چالاکوانانی وەکالەتی جولەکە بە دوای هەرکەسێك یان لایەنێکدا بگەڕێن کاریگەری لەسەر بڕیارەکانی ئەو لیژنەیە

دروست بكات تاوەكو بڕیارەكە لە بەرژەوەندی ئیسرائیل بدرێت ، بۆیە دوو كەس لە لقی سیاسی (مۆریزڤیشەر وە هاوڕیكەی یەهۆدا هۆڵمان) نێردران بۆ بە سەرباز كردنی كورد و ئاشوری و مارۆنیەكان ، هۆڵمان هاوبەشێكی باشی ڤیشەر بوو ئەو بە شێوەیەكی زۆر باش و بە ئاسۆیەكی فراوانەوە لە نهێنی و پشت پەردەكانی سیاسەتی خۆرهەلاتی دەرِوانی چونكە دەرچوی زانكۆی ئەمریكی بوو لە بەیروت ، وە هەروەها پەیامینری پێشوو ئاژانسێكی هەواڵیش بوو بۆ ڕۆژنامەی فەلەستین پۆست كە دواتر ناوەكەی گۆڕا بە (جیرو زالم پۆست) ڤیشەر و هێلمان پێویستیان بەوە نەبوو كە كۆششیكی زۆر بخەنە گەر بۆ ڕازی كردنی كورد وە ئەو ئاشوریانەی كە لە ناویاندا دەژیان چونكە بیركردنەوەیان لە چارەنوسی خۆیان وای لێ دەكردن كە هەرگیز دژایەتی ئەو چارەنوس نەكەن كە بەریتانیا پەیمانی دابوو بیدات بە جولەكە ، (سەر زەوی ئیسرائیل كە تێكست دەكات لەسەر پێدانی شوێنێك بە جولەكە لەوێ و پاراستنیان بە هێز گرمنتی نێو دەوڵەتی .

لە ماوەی سەردانەكەی ڤیشەر و هۆڵمان بۆ كوردستان وەكالەتی جولەكە لەو یاداشت نامەیەی كە پێشكەشی لیژنەی كرد نوسیویەتی : ئەوە بەسە كە ئاماژە بەو چارەنوسە بكەین كە تووشی كورد و ئاشوریەكان بوە لە عێراق تا درك بە لاوازی ئەگەری مامەڵە كردنی هەر سیستمیكی عەرەبی بە ڕۆحیەتی ئۆتۆنۆمیی فیدراڵی و پێ بە پێی پرەنسیپ و بەهاكان لەگەڵ كەمینەی خاوەن سروشتی سیاسی و شارستانی جیاواز لە شارستانی عەرەبی بكەین ، نوینەرانی هۆزی ئاشوری (كشتیە) لە پاشماوەی گەلانێكی درێژ نین ، ئەم هەلەیان زۆر بەجددی قۆستەوە وە داوای سستیمێكی هێمنیان بۆ نیو ملیۆنی ئاشوری دەكرد لە ژێر سایەی حكومەتێكی كوردی لەسەر زەمینی كوردستان لە ڕاپۆرتیكدا سەبارەت بە كوردەكان كە دەست وەكالەتی جولەكە كەوتوە لە ناو ئەو فایل و ئەرشیفەكەیدا پارێزراوە ئەوەیە هاتوە كوردەكان دووساڵ دەبێت بە هەموو ڕێگەیەكی شیاو

هەوڵی ئەوەیان داوە کە پەیوەندییان پێوە بکەین وە دەنگمان بخەینە پاڵ دەنگیان دژی دوژمنەهاوبەشەکەمان لە عەرەبەوە سەرکردەکانی کورد دڵنیای ئەوەیان داوەتە (ئارچی بێڵد ڕۆزفڵت) پاشکۆی سەربازی لە بەغداد کە پشتگیری خەبتی زایۆنی جەنگی جولەکە دەکەن لە فەلەستین لە ماوەی ئەو سەردانەیدا کە (ڕیچارد ماورەر) پەیامنێری ڕۆژنامەی نیۆرك پۆست بۆ کوردستان ئەنجامی داوە لە ڕاپۆرتەکەیدا دەڵێت: کوردەکان دەڵێن جولەکە کار دەکات بۆ ڕاکێشانی شارستانیەتی خۆرئاوا بۆ خۆرهەلاتی دواکەوتووی ، بەلام عەرەب ئەم شارستانیەتەیان ناوێ بۆیە بەرەنگاری جولەکە دەبنەوە ، خاوەنی ڕاپۆرتەکەی یەکەم کە گەیشتۆتە وەکالەتی جولەکە زیاتر دەڵێت کوردەکان داوامان لێ دەکەن ڕێکخەر و ڕاهێنەریان بۆ بنێرین ، ئەوان باوەڕیان وایە کە نێردراوە ئیسرائیلیەکان دەتوانن هەموو تیرەو هۆزە کوردییە ناکۆکەکان لە بۆتەی یەك سوپایشەڕکەردا یەك بخەن ، وە دەتوانن لەسەر هەموو جۆرەکانی چەك تەقەمەنی ڕایان بهێنن وە کاتێك لێم پرسین بۆچی تەنها داوا لە جولەکە دەکەن یارمەتیتان بدات ، پیان وتم دوژمێنی هاوبەشمان هەیەو پێویستە بەیەکەوە کار لە دژی بکەین ڕاپۆرتەکە هەروەها زانیاری دەدات کە (شەمدین ئاغا) میری ناوچەی زاخۆ و ئەندامی پەرلەکانی عێراقی لەمبارەیەوە وتویەتی : بەریتانی و ئەمریکیەکان بێ ئومێد بوین بۆیە ئامادەین کە پەیوەندی بە هەر لایەنێکەوە بکەن ن هەروەها یارمەتێکیش لە جولەکەوە بێت ئامادەین وەری بگرین ، وەکاتێك داوام لێ کرد کە ببەخشێت لە پیناوی کار کردن بۆ کۆکردنەوەی گەلی کورد ترساو پێی وتم ئێمە ئومێد دەکەین کە جولەکەکانی سەر زەوی ئیسرائیل نێردراو بنێرن بۆ ڕێکخستنمان وە داوای لێ کردم کە ئەم داخوازییەی بگوێزمەوە بۆ دامەزراوە جولەکەکان وە پەیمانی دا کە بە پێشوازی دابین کردنی شوێنی پاراستنی هەریەکێك لەو نیردراوانەی کە بۆیان دەنێرین وە وتی : کە لە خزمەتی دای بۆ دەرباز کردنی هەر نێردراوێکی جولەکە لە بەغدادەوە من لێرەدا پێشنیار

دەکەم کە ئەگەر کوردەکان ڕازی بە ناردنی ژمارەیەکیان بۆ سەر زەوی ئیسرائیل تا ڕێکیان بخەین و ڕاهێنانیان پێ بکەین ، وابکەین لیرەدا شایانی وتنە کە کوردەکان چەندان جاری ئەم پێشنیارەیان دووپات کردۆتەوە ، هەمان ڕاپۆرت ئاماژە بە ئاشورییەکان دەکات دەڵێت ئاشوریەکان بە هەمان شێوە زۆر ڕقیان لە عەرەبە هاوسۆزن لەگەڵماندا بەڵکو قسەیان کردوە سەبارەت بە بەستنی پەیوەندی لەگەڵماندا ، ئاشوریەکانی سەربازی باشن وە بە شێوەیەکی باش ڕاهێنراون وە چەك و تەقەمەنی لە سوپای بەریتانیەوە بۆ هەردولایان پاشقول دەدرێت (بە نهینی دەنێردرێت) دەتوانرێت ئەم گەلە بە هەند وەربگریت کاتێك ڕۆژی ڕوبەرو بونەوە هات وەك نیوە هاوبەشێك لەگەڵ ئێمەدا رون نی یە کە ئایا وەکالەتی گفتوگۆی لەسەر ئەم ڕاپۆرتە کردوە یان نا ، بەلام ئەوەی کە زۆر ڕونە ئەوەیە کە بەدرخان کوردی ڕێپێدراو بوە ، کە پەیوەندی لەگەڵ جولەکەدا ببەستێ وە ئەویش هەستی بە بێ ئومێدی دەکرد لەوەکالەتی جولەکە وە دەیوت کە ئەو وەکالەتە کار بۆ بەرژەوەندی ڕۆڵەکانی گەلەکەی ناکات ، وە لەو ڕاپۆرتەدا کە هۆلمان لە ١١شوباتی ١٩٤٦ ئامادەی کردوەو دەڵێت: سەرە ڕای ئەو بێ ئومیدیەی کە بەدرخان توشی بوە ئامادەیە لە بەرامبەر لیژنەی لێکۆڵینەوە دابنیشێت و شایەتی لایەنگیر کردنی بۆ زایۆنیزم دەربرێت ئەمەش لە میانەی ئەو نوسینەیدا کە دەڵێت لە ڕێگەی بە یەکگەیشتنی بەرژەوەندیەکانەوە لە نێوان هەردو جولانەوەی جولەکە و کورددا وە لە میانەی ئەو هاوسۆزییەی قوڵەی کە لەگەڵ گەلی جولەکەدا هەمان ، کە زۆری چەشتوە وە دانپیانانم بە بەرێزی فیشەری هاوڕیم ئەمە مانای لایەنگرییە ، بەڵام ئەم پەیمانە نەچوە نێو زەمینەی جێ بەجێ کردنی کردارییەوە وە لەو نامەیدا کە هۆلمان لە ١٥ ئازاری ١٩٤٦ ناردویەتی لە سەرو بەندی چاو پێکەوتنی لەگەڵ میردا بۆ جارێکی تر دەڵێت : (بەدرخا لە هەڵوێستەکەی پێشوی پەشیمان بومتەوە ، وە ئەو بارودۆخە خراپەی ڕون دەکاتەوە کە تیایەتی ، کە پیاوانی ئاسایش چواردەوریان گرتوە ، بۆیە ناتوانیت

هیچ لێدوانێكی لایەنگری بۆ زایۆنیزم بدات ، هەرچەند ئارەزی لێی یە ئەوە بكات وە ئەوەم خستە بەردەمی كە لەو ڕێنمایەدا هەبو كە لە وەكالەتی جولەكەم وەرگرتبو تا شایەتی بدات لە بەرژەوەندی خۆی و گەلەكەی لەبەردەم لیژنەكەدا كێشەی زۆرینە و كەمینە لە ڕۆژهەڵاتدا بخاتە ڕوو ، ڕازیش بوو لەسەر ئەوە وە پەیمانی دا كە پەیامێك بنێریت كە هیمای دادپەروەری كێشەی جولەكە لە خۆ بگرێت وە پەیوەندی بەردەوامی نێوان ئەو دوو كێشەیە ڕون بكاتەوە ، وە لە ٢٤ ی ئازاری ساڵی ١٩٤٦ هۆڵمان نامەیەكی تر دەنێرێت وە تیایدا دەڵێت: زۆر بە داخەوە بەدرخان پەیمان نامەكەی بەجێ نەگەیاند بە ڕاستی لە پەیامەكەیدا باسی لە زۆرینەو كەمینە كردوە لە ئەوگۆرانكارییە ماوە درێژانەی كە دەبێ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ڕوبدەن ، بەلام هەرگیز ناوی زایۆنیزم نەهێناوە نە لە دور نە لە نزیك تەنانەت بە هیمایەكیش ، وە لەو نامەیەدا كە هۆڵمان سێ ڕۆژ لەوەو پێش ناردبوی وتبوی بەدرخان زۆر بە متمانەیەكی تەواوە كار لەگەڵ وەكالەتی جولەكەدا دەكات ، بەڵام دەڵێت كارمەندانی وەكالەت پەیمانی بریقەدار دەدەن، بەڵام ئەم پەیمانانە هەرگیز جێ بەجێ كردنی كرداری بە خۆوە نابینن ، باوەڕی بەوە هەیە كە فیشەر خۆی نیەتێكی باش هەیە ، بەڵام وتەكانی ئەو ڕی لقی سیاسی لە وەكالەتی جولەكە نین، ئەم ڕاپۆرتانەی باس كران تەنها سنورداری توانستی وەكالەتی جولەكە دەرناخەن بەڵكو جیاوازی بیرو ڕای شارەزاكانیشی سەبارەت بە كاروباری خۆرهەلاتی ناڤین بە ئاشكرا دەخەنە ڕوو بە تایبەتیش لە نێوان فیشەر و ئیلیا هۆساسۆن كە دواتر بوە باڵوێزێكی پایەدار و وەزیریش لە حكومەتی ئیسرائیلدا خاتوو حەیە فیشەر ئەم ڕاستیە دەدركێنێت و ساسۆن ئەو چالاكیە فراوانانەی جێ بەجێ نەدەكرد كە مێردەكەم پێیا هەڵدەستا وە تەنانەت بیرو بۆچونەكانی نەشدەنارد بۆ (دەیڤد بن گۆریۆن) موشێ شارید وە گۆڵدا مائیر پێ دەچو وەك ڕكبەرێكی خۆی داینابێت پرۆفیسۆر (یوئالگۆبلەر) لە كتێبەكەیدا

ڕەگەكانی كێشەكەی دەڵێ    ساسۆن گومانی هەبوو لە ئاستی گرنگی كورد و ئاشوریەكان بۆ مەسەلەی نیشتەجێ كردنی جولەكە

یەكێ لە لێكۆڵینەوەو توێژینەوەكان ئەمیر بەدرخان وەك بەكرێ گیراوی ئیسرائیل وەسف دەكات بەلام ئەو بەكرێ گیراو نەبوو ، بە مانا كلاسیكیەكەی بە كرێگیراو ، بەڵكو ئەو بە ڕاسپاردنی ئیسرائیل هەڵدەستا بە كاری سیاسی هەستیار تا لە بەرامبەردا لە شێوەی هاریكاری ئیسرائیلی بۆ خەباتی كورد وەربگرێت یەكێ لە پرۆسە سیاسیەكان كە بەدرخان ئەنجای دا لە هاوینی ساڵی ١٩٤٨ بوو ساسۆن داوای لێ كرد بڕوات بۆ ئەردەن و وە ڕاسپێردرابوو سەردانی دیمەشق و قاهیرەو بەیروت بكات ، تا لە نزیكەوە لە بارودۆخی ئەو ولاتانە ئاگاداربێت وەگواستنەوەی نامە بۆ چەند كەسایەتیەكی عەرەبی پەیوەندی بە ئیسرائیلەوە وە گەیاندنی بانگهێشت بۆ سەردانی ئیسرائیل پێدەچێت بەدرخان كاری سیاسی تری لەسەر داوای ئیسرائیل كردبێت بەلام بە هەر هۆكارێك بێت ئەو كارانە تائیستا بە نهێنی ماونەتەوە ئاشكرایە ئەو ماوەی سالانی ١٩٤٨ – ١٩٤٩ چالاكیەكی بەرفراوانی كوردەكانی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بە خۆوە بینی وە یەكێ لە بەڵگەنامەكانی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل ئاماژە بەوەدەكات كە دەستی ئیسرائیل لە پشت ئەو چالاكیانەوە بوبێت ، ئەوچالاكیانەش لەو پەیوەندی كردن بە نەتەوەیەكگرتوەكان وبلاو كردنەوەی چەندەها وتار و لە ڕۆژنامە جۆربەجۆرەكانی جیهان و دان نان بە زمانی كوردیدا لە خوێندنگای زمانە خۆرهەلاتیەكان لە پاریس و دەرچونی فەرهەنگێكی كوردی – فەرەنسی خۆی دەبینێتەوە ، وە كتێبیكی فێركاری سەبارەت بە كوردەكان دامەزراندنی سەنتەری لێكۆڵینەوەی كوردی فەرەنسی لە پاریس ، شیاوی ئاماژە پێدانە كە كێشەی كورد زوو لە نەتەوە یەكگرتوكاندا باس دەكرا بەلاّم لە هیچ یەكێك لەو جارانەدا بە شێوەیەكی ڕاستەقینە كار لەسەر چارەسەر كردنی نەكراوە.

## بەشی سێیەم / نیمچە کودەتایەک لە دیمەشق

((حسنی البرازی)) سەنتەری دراماکەی داگیر کرد کە لە دیمەشق ڕوی دا ئەوە لە بنەڕتدا سەرکردەیەکی بە ڕەگەز کوردبوو توانی سەرمایەیەکی زۆر کۆبکاتەوە کە لە کۆتایی ڕێگادا گەیاندنی بە پۆستی سەرۆکی حکومەت لە ساڵی ١٩٤٢ (البرازی ) دەیویست کودەتایەك لە دیمەشق دا بخولقێنیت بە سود وەرگرتن لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەدرخان و گەورە پیاوانی دیبلۆماسی و ئیسرائیلی کە کاریان لە بواری کێشەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا دەکرد ، وە دڵنیا بوو لەوەی کە ئیسرائیلیەکان بەرژەوەندی گەورەیان بۆ پاراستوە لە ڕابردوی نزیکدا لە ١٣ ی شوباتی ساڵی ١٩٤٦ (البرازی) بە دکتۆر دۆڤ یوسیف یەکێ لە گەورە لێپرسراوانی لقی سیاسی لە وەکالەتی جولەکەی وت کە ئاسانکاری زۆری کردوە لە کاتی بەڕیوە بردنی پۆستی سەرۆکی حکومەت لە سوریا بۆ ئەو جولەکانەی کە لە پۆڵندا دەیانویست لە ڕێگای سوریاوە ڕابکەن بۆ ئیسرائیل وە لەو کاتەوە ئەو تێروانینیکی ئەرینی هەیە لەسەر هاتنی جولەکە بۆ خۆرهەلاتی نێوەند ، یوسیف لە ڕاپۆرتەکەیدا کە ناردویەتی دەڵیت (البرازی) پەیوەندی بەرفراوانی لەگەڵ زۆربەی سەرکردەکانی جیهانی عەرەبی هەیە ، وە ئەو ڕەخنەی توندیان لێ دەگرێ لەبەر ئەوەی واقیعیان بە هۆی دەستێوەردانیان لە ژیانی گشتی یوسیف لەوە زیاتر دەڵێت هەتا ئەمڕۆ عەرەب درك بەو ڕاستیە ڕەت دەکەنەوە کە پیویست زۆریان بە هاوکاری بیانی هەیە تا بتوانن وڵاتەکانیان بەڕیوەببەن ، (البرازی) رەخنەی ئەوە لە سەرکردەکان دەگرێت کە ناتوانن بە هۆی بێ جورئەتیانەوە بە گەلەکانیان بڵێن چی لە بەرژەوەندی ئەواندایە ، ئەوان تەنها گرنگی بە داخوازی جمهور دەدەن وە هەوڵ دەدەن ، بە بێ ئەوەی بیر بکەنەوە کە ئایا ئەمە بە سودی خەڵکی یاخود نا ، دکتۆر دۆڤ یوسف کە دواتر بوە وەزیر لە یەکێ لە حکومەتەکانی ئیسرائیل لەو ڕاپۆرتەدا کە پێشتر لە شوباتی ١٩٤٥ دا ناردبوی دەڵێت ئەو پیاوە سوریەی کە چەند جارێك سەردانی ئیسرائیلی کردوە

حەماسێکی زۆری پیشان داوە کاتێك باس لە دەسکەوتەکانمان کردوە لە بواری ئابوری بونیات نان و کۆمەڵگادا ، هەروەها زۆر بە داخەوە باسی لەو دواکەوتنە کردوە کە توشی ولاتەکەی سوریا و وڵاتانی عەرەبی بوە ، لە بۆنەیەکی تردا (البرازی) دەڵێت هەردولا بونەتە قوربانی نێودەوڵەتی پێویستیەکی زۆر هەیە بۆ بڕیار گەلی کۆتایی پێهێنەر و دەستێکی بەهێزی جێ بەجێ کار ئاشتی لە هەموو ولاتانی عەرەبی دا بەندە بە ئاشتەوایی نێوان عەرەب و جولەکە ، هەروەها لێك تێگەیشتن لەنێوان جیهانی عەرەبی و هەردو دیموکرات خوازە گەورەکە بەریتانیا و ئەمریکا ئەگەر مامەڵەمان لەگەڵ کێشەی جولەکەدا بە تێگەیشتن باوەڕ بون بە ڕاستیەکانەوە کرد ، وە دامان نا بە یەکێك لە کێشەکانی جیهانی عەرەبی کە بەرە و یەکگرتن هەنگاو دوەنێت و ڕیژەی دانیشتوان ٤٥ ملیۆن کەس دەبێت هەر زوو دەزانرێت کە جولەکە ژمارەیان لەسەر زەوی ئیسرائیل هەرچەندێك بێت وەك کەمینە دەمێنێتەوە لە جیهانی عەرەبی دا ئەمە ڕاستیەکی زانراوە لای عەرەب ، بەڵام ئەوان هەوڵ دەدەن بۆ دواخستنی یەکختنی ڕیزەکان لەسەر حسابی زایۆنیزم ، وە سازشی نوێ لە بەریتانیا بە وەصف کردنیان بەوەی کە بەربەرکانێ کەرێکی سەرسەختی زایۆنیزمن ، جێی وە بیر هێنانەوەیە کە (البرازی) لە پشت پەردەوە ئاماژگاریەکانی بە پیاوەکانی وەکالەتی جولەکە دەوت ، کاتێك لیژنەی لێکۆڵینەوەی بەریتانی ئەمریکی ویستی لێکۆڵینەوە لە دۆسیەکە بکات وە لە لوتکەی جەنگی ساڵی ١٩٤٨ (البرازی) بیری کردوە لەسەر کار لادانی سەرۆکی سوریا (شوکرالقوتلی) وە سەرۆکی حکومەتەکەی (جمیل مردم) وە دەست بەسەرا گرتنی سەنتەری دەسەڵات لە ڕێگەی گفتوگۆکانیەوە لەگەڵ بەدرخان داوای کردبو ئیسرائیلیەکان ڕۆڵ لەم پرۆسەیەدا بگێڕن بەوەی کە سوپای ئیسرائیل لەسەر سنور تەنگەژە دروست بکات تا سوپای سوریا بۆ ئەوێ ڕابکێشێت لە دیمەشق دوریان بخاتەوە بەمەش هەڵ بڕەخسی تا البرازی لە کەتیبەی دەبابەکانیەوە بچێتە نێو شارەوە ، وە ئاسانی دەست بەسەر دەسەڵاتدا

بگرێت (البرازی) پەیمانی دا بە بەدرخان کە ئەگەر بیرۆکەکە سەرکەوتو بوو وە توانی بگاتە سەرۆکایەتی حکومەت ، ئەوا کار دەکات لەسەر مۆرکردنی پەیمان نامەی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل و چەسپاندنی سنورە نێودەوڵەتیەکانی داوای لێ کردبوو ئەمە بگەیەنێ بە ئیسرائیلیەکان وە وتبوی کە هاوبەشەکانی لە ئەو کەمینانە دەبن کە داخوازی مافی ئۆتۆنۆمی دەکەن لە سوریا دا وەك کوردەکان و دروز و چەرکەسەکان ».

بەردخان پرۆژەکەی خستە بەردەم (ساسۆن و یەهوشەعفلمان) کارمەندانی لقی سیاسی لە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل کە وەك دەزگای هەواڵگری کاری دەکرد ، ئەوان داوایان لە خان کرد کە ماوەیەکیان بداتێ تا بیر بکەنەوە پاشان گەڕانەوەو بە بەدرخانیان وت ، کە ئیسرائیل هاوکاری ڕودانی کودەتا ناکات لە سوریادا ، لەو نامەیەدا کە ساسۆن بۆ یەعقوب شەمعۆنی ناردبوو لە ٣ ئەیلولی ١٩٤٨ نوسیویەتی من زۆر بە داخەوەم لەبەر ئەوەی دۆسیەکەی ..... (ناوەکە لە سەرچاوەکەوە سڕاوەتەوە) بە بێ هیچ شتێك کە شیاوی باس بێت کۆتای هات ، من پیم وایە (جەدعۆن ڕۆفائیل) هۆکار بوە لە فەشەلی ئەو دۆسیەیە لەبەر ئەوەی بە جددی مامەڵەی لەگەڵ ئەو بۆندەدا نەکردوەو درەنگ خراوتە بەر دەستی یاخود پیاوەکەی نەناسیوە بە باشی ، بەدرخان یان البرازی نەسروشتی پەیوەندیەکانی لە لوبنان و سوریا ئەم ڕوداوە ئەوە دەردەخات زۆر هەل و فرسەت بە با دەچن کاتێك دەکەونە دەستی کەسانێك کەشارەزای ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و قورسایی کەسایەتیەکانی ناوی نین ، لە یەکەم بینینەوە دەردەکەوێت کە تاوانبار کردنەکە زۆر توند بوە بە تایبەت ئەگەر بڵێین لە کاتی جەنگەکەدا بوە ، شەمعۆنی لە ساڵی ١٩٥٥ دا دەڵێت پیم وایە ئاماژەکان مانای نیەتی پەرە پێدانی پەیوەندی نهینی و بە تایبەت هەواڵگرییان لەوانەیە پێشکەش کردنی یارمەتی بە دروزەکان بۆ گەیشتن بە سەربەخۆییان ئۆتۆنۆمی بدات بە دەستەوە نەك بۆ ڕێکخستنی کودەتا لە سوریادا لەبەر ئەوەی ئەوکات دو دڵ بوین لەە هەر پەیوەندیەك

سەبارەت بە دروست كردنی كودەتا لە سوریادا ، وەبڕیارمان دا كە تێوە نەگلێن لەو جۆرە پیلانانەدا ، باوەڕمان نەدەكرد كە بە ڕاستی كودەتا بە سودی ئێمە بێت ، چونكە نەمان دەتوانی ئاراستەی بكەین و كاریگەری بخەینە سەری وە (جەدمۆن ڕۆفائیل) كە تاوانبار كراوە بەوەی هۆكاری سەرنەكەوتنەكەیە پاش ٤٧ ساڵ لە ڕوداوەكە دەڵێت ساڵی ١٩٤٨ هیچ پەیوەندیەكم بە مەسەلەكانی نافینەوە نەبوو ، نازانم مەبەستی ساسۆن چی یە لە نامەكەیدا كە ئاماژەی بۆ ناوی من كردوە ، هەموو ئەوەی لە بیرمە ئەوەیە ساسۆن هەر خەریكی خستنە ڕوی بیرۆكەی نانەوەی كودەتا بوو لە دەوڵەتێكی عەرەبی دیاریكراودا ، من ساڵی ١٩٥٣ هاتمە نێوەندی كاركردن لەسەر دۆسیەكانی خۆرهەڵاتی نافین كاتێك داوام لێ كرا كە سەرۆكایەتی لقی خۆرهەڵاتی نافین بكەم لە وەزارەتی دەرەوە كاتێك بۆ ئەو مەبەستەش پەیوەندیان پێوە كرم بە هەموشێوەیەك ڕەتم كردەوە لەو كارە گیان بازانەیە بكەم جار لە دوای جار جەختم لەسەر ئەوە دەكردەوە كە ئێمە بەڵێندەری كودەتا نین ، هەنێد بەڵگەنامەی تر جەخت لەوە دەكەنەوە كە دۆسیەی كودەتا لە سوریا بە جددی خراوتە بەر باس و گفتوگۆ ولەو چوارچێوەیەش ناوی (ڕۆفائیل و ساسۆن و ئۆرزی) هاتوە ئەمە جگە لەوەی ناوی مێرزا دەیڤن یەكێ لە دیبۆلماتكارە پێشینەكانی هەوالگری چالاكی سەردەمی نیشتەجێ كردنی جولەكە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەت وە لە ٢١ ئەیلولی ١٩٤٨ دەنین بۆ ئۆرزی دەنوسێت زۆر بە ڕاشكاوی كە (یاخی بونی كودەتا ئامێزن) لە سوریا تاقە دەروازەیە بۆ كۆتایی هێنانی جەنگی ١٩٤٨ و كردنەوەی دەرگای ئاشتەوایی ، ئەویش وەكو هەموو بە (عەرەب) كراوەكان لە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل (دەنین) هەستی بە دارمانێكی زۆر دەكرد ئەو باوەڕی وابو كە بەردەوام بونی جەنگ نابێتە هۆی یەكلای كردنەوەی هیچ شتێك ئەمە لە كاتێكدا كە گفتوگۆی ئاشتەوایی زۆر بە هێواشی بەڕیوە دەچوو ، گرەنتی هیچ چارەسەرێكی نزیكی نەدەدات بە دەستەوە كارەكان بەرەو ڕێگایەكی بێ دەربازگە

دەچون ، ئەو بیرۆکەی( دەنین ) لە ژێر ڕۆشنایی ئەو بارودۆخەدا خستیە روو زۆر سادە بوو ، ئەگەر هەر شانۆگەرییەك لە هەر ولاٚتێکی عەربیدا ڕوی دا دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرەنجی عەرەبەکان ، وەدرو خستنەوەیان لە ئیسرائیل ، تەنیا ئەوکاتە ئیسرائیل دەتوانیت بەرەو پێشەوە بچێت بە ئاراستەی هەنگاو نان بۆ دروست کردنی پەیوەندی ئاشتیانەو ماقولٚ (دەنین) دەلٚێت : مەبەستم لە شانۆگەری دروست بونی کودەتایە لە سوریا بە هاوکاری ئیسرائیل بە گرمانەی ئەوەی کە لایەنە کودەتا کارەکان پێویستیان بە هاوکاری و پشتگیری ئێمە هەیە وە دانمان پێدا دەنێن و هاوکاریمان دەکەن)).

گریمانەو بۆچونە خرانە سەر مێزی وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل (موشێ شاریت) لەگەلٚ وردەکاری بوجەی پێویست بۆی، تەنها جولانەوەی سەرەتایی پێویستی بە (١٠,٠٠٠) لیرە هەبوو ، پاشان (١٠٠,٠٠٠) لیرە بەهای تاقیکردنەوەی یەکەم، (٥٠٠,٠٠٠) لیرە بۆ جێ بەجێکردنی پرۆسەکە خۆی.

شاریت سیاسیەکی زۆرزان بوو ، زۆر بە گومان بوو ، دەنین دەلٚێت: ((شاریت)) باوەڕی نەدەکرد کە بتوانرێت پارە بدرێت بە لایەنێکی دەرەکی لە بەرامبەر سیاسەتدا ...... هەروەك چۆن هەنگاوێکی لەو جۆرە دەبێت لە سوریا خۆیەوە بێت ، جگە لەوە ئەو پێی وابوو کە بێ مانایە تەنانەت تەرخان کردنی بڕی کەمتر لە بڕی تایبەتکراو بە جولاٚنەوەی سەرەتایی و تاقیکردنەوەکان.

سەرڕای ئەوە دژایەتی بیرۆکەکەی نەکرد و ، بەلٚکو پێشنیار کرد لێی بکۆلٚنەوە ، وە بزانن دروزەکان چی دەکەن یان لەنەیە کوردەکان ، کاتێك دەگەڕێنەوە بۆ باسکردنی کارەکان کە لە سورشتی بارودۆخەکەی ئاگادار بوینەوە)).

(دەنین) پێشنیاری کرد بۆ (ئۆرزی) تا گفتوگۆ لەگەلٚ (فلمان)دا بکات و ووتی: ((ئەوە دواهەمین کەس بوو کە هەولٚی دەدا جولانەوەی سەرەتایی بە واقعی بکات ، وە هەولٚەکانیشی تا ڕادەیەك سەرکەوتوو بون)).

(دەنین) کۆپیەکی بەڵگەنامەکەی نارد بۆ ساسۆن ، وە لەو نامەیەدا کە (شەمعونی) ناردویەتی بۆ ساسۆن لە ٢٣ ئەیلولی ١٩٤٨ هەمو پرۆسەکەی بە پرۆسەیەکی چالاك کە ئەگەری ئەوە هەیە لە سوریا بکریت سەبارەت بە پێشنیارەکانی (د.بەدرخان) ناوزەدکردووە، وە لەگەڵ نامەکەدا ڕاپۆرتێکی دور و درێژی لەگەڵ دا بوو کە بەدرخان ناردبوی ، پێ دەچێت لە وەزارەتی دەرەوە خوێنرابێتەوە ، بەڵام لە فایلە ئاشکراکانی وەزارەتدا نەپارێزراوە .

شەمعون لە نامەکەیدا بۆ ساسۆن دەڵێت: (( ڕاپۆرتەکەی بەدرخان زۆر بێ ئومێد کەر بوو ، پێشتر دەنین باسی ئەو مەسەلانەی کرد کە ئەو دەیەوێ باسیان بکات ، وە ڕاپۆرتەکەی (بەدرخان) ئاماژە بە توانای تێگەیشتنێکی قوڵ لە بارودۆخەکەی نەکردوە، لەوانەیە هۆکاری ئەوەبێت کە ئەو ڕانەهاتوە ڕاپۆرتەکانی بە شێوەی خوازراوی ئێمە تۆمار بکات و بینیرێت، ڕونتر دەبێت ئەگەر دانیشتن بکرێت لەگەڵی بەدرێژی و بابەتی گرنگتر لێ هەڵ هێنجرێنی، ئەگەر تۆ و (ئۆرزی) بتوانن هەندێ شتی تری لێ دەربێنن ، داواکارم بینوسن و بۆمانی بنێرن)).

پرۆفیسۆر ((ئیتمار ڕابینۆفیچ)) یەکێ لە گەورە توێژەران لە زانکۆی (تەل ئەبیب) لەسەر بارودۆخی سوریا لەکتێبەکەیدا ، لەژێرناوی (ئاشتی لە دەستچوو) نوسیویەتی و دەڵێت: ((ئۆرزی و فلمان بەچەند پلەیەك کاریان لەسەردۆسیەی سوریا کردوە ، وە هەندێ لەو چالاکی و پرۆسانە لەڕێی ئەو نێوەندانەوە بوە کەپەیمانیان دابوو ، تا ناوی ئەو ئەفسەر و سیاسەتمەدار و تیرە و هۆز و کەمینانە بدەن بەدەست کە ئیسرائیلیەکانەوە کە بڕیارە کودەتاکە جێ بەجێ بکەن.

لەوچاوپێکەوتنەدا (یۆڤال نیۆمان) لەگەڵ بەدرخان لەپاریس کردویەتی لە ماوەی نێوان تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ و کانونی دوەمی ساڵی ١٩٥٧ بەدرخان زۆر بەتوڕەییەوە دەڵێت : (ئیسرائیل دۆڕا...!

یۆڤال نیۆمان ئەوکاتە وەك جێگری سەرۆکی لقی هەواڵگری بەپلەی عقد لیپرسراوبوو لەڕێککاریکردن لەنێوان باڵەکانی هەواڵگری ئیسرائیلی و فەرەنسی دا ، وەك خۆئامادەکردنێك بۆ ڕوداو و هەڵگیرساندنی جەنگی ساڵی ١٩٥٦، ئەوکارەی کە پێش ماوەیەکی کەم لەم چاوپێکەوتنە جێ بەجێ دەکرا.

نیۆمان پێش ئەوە گرنگیەکی زۆری دەدا بە پەیوەندی لەگەڵ کەمینەکان ، لەووڵاتە عەرەبیەکاندا وە ژمارەیەکی زۆر یاداشتنامەی نوسیوە لەسەر پێویستی گرێدانی پەیوەندی لەگەڵ ئۆپۆزسیۆن لەو ووڵاتانەدا ، سازدانی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکان ، ئاشوریەکان ، مارۆنیەکان ، دروزەکان، تەنها یاداشتی نەناردوە و بەس ، بەڵکو چاوپێکەوتنی نهێنی لەگەڵ کەسایەتیەکان ئەنجام داوە لەلوبنان ، نیۆمان دەڵی : چاوپێکەوتنێکی نهینیم بۆ سازدرا لەگەڵ ((سلطان الاطرش)) سەرکردەی جبل الدروز لە سوریا ، بەڵام ئەم چاوپێکەوتنە لەچرکەساتی کۆتایی دا هەڵوەشێنرایەوە .

نیۆمان دەڵێت : ( فیشەر بەدرخانی پێناساندم ، هەستمکرد کە میرە کوردەکە هەست بەبێئومێدی دەکات ، ئەمە یەکەم بێ ئومێد بونیشی نی یە ، وە باوەڕی وایە کە سیستەم لە سوریا لاوازە ، ڕودانی کودەتا دەبێتەهۆی کردنەوەی ڕێگا بۆئۆتۆنۆمی کوردەکان لەسوریا، کەلەوێشەوە عێراقی دەگرتەوە، بەڵام ئیسرائیل هەلەکەی لە دەستدا ).

وەك دەردەکەوێت سەرچاوەی وەڵامدانەوەنەرێنیەکان گەورەی کادیرە باڵاکانی سیاسەت بوە کەئەویش (داڤید بن گۆریۆن)ە ئەمەش لەونامەیەدا ڕون دەبێتەوە کە (دەنین) لە ٢٤ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٨ بۆ (ساسۆن)ی ناردوە کە تیایدا هاتوە : ( لەگەڵ بن گۆریۆن لە ٢٢ی تشرینی یەکەمدا کۆبومەوە ، وە ئاڕاستەی بیرکردنەوەمانم سەبارەت بەسوریا تێ گەیاند و بۆم ڕون کردەوە کە زۆرینەی سەرکردەکانی سوریا و بەشێکی هەرە زۆری لێپرسراوە کارگێریەکان لەدیمەشق لە

کەمینەکانن ، بەڵام ئەو لەسەرهەمموو ئەمانە زۆر بەکورتی وەڵامی دایەوە : خۆمان ناخەینە بەردەم مزراحێکی نوێوە).

جێی بیرخستنەوەیە کەئەوکەسانەی گرەنتی بەشداربونیان هەبوو لە مزراحەکەدا لە لایەنی سوریاوە بریتی بوون لە (بریجادیرحسنی الزعیم) سەرۆکی ئەرکانی سوریا و وەزیرو سیاسەتمەدار (محسن البرازی ) - هیچ پەیوەندی نیە (حسنی البرازی) یەوە - کەیەکێك بوە لەدڵسۆزەکانی (الزعیم) ئەم دوانە هەردوکیان لەبنەچەدا کوردبون ، و بۆچونی پراگماتیان سەبارەت بەئیسرائیل هەبوو ، و باسیان لەڕێکەوتنی سیاسی گشتگیر دەکرد لەگەڵیدا لەجێگەی ڕێکەوتنی ئاگربەست یان ڕاگرتنی تەقە ، وە هەردوکیان پلانیان دادەنا بۆ لەسەرکارلابردنی سەرۆك(القوتلی) و سەرۆکی حکومەتەکەی (مردم) ، بەدرخان پێشنیاری بانگهێشتکردنیانی کرد بۆ دانیشتنێك لەگەڵ ئیسرائیلیەکان لەپاریس ، شەمعونی پێشنیاری کرد ساسۆن بۆندەکە بخاتە بەردەم (شاریت)ی وەزیری دەرەوە ، بەڵام ساسۆن وای نەکرد و ئەمەش بوە هۆی کۆنەبونەوەی لەگەڵ (الزعیم) دا.

لە ٢ی تشرینی دوەم شەمعۆنی نامەیەکی نارد بۆ ساسۆن نوسیویەتی کە ئەو پێشتر دەیزانی دەستپێشخەرییەکە تەواودەبێت : ( هیچ گومانم نەبو لەوەی کە شاریت ڕازی نابێت لەسەر بانگهێشتکردنی ئەو دوو پیاوە ، نە بە دابینکردنی بودجەیەکی تایبەتی و گونجاو بۆ ئەو مەسەلەیەش).

لەم نامەیەوە دەردەکەوێت کە (شاریت) پێشتر بەتەواوەتی هەموو نەخشە بەرفراوان و کرداریەکانی سەبارەت بەبارودخی سوریا و درۆزەکان ڕەتکردوەتەوە ، ئەم ڕەتکردنەوەیەش بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەسەربنەمای نەبونی بودجەی پێویست و ڕازی نەبون لەسەر دابینکردنی بڕی گەورە بۆ پرۆسەی جوڵاندن و هەوڵی لەم شێوەیە بووە.

جێی باسه کودەتاکه بەبێ تێوەگلانی ئیسرائیل له کانونی یەکەمی ١٩٤٨ دا ڕووی دا ، حکومەتەکەی (مردم) لەئەنجامی خۆپیشاندان و مانگرتنەکانەوە ڕووخا ، پاش ماوەیەکی کەم سەرۆك (شکری القتلی) یش بەهەمان شێوەی لێهات.

پێدەچوو (الزعیم) بڕیاری دابێت پشت بەخۆی ببەستێت ، لە٣٠ی ئازاری ١٩٤٩ پاش پێنج مانگ لەچاوەڕوانی بێ ئاکامی ئامازەیەك لەئیسرائیلەوە دەستی بەسەردەسەڵاتداگرت ، و بووەسەرۆك و (محسن البرازی) یش کرایە سەرۆکی حکومەت و وەزیری دەرەوە.

پاش تێپەڕبونی ٤٦ ساڵ بەسەر ئەو ڕوداوانەدا شەمعون دەڵێت ( لەوانەیە ئێمە ئەوکات هەڵەمان کردبێت کەداواکاری (الزعیم)مان بەهەند وەرنەگرت بەکۆششی خۆی توانی سەرکردایەتی کودەتاکەی بکات ، حکومەت بڕوخێنێت ، پاشان داوای کرد لەئیسرائیل کەلەگەڵی ڕێك بکەوێت ، گومان لەوەدانیە کەکەموکورتی پارە یەکێ لەهۆکارەکانی ڕازی نەبونمان بوو ، بەڵام لەهەمان کات باوەڕمان نەدەکرد کەکودەتاکە بەئاراستەی خوازراوی ئێمە بێت وە پێمان باش بوو لەو ڕووەوە لەهیچ شتێکەوە نەگلێین.

وە پرۆفیسۆر (موشێ مەعوز) له کتێبەکەیدا ((ئیسرائیل و سوریا کۆتایی ناکۆکیی)) دەڵێت : (( (الزعیم) و (البرازی) هیچ پەیوەستییەکی ئایدۆلۆژی نەتەوەیی عەرەبی یان نەبوو ، هەموئەوەی بەلایانەوە گرنگ بوو جێگیر کردن و ڕەگداکوتانی دەسەڵاتیان بوو ، و پەیوەندی بەستنیش لەگەڵ ئیسرائیل بەشێك بوو لەدورنمای سەربازی و سیاسیان بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی له ناوچەکەدا)).

وەك سەرۆکی کۆمار ، زەعیم فەرمانی دا بەئەنجامدانی گفتوگۆی سیاسی و کرداری لەگەڵ ئیسرائیل و ئامادەیی دەربڕی بۆوەرگرتنی سەدەها هەزار پەناهەندە ، بەڵام لەهەمان کاتدا چەندداخوازییەکی هەرێمایەتی ماوەدرێژی هەبوو سەبارەت بەدەریاچەی (طبری)یە.

لەسەربنەمای ڕاپۆرتێکی چاودێرانی نەتەوە یەکگرتوەکان (بن گۆریۆن) لە یادنامەڕۆژانەکەیدا لە١٦ای تەمموزی ١٩٤٩ نوسیویەتی : (( (الزعیم) ئارەزوی ئاشتی دەکات بەڵام داوا دەکات ، کارەکە چەندهەفتەیەك دوابکەوێت ، ئەو نایەوێت هیچ کەلێنێك لەیەکیتی عەرەبی ببێت ، و ئەگەر ئاشتیمان دەست نەکەوێت لەڕیگای گفتوگۆکانی (لۆزان)ەوە - کە شارێکی سویسری بوو ، گفتوگۆ و پەیوەندی بۆ گەیشتن بەئاگربەست لەنێوان ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی لەوێ ئەنجام دەدرا - لەماوەی چەند هەفتەیەك ئامادەدەبێت بۆگفتوگۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵماندا دەربارەی ئاشتی بۆیە نابێت ئیستا هانبدرێت)).

جێگەی وتنە کە ڕێکەوتن لەگەڵ سوریا بەشێوەیەکی سەرەتایی لە ١٨ی تەمموزی ١٩٤٩ ئەنجام درا و لە ١٩ای تەمموز شاریت لەمیانەی دانیشتنیکی حکومەتدا ووتی: کە ئیسرائیل نیازی گفتوگۆی هەیە لەگەڵ (زعیم)دا ، (زعیم) کاتێك لەگەڵ میوانە پلەبەرزەئەمریکیەکانی دەدوێت گرنگیدانێکی زۆر پیشاندەدات بەئاشتەوایی لەگەڵمان و هاوکاری لێ وەرگرتنمان و یارمەتی وەرگرتن لەشارەزائیسرائیلیەکان و زۆر باس لەهەلی ئاشتبونەوە وکاری هاوبەش دەکات لەگەڵمان ، ئێمە پێمان باشە لێکۆڵینەوەی وردی لەسەربکرێت لەمیانەی مۆرکردنی ڕێککەوتنی ئاگربەست ، و پێدەچێت بەرەوپێشچونێکی فراوان هەبێت لەلایەنی (زعیم)ەوە ، لەگەڵ چەندچاودێرێکی نەتەوەیەکگرتوەکان باسی لەئامادەیی خۆی کردوە بۆ وەرگرتنی ٣٠٠ هەزار پەنابەر وە ئەمە ژمارەیەکە کە سێ ئەوەندەی ئەو پەنابەرانەیە کە ئیستا لەسوریادا هەن ، (زعیم) بۆ دۆلارە ئەمریکیەکان هەوڵ دەدات ، و وتویەتی کەئامادەیە باجی ئەوکارە بدات ، شتگەلێکی وای باسکردوە ، مەحاڵە بتوانرێت باس بکرێت و ئاشکرا بکرێت.

بەردەوام دەبێت : (ولیام دۆگلاس) دادوەری دادگای باڵای ئەمریکا کەچەند دیدارێکی لەگەڵ سەرۆك و سەرکردە عەرەبەکان ئەنجامداوە پێی وتم کە زەعیم جەختی لەسەر ئەوانە کردونەتەوە لای ئەو ، بەڵام پێی وتم ئەو نازانێت

کەدەتوانرێت باوەڕی پێ بکرێت یان نا ، بەلام وتی: ئەو دلنیایە لە ئارەزوی (زعیم) بۆ ئاشتی لەگەل ئیسرائیل و هاوکاریکردنی ، ئەو دمیەوێت یارمەتی بدمین بۆبردنەناوەوەی شیوازی نوێ بۆ ولاتەکەی و سودوەرگرتن لە بیروڕای زاناکانمان ، دەگونجێت ئەوانەی کە ووتوویەتی هەموو قسەی پوچ بن و ڕاستیان تیانەبێت ، و لەهەمان کاتدا دەشێ بگونجێت کە بەڕاستی ئارەزوی ئەومبێت کەدەیلێت ، پێویستە لەسەرمان کە لەڕاستی و ناڕاستی هەموو ئەمانە بکۆلینەوە). ئیستاشی لەگەل دابێت نازانین ئەو هۆکارانە چیی بون کە وایان کرد ، لێنۆڕین لەو دۆسیەیە نەکرێت وەك ئەوەی (شاریت) باسی کرد بەپێی ڕای (موشێ مەعوز) جیاوازییەکی زۆرقول لەنێوان (زعیم) و بن گۆریۆندا هەبوو ، وە هەردوکیان خۆشحال بوون بون بەڕێکەوتنی ئاگربەست لەگەل ئەوەشدا زەمەن و کاتی تەواو لەبەردەستدا نەبوو بۆ ئەنجام دانی ئەوکارە ، نزیکەی مانگێك دوای قسەکانی شاریت وە لە ١٤ی ئابی ١٩٤٩ کودەتایەك کۆتایی بە حوکمی (الزعیم ) و (البرازی) هیناو هەردوکیان لە سیدارە دران.

* * *

لەسێدارەدانی زەعیم نەبوومهۆی بیرۆکەی ئیسرائیلی تایبەت بەدروست کردنی کودەتا لەسوریادا ، سوریا کودەتای نوێی بە خۆوەبینی لەو زەمینەیەوە دیالۆگ لەسەر ئاستی سێگۆشەی ئیسرائیل-بەردخان-البرازی ئەنجام درا ،وە یەکەم پەیوەندی زانراو لەوبارەیەوە لەنیوان بەدرخان و (جەدمۆنڕافائیل)دا لە سالی ١٩٥٤ لەو کاتەدا کە سوریا توشی بومەلەرزەیەکی سیاسی نوێ بوو ، سەرۆك ئەدیب (الشش کلیی) کە کۆلۆنێلیکی خانەنشین بوو پێشتر هاوکاری (الزعیم)ی کردبو لە کودەتاکەیدا کودەتای کرد بە سەر (سامی الحناوی) کە کودەتای بەسەر (الزعیم) دا کردبو، بەلام (ئەدیب الششکلی) ناچار بوو دەست لە کار بکێشێتەوە بەهۆی ئەو مانگرتن و خۆپیشاندانانەی سوریای گرتەوە ناچار بوو ، ولات جێ بهێلێت

بەمەش (البشیر الكتلی) كە (البرازی)[1] دەیویست لە كۆتایی ساڵی ١٩٤٨دا كودەتای بە سەردا بكات ، وە لەسەر سەرۆكایەتی دایبگرێت لە ٧ی تەمموزی ١٩٥٤ (رافیائیل) بۆ فیشەر دەنوسێت بەدرخان یەكسەر ڕازی بوە كە (البرازی) ڕابگەیەنێت ، هاوڕیكانی دەیانەوێت لەگەڵی كۆببنەوە (فیشەر) لەو كاتەدا وەك نوێنەری ئیسرائیل كاری دەكرد لە ئەنقەرە بەڵام رافائیل دانرابوو بە بەرپرسی كاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوە ، كاتێك دەستم كرد بە كار كردن لەسەر وڵاتانی عەرەبی ساسۆن پیی وتم كێشەی جولەكەو عەرەب هەمان كێشەی جولەكە و جولەكەیە ، ئەم دۆسیەیە نەخراوەتە بەردەستێكی-نێوەندی ، دەست زۆرن كە یاری پێ دەكەن لێرەو لەوێ بۆ ئەو مەبەستە ئەو ئەركەیان خستۆتە سەر شانم ، تا بە زوی بە جدی چارەسەری بكەم، فیشەر بە بەدرخانی ناساندم بەدرخان هیچ ژێرخانێكی ئەرێنی نەبوو تا هەلی ئەوەی بداتێ كە ئامانجەكانی كورد بە دی بهێنێت وە بەو هۆیەوە دەستی چلەپۆشێكیش دەگرت تا بیگەیەنێ بە وشكانی سەلامەتی، وای بیردەكردەوە لە كودەتا لە سوریا سودێكی بۆ ئەو یان بۆ براكەی دەبێت ،بەڵام (البرازی) خۆی ئامادە دەكرد بۆ دەستبەسەراگرتنی كورسی دەسەڵات لە سوریادا وە داوای لە ئێمە كرد كە دارایی پێویستە بخەینە بەردەست تا بتوانێت كودەتایەك دروست بكات و هاوكاری لە كاتی گونجاودا پێشكەش بە كوردەكان بكات ، دەتوانین هەندێ لەو شتانە ئاشكرا بكەین كە تا ئێستا بە شاراوەیی ماونەتەوە ، لەو یادنامەیەدا كە وەزیری دەرەوە (شاریت) تۆماری كردوە لە ڕۆژی ٣١ /١٩٥٥/٧ دا دەڵێت (دعۆنرافائیل) كە پێش هەفتەیەك لە سەفەرێكی ئەوروپا گەڕاوەتەوە پێی وتم كە لەگەڵ (حوسنی البرازی) سەرۆك حكومەتی پێشوی سوریا كە هەوڵدەدات بگەڕێتەوە بۆ سەر دەسەڵات ئامادەی هاوكاری وەرگرتنە بۆ ئەو كارە لە هەر لایەنێكەوە بێت لە توركیا بەرامبەر بە پەیماندا بە

---

[1] مەبەست لە (حوسنی البرازی) سەرمایەدارەكەیە نەك (محسین البرازی) هاوكاری (الزعیم) وەرگێر.

چونه ناوخولگەی (ئەنقەرە – بەغداد)ەوە لە ئەمریکا بە پەیمان دان بەوەی کە پێ بە پێ ڕۆژئاوا ڕێ بکات وە لە ئیسرائیل لە بەرامبەر پەیماندان بە مۆرکردنی ڕێکەوتننمای ئاشتی وەك پێدەچێت ئیسرائیل پێشتر گومانی لە (البرازی) هەبو کە کەسێکە ناتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت ئاشکرایە ئەوە بەسە کە تورکیا گوێی بۆ بگرێت کە دەیەوێت لەگەڵ عێراقدا یەك بگرێت ، پارەم دەوێت تاوەکو دەزگاکانی ڕاگەیاندن بەدەست بهێنم کە ئەو ئیستا دەڵێت، وە کەسایەتی حیزبەکان بکەم ، (ڕافائیل) پێشنیاری ئەوەی بۆ (البرازی) کرد کە کەسێکی زۆر بلی بوو ، کە کار بکات تا هەموو داواکان بکەونە دەستی ئەو ، وە سەرمایەدارەکان کۆبکاتەوە وە دەستپێشخەری بکات لە خستنە ڕوی پلان گەلیك بۆ نیشتەجێ کردنی پەنابەران ، وشك کردنی زۆنگاوەکان و بەکارهێنانی ئاوەکانی (ئۆرۆنتس) بۆ ئاودێری ئەمە وای لێ دەکات کە بکەوێتە بەرچاوی ئەمریکا وە وا بکات کە بە ئەنقەست بڕە پارەی زۆر و پشتگیری سیاسی لێ بکەن ، (البرازی) زۆر بە هیمنی گوێی بۆ گرتبو پاشان وتبوی ئەوەی تۆ دەیخەیتە بەردەمم کاتێکی زۆر زۆری دەوێت ، تەنها لە کاتێکدا جێ بە جێ دەکرێت کە دەسەڵام بە دەستەوە بێت، وە ئەمە ئیستا پێویستی بە دەسەڵاتێکی باڵا هەیە ، ئەم مەسەلەیە لەو ئاستەدا تەواو نەبوو ، لە ٧ی‌شوباتی ١٩٥٦ شاریت لە ڕۆژانەکەیدا ڕستەیەکی گرنگی نوسیبوو ، (جەدعۆن ڕافائیل) پێڕاگەیاندم ئەگەری ئەوە هەیە سەفەری دەرەوە بکات و سەبارەت بەوەی بۆی ڕونکردمەوە کە دەیەوێت لەگەڵ (البرازی) کۆببێتەوە ، تا زانیاری زیاتر لەسەر ئەوە دەست بکەوێت کە لە سوریادا دەگوزەرێت ، کاتێك بەدرخان بیرۆکەی سەربەخۆی کوردی خستە ڕوو (لیۆڤاڵ نیۆمان) وای بە بیردا هات کە ئەم پیاوە لە (بن گۆریۆن) دەچێت پیاوێکی زۆر بە حەماس باوەڕێك لە دڵیایەتی کە هەرگیز مل کەچ ناکات ، بە هێزێکی زۆرەوە جەنگی خۆی دەکات وە بە ئاشکرای گوزارشتی لە ترسی خۆی دەکرد سەبارەت بە ڕودانی سەربڕین خانەیەك لەسەر گەلی کورد بە (نیۆمانی) ووت ئەوەتان بە دەست هێنا کە دەتان ویست ،ئ یستا

پێویسته لەسەرتان کە ڕاهێنان بە گەنجەکانمان بکەن ، کادیرمان بۆ ئامادە بکەن ، ئێمەش زیرەکترین گەنجانی خۆمنتان بۆ دەنێرین تا ئەفسەر گەلێکیان لێ دروست بکەن کە سەرکردایەتی جەنگاوەرمان بکەن لەسەر ڕێگای سەربەخۆیی ،هەر بەو شێوەیەی کە ئێوە خۆتان کردتان سەربەخۆیتان دەست کەوت ، (نیۆمان) ڕاپۆرتێکی دور و درێژی نارد بۆ سەرۆکی لقی هەوالگری سەربازی پەیوەندی دار (یەهوشفات هەربکابی) بەلام (هەرکابی) گومانی لە دۆسیەکە هەبوو بەلام (نیۆمان) دەستی لە دۆسیەکە هەڵنەگرت لەو کاتەدا (شائۆل ئەبی گۆر) سەرۆکی پێشوی موساد بوو ، کۆچی دوەم سەردانی پاریسی کرد کە پیاوی ئەرکە نهینی تایبەتیەکانی ئاسایشی نەتەوەیی بوو ،(نیۆمان ) هەستا بە ڕێکخستنی کۆبونەوەیەك لە نێوان ئەو و بەردخان دا ، نیۆمان دەڵێت : کۆبونەوەکە لە شوقەکەی مندا کرا ، (ئەبی گۆر) وەك خوی هەمیشەیی خۆی بە ناوێکی خوازراوەوە هات ، کەمی سۆبن دەیڤید بوو ، بیرکردنەوەیەکی باشی بۆ دروست بوو لەسەر مەسەلەکە وە پەیمانی دا کە لای بن گۆریۆن باسی بکات وە پەیمانەکەی بە جێ گەیاند (نیۆمان) دەڵێت: پیم وایە هەموو ئەو ڕوداوانەی پاشتر ڕویان دا بە پەیوەندی کردن بە مەلا مستەفای بارزانیشەوە بە هۆی ئەو یەکتر بینینەی (ئەبی گۆر و بەدرخان)ەوە بوو ، باس لەوە دەکەم کە ڕوی دا کاتێك (بارزانی) یەکەم جار سەردانی ئیسرائیلی کرد لە ساڵی ١٩٦٨ ئەو پێشوازییە فەرمییەی کە لێی کرا لە خانەی میوانداری حکومی کە شوێنی میوان داری میوانە نهینیەکان بوو ، لەو سەردانەدا هەرچی باش و بە لەزەتە لە خواردن و خواردنەوە پێشکەش کرا ، کاتێك لیوا (مائیر عمید) سەرۆکی ئەوسای موساد کە بارزانی بە نیۆمان ناساند وە پێی وت : ئەم پیاوە ڕێگایی بۆ تۆ ئاسان کرد تا بگەیت بە ئێمە ، نیۆمان دەڵێت : (بارزانی) باوەشی پیادا کردم و ماچی کردم ، (عمید) دەڵێت: بەدرخان هەموو ژیانی بۆ کێشەی کورد تەرخان کرد، ئەو پیاوێك بوو توانی هاوارەکانی گەلەکەی بدات بە گوێی خۆرئاوادا ، ئەو یەکەم سەرکردەی

کورد بوو ، کە ناسیبیتمان و هەوڵی هاندانمانی دابێت تا یارمەتی پێشکەش بە شۆڕشگێڕەکانی کورد بکەین لە نیشتمانەکەیاندا، بەڵام پێگەیەکی شکۆمەند یان ڕێزێکی ئەو تۆی لێ نەگیرا ، لە لایەن (بارزانی)ەوە سەرە ڕای ئەوەش کە بەدرخان ئامۆژگاری ئیسرائیلی کرد کە چۆن دەتوانن بگەن بە مەلا مستەفای بارزانی .

ناتوانین ئیستا ئەوە هەڵهێنین کە ئایا کودەتا لە سوریادا ب هاوکاری ئیسرائیل بە ئاراستەی خوازراودا دەگوزەرا یان نا؟ وە ئەگەر کودەتاکە بە ڕاستی سەری بگرتایە هەر بە ڕاست سوریا ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل مۆدەکرد؟ هیچ بەڵگەیەکمان لە بەردەستدا نی یە کە بیسەلمێنێت سەرکردەی کوردەتا هەتا ئەگەر کوردیش بێت وە ڕێنماییەکانی بەدرخان جێ بەجێ بکات دەتوانێت سروشتێ:ی نیشتمانی بدات بە کوردەکان و کەمینەکانی تر وەك دروزەکان لە سوریا ، دۆسیەی کورد بەردەوام بوو لە کوڵان و پێگەیشتن لەسەر ئاگرێکی هێواش لە چوارچێوەی چالاکییە سیاسیەکانی ئیسرائیل دا ، چەند بەڵگەنامەیەك هەن کە لە ماوەی نێوان ١٩٥٨ بۆ ١٩٥٩ نوسراون تا ئێستا لە ژێر پلەی زۆر نهێنی دا پۆلین کراون ، لە نێوان ئەو بەڵگەنامانەدا نین کە وەزارەتی دەرەوە ڕێگەی بە جەماوەر داوە بیان بینێت ، ئەو بەڵگەنامانەش کۆمەڵێك ڕاپۆرتی زۆر لە خۆ دەگرن ، سەبارەت بەوە کە چی ڕودەدات لە نێوان کوردەکان ، دەربارەی گرنگی ستراتیژی کوردستانی عێراق بە تایبەتیش بە هۆی بونی نەوت لە ناوچەی کەرکوك ، ئەو پیاوەی کە قەدەر وای دانابوو ئاگر کورد هەڵبسێنێ و بیگۆڕێت بۆ کورەیەکی بەردەوام تەنها خۆیەتی مەلا مستەفای بارزانی

## بەشی چوارەم/ تەنها کوردێکی سادەبووم

گوندی بارزان کە بەتورکی بەمانای (سەرزەوی کۆچ) دێت دەکەوێتە دوری ٨٠ کیلۆمەتر لە باکوری شاری هەولیر لە بەرزاییەکانی چیای شیرین ، گوندێکی جوان گەورەیە بەسەر زەوییەکی کشتوکاڵی گەورەدا دەڕوانێت ، ڕوباری زێی گەور کە دەڕژێتە دیجلەوە زۆر دور نی یە لێیەوە ، لە گوندەکەدا ئەفسانەیەك هەیە دەڵێت: کە ئەسڵی بنەماڵەی (بارزانی) دەگەڕێتەوە سەر ئەمارەتێکی کۆن کە ناوی (عمادی)یە کە ئەمریکەی وازی لە دەسەڵات هێناوە تا وەك هەژارەکان بژی ن پاشان کوڕەکەی پەیوەندی کردوە بە کۆمەڵەی نەقشبەندییەوە کە پەیوەندی دارە بە کۆمەڵەی دەروێشە موسوڵمانە سوننیەکانەوە ، وە لەمەلا مستەفای بارزانی لە میانەی ئەو گفتوگۆیانەدا کە لەگەڵ ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان کردویەتی لە ماوەی سالانی ڕابردوودا وتویەتی : کە بنەماڵەکەی لە ساڵی ١٢٧٠ ی زاینیەوە لە بارزان دەژین وە ئەم خێزانە هێزی خۆیی لەوەوە وەردەگرێت کە بە جورئەت و وە ئازاترین بنەماڵەن لەم ناوچەیەدا ، هەر بەم هۆیەوە پێنج عەشیرەتی درۆز پەیوەندیان پێوە کردون و هەمویان بە یەکەوە لە ژێر ناوی بارزاندا بون بە یەك هۆز، وە دکتۆرە (عوفرە بنجا) لە کتێبەکەیدا زەنگی کوردەکان لە عێراق دەڵێت بارزانیەکان تاکە بنەماڵەن کە توانیویانە سەرکردەیەکی نیشتمانی دروست بکەن بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ سەرکردایەتیان بکات ، (بارزانی) سەرکردەیەکە لە هەموو سەرکردەیەك زیاتر پشکدار بووە لە دروست بوون و تێگەیشتن و درك پێ کردنی نیشتمانی کورددا ، وە لە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ (دنا ئەرمز شمیدت) پەیامنێری ڕۆژنامەی نیۆرك تایمز لە کاتی میوانداری کردنی لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٢ دەڵێت: بارزانیەکانی هەمیشە جەنگاوەرن لەگەڵ فارس و ئێرانیەکان ، وە لەگەڵ عەرەب عێراقیەکان ، تەنانەت لەگەڵ کوردەکانیش، واتە بارزانیەکان جەنگی نێوخۆیشیان کردوە ، وە جەنگی ئازادیش، شیاوی وتنە کە بارزانیەکان سەرتا دژی هۆزی زێباری جەنگاوەن کە

بانگەشەی موڵکدارێتی گوندی بارزان دەکەن، پاشان لەگەڵ ئەو کوردانەدا هاوکاری عێراقیان کردوە، (شێخ سەعید بارزانی ) باپیرەی گەورەی مەلا مستەفا بارزانی یەکێ بوە لە سەرسەخت ترین پێداگرترین دوژمنەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی وە کوڕەکەی شێخ محمد کە هەستاوە بە سەرکردایەتی کردنی چەندەها شۆڕش و پرۆسەی یاخی بوو لە ماوەی ساڵەکانی ۱۹۱۹ و ۱۹۲۲ و ۱۹۲٤ و ۱۹۲٦ لەگەڵ بەریتانیەکان کە بە بۆمب بارانی ئاسمانی زۆر بە توندی چەکدارەکانیان دەکوشت ، لە سەرو بەندی شۆڕشی ۱۹۲٦ شێخ محمد بۆ دانیشتن ڕوی کردە ئێران بەڵام پش ٤ ساڵ گەڕایەوە عێراق پێشنیارێکی دور و درێژی خستە بەردەم بەریتانیەکان بەم شێوەیە :-

چۆڵکردنی ڕوبەرێك کە دەگاتە ۲۵ هەزار کیلۆمەتر چوار گۆشە ، لە خانەقێن لە ڕۆژهەڵاتەوە درێژ دەبێتەوە تا زاخۆ ، لە ڕۆژئاواوە لە هەر سەربازێکی عێراقی وە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە ژێر پاراستنی ئینتیدابی بەریتانی ، بەڵام ئەمجارە بەریتانیەکان بە تۆپ باران ، وەڵامی دایەوەو شکاندیان کاتێکیش شێخ محمد کۆچی دوایی کرد کە هەندێك دەڵێن لە سیدارە درا ، و هەندێك دەڵێن بە مردنێکی سروشتی مردوە ، (عبدالسالم)[1]ی کوڕی جێگەی گرتەوە ئەویش بە هەمان شێوە هاوبەشی یاخیبوون بوو دژی عوسمانیەکان ، پاشان کۆچی کرد بۆ ئێران وەك پەنابەر و لەوێ ناچار کرا بچێتەوە تورکیا و لەوێ کۆچی دوایی کرد ، لە ساڵی ۱۹۱۵ (شێخ ئەحمەد)ی کوڕی دووەمی کرا بە شێخی هۆزەکە ، بەڵام ئەم پیاوێکی ئاینی نامۆ بوو ، کە بوە هۆی نانەوەی چەندان گرژی و ناخۆشی لە نێوان هۆزەکەیدا ، کە بەمەرگی برای سێیەمی (محمد صادق) کۆتایی هات.

لە ساڵی ۱۹٤۳ کوڕی پێنجەم (مستەفا بارزانی) سەرکردایەتی گرتە دەست ، مستەفا خوێندنی سەرەتایی لە بارزان تەواو کردوەو پاشان لە تورکیا درێژەی بە

---

[1] مەبەستی شێخ ( عبدالسلام )ە بەڵام پێدەچێت هەڵەی چاپ بێت ( وەرگێر )

خوێندن داوه ، ئینجا زانستی ئاینی له سلیمانی تەواو کردوه ، هەر لە تەمەنی ١٨ ساڵیەوه ئارەزوی یاخیبونی کردووه ، کاتێك لەگەڵ دایکی لەبەندینخانەی عوسمانیەکاندا بوو.

لەساڵی ١٩٣١ چالاکیەکانی بە یاخیبونی کوردەکان دەستی پێکردوە و شێخ ئەحمەدی برای قەناعەت پیٚ کردوە بگەڕێتەوە سەر ئیسلامی سوننی.

لە ساڵی ١٩٣٢ لیوایەکی عێراقی هێرشی کردە سەر گوندی بارزان لە باشوری ڕۆژهەڵاتیەوە کەتاکە بۆشاییە لەئامێری بەرگری سروشتی ناوچەکەدا ، بەمەبەستی هەوڵدان بۆ سەرکوتکردنی شێخ ئەحمەد ، لیواکە کەوتە کەمینێکەوە کەکوردەکان بۆیان دانابوو ،و دەتوانرا بە یەکجاری لیواکە تەفروتونا کەن ئەگەر چەکی ئاسمانی بەریتانیا نەبوایە.

شێخ ئەحمەد ناچار بوو دیلەکانی (کە عێراقی و ئەو کوردانە بون کە دژایەتی بارزانیان دەکرد) ئازاد بکات ناوچەکە چۆڵ بکات و بەرەو سنوری تورکیا ڕابکات ، بەڵام دەسەڵاتدارانی تورکیا دەستگیریان کردو لە کۆتایی ساڵی ١٩٣٣ تەسلیمی حکومەتی عێراقیان کردەوه کە لەگەڵ سەدان کەس لەهاوەڵانی بەمەلامستەفاشەوە ڕایگواستن بۆ سەربازگەگەلێکی دورەدەست لەباشوری عێراق ، چوار ساڵ لەوێ مانەوە و پاشان ناردنی بۆ سلیمانی تا ٧ ساڵی تر لەوێ بمێننەوە.

یاخیبونی کوردەکان هەمیشە دەسەڵاتدارانی تورکیا و ئێران و عێراقی بێزار کردوه ، لەو ڕیکەوتننامەیەدا کە لە ئازاری ١٩٣٧ لە نێوان ئەم سیٚ وڵاتەدا مۆرکرا ، ڕێککەوتن لەسەر ڕێگرتن لەهەر کۆمەڵە یان گروپ یان دامەزراوەی چەکدار کار بۆ دژایەتی یەکیٚ لەو ووڵاتانە بکات ، و دەبێت هەرچالاکیەکی ئەوشێوەیەیان لیٚ قەدەغەبکرێت.

بەریتانیەکان بەوبڕیارە دڵخۆش بون ، چونکە ژمارەیەکی زۆر بیرمەوتیان لەخواروی عێراق لە بەردەستدابوو ، هەرزوو ڕێگەیان بە بڕیارەکە داو و

خستیانە بەردەم حکومەتی عێراقی تا کاری پێ بکات تا دڵنیا بن لەوەی کەهیچ سیستەمێك لە ناوچەکەدا بێ ئەوان کار ناکات.

*　　　*　　　*

(مستەفا بارزانی) سەرەتا ئامانجە سیاسیەکانی لەسلێمانیەوە دەست پێکرد کە شارێکی گەورەیە و بەیەکێ لەچوار لیواکەی کوردستان دادەنرێت ، لەوێ توانی زمانێکی هاوبەش دروست بکات لەگەڵ چەند کەسایەتیەکی کوردی کەگرنگی سەربەخۆییان دەزانی ، وەبە بیروبۆچونەکانیان بەرادەیەکی زۆر کاریگەربوو .

لەو کتێبەدا کە (حسن عرفە) سەرۆك ئەرکانی پێشووی ئێران و باڵوێزی پێشوو لەتورکیا و ئیسپانیا لەژێر ناوی "کوردەکان" نوسیویەتی هاتوە : بارزانی لەساڵی ١٩٤٣ توانی لەسلێمانی ڕابکات ، و گەڕایەوە بارزان بۆبنیاتنانی کارکردن دژی حکومەتی عێراق ، و هەوڵدان بۆڕازیکردنی سەرۆکخێڵە دراوسێکان ، لەناویاندا دوژمنە لەمێژینەکانی هۆزەکەی بەوەی کەئەو نایەوێت زەویەکانی هۆزەکەی فراوان بکات ، لەکاتیکدا زەوی بەپیتی زۆریان هەیە ، بەڵکو مەبەستی ڕزگار کردنی هەموو زەویەکانی کوردستان و ئازاد کردنی گەلی کوردە.

پاشان شەڕی پارتیزانی دژی جەندرمە و سوپای عێراقی دەستی پێکرد ؛ سەرکەوتنی لەداگیرکردنی چەند پێگەیەکی سەربازی و بنکەی پۆلیس ڕێزێکی زیاتری بۆ دروستکرد لە نێوەندی ئەو کوردانەدا کە لەناوچە سنوریەکان نیشتەجێ بون ، و زۆر لەوان هاتنەڕزەکانیەوە.

حکومەتی عێراقی درکی بەوەکرد کەلەگەڵ دوژمنێکی جددی ڕوبەڕو بونەتەوە بۆیە هەوڵیدا ڕازی بکات بەخۆبەدەستەوەدان ، بەڵام بارزانی بەهێرشێکی توند بۆ سەرهێزێکی سەربازی و ناچارکردنی بە پاشەکشە ، پاش ئەوەی زەرەرو زیانێکی زۆری لێدان وەڵامی دانەوە ، کەئەمەش وای کرد ناوی لەئاسۆی کوردایەتیدا لەکوردستان بدرەوشێتەوە ، ئەمەش وای کرد زۆرێك سەربازوپلەداری کورد لەسوپای عێراق ڕابکەن و پەیوەندی پێوەبکەن.

لەوكاتەدا كە هێزەكانی بارزانی سەركەوتن لەدوای سەركەوتن بەدەستیان دەهێنا ، چەندلایەنێكی كوردی هەموو كوردستان و بەغدادیش دەگەڕان بەمەبەستی بە دەست هێنانی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ كوردەكان ، ئەو لایەنانە چەندان یاداشتیان نارد بۆحكومەتی عێراقی و نوێنەرانی هاوپەیمانان لەبەغداد ، باڵوێزی بەریتانیا لەبەغداد نامەیەكی نارد بۆحكومەتی وولاتەكەی و داوای لێكرد كەگوێ لە كوردەكان بگرن و واز لەپرۆسەی سەربازی بهێنن لەدژیان.

لە هەمان كاتدا حكومەتی عێراقی بە سەرۆكایەتی نوری سەعید ئامادەیی دەربڕی بۆقبوڵكردنی داخوازی كوردەكان بەشێوەیەكی مام ناوەندی ، نوری سەعید كەسیاسیەكی فێڵباز و لەبنەچەیەكی عەرەب و كورد تێكەڵاوبوو، هەستا بەناردنی وەزیرێكی كوردی وەزارەتەكەی بۆ كردنەوەی گفتوگۆ لەگەڵ بارزانی دا ، بارزانی داوای دامەزراندنی لیوای كوردستانی دەكرد لەعێراقدا ، كە هەرچوار شارەگەورەكەی (كەركوك ، سلێمانی ، هەولێر، دهۆك، هەروەها خانەقینیش ) بگرێتە خۆی لەگەڵ ئەوناوچانەی لێیان دابڕینراوە ، داخوازی دامەزراندنی وەزیرێكی لێپرسراوی دەكرد بۆئەو لیوایە ، و جێگرێكی كورد بۆهەروەزیرێك بە پێدانی مافی خۆبەڕیوەبەری بۆكورد لەبوارەكانی پەروەردەو فێركردن و ئابوری و كشتوكاڵیدا ، زۆرینەی وەزیرەكانی نوری سەعید داخوازیەكانی كوردیان ڕەتكردەوە ،و جەختیان لەوەدەكردەوە كە قبوڵ كردنی ئەوە ئارەزوی كوردەكان دەكاتەوە ، و حكومەتی ناوەندی لاواز دەكات ، هەرچەندە داخوازیەكان ڕەتكرانەوە ، بەڵام بارزانی زۆری دەستكەوت هەبوو ، چونكە هێزوگەورەیی پێدا ، و بووە سەركردەیەكی دانپیانراو، و جێگەی ڕێز و خۆشەویستی هەموو كوردەكان.

لەكانونی دوهەمدا بارزانی هەستا بەكەمپینێكی سیاسی بۆهاندانی حكومەتی عێراقی بۆجێبەجێكردنی هەرچی زوتری مافی خۆبەڕیوەبەری بۆكورد ، لەماوەی مانگێكدا كۆمەڵەیەكی دروستكرد ناونرا "كۆمەڵەی ئازادی"

کەبانگەوازیان بۆ یەکێتی گەلی کورد دەکرد ، پیاوەکانی دەستیان کرد بە ناردنی یاداشتنامە بۆ وولاتەجیاوازەکان ، وە دەستیانکرد بەپڕوپاگەندەکردن دژی حکومەتی پاوەنخواز و دواکەوتوی عێراقی.
لەیەکێ لەیاداشتەکانیاندا بۆبالۆیزی ئەمریکا شکایەتیان لەبەریتانیا و حکومەتی نوری سەعید کردوە ، بەوەی کەبەریتانیا هاوکاری سەربازی نوری سەعید دەکات ، دژی کوردەکان ، وە داوای جێ بە جێ کردنی ئەو چواردە خاڵەیان کردوە کەسەرۆکی ئەمریکی (وێلسن) دایڕشتون ، کە لەیەکێ لەبەندەکانیدا دەڵێت : هەموو گەلێك مافی دیاریکردنی چارەنوسی نیشتمانی خۆی هەیە.
لە١ی ئازاری ساڵی ١٩٤٥ بارزانی لەسەرچاوەیەکی کوردییەوە ئەوەی پێگەیشت کەحکومەتی عێراقی بەم نزیکانە ، هێرشی سەربازی دەکاتە سەرهێزەکانی ، بەپەلە دەستیکرد بەخۆئامادەکردن بۆڕوبەڕووبونەوەی کەئەمەش بووەهۆی پاشگەزبونەوەی حکومەت لەهێرشەکەی، و دەستکرایەوە بەدرێژەدان بەپەیوەندیەکان لەنێوان هەردولادا ، کە بەردەوام بوو هەتا ئابی ١٩٤٥ لەوێدا حکومەتی عێراقی پێشنیازی ئەوەیان بۆ بارزانی کرد کەبگوازێتەوە بۆهەرناوچەیەکی عێراقی کە خۆی بیەوێت جگە لەکوردستان ، بەڵام بەهەمووشێوەیەك ڕەتی کردەوە.
لە١٠ی ئابی ١٩٤٥ شەڕێکی قورس لەنێوان سوپای عێراقی و هێزە کوردیەکان دەستیپێکردەوە ، کوردەکان توانییان زیانێکی گەورە لە سوپای عێراقی بدەن، بەڵام دووهۆکار هەبوو وایانکرد نەتوانن سەرکەوتنی تەواو بەدەست بهێنن : بۆمبارانی هێزەکانی بەریتانیا ، وە هەندێك تیرەو هۆزی کورد چونەپاڵ حکومەتی عێراقی کەدژایەتی بارزانیان دەکرد ، وە ئەو هێزانە ناویان لە خۆیان نا "سوارچاکەکانی (صلاح الدین)" ، ڕقەبەری و دوژمنایەتی نێوان ئەودووکۆمەڵە کوردییە ناکۆکە زۆر توندتر و زیاتر بوو لەڕقەبەرایەتی و ناکۆکی لەگەڵ حکومەتی عێراقی ، بارزانیەکان کوردەدژەکانی خۆیان ناونا "جاشەکان".

جێی وەبیرهێنانەوەیە گۆڤاری (الثورة العربیة) کەزمانحاڵی حیزبی بەعس بوو پاش ماوەیەکی زۆر ڕوونی کردەوە کەجاشەکان کۆمەڵێك بە کرێ گیراو پیاوکوژ بون لەپیناو سەرۆکەکانیاندا دەجەنگان لەبەرامبەر دەستکەوتێکی دارایی ، عێراقیەکان هەمیشە نەیاندەتوانی بڕوایان پێ بکەن ، هەندێك لەوجاشانە لەگەڵ بارزانی لەپەیوەندی ژێربەژێردا بوون.

لە ووتەکانی بارزانی لەبەردەم (دەیڤید کرۆن) نوێنەری موساد لە تاران لە ساڵانی نیوان (١٩٦٥ -١٩٦٩)دا هاتوە کەجاشەکان سێ جۆرن :

* جاشە باشەکان ئەوانەن کە لەعێراق و سەرۆکخێڵەکانیان چەك و پارەیان بۆبەربەرەکانی بارزانی وەرگرتوە ، بەڵام لەدژی نەجەنگاون بەڵکو پارەوچەکەکانیان لەگەڵی بەش کردوە .

* کۆمەڵێ جاشی تر دەشێت هەبن کەچەك پارەیان وەرگرتوە بۆ دژایەتی بارزانی لەحکومەتی عێراق و سەرۆکخێڵەکانیان ، بەڵام چەندان بەهانەو ئەملاو ئەولایان کردوە تا شەڕ لەگەڵ بارزانی نەکەن.

* جۆریکی تریان کە ئەوپەڕی هەوڵیان داوە زەرەر لە یاخیبوان بدەن ، بەهۆی ناکۆکی خێڵایەتی شتی ترەوە .

لە٣٠ ئەیلولی ١٩٤٥ لەزەمینەی ئەو سەرکەوتنەدا کەچەکدارەکان بەدەستیان هێنابوو کە توانیان دەست بەسەر ڕێڕەویکی درێژدا بگرن لەسەرسنوری ئێران ، بارزانی گەیشتە بڕیارێکی ستراتیژی ، ئاماری هەموو جەنگاوەرەکانی و خێزانەکانیان و ژمارەی مەڕو ماڵاتەکانیان و ژمارەی ڕۆشنبیران و مامۆستیان و کارمەندانی حکومی و ئەفسەر و سەرباز و پیاوانی جەندرمە کەهەڵهاتبون لەسوپای عێراق و هاتبون بۆ لای کرد ، لەدەرئەنجامدا بۆیدەرکەوت ئەمجارەیان ناتوانن بەر بەسوپای عێراقی بگرن ، بۆیە فەرمانیدا کە لەسنور ئاودیوببن و

لەگەڵ ئەو کوردانەدا بژین کەگەیشتبونە باکوری ڕۆژئاوای ئێران لەژێرئاڵای سوپای سوردا لەسەروبەندی جەنگی دووەمی جیهانی.
سۆڤیەت تائەوکاتەش هانی بۆچونە نەتەوایەتیەکانی کوردی لە ناوچەکەدا دەدا ، بەڵکو هاوکاربوون لەدامەزراندنی کیانێکی کوردی لە ساڵی ١٩٤٦ بەناوی "مەهاباد" لەسەرزەمینێکی تەسك بەرەو ڕۆژهەڵات لەسنوری عێراقی تورکی ،و لەسنوری سۆڤیەتدا درێژ دەبێتەوە تادەوروبەری باکور (سەقز) ، سۆڤیەت ئەوکۆچبەرە کوردانەی هاتبون بۆناوچەکە وەك هێزێك دایدەنان بۆ بەهێزکردنی ئەو کیانەی دروستی کردبوو ، بۆیە فەرمانی کرد بەمستەفا بارزانی کەبچێتە ژێررکێفی سەرۆکی کۆماری مەهابادەوە ، بەڵام ئەم کۆمارە تەنها ساڵێك ژیا ، سۆڤیەت هێزەکانی خۆی لێ کشاندەوە ، ئێرانیەکان خێرا زەویەکانیان کۆنترۆڵ کردەوەو کۆمارەکەیان هەڵوەشاندەوە ، مستەفا بارزانی کەسەرکردایەتی سوپای کۆمارەکەیانی دەکرد ، خۆی و ٥٠٠ لە پیاوەکانی ڕایانکرد ، کەنزیکەی ٤٦ ڕۆژ لەتاران مایەوەو لەوماوەیەدا لەوبۆندەی کۆڵیەوە کەخرابووە بەردەمی بەوەی کەخۆی و شوێنکەوتوانی لەخوارووی بەشی باشوری ڕۆژهەڵاتی ناوچە کوردیەکانی ئێران نیشتەجێ ببن ، لەنزیك هەمەدان کاتێك بۆی دەرکەوت ئێرانیەکان دەیانەوێت لەناوی بەرن و دوری بخەنەوە داوای لەبەریتانیەکان کرد هاوکاری بکەن، حکومەتی بەغداد وەڵامی دایەوە بەدەرکردنی بڕیارێك بەلەسێدارەدانی بارزانی و پیاوەکانی هەرکاتێك دەستگیرکران ، ئەمەبەسەرئەو پیاوانەدا جێبەجێکرا کەگەڕانەوە عێراق.
هەمو ئەوهەوڵانەش فەشەلیان هێنا ، کەبارزانی دانی بۆ دەستکەوتنی پەناگەیەکی هێمن بۆخۆی و هاوڕێکانی لەئەمریکا ، باڵوێزی ئەمریکا لەتاران (جۆرج ئالن) کەدۆسیەکەی چارەسەرکردوە لەوچاوپێکەوتنەدا لەگەڵ پەیامنێری ڕۆژنامەی "نیۆرك تایمز" ئەنجامی داوە دەڵێت : ئەمریکا بەگومانێکی قوڵەوە مامەڵەی لەگەڵ یاخیبووەکوردەکان دەکرد، بۆیە ئەوکات بارزانی هیچ

دەروازەیەکی شك نەبرد بۆڕزگاربوون تەنها یەکێتی سۆڤیەت نەبێت ، دەستیشی نەکرد بەگەشتەدورودرێژەکەی هەتا زۆرینەی شوێنکەوتوانی بەسەلامەتی گەڕانەوە بۆنیشتمانەکەیان لەمەهاباد ، بارزانی بۆپەیامنێری نیۆرك تایمز دەڵێت : ٥٢ ڕۆژ لەبەرزایی چیاکانماینەوە سەرەتا بەئاراستەی باکوری ڕۆژئاوا دەستمان پێکرد ، بەفری دواهەمینی بەهارمان بڕی کە چڕیەکەی لەنیوان ٢ مەتر بۆ ٤ مەتردابوو ، لەڕێگادا لەگەڵ دوژمنەکانمان جەنگاین و چوارمان لێ کوشتن و حەوت بریندارمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرت و کاتێکیش چووینەناو سنوری تورکیەوە دەربازمان بوو لەبەریەك کەوتن لەگەڵ سوپای تورکیا لەماوەی نێوان ١٦-١٨ ی ٦ /١٩٤٧ سنوری یەکێتی سۆڤیەتمان بڕی.

بارزانی بە(دەیڤید کرۆن)ی وتبوو : لەکاتی تێپەڕاندنی سنوری ئێراندا بەرمیلیك زێڕمان دا بەئەفسەریکی ئێرانی گونجاو تارێگەمان بدات.

لەخاکی یەکێتی سۆڤیەت بارزانی ماوەیەکی تاڵ و شیرینی ڕابوارد ، بە بەدرخانی وتبوو لەوڕۆژانەدا دڵخۆش نەبوە ، لەسەرەتادا لایەنگرانی لە سەربازگەیەکی کۆندا نیشتەجێ کران ، وناچاری چەندان کاری سوکیان کردبوو، وەك پاککردنەوەی شەقامەکان وماڵینی بەفر ، ئەم جۆرە مامەڵە تەواو بارزانی توڕەکردبوو ، بەبەدرخانی وتبوو لەهەموو تەمەنیدا ئەو مامەڵە پرسوکایەتیەی سۆڤیەت لەبیرناکات.

لەئەنجامی ئەوفشارەزۆرەی بارزانی دەیکردە سەرسۆڤیەت ، سۆڤیەت ڕازی بوو کەخولی سەربازی و ڕاهێنان بۆچەکدارەکانی بکاتەوە بەو جۆرەی بۆیان دیاری کراوە ، و ئەوانەی کەتوانای باشیان هەبوو جیای کردنەوە لێیان و ڕاهینانی ئاستی ئەفسەرانی پێکردن ، بەبێ ئەوەی ئەو پلەیەیان پێ بدرێت ، هەندێکیان ڕاهێنانی پیشەیی و شارستانیان پێ دەکرا ، هەندێکی تریان توانیان بگەنە پێگەی ئەکادیمی و زانستی باڵا ، پاشان بڵاوکرانەوە بەسەرشوێنەجیاوازەکانی یەکێتی سۆڤیەت تا لەکارگەو دامەزراوە پیشەسازی و کشتوکاڵی و پیشەییەکانی

تردا کاربکەن، و زۆرێك لەکوردەکان فێری زمانی ڕوسی بون ، بەڵام شێوازی ژیانیان نەگۆڕی و نەبوون بەشیوعی و یەکێتی سۆڤیەتیش داوای شتی لەوجۆرەی لێ نەکردن.

بارزانی بە(حاییم ، لیکۆڤ)ی وتبوو ، کاتێك (لیکۆڤ) سەرۆکایەتی ئەو وەفدەئیسرائیلیەی دەکرد کەسەردانی کوردستانی کردبوو لەساڵانی ١٩٦٦و١٩٧٢ : (ڕووسەکان بۆیان دەرکەوت ، ئێمەموسوڵمانین و ئیماندارین ، موسوڵمانیش ناتوانیت شیوعی بێت) ، کاتێك هەندێك لە نزیەکەکانیشی بەبرازاکەشیەوە بوون بەشیوعی، بارزانی پەیوەندی لەگەڵدا پچڕاندن ، نزیکەی ٨٠کەس لەلایەنگرانی بارزانی ژنی تورکمان و مەسیحی و روسیان هێنا ، بارزانی بەم هاوسەرگیریە تیکەڵاوە ڕازی نەبوو ، بەڵکو زللەیەکی بەهێزی. لە"عبدالله"ی گەورەی پاسەوانانی دا کاتێك داوای لێکرد ڕێگەبدات ژنێکی ئەوناوچەیە بهێنێت.

بارزانی پێگەی پەنابەری سیاسی پێ نەدرا ، سۆڤیەتیش داوای هەڵگیرساندنی ئاگری شۆرشی لەناوچەکە لێ نەکرد ، بۆبژێوی ژیانی خۆی سەرەتا کاری (قەصابی) دەکرد، پاشان لەکارگەیەکی دروست کردنی ئارد کاری دەکرد ، بەڵام چۆنیەتی مامەڵەی ڕوسەکان لەگەڵیدا دواتر گۆڕدرا.

ئایا بارزانی لەئەکادیمیای سەربازی (برونزە)دا کە سوارچاکی ڕوستی تیا دەمانەوە و وانەیان پێ دراوە تا لەووڵاتی تر کاربکەن ، خوێندویەتی؟

کرۆن دەڵێت : گۆیم لەبارزانی بوو ووتی: زەمەنێکی زۆر لە دوای گەیشتنمان بەیەکیتی سۆڤیەت پاش ئەوەی کەماوەیەکی زۆر لەئاشێکی گەنمدا کارم کرد ، بانگیان کردم و بەشێوەیەکی باشتر مامەڵەیان لەگەڵدا کردم، بەشەمەندەفەر ناردمیان بۆ مۆسکۆ و پاشان بۆ کرملین بۆقسەکردن لەگەڵ سەرۆکی وڵات (ستالین) ، کێشەی کوردم بۆ ڕوون کردنەوە ، لێی پرسیم : ئایا تۆ سەرکردەیەکی سەربازێت؟ پاشان ناردمی بۆکۆلیژی سەربازی (برۆنزە) ، پرسیارەکان و

تاقیکردنەوەی وەرگرتن زۆرئاسان بوون، لێیان پرسیم : دەزانی باکور کامەیە ، ئەی باشور لە کوێدایە ، وەڵامی ڕاستەقینەم دایەوە.
(شمیدت) دەڵێت : لەبارزانیم بیستوە بەتەواوەتی ئەو قسەیە ڕەت دەکاتەوە کەکۆلیژی (برۆنزە)ی تەواو کردبێت و پلەی (جەنەراڵ)ی پێ درابێت ، وتی: لەکاتی سەرکردایەتی سوپا لەکۆماری مەهاباد ئەو پلەیەم وەرگرت.
لەپاش مردنی ستالین لەساڵی ١٩٥٣ مامەڵەی ئەو سەرکردانەی کە شوێنی ئەویان گرتەوە لەگەڵ بارزانی باشتربوو، بەڵکو "نیکیتا خرۆشۆف"کەجێی ستالینی گرتەوە ، شوقەیەکی بۆ گرت و خستیەژێر ڕکێفیەوە ، و ناردی بۆ کاملبونی خوێندنەکەی لەزۆربەی بوارەکاندا بە تایبەتی لەبوارەکانی ئابوری و جیۆلۆجیا و زمانی ڕوسی لەپەیمانگای پێگەیاندنی کادیرەکانی پەیڕەوکار لەحیزبی شیوعی ، ئەوکات ڕوسەکان هیچ نیەتێکیان پیشان نەدا بۆ هاوکاری کردنی بارزانی بۆ بەدەستهێنانی ئومێد و ئامانجەسیاسیەکانی ، بەڵام ڕێگەیاندا چاوپێکەوتن بکات لەسەر ئاستە باڵاکان ، وەك ئەوچاوپێکەوتنەی لەگەڵ ئەندامی سەرکردایەتی (میخائیل سۆسلۆڤ) ئەنجامی دا.
وە دکتۆر "نجم الدین کەریم" کە لەساڵی ١٩٧٣ پەیوەندی کرد بە بارزانیەوە دەڵێت بارزانی پێمی وت: لەئاهەنگێکدا ئامادەبوم کە (خرۆشۆف) سازی کردبوو لەگەڵ سەرکردەکانی تر لەحیزبی شیوعی لە یەکێ لەو ئاهەنگانەدا کە خرۆشۆف سازی کردبو لە کازاخستان کەس بە پیوە نەوەستابوو ، جگە لە من (خرۆشۆف).

* * *

ئارامییەکی ڕێژەیی خاکی ئێرانی گرتبووەوە پاش پاکتاوکردنی ئەو کیانە کوردییەی لەوێ دروست بووبوو ، ئێران و تورکیا توانیبویان ئەو چالاکیانەی کورد بەتەواوی بێدەنگ بکەن کە لەسەرخاکەکانیان ئەنجام دەدران ، ئەمەش مەترسیەکی داهاتویی یان لە خۆیان دەرخستبوەوە وەك چۆن "یوسف هۆدس"

جێگری پۆلی لێکۆڵینەوەی سەر بەوەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل لەبەڵگەنامەیەکدا کە لە٢٠ی نیسانی ١٩٥٩ ئامادەی کردوە هەمان شت دەڵێت.

بەڵگەنامەی ناوبراو باسی سوریا ناکات لەبەرئەوەی کوردەکانی ناوی تاڕادەیەك کەمن ، بەڵام زوو شوێنەواری مەلا مستەفی بارزانی لە سوریا هەستی پێ کرا ، ئەو دەوڵەتانە بەناجێگیری دەناسرێنەوە وە شان و باهۆی حیزبە چەپەکان تیایدا بەهێزبوو، شیوعیەکان سەریان بەرزکردەوە بەئاشکرا دەرکەوت کەسۆڤیەت داوای لەکوردەکان کردوە کە سەنتەری چالاکیەکانیان بگوازنەوە بۆ سوریا.

لەبەڵگەنامەکەی (هۆدس)دا هاتوە کەبارزانی ڕاهاتبوو ماوەماوە بەنهێنی بێت بۆسوریا ، چالاکیەکانی بەرفراوان بوون ، کوردەکان دەستیانکرد بەوەرگرتنی چەك کە بەرێگا وشێوازی جۆراوجۆر بۆیان ڕەوانە دەکرا .

دەستی سەرۆکی میصر (جمال عبدالناصر) لەپەنجاکان و شەستەکانی سەدەی ڕابردودا زۆر درێژبوو ، لەنێوەندی کۆبونەوەی وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی ، ساڵانی ١٩٥٥-١٩٥٧ چەند بڕیارێك سەبارەت بە کوردەکان درا کە مافی داواکارییە نیشتمانیەکانیان هەیە ، بەڵام عێراق ئەو کات خۆی ئەو لایەنەبوو کەکاری دەکرد بۆگۆڕینی مامەڵەی خۆی لەگەڵ بارزانیدا ، لەو سەروبەندەدا ئەفسەرێکی پلەبەرزی عێراقی بە ناوی (عبدالکریم قاسم) کودەتایەکی بەسەرخێزانی پاشایەتی لە عێراقدا ڕێکخست و پادشا و سەرۆکی حکومەتەکەی کوشت ، لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ حکومەتی شۆڕشی دروستکرد ، لەوکاتەدا مستەفا بارزانی لە(پراگ)بوو ، بروسکەیەکی لە(عبدالکریم قاسم)ەوە پێ گەیشت داوای لێ کرد کەبگەڕێتەوە بۆعێراق ، وەهەروەها وەفدێکی عێراقی و کوردی نارد بۆلای کەهەمان داخوازییان لێی هەبوو ، بەر لەوەی کەبارزانی پێ بنێتە خاکی عێراقەوە ، ڕژێمی عبدالکریم قاسم یاسایەکی تازەی هەموار کرد ، کەتیایدا هاتوە " عەرەب و کوردەکان هاوبەش لە ئەم نیشتمانەدا ، یاسا مافە نیشتمانیەگشتیەکان دەپارێزێت".

، شادومانی لەدڵی کوردەکاندا گەیشتە لوتکە ، ئەوانەی کەگرنگی بەنووسینەوەی مێژوودەدەن ، ئەوسا جەختیان لەوەکردەوە کە (عبدالکریم قاسم) مێژویەکی نوێیی نوسیوەتەوە ، بۆیەکەمجار حکومەتێکی عەرەبی دان بەمافی هاونیشتمانیدا دەنێت بۆ ئەو کوردانەی لە وولاتەکەیدا دەژین ، قاسم بەوەوە نەوەستا بەڵکو پێگەیەکی یاسایی بەخشی بەپارتی دیموکراتی کورد ، و ڕەزامەندی دەربری لەسەردەرچونی ١٤ ڕۆژنامەی کوردی ، ناوی ئەو گۆڤارانە گوزراشتیان لە ئازادی نیشتمانی دەکردەوە.

وە لەوراپۆرتەدا کەلەوبارەیەوە بۆوەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل نێردراوە ، بەبێ ناو و ناونیشان هاتوە : " لەناکاو دۆسیەی کورد کارابوو ، هۆکارەکەی ناگەڕێتەوە بۆخودی کورد خۆی ، بەڵکو بۆچالاکی سۆڤیەت و میصر کەپێش کودەتاکەی قاسم کەوت".

وە لەو ڕاپۆرتەدا کە لقی لێکۆڵینەوەکان ئامادەیکردوە ، کە بەڕێژەیەکی زۆر پشتی بەپێشبینی و هەڵسەنگاندنەکانی پۆلی هەواڵگری و سەربازی بەستووە هاتوە (کوردەکان دواکەوتون ، وژێرخانی کۆمەڵایەتیان لەرزۆکە و هەستی نیشتمانپەروەرییان هێشتا لەسەرەتادایە ، بە تایبەتیش لەعێراق ، کەکۆمەڵێك لەگەنج و ئەفسەر و یاخیبوان کار دەکەن دژی چەوساندنەوەی خێڵایەتی و دواکەوتوویی کۆمەڵایەتی) ، بەڵگەنامەکە زیاتر دەدوێت (هیچ پەیوەندیەك نیە لەنێوان کێشەی کورد و کێشەی نەتەوەی کورددا، و دروستکردنی کوردستان پێشبینیەکی زۆر نادیار و خاڵیە لە هەربنەمایەکی لۆژیکی سیاسی و ئابوری ، بەڵام پەرە سەندنی ڕەوشەکە و ئەو گرنگی پێدان و ترسەی عێراقی و ئێرانیەکان پیشانی دەدەن لەئێستادا و چارەسەرکردنی نەرێنی بۆمافەکانی کورد و باشترکردنی پێگەکەیان لەچوارچێوەی سیاسی بەردەوام دا ، هەنگاوێکی زۆر پرمانایە کەپرۆسەی دروستبون و چاکترکردنی پێگەیان خێراتر دەکات ، و

ئەگەری ئەوە هەیە کەببێتە بنەماو قۆناغێك بۆداخوازی و پەرەسەندنی دورمەودا لە داهاتوودا).

* * *

گەڕانەوەی بارزانی بۆ عێراق بووە هۆی داگیرساندنی چەندەها گلۆپی سوور لەرۆژئاوادا ، وە لەکاتی گەڕانەوەمیدا لەیەکیتی سۆڤیەتەوە بۆ بەغداد وەك پاڵەوان پێشوازی لێکرا ، جەماوەری کورد ئەوسا یەکێتی سۆڤیەتیان وەك دەوڵەتێك وێنادەکرد کە ئالاهەڵگری ئازادی و پێشکەوتنە لەجیهاندا ، دوژمنی هەرکەسێکە کەدژایەتی کوردەکان بکات.

ئەو گلۆپەسورانە هەردیسان بەردەوام بوون هەتا کاتێك زانیاریەکان کەڵەکەبون لای خۆرئاوا لەسەرئەوەی کە بارزانی لەسوریا لەگەڵ ئەو دیبلۆماتکارە سۆڤیەتیانە کۆدەبێتەوە کە لەبەغداد کاردەکەن ، ئەوەش ئەو گومانەی زیاد کرد کەدەشێت ئەو بەڕاسپاردەی یەکیتی سۆڤیەت ئەو کارەبکات ، لەسەر ئەوبنەمایە رۆژئاوا بیری لەدەرخستنی سەرکردەیەکی کوردی تر کردەوە بۆڕوبەڕوبونەوەی بارزانی تا هاوسەنگی بپارێزێت ، بەدورنازانرێت کە ئەمریکا لەمبارەیەوە لەگەڵ (تاران)دا دوابێت ، لەکاتێکدا شای ئێران (محمد رەزا پەهلەوی) زۆر دوودڵ بوو لەگەڕانەوەی بارزانی بۆ وولاتەهاوسێکەی ، زۆر لەوە دەترسا کەبارزانی کاربکات بۆ تۆڵەلێکردنەوەی ، بەهۆی ڕوخاندنی کۆماری مەهابادەوە ، و کێشەی لەنێوەندەکانی ئێراندا بۆ دروست بکات هەر دوو وڵاتەکە باوەڕیان وابوو کەبەدرخان دەتوانێت بەو ڕۆڵە هەڵ بستێت ، ئاسەواری ئەو بڕیارە بەبەڵگەنامەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیلەوە دیارە.

دەزگاری (ساڤاك)ی ئێرانی "ئاژانسی ئێران بۆ هەواڵگری و ئاسایش" لە ئەیلولی ١٩٥٨ داوایان لەبەدرخان کرد کە لەئێران نیشتەجێ ببێ و لەوێ کاربکات ، بەرلەوە گفتوگۆ لەنێوان بەدرخان و "شا"ی پەهلەویدا کرابوو، هەروەها لەنێوان

بەدرخان و ژەنراڵ (تەیمور بەختیار) سەرۆکی دەزگای (ساواك) کە لەبنەچەدا کوردبوو.

بەهەمان شێوەی کوردەناسیۆنالیستەکان بەدرخان ئەوکوردانەی کە خزمەتی لایەنە بێگانەکانیان دەکرد ، بەبەکرێگراوو خیانەتکار ناوی دەبردن ، بەڵام سەرەرای ئەوە هەوڵی دەدا لەرێگەی (بەختیار)ەوە سودێکی بەربکەوێت لەهەمان کاتدا بەختیار لای خۆیەوە پێشنیارەکانی بەدرخانی رەت نەکردەوە بۆ کارکردن لەپێناو پاریزگاری لە شارستانیەتی کوردی لەنێوەندەکانی کوردانی ئێراندا ، و دامەزراندنی کارمەندی پلەی باڵای کورد لەنێوچە کوردیەکاندا ، هەرچەند رازی بوو ، بەڵام هیچ یەکێ لەم پێشنیارانە بە کردار جێ بەجێ نەکران.

بەڵام "شا" وای پیشاندا کەئارامگر و خۆراگرە بەرامبەر کوردەکانی ئێران ، داوای لێ نەکردن کە وازبهێنن لەرابردوی شارستانیەتیان بە شێوەیەکی کۆتایی ، ئەوەش بەمەرجێك جورئەت نەکەن وشەی ئۆتۆنۆمی لەدەمیان بێتەدەرێ ، داوای لە بەدرخان کرد کەسەرۆکایەتی ناوەندێکی زمان و شارستانیەتی کوردی بکات لەزانکۆی تاران ، لەژێر چەند مەرجیکی زۆرتونددا، بەدرخان بریاری دا شا بەپێوەری کرداری هەڵبەسنگێنێت ، ئەو پێشنیارە خرابووە بەردەمی قبوڵی کرد بەڵام بەمەرجێك رێگەی پێ بدرێت رۆژنامەیەك بەزمانی کوردی دەربکات ، لەهەموو ناوچەکانی کوردستانی ئێران بڵاوببێتەوە ، و کردنەوەی چەندان خوێندنگا لەوڵاتی ئێران کە بەزمانی کوردی بخوێنن، و دامەزراندنی دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان و کارمەندانی باڵای کورد ، ئەمەش لەپێناو کۆکردنەوەی جەماوەری کورد و زیادکردنی دڵسۆزییان بۆ تاجی پادشایەتی ئێران ، "شا" وەڵامی داخوازیەکانی بەمەدایەوە (لەو مەسەلانە دەکۆڵینەوە و بەزوویی وەڵامت دەدەینەوە) بەڵام . هەروەك چۆن لە پێشیدا پێشبینی دەکرا وەڵامی هیچ یەك لەو داخوازیانە نەدرایەوە.

بەدرخان پێشنیارێکی تریشی ڕەتکردەوە کەدەیتوانی خەزێنە بەتاڵەکەی پڕبکات ، بەدرخان لەوماوەیەدا کچێکی پۆڵەندی خواستبوو کە زۆر لەخۆی بچوکتربوو و لەخێزانێکی زۆردەوڵەمەند بوو بەڵام لەکاتی دەسەڵات گرتنەدەستی شیوعیەکان لەپۆڵەندا هەموو سەروەتەکەی لەدەستدابوو ، (ناتاشا) بە فەرمانی خێزانەکەی کۆچی کردبوو بۆفەرەنسا و لەزانکۆی (سۆربۆن) بوویوە خوێندکار و لەسەردەستی بەدرخان زمانی کوردی خوێندبوو ، کاتێك هەستی کردبو کە بەدرخان بەسیحری خۆی دیلی کردووە چونکە خۆی تەرخان کردبوو بۆخزمەتی گەلەکەی ئەوەبوو بڕیاریدا نەك هەرببێتە خێزانی بەڵکو سکرتێرەی تایبەتیشی ، و لەگەڵ خۆی بڕێکی گەڵ زۆر پارەشی بۆ زاوا هێنا ، و کێڵگەیەکی فراوان کەهەشتا کیلۆمەتر لە پاریس دوربوو و خزمەکانی کڕی بوویان بۆی ، بەوپارەیەی بۆیان مابویەوە.

ئەو پارەیە هاوکاری بەدرخان و خێزانەکەی کرد لەناوچەی زانکۆکەدا و لەشوقەیەکی بینایەکی بەرز نیشتەجێ ببن دوور لەدەستی هەرکەسێك کەبیەوێت تیرۆری بکات ، ئەوە لە کاتێکدا کە کێڵگەکەشیان بەدەستەوە مابوو کە لەو کاتەدا نرخەکەی دەگەیشتە سەد هەزار دۆلار کەنرخێکی باش بوو بۆی ، بەڵام ئەمان ڕازی نەبون بەو بڕە بیفرۆشن.

بەدرخان لەیەکێ لەچاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ (بن دەیڤید) دەڵێ: لە ناکاو ئێرانیەکان داوایان لێ کردم کێڵگەکەیان پێ بفرۆشین بە "یەك ملیۆن دۆلار" ! ، واتە دەنەوەندەی ئەو پارەیەی کەپێشتر پیمان درابوو.

ئەگەر ڕازی بوومایە بەڕۆشتن بۆئێران ، ئەوا دەبوومە بارمتە بەدەستیانەوە ، لەهەرکاتێکدا کیشەی کورد بوروژایە ئاماژەیان پێ دەکردم وەك ئەوەی بڵێن وەڵامی هەمووداخوازیەکانی کوردمان داوەتەوە ، کاتێکیش بارودۆخەکە هێمن دەبووەوە، بەجۆرێك لە جۆرەکان تەواویان دەکردم، گومان لەوەدانیە کە وایان دەکرد ، ژورەکەم لێرە لەزانکۆ بگۆڕمەوە بە گۆشەیکی زیندانەکان.

سەرەڕای هەموو ئەوانە بەدرخان بەردەوام بوو لەپەیوەندیەکانی لەگەڵ (ساواك) ، لەهەمان کات بەردەوام بوو لەهەوڵدان بۆیارمەتی دانی شۆڕشەکان لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست ، بەئومیدی ئەوەی کە لەکۆتایی ڕێگەدا ئەو هەولانە بەسودی کورد تەواوببن، هەرزوو بەدرخان هاوبەشێکی لەبیروڕادا بۆخۆی دیتەوە لەوێنەی سیاسییەکی لوبنانی کاریگەر کە لەوکاتەدا کەنارگیر خرابوو ، ئەو سیاسەتمەدارە تەنها (سامی الصلح) بوو ، کەموسوڵمانێکی سوننەی لەدایکبوی (عەکا) بوو ، چەندجارێك پۆستی سەرۆکی حکومەتی لوبنانی وەرگرتبوو و لەحوزەیرانی ۱۹۵۸ بەزۆر لەپۆستەکەی دایان گرت.

"الصلح" هەرگیز لەو کەسانە خۆش نەدەبوو کەلەسەرکورسی حوکم دایان گرتبوو ، لەهۆکارێك دەگەڕا تابیگێڕێتەوە بۆپۆستەکەی ، بیرکردنەوەکانی لەکۆتایی ڕێدا گەیاندیانە خستنەڕووی بیرۆکەیەکی سیاسی دورمەودا کەجەختی دەکردەوە لەسەردانانی سنورێك بۆ دوو کەسایەتی سیاسی زۆرناودار لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا ، ئەوانیش "جمال عبدالناصر" کە(الصلح) بەگەورەترین دوژمنی ناوچەکەی دادەنا ، کەسی دوهەمیش "عبدالحمید السراج" سەرۆکی دەزگای هەوالگری سەربازی سوریا بوو "پیاوە سوریە بەهێزەکە" ، کە بەپشتگیری "جمال عبدالناصر" توانی سوریا و میصر یەکبخات و بیانکات بە یەك دەوڵەت.

(الصلح) دەیوت : "سەرڕاج" هێزی جوڵێنەری زۆربەی ڕوداوەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاستە ، و هۆکاری گەورەیە لەلابردنی لەسەر کورسی دەسەلات.

قۆناغی یەکەمی پلانەکە بریتی بوو لەڕوخاندنی سیستمی حوکم لە لوبنان کەپاڵپشتی لەیەکێتی میصر ـ سوریا دەکرد و گۆڕینەوەی بە حکومەتێکی نوێ و بەئەنجومەنێکی دەسەلات کەنوێنەری هەموو چین و توێژەکانی تێدابێت.

"الصلح" بەبەدرخانی وت : زۆرینەی لایەنە سیاسیەکانی لوبنان بەڵینی پشتگیرییان پێداوە ، تەنها دابینکردنی پارەی پێویست ماوە بۆ پرۆسەکە ،

ئامادەکاری بۆ دروستکردنی کودەتا لەماوەیەکی لەنێوان شەش مانگ بۆ ساڵێکی دەوێت ، وە پێویستم بەنزیکەی پەنجا هەزار دۆلار هەیە بۆبەکرێگرتنی شوقەیەك و ناوماڵ و کڕینی دوو سەیارە و پاسەوانی تایبەتی ، ژیانم لەمەترسیدایە بۆیە پیویستم بەنزیکەی ٣٠ پاسەوانی بەرەگەز کورد هەیە.

(الصلح) بەردەوام بوو وتی: لەقۆناغی داهاتودا هەوڵ دەدات بۆدروست کردنی یەکیەتیەکی فیدراڵی کەعێراق و سوریا و لوبنان و پاشان کوردستان و حیجاز و یەمەن و تورکیا و ئێران بگرێتەوە ، پاشانیش ئیسرائیلی بۆ زیادبکرێت ، کاتێك هەلی ئەوەمان بۆ هەڵکەوت .

(الصلح) جەختی لەوەکردەوەکە دەتوانرێت لەگەڵ "عبدالکریم قاسم" لێکتێگەیشتن ڕوبدات.

بەدرخان ڕازی بوو بەهاوکاریکردنی (الصلح) و پێشنیاری کرد کە سەردانی بەغداد بکات بۆقسەکردن لەگەڵ عبدالکریم قاسم سەبارەت بەپلانەکەی ، ئەمە لەکاتێکدا هێشتا قاسم لەچاوی کوردەکاندا دەدرەوشایەوەبەهۆی یاساکەی کەپێشتر باسکرا.

بەدرخان نەیدەزانی کە "الصلح" پێشتر هەمووپلانەکەی بۆ نوێنەری (مۆساد) باسکردوە لەکاتی سەردانەکەیدا بۆپاریس ، بۆیە بەدرخان هیچ شتێکی تازەی بە(بن دەیڤید) نەوت کاتێك باسی دانیشتنەکەی خۆی و (الصلح)ی بۆکرد ، ئەوکات (بن دەیڤید) پێشنیاری بۆ بەدرخان کرد کە لەبیرۆکەکەی (الصلح) دا جێگەی ئەم بیرۆکە تازمیەش بکاتەوە ، هەڵوەشاندنەوەی (الجامعە العربیە) و گۆڕینی بە کۆڕبەندێکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیی کەدەبێتەهۆی کارلێککردنی هاوبەش لەنێوان ئاینەکانی ناوچەکەدا ، و کاربکات بۆ پێکەوەبەستنی ئابوری وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و لێکنزیککردنەوەی سیاسی یان لەسەر بنەمای ئەگەرە هاوبەشەکان.

"بن دەیڤید" پرسیاری لەبەدرخان کردبوو کە ئەم پلانە چی بۆ کورد تێدایە؟ ، : لەناوبردنی "عبدالناصر و السراج" دەبێتەهۆی گۆڕینی بارودۆخی ناوچەکە ، پاشان دروستبونی ئۆتۆنۆمی و ڕۆشنبیری لەناوچە کوردیەکان ، عێراق لەسەرەتادا ، پاشان ئەم شێوازە دزە دەکاتە ئەووڵاتانەی تر کەکوردی تێدایە"

"بن دەیڤید" گەڕایەوەو پرسیاری لەبەدرخان کرد : چی دەکەی ئەگەر "الصلح" خیانەتی لێکردی؟ ، بەدرخان وەڵامی دایەوە بیرم لەوەش کردۆتەوە پیویستە ترسمان هەبێت ، لەو باوەڕەدام بتوانم لەنزیکەوە چاودێری بکەم ،تا ڕێبگرم لەراکردنی لەرێنماییەکان ، یەکێ لە هۆکارەکانیش کەبەکاری دەهێنم پاسەوانی تایبەتی کوردییە ، لەوانەیە باشتربێت کەپاسەوانی ئیسرائیلیشیان لەگەڵ بێت.

لەیەکی لە چاوپێکەوتنەکاندا "بن دەیڤید" وتی: بۆمان دەرکەوت کە ئەوپلانە سەرکێشانەیەو زۆر بێ ناوەڕۆکە ، ئیسرائیل دوردەخاتەوەو دەیخاتە پەراوێزەوە ،ئەگەر سەریش بکەوێت وبەهەندوەربگیرێت ئیسرائیل ناتوانێت ، شوێنێك لەچوارچێوەیدا وەربگرێت ، بەڵام بیرمان لەوەکردەوە کەدەتوانرێت سود لە"الصلح" وەربگیرێت ئەگەر بەڕاستی هەوڵی پێکهێنانی حکومەتێکی لوبنانی نوێ بدا و کاربکات لەسەر پێکەوە ژیانی "ئەتنی" و لەناوبردنی ڕێکخراوە دژەکان بۆنمونە "الجامعە العربیە".

بەدرخان ڕویکردە جێگرەکەی "بەختیار" بۆ دابینکردنی پارەی پێویست بۆ "الصلح" ، پاشان ڕووی لەعێراق کرد و بۆهەمان مەبەست لەگەڵ بارزانی کۆبووەوە ، و نهێنیەکەی پێ گوت : بارزانی پیشوازی لە پلانەکە کرد ، وەك چۆن پیشوازی لەهەرپیلانێك کردوە کەپێی وابووبێت لە ئۆتۆنۆمی ڕۆشنبیری زیاتری بۆ کورد تێدایە.

لەپاش بینینی بارزانی سەردانی بەغدادی کرد و لەگەڵ "عبدالکریم قاسم" کۆبوەوەو و نەخشەکەی خستەبەردەمی و بەدەستی بەتاڵ هاتە دەرەوە..!

"الصلح" گەڕایەوە لوبنان بۆجێبەجێکردنی پلانەکەی لەوێ ، و سێ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەنجامدا و لەدوانیاندا دۆڕاو دانەیەکی بردەوە ، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم لەهەوڵدانی سێیەمی مرد.

لەپاش ئەو هەوڵەی "الصلح" هەوڵێکی تر درا ، کەسوریەکی تر سەرکردایەتی دەکرد و لەبنەچەدا کورد بوو ، خێزانەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەر سەردەمی خەلافەت لەدیمەشق ، ئەو کوردە کە ناوەکەی لە کاغەزەکانی (بن دەیڤید)دا نەنوسراوە داوایکردوە لەگەڵ لێپرسراوانی ئیسرائیل کۆببێتەوە لەباڵوێزخانەی پاریس ، لە١٥ی کانونی یەکەمی ١٩٥٨ چوەتە باڵوێزخانە و لەگەڵ (بن دەیڤید) کۆبوەتەوە ، پیاوەکە نزیکەی پەنجاساڵ تەمەنی بووە ، و ڕۆشنبیریەکی باڵای هەبوە ، زۆر بە باشی بەئینگلیزی قسەی کردووە ، پلانێکی دوورودرێژی خستۆتەڕوو بۆ دانانی سنورێك بۆیەکیتی نیوان میصر و سوریا ، ئەویەکیەتیەی کە وایکردوە سوریا ببێتە کۆیلەی میصر ، و شیوعیەت لەخاکەکەیدا بلاوببێتەوە.

ئەو سوریایی یە ووتبوی کەکۆمەڵێك پیاوکوژی هەیە ، ئامادەن بۆ لەناوبردنی عبدالناصر و ژمارەیەك سەرکردەی سوری کەپشتگیری لێ دەکەن ، وەکو (أکرم الحورانی) نازیستی پێشوو کەئێستا جێگری سەرۆکی دەوڵەتە یەکگرتوەکەیە ، و سەرۆکی هەواڵگری (عبدالحمید السراج) گومان لەوەدانیە کەئەم پاکسازییە دەبێتەهۆی جیابوەنەوەی سوریا لە میصر ، هەروەها پیاوکوژەکان ئامادەن لە جێبەجێکردنی پرۆسەکەدا خۆیان بەکوشت بدەن..!

"بن دەیڤید" پێشنیارەکەی گەیاندۆتە لایەنە پەیوەندیدارەکان ، بە هەریەك لەلیپرسراوانی پۆلی هەواڵگری سەربازی و دەزگای ئاسایشی گشتی و وەزارەتی دەرەوە ، دەڵێت: لە میوانەکەم پرسیوە بۆچی ڕوی لە ئیسرائیل کردوە نەك فەرەنسا ، کەتۆڕێکی پەیوەندی لەمێژینەی لەگەڵ سوریا هەیە ، سوریاییەکە وەڵامی داوەتەوە : لەگەڵ فەرەنسیەکان نازانیت تۆ لەکوێ وەستاوی ،

ئەمریکیەکانیش هێشتا لەسەرئاستی سیاسی نازانرێت چی دەکەن، بۆیە دەرئەنجامەکەم بۆ دەرکەوت کەئیسرائیل پەیوەندیدارە بەوگۆڕانکاریەوە.
سەرەڕای ئەوەش سوریایەکە ئامادەنەبوو بەڵێن بدات بەمۆرکردنی رێکەوتن لەگەڵ ئیسرائیل لەپاش کودەتاکە ، بەڵام پەیمانی دا کە بە چەند قۆناغێك ئەوەبکات ، ئامادەیی خۆیشی دەربڕی سەردانی ئیسرائیل بکات و پلانەکەی لای کاربەدەستە بالاَن ڕوون بکاتەوە، وە داوای کردوە کەپاسپۆرتێکی ئیسرائیلی بەکەسایەتیەکی دروستکراوەوە بۆبکرێت ، و "بن دەیڤید" کاسێتێکی تۆمارکراوی دانیشتنەکەی ناردوەو هۆشداری داوە بەگوێگرتن و قسەکردنی ڕووبەڕوو لەگەڵ ئەو پیاوە ، بەڵام وریایی لەسەرجێ بەجێ کردنەکەی داوە وتویەتی: دەبێت زۆر هوشیاربین و کارنەکەین لەپشت ئەوەی کە ئەودەیڵێت ، لەبەر ئەوەی ئەو سەرکردە عەرەبانەی کە لەکاتی دەسەڵاتدا ئیسرائیلیان بە دوژمن زانیوە لەکاتی کێشە و لابرانیاندا هانایان بۆ هێناوە ، و هاوکارییان لێ وەرگرتوە لەپێناو لەسەرکارلادانی ئەوانەی کە ئەمانیان لەسەرکارلاداوە ، سەرەڕای ئەوەش دەبێت هەرحاڵەتەو بەپێی بارستایی خۆی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت.
لەوکاتەدا پاشکۆیەکی سەربازی نوێی ئیسرائیلی گەیشتە پاریس ئەویش عقید "عەوزی نەرکیس" بوو ، کەپێشتر وەك جێگری سەرۆکی پۆلی ئەرکان لەسوپای ئیسرائیل کاری کردبوو، ئاسایی بوو کە لەسەرەتای ڕێگاکەیدا سەردانی "گەشتیار" بکات ، "گەشتیار" ئەو ناوە نهێنیە بوو کە لەبەدرخان نرابوو تابزانێت چی لەعێراقدا دەگوزەرێت ، کەپێش ماوەیەکی کەم لەوێ گەڕابووەوە ، لەڕێگەی ئەو زانیاریانەوە کە گەیاندبوونی دەرکەوت کە لەپەیوەندیەکی توندوتۆڵدایە سەبارەت بەوەی کە لەعێراق دەگوزەرێت ، لەوماوەیەدا بەدرخان لەباشترین بارودۆخدا بوو ، و ڕۆڵی پەیامنێری دەبینی لەنێوان بارزانی و جیهانی دەرەوەدا.

لەو نامە زۆر تایبەت و نهێنیەدا کە (نەرکیس) لەای ئایاری ١٩٥٩ ناردویەتی بۆ "رۆبن شیلۆح" لەوەزارەتی دەرەوە لەقودس ، وەسفی ئەمیرەکوردەکەی کردوەو وتویەتی: پیاوێکی زۆر زیرەکە و کاریگەرییەکی بەهێزی هەیە ، پشتگیری لە "عبدالکریم قاسم" دەکات لەبەرئەوەی پێی وایە رۆڵەکانی گەلی عێراق ئازادیان زیاترە وەك لە ئێران و تورکیا و سوریا ، وە بەلەوەی هەرگۆرانکارییەك روبدات لە هەڵوێستی "عبدالکریم قاسم" سەبارەت بەکوردەکان یان ئێرانیەکان سەبارەت بەکورد، گەشتیارەکە پشتگیری شۆڕشی عێراقی دەکات و هێماکە بە "عبدالکریم قاسم" دادەنێت و رقێکی زۆرزۆری لە "عبدالناصر" هەیە و دەڵێت کە "عبدالناصر" دژایەتی شیوعیەکان ناکات بەڵکو شەڕ لەگەڵ هەرکەس و لایەنێك دەکات کە ئامادەنەبێت سەر بۆدەسەلاتەکەی شۆڕبکات بەدرخان هەمان بیروبۆچون و تێڕوانینی ئێمەی هەیە.

بەدرخان بێزاری خۆی لەبالۆێزخانەی ئەمریکی لەپاریس نەشاردەوەو ووتی: ئەوانە وەك بەکرێگیراو مامەڵەم لەگەڵ دەکەن، لەباشترین بارودۆخدا رێگەم دەدەن کەلەگەڵ جێگری سێهەمی بالۆیزدا کۆببمەوە ، رۆژئاوا هەڵەیەکی گەورە دەکات ، کاتێك پشت لەورِوداوانە دەکات کەبەسەر کورددا دێن ،و وەك پارویەکی ئاسان بۆ سۆفیەت جێیان دەهێڵێت، جەختی لەوەش کردوە کەپارێزگاریکردنی ئەمریکی دەبێتەهۆی ئالۆزبونی پەیوەندیەکانی رۆژئاوا لەگەڵ ئێران تورکیا بەلام دڵنیاییدا کە ئەو ئالۆزبونەوە باشترە لەدەستێوەردانی سۆفیەت لە بەرژەوەندی دۆسیەی کورد ، با ئەمریکیەکان بێن نەك لەبەر خۆشویستنی کوردەکان بەڵکو بۆ پتەوکردنی کۆنترۆڵیان بەسەر ناوچەکەدا.

لەوراپۆرتەدا کە بەدرخان داویەتی بە (نەرگیس) روندەبێتەوە کە تورکیا بووەتەهۆی فەشەلهێنانی ئەگەری گەیشتنی کوردەکان بە کۆتاییەکی ئیجابی لەگەڵ ئێرانیەکاندا ، تورکەکان هۆشداریان داوە بە ئێرانیەکان و ووتویانە ئێوە

یاری بەئاگردەکەن ، هیچ مەدەن بە کوردەکان ، ئەمەش وایکردوە لەڕێکەوتنەکە بکشێنەوە.

(نەرگیس) دەڵێت: ئیسرائیل ڕووبەڕووی قەیرانێك بووەوە لەتای یەکەمی تەرازووەکەدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیای تێدابوو کە بە بەردی بناغەی لایەنی ئەمریکی دژ بەسۆڤیەت دادەنرێت ، وەهەروەها پەیوەندی بەئێرانەوە کەگرنگیەکی زۆری هەیە ، هەرچەندە کە لەسەر لێواری داڕمانە بەهۆی گەندەڵی نێوخۆییەوە و لەتایەکەی تری تەرازووەکەدا ١١ ملیۆن کورد هەبوو کە ئەگەر توانایەکی ڕاستەقینەیان هەبوایە ئەوا ئێمەیان دەکرد بەپێشەنگی خۆیان تادەگەیشتن بەشتێك.

"نەرگیس" ئامۆژگاری دابوو کەئیسرائیل بەردەوام بێت لەهاوکاری کردنی بەدرخان بەنهێنی و هێمنی و بەووریاییەوە ، و هەوڵ بدات بە شێوەیەکی گشتی سەرنجی ئەمریکا بۆدۆسیەی کورد ڕابکێشێت بە تایبەتی بۆ بارودۆخی کورد لە تورکیا.

★ ★ ★ ★

(واڵتەر نیتان) بەڕێوەبەری گشتی لەوەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل لەبەهاری ساڵی ١٩٥٩ داوای لە(ئیبان) باڵوێزی ئیسرائیل کرد لەواشنتن تا لەحکومەتی ئەمریکی و ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی "سی ئای ئەی" زانیاری وەرگرێ سەبارەت بە مەلامستەفای بارزانی و نیەتەکانی ، ئەوەبوو لە٩ی ئایاری ١٩٥٩ (ئەبا ئیبان) نامەیەکی ناردەوە بۆوەزارەت و جەختی لەسەرگومانەکانی ئیسرائیل کردەوەو دەڵێت : کەدەتوانرێت بارزانی ناوبنرێت بە "بارزانییە سورەکە" ، ئیبان لەنامەکەیدا نوسویەتی بەبێ هیچ گومانێك بارزانی بەکرێگیراوێکی سۆڤیەتە و قاسم دەیکات بەسەرۆکی کوردەکان ، هەرچەندە حەزی پێ ناکەن ، سەرەڕای ئەو مەترسیە بۆئێران و تورکیای دروست دەکات ، هیچ هۆکارێك نیە وامان لێ بکات هیواداربین ئەو پلانە سەربگرێت وەك ناتوانین کاریگەری بخەینە سەرئەم یان

ئەو لایەن ، بەنیسبەت کێشەی کوردەوە ئەو مەترسیەی کەتوشمان دەبێت بەهۆی "مانگی پڕ - هیلال الخصیب" عەرەبی شیوعیەوە لەهەموو ئەو مەترسیانە گەورەترە کە لەم ماوەیە توشمان هاتوە.

"ئیبان" مەبەستی لە "مانگی پڕ" عێراق و سوریا و لوبنان بوو، کە هیوایان بۆیەکێتی عەرەبی دەخواست و دەیانویست ئیسرائیلش بخەنە پاڵی.

بارزانی لەسەرئاستی ناوخۆیی ڕوبەروی کێشەی زۆربویەوە ، ئۆپۆزسیۆنی کوردی لەجەنگدابون لەگەڵی ، باڵوێزی ئێران لەئەنقەرە بە هاوتا ئیسرائیلیەکەی "مۆردخای ئەلۆن"ی ووتبوو : لەوکاتەوەی کوردەکان شەڕیان هەڵگیرساندوە دژی پاوانخوازی بارزانی نزیکەی ١٧,٠٠٠ هەزار کەسیان گواستویانەتەوە بۆئێران و ٣,٠٠٠ هەزار بۆ تورکیا ، شەڕەکە بەسەرکەوتنی بارزانی تەواوبوو ، لەڕاستیدا سەرکەوتنەکەی ئەو سەرکەوتنی شیوعیەت بوو.

ئەمە هەمان هەڵسەنگاندنی ئیسرائیلیەکان بوو بۆمەسەلەکە ، "یوسف هۆدس" یەکێ لەلێپرسراوانی پۆلی خۆرهەلاتی ناوەڕاست لەوەزارەتی دەرەوە پێی باش بو بارزانی بە سەرکردەکوردەکەی لایەنگری سۆڤیەت بناسرێت کە تەمای سەربەخۆیی بۆ کوردستان هەیە.

ڕۆژهەلاتناسی سیاسەتمەتدار "شەمعۆنی" دەڵێت : سەرەڕای ئەو هاوکاری و لایەنگرییەی کەیەکێتی سۆڤیەت پێشکەشی کوردەکانی دەکرد ، بەلام سورن لەسەرئەوەی هیچ لێدوانێك نەدەن لەسەر پەیوەندیەکانیان لەگەڵ عێراق ، جێی باسە دواتر یەکێتی سۆڤیەت هاوکاری ماددی لەکوردەکان بڕی.

لە٩ی حوزەیرانی ١٩٥٩ "هۆدس" نامەیەکی نارد بۆنوێنەری ئیسرائیل لەتورکیا و دەڵێت : "عبدالکریم قاسم" هیچ یارمەتیەك پێشکەشی کوردەکان ناکات سەبارەت بەکوردستانی سەربەخۆ ، بارزانی بەتەواوەتی ئەوە دەزانێت و تێگەیەنراوە بەلام ئەوەی چاوەڕێی دەکات و ئومیدی هەیە ئەومیە کە "قاسم"

وەفای بۆبەڵێنەکانی هەبێت و پاپەندبێت بەڕێزگرتن لەمافەکانی کورد و دەسەلاتی ئۆتۆنۆمیان بداتێ.

لەکۆنگرەی نهێنی قوتابیانی کورد لەئەورووپا کە لە "ڤیەننا" بەسرا لە ماوەی نێوان ٢٣ و ٢٥ی تەممووزی ١٩٥٩ نامەیەك بۆئامادەبوان خوێنرایەوە کەبارزانی ناردبوی و خۆی بەسەربازی دڵسۆزی "عبدالکریم قاسم" ناوبردبوو کەخەبات دەکات بەهاوکاری ئەو لە پێناودامەزراندنی کۆمارێکی عەرەبی - کوردی ، هەمان کۆنگرە داوای لە سەرکردەکانی ئێران و سوریا وتورکیا کرد کەهەمان هەنگاوی "عبدالکریم قاسم" وەرگرن و هەل ببەخشن بەو کوردانەی کە لەخاکەکەیاندا دەژین ، مافی خۆیان بۆخۆیان دیاری بکەن.

"بن دەیڤید" ناردی بۆ ئەو کۆنگرەیە تا بەدرخان ببینێت ، چونکە دەیزانی کە لەبینینی بارزانی گەڕاوەتەوە ، و بارزانی پێی وتوە کە ئیسرائیلیەکان ئامادەبون ویستگەیەکی گەیاندن و یارمەتی پزیشکی بە کوردەکان بدەن، وە ئەو[1] زۆر توڕە بوە کە ئیسرائیلیەکان ڕاستەوخۆ بە خۆیان نەوتوە ، "بن دەیڤید" بەهانەی بەوەهێنایەوە زۆر هۆکار هەن کە وادەکەن لەگەڵ زۆر لایەندا کاربکەن و زۆر پێگەشیان هەبێت ، بڕیار دەدات خەلاتی بەدرخان بکات بە ڕێکخستنی دیدارێك لەنێوان ئەو و خاتوو "گۆڵدا مائیر"ی وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل کە بە گەشتێك لەئەورووپایەو لە ڕێگەیدا لە "تسیریخ" ((- لەوانەیە "زیورخ" بێت – وەرگێڕ)) لادەدات ، کارەکە ئاسان نەبوو ، لەبەرئەوەی قوتابیەکان زۆربەنهێنی هەوڵیان دەدا کە ناو و شوێن و کاتی کۆبونەوەکە ئاشکرا نەبێت ، بەلام "بن دەیڤید" یەکێ لەناسیاوەکانی لەدەزگای ئاسایشی گشتی ئیسرائیل ڕێکخست تابچێت بۆئەوێ و پاش زنجیرەیەك گەڕان و هەوڵدان لەهەمان شەودا "بن دەیڤید" و

---

[1] مەبەست پێ دەچێت بەدرخان بێت (وەرگێر)

بەدرخان لەقاوەخانەیەکی "ڤییەننا" بەیەکەوەبوون و لەبەیانی ڕۆژی دواتردا بەهەمان فرۆکەو هەریەکەی لە جێگایەك سەفەریان کرد بۆ"تسیریخ".
وەزیری دەرەوە لەخانووی ژمارە ٣٦ دابەزی بوو لەیەکێ لەشەقامە تەسکەکان لەگەڕەکێکی زۆرخۆش کە لەداری گرانبەها دروستکرابوو ، چواردەوری بەباخچەی جوان دەورەدرابوو : کاتێك بەقادرمەکاندا سەرکەوتین "گۆڵدا"مان بینی لەبەردەرگا ڕاوەستاوە و چاوەڕێمانە ، زۆر بەگەرمی و خۆشەویستیەوە پێشوازی کردین ، هەر لەچرکەساتی یەکەمەوە نزیکییەکی زۆر لەنێوان ئەودوانەدا بەدەرکەوت.
گۆڵدا ووتی : زۆرم لەبارەتانەوە بیستوە خاوەنشکۆ ، من ئاگادارم لەهەموو ئەو شتانەی کەدەگونجێت بکرێت بۆمەسەلەی کورد ، دڵنیات دەکەمەوە کە لەنزیکەوە ئاگاداربووم لە سەرهەڵدانی کوردەکان و لەهەمووکارەکانی تۆ ، گۆڵدا داوای لەبەدرخان کرد چی دەوێت بیڵێت ، بەڵام ئەوەی بیرخستەوە کەئێمە گەلێکی بچوکین کەکێشەی زۆرمان ڕوبەڕووبووەتەوە و ئەو یارمەتیانەی کەدەکرێ پێشکەشی بکەین سنورداره.
بەدرخان بەئەنقەست بیروبۆچونەکانی خۆی لەبەردەم (گۆڵدا مائیر) خستە ڕوو کە ئەو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نوێیەکەی کەهەوڵی بۆدەدات کەهەمو کەمینەکان تێیدا بە پێکەوە دەژین بە ئاشتی و ڕێزەوە دەژین بەبێ ئەوەی هیچ دەوڵەتێك دەست بخاتە کاروباری دەوڵەتێکی ترەوە ، و باسی سەروەتی سروشتی ناوچەکەی کرد و سەبارەت بەئیمکانیەتی کۆکردنەوە لەنێوان زانستی جولەکەو کارامەیی دەستی دانیشتوانی ناوچەکە ، لە کۆتایی ڕونکردنەوەکانیدا سڵاو و ڕێزی مەلامستەفا بارزانی پێ گەیاند بەهۆی پەیوەندی نێوان هەردوو گەلەکەوە.
"بن دەیڤید" دەڵێت ڕوخساری (گۆڵدا مائیر) دۆش داماو هیچ باسی لە پەیوەندی لەگەڵ بارزانی نەکرد تەنها وتی : خەڵکانێك هەن کەگرنگی بەپەیوەندییەکە دەدەن، وەمن دڵنیام کە ڕاستگۆیی بەردەوام دەبێت وە بەڵێنی دا کەلێکۆڵینەوە

لەوبیرۆکانە بکات کەسەبارەت بەپێشکەش کردنی هاوکاری لەسەرئاستی ڕاگەیاندن و میدیا بەشێوەیەکی ئەرێنی و لەسەرئاستی ڕۆشنبیریش خرابوونەڕوو ، و کارکردن بۆ بەرەوپێشچونی ئەو لایەنە بە ئەو پەڕی توانا کەدەگونجێت بکرێت.

کاتێك ئەو دوانە لەماڵەکە دەچنەدەر بەدرخان بە "بن دەیڤید" دەڵێت: وا هەستم کرد لەماڵەکەی خۆمدام دەتوانم هەرشتێکم بوێت بیخەمەڕوو ، هەستم بەو لێکتێگەیشتنە کرد کەدەکرێت دروست ببێت لەنێوان ڕۆڵەی ئەوگەلانەدا کە لەمانای چەوسانەوە تێدەگەن".

بن دەیڤید دەڵێت : لەومبەدوا بەدرخان ئاگادارنەبوو سەبارەت بەهیچ زانیارییەك لەسەر ئەو یارمەتیانەی پێشکەشی کوردەکان دەکرا ، بەڵام بەردەوام بوولەناردنی ڕاپۆرتەکانی دەربارەی ئەوەی دەیزانی و لە سەرچاوەکانیەوە وەریدەگرت ، سەبارەت بەوەی لەکوردستانی عێراقدا دەگوزەرێت.

لەوماوەیەدا خەونی کوردەکان بەباچوو بەوەی کەوایاندەزانی عبدالکریم قاسم بەلگەو گرەنتیە بۆئەوان ، ئەو خەونانەی کە لەژێر قسەو وتەی پڕگوڵی قاسم دا دیوبیان نەما ، ئەومبوو "قاسم" بەنهێنی کاریدەکرد بۆنانەوەی ئاژاوە لەنێوان ڕیزەکانیاندا و بەشەڕدانیان لەگەڵ بارزانی.

لەڕاپۆرتێکدا کە لەبەدرخانەوە بەوەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل گەیشتوە : "عبدالکریم قاسم" پارەی داوە بە سێ هۆزی دوژمنی بارزانی تاهێرش بکەنەسەر ئەوگوندانەی کە لایەنگری ئەوی لێن ، بەو ڕێگەیە لەسەرکردەیی ئەو کەم بکەنەوە.

"عیسا سۆبار" یەکێ لە فەرماندەی هەرێمەکانی هێزەکەی بارزانی دەڵێت : (( لەتوندترین لایەنگرانی قاسم بوین ، بەڵام ئەو گەورەترین هەڵەی کرد بەهاندان و بەشەڕدانی هۆزەکوردیەکان لەدژی یەکتر)).

پاشان قاسم گورزی دووەمی خۆی لەپارتی دیموکراتی کوردستان وەشاند کە لەساڵی ١٩٤٦ دامەزراوە وە چوارچێوەیەکی ڕێکخراوەیی و ئاراستەیەکی ئایدۆلۆژی و سیاسی بەکوردە ناسیۆنالیستەکان بەخشیوە ، بەرنامەی ئەو حیزبە گۆڕانکاری زۆری بەخۆوە دیوە هەر لەداواکاری سەربەخۆیی تەواوە بۆ کوردستان تا دانانی عێراق بەووڵاتیکی دوونەتەوە بۆ کورد و عەرەب، تا وازهێنان و ویستنی ئۆتۆنۆمیی ، بەڵام قاسم تەنانەت بەئۆتۆنۆمیش ڕازی نەبوو.

یەکەم هەنگاوی قاسم دژی ئەو حیزبە خۆی لەخستنەڕوی لیستێك تۆمەت لەسەر "ئیبراهیم ئەحمەد"ی سکرتێری ئەو حیزبە دەبینێتەوە بەتۆمەتی هاندانی ڕقابەرایەتی ، ڕقەبەرایەتی مەبەستی لە بڵاوکردنەوەی ئەو وتارەبوو کە "عیسمەت شەریف وانلی" کە یەکێ لە چالاکوانە کوردەکانە لەئەوروپا لەبەردەم کۆنگرەی خوێندکارانی ئەوروپادا دابووی کە لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٦٠ لەبەغداد ڕێکخرا.

هەواڵێکی تر بڵاو بویەوە کە "ئیبراهیم ئەحمەد" تۆمەتبارە بەکوشتنی دژە سیاسیە کوردەکانی ئەمەش وای لێ کرد خۆی بشارێتەوە و دەست بکات بەکاری نهینی و زۆربەی سەرکردەکانی تریش چاویان لەوکرد ، پاش ئەوەی لەهەڵمەتی دەستگیرکردن ڕزگاریان بوو، لەهەمان کاتدا حکومەت ڕۆژنامە کوردیەکانی یەك لە دوای یەك داخستن ، وە ئەو ڕۆژنامەنوسانەی کە بەئاراستەی حکومەت کاریان دەکرد ، بانگەشەی بیرۆکەی تیکەڵکردنی کورد و عەرەبیان دەکرد.

وە لەو ڕاپۆرتە هەواڵگرییەی لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٦١ گەیشتۆتە وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل وتراوە : قاسم و وەزیرەکانی بەدەستێکی ئاسنین دەستیان بەسەر عێراقدا گرتوە ، ئەوان شەوانە کاردەکەن لە ترسی تیرۆر کردن ، قاسم لەقەڵای نوسینگەی وەزارەت خۆی پەناداوەو فەرمانی دەرکردوە بەڕوخاندنی هەمووبیناکانی چواردەوری ، هەموو جەماوەری عێراقی لە دژیەتی ، بەڵام هاوپەیمانەکانی ئەوانەن کە لە لەسێدارەدران دەترسن ئەگەر هاوکاری نەکەن یان

ئەوانەن کە لەوە دەترسن لە سێدارەبدرین ئەگەر قاسم بڕوخێت ، ئەوکاتە نوکتەیەکی عێراقی هەبوو دەیگوت: ((ئەوانەی کە لەسەردەمی قاسم دا دەستگیر نەکرابون ، شەرمیان لەخۆ دەکرد و بەوەبەهانەیان دەهێنایەوە کەشوێنی بەتاڵ نەبوە لەبەندیخانەکاند)).

ڕاپۆرتەکە زانیاری زیاتردەدات : چەند یەکەیەکی کوردی هەن کە خۆیان ڕێکخستوە لە شێوەی کۆمەڵی شەڕکەری میللی ژمارەیان هەتا ئەمڕۆ دەگاتەنزیکەی(٧٠٠)کەس کەچەکی سوکیان پێ یە حکومەت سێ کەتیبەی سوپای ناردوە بۆ شەڕکردن لە گەڵیان و لەناوبردنیان ، بەڵام کوردەکان چەند دەستڕێژێکی سوکیان کردوەو هەڵهاتون ، کۆدەنگیەك هەیە لەناوکوردەکاندا ، سەبارەت بەپێویستی دەستکردن بە پرۆسەی سەربازی کەپێدەچێت لەهاوینی ئەمساڵدا دەست پێبکات ، ئامانجی ئەم یاخیبوونە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان دەبێت لەناو سنوری عێراق یان لەوانەیە یەکگرتن لەگەڵی لەسەر ئەو سنورە هەریمایەتیە.

وە لەڕاپۆرتێکی هەواڵگری تردا کەکۆتایی ساڵی ١٩٦١ نێردراوە هاتووە : مەلا مستەفا ڕوی کردۆتە بارزان تا چالاکی و کاری چڕوپڕ دەست پێ بکات لەوێ و جەبهەیەك لەلایەنگرانی لەوێ دروست بکات ، پەیوەندی لەنێوان پیاوەگانی و دژەکانیدا دەستی پێکردوە، ژمارەیەکی زۆر چەك بەسەر ناوچە کوردیەکاندا دابەش دەکرێت ، باوەڕێك هەیە لە ناو کوردەکاندا کە مەلا مستەفا تاکە کەسە بتوانێت سەرکردایەتی خەباتەکەیان بکات.

* * *

"عبدالکریم قاسم" لەهەندێ باردا هەوڵیداوە بەسەربارزانی دا سەربکەوێت بەڵام بە لێدان نا ، بەڵکو بە پێشکەشکردنی دورگەیەك وەك ئەوەی لە هاوینی ١٩٦١ دا ڕوی دا ، بارزانی لەو بارەیەوە بە "شمیدت"ی نێردراوی ڕۆژنامەی "نیۆرك تایمز" دەڵێت : داوای لێ کردم بگەڕێمەوە ناوحکومەت وە ئەگەر ئەوەبکەم ئەوا

لێم خۆش دەبێت و لەهەموو شتێکم دەبورێت و منیش وەڵامم دایەوە کە ئەوە تۆ نیت کە لەمن ببوریت بەڵکو تۆ تاوانباری یەکەمیت.

هەرلەهەمان ئەو ڕۆژانەدا "یەهودا بن دەیڤید" هاوڕێ کۆنەکەی بەدرخان سەری لەپاریس دا کەماوەی سێ مانگ بوو وەك باڵوێزی ئیسرائیل لەکۆماری "مالی" ئەفریقایی کاری دەکرد ، لەگەڵ بەدرخان کۆبوەوە و ڕاپۆرتێکی لێومبیست سەبارەت بەڕەوشی کوردستانی عێراق ، نوێنەری بارزانی لەئەوروپا دەڵێت : بارزانی کۆنترۆڵی چیاکانی کردووە، سوپای عێراقی ناتوانێت بێتەئەو ناوچانەوە ، بارزانی چاکسازی لەڕیزەکانی کورددا کردوە، چونکە هەمیشە لەوڕیزانەدا کەسانێك هەیە کەئامادەی ملکەچبوونن بۆدەسەڵات لەبەرامبەر دەستکەوتێکی ماددی یان بەشدارییان لەدەسەڵات.

لەو نامەیەدا کە بن دەیڤید ناردویەتی بۆ پۆلی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەوەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل هاتووە دەڵی : سێ یان شەش مانگی داهاتوو یەکلاکەرەوە دەبێت ، یارمەتیدانی ئیسرائیل بۆ ئەوان بە تایبەتیش لەڕێگەی هەڵمەتی بانگەشەوە لەئەمریکا و ڕۆژئاوا ، پاڵپشتێکی گەورەدەبێت بۆئەوان ، گرنگ ئەوەیە ڕێگەخۆش بکەن تا دەستمان بەڕۆژنامەی گەورەو گرنگ ڕابگات.

بەدرخان بە"بن دەیڤید"یشی گوتبوو، کەپەیوەندیەکانی بەنوێنەری ئاژانسی هەواڵگری نێوەندی ئەمریکی یەوە هێشتا بەردەوامە و هەوڵی لەگەڵیداداوە بۆ ئەگەری توانای گەشتکردنی بۆ نیۆرك و ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان و کۆبونەوە لەگەڵ سەرۆك "جۆن کەنەدی" لەهەمان کاتدا بەدرخان بەردەوام بوو لەپەیوەندیەکانی لەگەڵ شای ئێران کەهەمو هەستەوەرەکانی خۆی خستبوە گەڕ بۆ تێگەیشتن لەوگۆڕانکاریانەی کە "عبدالکریم قاسم" بەدوای خۆیدادەیهێنێت بەئاراستەی یەکێتی سۆڤیەت ، وە بەدرخان وتبووی کە پێی وایە ژەنەراڵ "فەقرەفانی" جێگرەوەی "بەختیار" هەوڵی داوە کە وەك هۆکارێك بەکاری بهێنیت بۆ

زیانگەیاندن بەرژێمی عێراقی و هیچ ئاماژەیەك لەبەردەستدا نیە کە وەڵامیکی دروست و جوانی بەرامبەر داواکاری کوردەکان هەبێت بۆ نومنە بە کردنەوەی سنورەکان و گواستنەوەی یارمەتی پێشکەشکراو بۆیان ، یان لەپێناو گۆاستنەوەی بریندارەکانیان.

لە ٩ی ئەیلولی ١٩٦١ هێزی ئاسمانی عێراقی دەستی کرد بەبۆمبارانی ناوچە کوردنشینەکان و لە١٣ای هەمان مانگ هێرشیان کردە سەر گوندی بارزان بەپشتبەستن بەزانیاری دەستکەوتوو بەوەی مەلا مستەفا لەوێیە و سوپای عێراقی ڕاهێنانەکانی فیرقەی سێی پیادەی وەستاند و سەربازەکانی نارد بۆ گەمارۆخستنەسەر چەند گوندێکی کوردی ، کوردەکانیش وەڵامی ئەو هێرشانەیان دایەوە بەهێرشکردنە سەر ناوەندەکانی پۆلیس و گەمارۆدانی بەنداوەکان وە گەمارۆخستنە سەر بۆریەکانی گەیاندن لەناوچە جۆربەجۆرەکان و لەگەڵ تەگەرەخستنە بەردەم یەکەسەربازیەکانی عێراق بە گوللەباران و هەوڵدان بۆئەوەی زۆرترین زەرەریان پێ بگات ، ئەمەش بووەهۆی ڕق هەستانی سوپای عێراقی و هەوڵدان بۆ لابردنی گەمارۆی سەربەنداوەکان بۆئەمەش هێزی زیاتر ڕەوانەی ناوچەکەکرا.

لەپۆلی هەوالگری سەربازی ئیسرائیل لێپرسراوان لەڕاپۆرتەکانیاندا تۆماریان کردوە : ئەو قۆناغە جەنگی توندوتیژی وای بەخۆیەوە دەبینی کە یاخیبوونی کوردی لەساڵی ١٩٤٦ ەوە بەخۆوەی نەبینیبوو ، کوردەکان دەیانویست سەرنجی ڕای گشتی نێودەوڵەتی ڕابکێشن لەپێناو ناچارکردنی حکومەتی عێراقی بەپایەندبون بە پەیمانەکانیەوە سەرەڕای ئەوەش بەئاشکرا دەرکەوت کەهێزەکانی بارزانی ناتوانن زۆر خۆڕابگرن لەبەرامبەر کشانی زۆری سەربازانی سوپای عێراقی هەروەها دەرکەوت بارزانی بەرگری لەمانەوەی خۆی دەکات ، لەناوبردن و ملکەچ کردنی پێویستی بەکۆششکی زۆری سوپای عێراقی هەیە ، هەروەها قەبارە و

پێوەرەکانی یاخیبوونەکە لەوانەیە ببێتەهۆی ئەوەی کەعێراقیەکان ناچاربن سازشی دیاریکراو بۆ کوردەکان بکەن، تا ئەگەر یاخیبوونەکە فەشەلیش بهێنێت.

★ ★ ★

گرنگیدانی ئیسرائیل بەوەی کە لەناوچە کوردیەکاندا چی دەگوزەرێت تارادەیەکی زۆرزیادی کرد، و لەکاتی گەڕانەوەیدا لەکوردستان بەدرخان زانیاری دەربارەی ئەو کورتهێنانە زۆرە بۆهێنایین کە شەڕکەرە کوردەکان پێوەی دەناڵێنن ، وە داوایکرد ئیسرائیل هاریکاری بەرفراوانیان بکات ب چەك و خواردەمەنی و داو و دەرمان و دکتۆر لە پێناو چارەسەرکردنی بریندارانی بۆمبارانی عێراقی ، هەروەها یارمەتی جددی لەپێناو دامەزراندنی ویستگەیەکی پەخش (ڕادیۆیەکی نوێ) و بەکاریگەری خستنە سەرهۆکارەکانی ڕاگەیاندنی نوسراو و ئەلیکترۆنی لەئەوروپا و ئەمریکا.

بەدرخان لەو ماوەدرێژەدا پەیوەندی پتەوی لەگەڵ هاوڕێ کۆنەکەی "مۆریس فیشەر"دا هەبوو کەئەوسا کرابوە باڵوێزی ئیسرائیل لە ئیتالیا ، لەوێوە فشاری زۆری خستبوە سەرهاوڕێکانی تا هانیان بدات یارمەتی پێکەش بەکوردەکان بکەن ، لەوراپۆرتەی کە "فیشەر" ناردویەتی لەشەشی تشرینی یەکەمی ١٩٦١ دا ڕوون دەبێتەوە کە حکومەتی ئیسرائیل بڕی ٢٠ هەزار دۆلاری بۆ چالاکیەکانی بەدرخان دابین کردووە ، و دەزگایەکی ڕادیۆی دیاریکراوی بەبڕی دووهەزار دۆلار کڕیوە ، وەك هەوڵدانیك بۆبەردەوامبونی پەیوەندی لەنێوان سەرکردایەتی یاخیبوون لەکوردستان و نێوەندی چالاکیەکانی کورد لە ئەوروپای ڕۆژئاوا.

بەدرخان پێی وابوو یاخیبوونی بارزانی لەکاتێکی گونجاودا نەبوە ، سەرەڕای ئەوەش بەهەموو هێزێکەوە هەوڵی یارمەتی دانی دەدا، هەروەها کوردانی تریش هەبوون کە هەمان هەوڵیان داوە ، ئەوانیش بەهەمانشێوە ڕوویان لە ئیسرائیل کردوە ، یەکێ لەوانە"ڕەشید عارف" بووە کەئەندازیارێکی دەوڵەمەند بووە ،و خاوەنی کۆمپانیایەکی بیناکاری بووە لەعێراق و هاوبەشەکەی جولەکەیەك بووە ، لەوانەیە بەوهۆیەوە بووبێت کە داوای لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل کردووە لە

لەندەن لەپێناو وەرگرتنی یارمەتی ، بالۆیزخانە داواکاریەکەی نارد بۆ "مۆساد" کەئەویش ڕایگەیاند ئەو کەسە پێشتر ناسراوە لایان ، پێشتر داوای هاوکاریکردوە بەناوی مستەفا بارزانیەوە بەلأم بەرلەوەی یارمەتی پێ بگات خۆی وون کردووە، ئەو درۆزنێکە لەپێستی ڕۆشنبیرێکدا ، وە "مۆساد" متمانەی پێی نیە ، بەلأم بەتێڕوانینی ئەوەی کە "عارف" لەبەلگەنامەی کوردەکاندا بەکەسێك ناوی تۆمارکراوە کە یارمەتی پێشکەش کردووە بۆسەرمایەدان بە"رابیتەی ڤوتابیانی کورد لە ئەوروپا"کە داوای سەربەخۆیی کوردستان و چالاکی ڕۆشنبیری تریان دەکرد ، مۆساد ناچار بوو بەڕێزەوە دەستی لێ بشوات.

ئەوەبوو بەبالۆیزخانەی ڕاگەیاند کەئیسرائیل پەیوەندی بە کەسایەتیەکی کوردی گەورەوە هەیە گومان لەوەدا نی یە کە دەبێت ڕێز لەو کەسایەتیە بگیرێت ، بەم شێوەیە چیرۆکەکە کۆتایی هات.

هەر لەوماوەیەدا بەدرخان نامەیەکی بۆ "فیشەر" نارد سەبارەت بە "پیتەر ڕیکلد" کە ڕۆژنامەنوسێکی "نەمسا"یە لەڕۆژنامەی "فری هید" کار دەکات و خۆی بەئیسرائیلی ناساندوە، و دەتوانێت کاروباری سەفەر بۆچالاکوانی کورد "دکتۆر ڕەواندزی"و یەکێ لەهاورێکانی ڕێکبخات بۆئیسرائیل.

لە١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٦١ (مۆساد) وەلأمی دایەوە : "ڕێتلد" ئیسرائیلی نیە بەلکو جولەکەیەکە و بۆتە گاور ، و ئیسرائیل دکتۆر "ڕەواندزی" ناناسێت، بەلأم هەرزوو دەرکەوت کە"دکتۆر ڕەواندزی" کەسایەتیەکی دروست کراو نیە ، بەلکو ئەندازیارێکە لە"بەرلینی ڕۆژئاوا" دادەنیشێت و یەکێکە لەئەندامانی لیژنەی نوێی ڕابیتەی ڤوتابیانی کورد لە ئەوروپا ، و ناوی تەواوی "سەعدی ئەمین وریا ڕەواندزی"ە بەناوی شوێنی لەدایکبونیەوە "ڕەواندز" و زاوای "ئیبراهیم ئەحمەد" سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردە ، وە "ئیبراهیم ئەحمەد"یش یەکێکیترە لەوانەی بەهەمان مەبەست پەیوەندیکردوە بە ئیسرائیلەوە ، ئەمە جگە لەچالاکوانێکی کوردی تر کەپێشتر باسکرا "عیسمەت وانلی" کەخەریکی

خوێندنی پارێزەری بوو بۆماوەی ١٢ ساڵ لە"لۆزان"ی سویسرا خەریکی ئەو پیشەیە بوو و سەرۆکی رابیتەی قوتابیانی کوردی دەکرد لە ئەوروپا ، و سەرۆکایەتی رێکخراویکی خۆبەخشانەی دەکرد بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی بۆگەلی کورد ، لەئەیلولیی ١٩٦١ دا بەداخوازی خۆی لەگەڵ چەند کەسایەتیەك لە باڵوێزخانەی ئیسرائیل کۆبوەوەو، وە پلانیکی بۆ خستنەڕوو سەبارەت بە هاریکاری ئیسرائیل و کورد لەبواری میدیادا ،و وتی پەیوەندی بە چەند رێکخراوێکەوە هەیە لەکوردستانی عێراق و دەزانێت کەچۆن چەکیان پێ دەگەیەنێت.

★ ★ ★

لە ١١ای کانونی یەکەمی ١٩٦١ بەدرخان نامەیەکی نارد بۆ"مۆریس فیشەر" لەسەر ئەوزانیاریانەی کە بەدەستی گەیشتبوو ، تیایدا هاتبو پرۆسەی جەنگی ڕوبەڕوو لەکوردستانی عێراق بەردەوامە کەزەرەری زۆر گەورەی بەسوپای عێراق گەیاندوە ، و ناچاری کردوە زۆر شوێن چۆڵ بکات ، ئەویارمەتیانەی لەکوردە مەسیحیەکانەوە گەیشتون بەکوردەکان زۆر کاریگەر بوون ، سوپای عێراقی هەستاوە بە لەسەرکارلادانی سەرکردەی هێزی ئاسمانی کە بەلایەنگری کوردەکان ناسرابوو و گۆڕیویەتی بەئەفسەرێکی تر بە پلەی عقید کە یەکێکە لە سەرسەخترین دوژمنەکانی کورد .

لە ١٧ی کانونی یەکەم "عبدالکریم قاسم" یەکێك لە ئەفسەرانی خۆی بەناوی "حسن عەبود" نارد بۆلای بارزانی ، بارزانی بۆ "شمیدت"ی گێڕابویەوە : ئەو ئەفسەرە لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی تردا هاتن بۆلام ئەم پەیامەیان پێ بوو : بەبارزانی بڵێ ئێمە براین، ئەگەر دژمان نەجەنگێت ئەوا بەپێی مەرج ئامادەین لەگەڵی ڕێك بکەوین ، "عەبود" پێشنیاری لێبوردنی گشتی بۆکوردەکان دەکرد ، مستەفا بارزانی هەمیشە ئامادەبوو ، بۆلێکۆڵینەوە لەهەموو پێشنیارێك سەرەڕای ئەوەش لەسە بنەمای "ڕێزی بگرەو هۆشیاریش بەو لێ بترسێ" کاری دەکرد ،

فەرمانی کرد بەوەی بەنهێنی ئۆتۆمبیلەکەی "عەبود" بپشکنن ، ئەوەبوو ئامێرێکی پەیوەندی ڕاستەوخۆیان تێدادۆزیەوە ، کە تایبەت بو بەدیاریکردنی شوێنی بارزانی تا دواتر هێرش بکرێتەسەری ، بارزانی بە عەبودی وت: " من هیچ تاوانیکم نەکردوە بەڵکو ئێوە تاوانبارن ئایا دەگونجێت پیشنیاری ئەوە بکەن کە لێم خۆش بن وازم لێ بێنن لە کاتێکدا من ناتوانم لێتان خۆش بم نا ..... ئێمە نامانەوێت بتان بەخشین.

هەرچەندە ئەمە هەوڵێك بوو بۆپیشاندانی هێز بەڵام لەسەر هیچ بنەمایەکی ڕاستەقینە نەبوو ، سەرەڕای هەموو ئەو ئامادەکاریانەش کە بارزانی کردبووی بۆ ئەگەری بەردەوامی یاخیبوونەکە ، بەڵام بارزانی خۆی لە بارودۆخیکدا دەبینێتەوە کەئیرەیی پێ نابرێت ، دەتوانین پەی بەخراپی ئەوگوزەرانە ببەین لەو نامەیەدا کە"عوزی نەرگیس" باڵوێزی ئیسرائیل لەپاریس ناردویەتی سەبارەت بەدیداری لەگەڵ بەدرخان لە ٧ی ئایاری ١٩٦٢ کەدەڵێت " وشەکانی لەدڵەوە بۆدڵ دەرچون ، ئەمەجگە لەئەو باوەڕەی کەبۆدامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ هەیەتی کەهەرگیز ڕاڕانابێت بەڵام هیچ بنەمایەکی ڕاستەقینەی بەدەستەوە نیە تاپشتی پێ ببەسترێت ، ئەو پێی وابوو ئیسرائیل تاکە لایەنە لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا کەبتوانێت دەستی یارمەتی درێژبکات بۆبەدیهێنانی خەونەکەی ، هەمیشە پەرێشان بوو ، کەیارمەتیەکانمان بەفراوانی پێشکەش ناکەین بۆیان ، دەیگوت ئێمە براین و کێشەکانمان هاوشێوەن بۆچی بەپەرۆشییەوە هاوکاریمان ناکەن، ئەو داوای هاوکاری بەچەك و ڕاوێژکاری و دارایی دەکرد ، هەروەها بە پەخشی میدیایی بۆ جیهانی عەرەبی ، بەڕاستی من نەمتوانی بەپێی بیروڕای خۆم وەڵامی بدەمەوە ، بۆیە داواکارییەکە دەگوێزمەوە بۆ ئێوەو پێم باشە کاربکرێت تا دان بەخۆیدا بگرێت وە تێبگەیەنرێت کە ئێمە ناتوانین هەموو ئەوکارانەبکەین کەدەمانەوێت بیکەین.

لەدیدارەکەدا "بەدرخان"دڵنیایی داوە کەکاردەکات بەتەنسیق لەگەڵ سەرکردەی یاخی بون مەلا مستەفا بارزانی و بارزانی سەرپشکی کردوە لەداواکردنی یارمەتی لەئیسرائیل و مەسەلەی ڕاهێنانی شەش سەرکردەی کورد لەئیسرائیل ڕێك بخات و ووتی کوردەکان لەدەنگی ئیسرائیل بە زمانی عەرەبی چەند راپۆرتیکیان گوێ لێبووە سەبارەت بەخەباتەکەیان ، داوای کرد ئەوجۆرە ڕاپۆرتانە زیادبکەین.

لەونامەیەدا کە "نەرگیس" ناردویەتی بۆ سەرۆکی هەواڵگری سەربازی "مائیر عەمیت" دەڵێت: "گەلی ئیسرائیل ئامادەنەبوو تێ بگات کە بۆچی یارمەتی پیشکەش بەکوردەکان ناکرێت لەسەرخەباتیان دژی عەرەب ، بۆیەدەبێت بەشێوەیەکی عەقلانی لەگەڵ کەمینەی کورد هەڵسوکەوت بکەن ، ئەمەش ئەرکێکی ئەخلاقیە.

"نەرگیس" پێشنیاریکرد وەڵامی داخوازیەکانی بەدرخان بدرێتەوە بەوەی وتی: داخوازیەداواکراوەکان زۆرکەمە لەچاو ئەو ئامادەکاریانەی کەکوردەکان دەیکەن بۆدەستکەوتێکی کردەیی تازستانی داهاتوو ، ئامانجی سەرەکیان دەستکەوتنی ئۆتۆنۆمیە بۆکوردستان ، و دروست کردنی سوپایەکی کوردییە بۆپاراستنی ئۆتۆنۆمیی کەخۆی لەقەرەی بیست هەزار سەرباز دەدات ، و ڕێگەنەدرێت بەسوپای عێراقی بێتە ناوچەی ئۆتۆنۆم بەهیچ شێوەیەك" ، پاش ماوەیەکی کەم "عەوزی نەرکیس" وەك پاشکۆی سەربازی لە ئیسرائیل لە پاریس گوازرایەوە پەیوەندی لەگەڵ بەدرخانیش سپێردرا بەجێگرەوەکەی .

★ ★ ★ ★ ★ ★

لە ٢٣ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٢ سەرکردەی هێزەکانی عێراق لە کەرکوك نامەیەکی نارد بۆمەلا مستەفا و داوای لێکرد بۆکۆبوونەوە لە کاتوشوێنی دیاریکراودا سەبارەت بەئاگربەست ، بارزانی دواتر ووتبوی ........ نەچوم چونکە زانیم ئەم بانگەوازە تەڵەیەکە هەمان شت بە کردار ڕویدا ، فڕۆکەکانی عێراقی شوێنی

کۆبونەوەکەیان بۆردومان کرد هەرلەبەیانیەوە تاشەو سەرەڕای ئەوەش بارزانی دەرگاکەی بەیەکجاری دانەخست وتبوی : سێ مەرجم هەیە بۆ ئاگر بڕ :

- کشانەوەی هەمو هێزەکانی عێراق لەکوردستان
- ئازاد کردنی هەموو بەندکراوە سیاسیەکان
- چەکداماڵینی هەموو یەکەکانی جاشەکان

بەڵام هیچکام لەم مەرجانە قبوڵ نەکران ، هەمو ئەو پێشنیارانەی کە "عبدالکریم قاسم" لەکۆتایی هاوینی ۱۹٦۱دا تاکانونی یەکەمی ۱۹٦۱ کردنی داو و تەڵەکە بون ، هیچ لەوانە ڕاستگۆیانەو نیەتی باش نەبون ،

---

دەبێت بارزانی چی ویستبێت؟ ، "شمیدت" لەوکتیبەدا کەساڵی ۱۹٦٤ لەسەر گەشتە ڕۆژنامەوانیەکەی بۆکوردستان بلاویکردەوە بەناوی "گەشتێك بە ناوەندەکانی پیاوە ئازاکاندا" دەڵێت: بارزانی پێی وتم ئێمە "سەربەخۆیی"مان بەمانای ووشە ناوێت سەرەڕای چەندبارەبوونەوەی ئەو زاراوەیە ، ئەو درك بەوڕاستیە دەکات کە دەبێت کورد لەگەڵ عێراقیەکاندا بژی ، بۆیە ئەوداوای مافی ئۆتۆنۆمیی دەکات ، دەسەلاتێکی لۆکاڵی لە چوارچێوەی کۆماری عێراقدا ، بەجۆرێك براکوردەکان بتوانن وەك کورد بژین و بەزمانی خۆیان بدوێن و پۆشاکە نیشتمانیەکانیان بپۆشن و پەرەبە شارستانیەتیەکەیان بدەن، بەکورتی بتوانن خۆیان بن ، هەموو گەلێك لەسەر ئەم زەوییە مافگەلێکی هەیە نابێت ئەم مافانە لەئێمە زەوت بکرێت .

لەمانگی ئابدا بارزانی لە "شمیدت" دەپرسێت دەربارەی ئەگەری ئەوەی کە ئایا ئەمریکا دەتوانێت هاوکاری کورد بکات ، وەڵامەکە نەرێنی بوو ، "شمیدت"ی زۆرزان ئەو هاوپەیمانیەتیەی بیر بارزانی هێنایەوە کە تورکیا و ئێران و پاکستانی کۆکردۆتەوە لەدژی سۆڤیەت لەستراتیژی جیهانیدا هەمان ئەو کارەی کەئەمریکا ئەنجامی دەدات ،بۆیە تورك و ئێرانیەکان ئەو هاوکارییەی ئەمریکا بۆ کورد وەك خیانەت دەدەنە قەڵەم و لەهاوپەیمانیەتیەکە دەکشێنەوە ، گومان لەوەدا نیە کە ئەمریکیەکان ناهێڵن کاربگاتە ئەوڕادەیەو پشت لەکوردەکان دەکەن.

بەڵام بارزانی پێی وابوو کەدەکرێت ئەوەڕووبدات و دەیگوت: لەوانەیە بتوانرێت هاوکاریەکان بەچەك وتەقەمەنی بەنهینی بکرێت کە ڕاستەوخۆ بێتەخاڵی سنوری ئێرانی لەشارۆچکەی "خانێ" لەوێشەوە بگوازرێتەوە بۆ کوردستانی عێراق ، ئەگەر ئەوە نەتوانرێت دەتوانن بە پارە هاوکاریمان بکەن، ئێستا هاوکاریمان بکەن ، هەرکاتێك ویستتان دەستی هاوکاری دەبین بۆئێوە ، هاوکارمان بن بەچەك یان خواردەمەنی کەل و پەل یان پارە بەئاشکرا بێت یان بەنهێنی یارمەتیمان بدەن بە سەر"قاسم"دا سەربکەوین ، وادەکەین کە عێراق یەکێ لەگەورەترین هاوپەیمانەکانتان بێت لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا نەکوردەکان بەتەنها وە نەئێرانیەکان و تورکەکان دەتوانن ڕێگربن لەبەرەوپێشچونی سۆڤیەت لەخۆرهەڵاتی ناڤیندا ، ئەوان لەچیاکانی قەوقازەوە دێن لەکاتی جەنگدا پێویستیان بە ئێمە دەبێت ناتوانن ڕێگە بەخۆتان بدەن کە پشت لە ئێمە بکەن، سەرکەوتنی کورد حاشا هەڵنەگرە یارمەتیەکانی ئێوە تەنها فراوان و خێرای دەکات ، ئەگەر مەرجی ئەمریکا بۆ هاوکاری کردنمان دەست تێوەرنەدان بێت لەکاروباری تورکیا و ئێران ئەوە ئێمە ئامادەین سوێند بخۆین ، بەڵام ئەگەر هاوکاریمان پێشکەش نەکەن ، ئەوا سزاکان قورس دەبن ، بەهەمانشێوە ئەگەر ئەمریکیەکان بەردەوام بن لەبەرژەوەندی خۆیان و ئێران تورکیا بەبێ ئەوەی بەرژەوەندی ئێمە بەهەند وەربگرن ، ئەمریکیەکان تەنانەت بۆ یەکجاریش نەیان

پرسیوه بۆچی هەزارەها پیاوی ئێمە لەزیندانەکان توند دەکرێن یان بۆچی دانەوێڵەکانمان بەهۆی بۆمبارانی عێراقیەوە دەسوتێت ، وە ئەو پێویستیە پزیشکیانە چین کە ئێمە پێمان دەوێ، ئەوان ناچارمان دەکەن کەیارمەتی لەشیوعیەکان قبوڵ بکەین .
وشەکانی بارزانی پەیامێکی نهینی لەخۆ گرتبوو بۆ کوردەکانی ئێران تورکیا وەك ئەوەی پێیان بڵێت ئیستا بەهێمنی دابنیشن ، بەزویی ڕۆژی ئێوەش دێت کاتێك مافی ئۆتۆنۆمی بەکوردانی عێراق دەدرێت ئەو کات ئاسان دەبێت بۆ ئیوە کە داوای ئەو مافە لەودوو دەوڵەتە بکەن.
"شمیدت" مەلا مستەفای بارزانی بەم جۆرە وەسف دەکات : ( ئەو هێمای شۆڕش و عەقڵی جێبەجێکاریەتی سەرکردەی سەربازی و سیاسیەتی ، دڵ و عەقڵیەتی جێبەجێکاریەتی ، پیاوێکی زۆر خۆشەویست و لەهەمان کاتدا زۆر تۆقێنەریشە لە ناوکوردەکان دا.
ئەم وەسفە قبوڵ کراو بوو لای هەموو ئەو ڕۆژنامە نوسانەی کە نزیك بونەتەوە لەبارزانی ، یان ناسیویانە ، سادەیی هەڵسوکەوت و مامەڵەی ڕوخۆشانەی ئەویان زۆر بەدڵ بووە لەگەڵ فرت و فێڵە ڕۆژهەلاتیەکانی باوەڕی تەواویان بە بەردەوامی نیەتە باشەکانی هەبوە ، درکیان بەوە کردوە کە ئەم پیاوە هەرگیز هیچی بۆ خۆی ناوێت ، ئەو بە ڕۆژنامە نوسانی دەگوت : ژەنەراڵ نیم من تەنها مستەفام ، پلە هیچ نیە بە لامەوە من تەنها کوردێکی سادەم ، بەلام هیچ کوردێك جورئەتی نەدەکرد تەنها بە مستەفا بانگی بکات ، زۆر کەس بەدەوری بارزانیەوە بوو ، بەلام ژمارەی زۆر نزیکەکانی لە نیوان ١٢ بۆ ١٥ کەس بون ، لە نێوانیاند ئەفسەری هەلاتو لە سوپای عێراقی هەبوو ، یەکێ لەوانە مقدم "عزیز رشید عقراوی" بوو ، کەدواتر لەم کتێبەدا ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت.
"شمیدت" دەڵێت : "سوپاتی ڕێکخراوی کوردەکان دەگاتە نزیکەی (١٥ بۆ ٢٠) هەزار شەڕکەر نزیکەی ئەو ژمارەیەش یەدەك هەیە کە لەکاتی پێویستدا بانگ

دەکرێن ، لەهێلی پێشەوەی ڕوبەڕوبونەوەی عێراقیەکاندا نزیکەی ٥ هەزار پێشمەرگە بلاَکراوەتەوە کەپیاوانی "ڕەشەبا"ن ، بارزانی ژمارەیەکی زۆری لەمانە هەیە ، لەجەنگە قورسەکانیدا بەکاریان دەهێنێت ئەو ئەزمونانەی کە کردویانە وای لێ کردون زۆر متمانەیان بە خۆیان بێت ، سوپا ژیانیانە ئومیدەوارن لە خزمەتی سەربازیدا هەتا کۆتایی یاخی بونەکە.

شمیدت دەلێت : جەنگی پارتیزانی کەکوردەکان بەتاکتیکێکی خێرا ئەنجامی دەدەن پێویستی بەخۆڕاگری و سەرلێتێکدان و خۆشاردنەوەی زۆر هەیە ، و جولانی خێرا لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر ، سەرەڕای ئەوەی کە چەکی قورسیان کەم پێە بەلام ئەمە هۆکاریك بوە بۆ ئاسانی هاتوچۆیان بەشاخە بەرزەکان لەو ناوچە سەختانەی کە سوپای عێراقی نەیدەتوانی بیانگاتی ، گواستنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر پێویستی بەڕۆشتن بەپێ هەیە یان لەسەر پشتی ئاژەلەکان بە ئەوپەڕی ئارام و خۆڕاگریەوە.

دەربارەی شێوازی جەنگەکە یەکێ لە پێشمەرگەکان بە "شمیدت"ی وتبو : گەمارۆی دوژمن دەدەین و دەستڕێژی لێ دەکەن ، سەرەڕای ئەوە تەنها یەك ڕێرەوی بۆ دەهێلینەوە بۆ ڕاکردن ، بەلام خۆمان لەوێ حەشارداوە کاتێك دوژمن دەیەوێت پاشەکشەبکات بەو ڕێرەوەدا لە دواوە لێی دەدەین ، لەنزیکترین شوێنەوە تێکەلی دەبین بەجۆرێك کە چەکەقورسەکانی هیچ سودێکیان نامێنێت.

"شمیدت" دەلێت: شەڕکەرە کوردەکان هیچ گرنگیەکیان بەلایەنی لۆجستی نەدەدا ، ئەوان پێویستیان بەخواردنەوە یان شیرینی نەبوو ، شەڕ کەر هەرکات حەزی بکردایە پەیوەندی بکات بەشۆرشەوە بەجل و بەرگ و چەکی خۆیەوە دەهات ، بەلام بە نیسبەت خواردنەوە زۆر بە ئاسانی دەستیان دەکەوت ، کشتیارەکان باش دەیانزانی دەبیت لە ١٠٪ ی بەرهەمەکانیان بەخۆڕایی بدەن بەسوپای یاخیبووەکان ، بارزانی زۆر جەختی لەوە دەکردوە کە سەربازەکانی تا ڕادەی تێر بوون نان بخۆن ، وە خواردنەکانیش بریتی بون لە برنج و گۆشت و

پەنیری سوێر ، ئەمە جگە لەمیوەی وەك هەنجیر و كاڵەك و ترێ و قۆخ و هتد.

ئەشكەوتەكان وەك شوێنی حەوانەوە وابوون لەجێگەی سەربازگە ، كە چەك و پێداویستیەكانیان لەوێدا هەڵدەگرت ، بەڵكو پیشەسازی سەربازیشیان لەوێدا دەگرد ، زۆربەی پارمەتی كەبۆیان دەهات لە كوردە دەوڵەمەندەكان لەوڵاتانی كەنداوەوە بوو، و ئەو پارانەی كە دەستیان بە سەردا دەگرت ، بەهۆی هێرش كردنەسەر بنكەكانی پۆلیس و سەربازگەكانی سوپای عێراقی)).

**بەشی پێنجەم/ ((بۆ گفتوگۆ چوون بۆ بەغداد و لەوێ گرانە زیندانەوە))**

پەیوەندی لەنێوان هەواڵگری ئێران و ئیسرائیل لە ئەیلولی١٩٥٧ دەستی پێکرد، کاتێك "د.محمد سودریە" سکرتێری یەکەمی باڵوێزخانەی ئێران لەپاریس سەردانی ماڵی "یعقوب تصور"ی باڵوێزی ئیسرائیل لە "پاریس" کرد ، تاپێ رایگەیەنێت کە"ژەنەراڵ بەختیار" لەرێگەدایە بۆ پاریس و دەیەوێت بیبینێت.

"تصور" کە سیاسیەکی فێڵباز بوو بەها و گرنگی ئەم هەلەی دەزانی خێرا "یەعقوب کرۆز" ی سەرۆکی دەستەی مۆساد لەپاریسی لێ ئاگادار کردەوە.

"بەختیار" کوڕی "ثریا"ی ژنەتەڵاقدراوی "شا"ی ئێرانە ، پێشتر وەك سەرکردەی فیرقەی زرێپۆش کاری کردوە ، و بۆتەفەرمانرەوای سەربازی تاران ، ئەوکاتەدا وەك جێگری سەرۆکی حکومەت کاری دەکرد، بەڵام ئەرکی سەرەکی و راستەقینەی سەرۆکی دەزگای "ساواك" "ئاژانسی نیشتمانی ئێران بۆ شۆڤاری و هێمنی"بوو ، کەڕاستەوخۆ لە ژێر سەرپەرشتی شادابوو، کاتێك "بەختیار" لەگەڵ "تصور" و "کرۆز"لە ماڵی کرۆز کۆبوەوە، بەباڵای ئەو سەرکەوتنانەی هەڵدا کە سوپای ئیسرائیل لە جەنگی ساڵی ١٩٥٦ بە دەستی هێناوە ، هەروەها سەرسوڕمانی خۆی بەودەسکەوتانە دەربڕی کەئیسرائیل بەدەستی هێناوە ، سەرەڕای پاشەکشە کردنی بەهۆی فشارە نێودەوڵەتیەکانەوە .

بەختیار ئاماژەی بەخۆشحاڵی خۆیدا بەهۆی ئەو زەبرەگەورەیەی کەبەر سوپای میسری و سەرۆکەکەی "جەمال عبدالناصر" کەوت، کە شا تۆمەتباری دەکرد بەپلاندانان بۆ لەسەرکار لادانی خۆی.

ئەمە یەکەمجار نەبوو کەرژێمی ئێرانی درك بەوەبکات کەسەرکەوتنی ئیسرائیل بەسەرعەرەبدا سودی بۆئەوان هەیە، هەرچەندە لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٤٧ ئێران دژی بەدەوڵەتبونی ئیسرائیل دەنگی دا، بەڵام ئەو جەنگانەی ڕویان دا وایان کرد کە شا بەبیرکردنەوەکانیدا بچێتەوە.

ئیسرائیل بەشێك لەڕقەبەرایەتی عەرەبی لەكۆڵ كردبوەوە و بەشێك لەڕقی عەرەبی لەئێران هەڵمژی بوو، و هەروەها ئەو فشارانەی دەكرانە سەری كەم كردبوەوە، هەروەها ئەوسەركەوتنەی كەئیسرائیل بەدەستی هێنابوو ، گورزێكی گەورەو توندی لەكەرامەت و پێگەی وڵاتە عەرەبیەكان دابوو ، كە ئەمە شای تەواو دڵخۆش كردبوو.

ئێران لەئازاری ساڵی ١٩٥٠ دانی نا بەئیسرائیلدا واتە پاش ساڵێك لە دانپیانانی توركیای موسوڵمان بەئیسرائیل بەڵام بەرلەوە مۆساد چالاكی بەرفراوانی لەسنوری ئێراندا هەبوو و پەرەی پێدابوو ، لەوێوە هەزارەها لەو جولەكانەی گواستەوە كە لەعێراقەوە هەڵهاتبون ، جگە لەوە ئاژانسی جولەكەو تۆڕی فێركردنی جولەكە چالاكی فراوانیان لە ئێران دەست پێكردبوو .

پاش چەند مانگێك لە دانپیانانی ئێران، بن گۆریۆن دەستی كرد بە خستنەڕوی بیرۆكەی هاوپەیمانی هەرێمایەتی كەجەخت دەكاتەوە لەسەر هاوكاری ستراتیژی و هەواڵگری ئابوری لەنێوان و ئیسرائیل و سێ وڵاتی ناعەرەبیی لەناوچەی دەرەوەی خۆرهەلاتی ناڤین ئەویش ئەسیوبیای گاور و ئێران و توركیای موسوڵمانن.

ئەم بیرۆكەی هاوپەیمانیە كە بەتایبەتی بۆ ڕوبەڕوبونەوەی ئەو بیرۆكانەبوو كە "جەمال عبدالناصر" خستبوونیەڕوو بۆدامەزراندنی خۆرهەڵاتی ناڤین لەسەربنەمای یەكێتی نەتەوەیی عەرەبی و بۆ پتەوكردنی پەیوەندیەكان لەچەند بوارێكدا لەنێوان سێ وڵاتی ناوبراودابوو ، لە نێوانیاندا ئێران.

لەوانەیە ئەم بارودۆخە لەو كتێبەدا ڕوون ببێتەوە كە"ئایسەر هەرئیل)" لێپرسراوی دەزگای ئاسایشی ئیسرائیل لەژێر ناونیشانی "ئاسایش و دیموكراسی" نوسیویەتی تیایدا هاتوە : هەوڵ زۆردرا لەپێناو پێكهێنان و دروستكردنی دەزگایەكی هەواڵگری و ئاسایشی بەهێز تاخۆڕاگربێت لەڕوبەڕوبونەوەی هەرهەوڵێكی كودەتا لە نێوخۆ و دەرەوەدا بۆپەرەسەندنی پەیوەندی لەگەڵ ئەو

دەوڵەتانە ڕووەو پەیوەندی سەربازی ، و بەشێوەیەکی فراوان سەرکەوتنمان بەدەست هێنا لەوەی ئەزمونی سوپای ئیسرائیل بخەینە خزمەتی ئەو دەوڵەتانەوە بەوشێوەیە سوپای ئیسرائیل بوو بەقوتابخانەیەکی کارا و پێگەیشتوو لەهەر شوێنێکدا ك پێویست بکات وابێت ، لەپاشان هاوکاری شارستانی ، ئیتر بواری شارستانی هاتەپێشەوە بەتایبەتی پەرەپێدانی بواری ئاودێری و کشتوکاڵی وپزیشکی و هاریکاریو ئاراستە کردن لە زۆربەی بوارەکاندا.

زۆر بەفراوانی لەڕاپۆرتی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی "سی ئای ئەی" کە لەپاش شۆرشی ئێران لەباڵوێزخانەی ئەمریکا لەتاران دۆزرایەوە باس لەهاریکار سێگۆشەی ئیسرائیلی - ئیرانی - تورکی دەکرێت ، مۆساد و هاوتا ئێرانیەکەی "ساواك" و هاوتا تورکیەکەیان "TNSS" ڕێکخراوێکی سێ قۆڵیان بەناوی "تریدنت" دروستکرد کە لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٨دا لەو چوارچێوەیەدا هەر سێ لا زانیاریە هەواڵگریەکانیان بەیەك دەگەیاندن ، سەرۆکەکانی ئەو سێ ڕێکخراوە ساڵانە کۆدەبونەوە.

بەڵگەنامەکە دەری خستووە کەئیسرائیلەکان زانیاریان داوە بەتورکیا سەبارەت بەچالاکی بەکرێگیراوانی سۆڤیەت لەسەرخاکەکەیان و هەروەها بەپرۆسەی چالاکی تری سۆڤیەتی لەدژی وڵاتانی تری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ، لەبەرامبەر ئەوەدا تورکیا زانیاری داوە بە ئیسرائیل سەبارەت بەنیەتی میسر و سوریا کە لەچوارچێوەی یەکیەتیەکدا کۆبوبونەوە هەروەها موساد ڕاهێنانی بەبەکرێگراوانی هەواڵگری "" tnssدەکرد لەسەر دژە شۆڤاری "التجسس المضاد".

سەبارەت بەهاریکاری لەگەڵ ئێرن ، ڕاپۆرتەکە زانیاری داوە و کاری هاوبەش کراوە ، وەك هاوکاریکردنی کوردەکانی عێراق هەروەها موساد زانیاری چڕوپڕی داوەتەوە ئێران سەبارەت بەوچالاکیانەی کە شیوعیەکان لەناوئیراندا دەیکەن ، و

زانیاری دەربارەی گۆڕانکاریەکانی نێوعێرق ، و چالاکی میسر لەجیهانی عەرەبیدا.

بەم شێوەیە کۆبونەوەکەی "بەختیار" لەگەڵ کرۆز لەخۆوە نەبوو ، ئاسایی بوو ئەگەر بەختیار داوای کۆبونەوەو دیداری لەسەفەرەکانی ئایندەیدا کردبێت ، بەڵام ئەمجارەیان کۆبونەوە لەڕۆما دەکرێت کە بە تۆڕی چالاکیەکانی "ساواك" دادەنرێت لەئەوروپای ڕۆژئاوادا ، کە ڕێکەوت وابوو خێزانی "فەقرەقان"یش لەوێ نیشتەجێ بوون.

"ئەیسەر هاریل" ئەو ڕاپۆرتەی خوێندۆتەوە کە "کرۆز" ناردویەتی و وەڵامی پێشنیاری ئێرانیەکان دەداتەوە ، ئەمجارە لەتشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٧ "هاریل" و "کرۆز" لەپایتەختی ئیتالیا لەگەڵ "بەختیار" و "فەقرقان"ی جێگریدا کۆبونەتەوە، و لەپاش چەند مانگێك لەکانونی یەکەمی ١٩٥٧ "کرۆز" بۆیەکەم جار چوەتە تاران لەپاش ئەوە کرۆز کراوەتە لێپرسراوی هەمووپەیوەندیەکان لەگەڵ ئێران.

★ ★ ★

بارودۆخ و ڕوداوەکان وایانکرد کەتۆڕی پەیوەندی ئەو دوو وڵاتە فراوان بێت و هەموو بوار و لایەنەکانی ژیان بگرێتەوە ، و بۆشاییەکی گەورەی بۆ ئیسرائیل کردەوە تالەوێوە بزانێت چی لەوڵاتانی عەرەبیدا دەگوزەرێت ، هەندێك لەو وڵاتانە هەوڵیان دەدا سزای "شا" بدەن لەسەر پەیوەندیەکانی بەئیسرائیلەوە ، بەڵام "شا" لەبڕیاری خۆی پاشگەز نەبووەوە بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە لەکانونی یەکەمی ١٩٥٨ ڕازی بوو بەکردنەوەی نوێنەرایەتی ئێران لەئیسرائیل ، پاشتر ڕازی بوو بەکردنەوەی پاشکۆی سەربازی ئیسرائیل لەتاران ، هەروەها دەرگای کۆشکەکەی بە ڕوی کەسایەتیە ئیسرائیلیە پلەباڵاکاندا واڵا کرد وەك سەرۆك و سەرۆکوەزیران ، سەرۆك ئەرکان و سەرۆکی پۆلەکانی هەواڵگری و

مۆساد کە زووزوو سەردانی ئێرانیان دەکرد و لەگەڵ کارمەندەباڵاکان و لەگەڵ "شا"شدا کۆدەبونەوە.

وە لەکتێبەکەیدا "پەیوەندیەکانی ئیسرائیل" پرۆفیسۆر "بنیامین بن هلحمی" دەڵێت : لەڕووی کاریگەری دانانەوە لەسەرئێران ئیسرائیل پلەی دووەمی گرتبو لەپاش ئەمریکا ، بەڵام لەسەردەستێوەردانی هەوالگری لەو لەپێشتربوو.

لەو چاوپێکەوتنەدا کە ڕۆژنامەنوسی ناودار "محمد حسنین هیکل" لەگەڵ "شا"دا ئەنجامی داوە لە٢ی ئەیلولی ١٩٧٥ ، "شا" زۆر بە ڕاشکاوی دەڵێت : هاوکاریمان لەگەڵ ئیسرائیل تەنها لەسەرئاستی هەوالگری نەبوو، بەڵکو زۆر لەوەفراوانتر بوو ، ئەفسەر و پلەدارم لە زۆربەی لقەکانی سوپا ناردوە تا لەئیسرائیل ڕاهێنان بکەن.

وە لەو کتێبەدا کە "هاریل" سەبارەت بەپەیوەندیەکانی بە "بەختیار"ەوە نوسیویەتی دەڵێت : لەنێوانماندا پەیوەندیەکی دۆستایەتی گەورە دروست بوو ، بەختیار بوو بەیەکێ لەگەورەترین دۆستەکانی ئیسرائیل لەناوچەکەدا بەشێوەیەکی ئاشکرا.

وە لەڕێگەی "بەختیار"ەوە ئیسرائیل هەوڵی دەدا کەپەیوەندی بە "عبدالکریم قاسم"ەوە بکات ، بۆیە لەکاتی گرتنەدەستی دەسەڵات لەساڵی ١٩٥٨ لەبەرئەوەی پەیوەندی لەنێوان "عبدالکریم قاسم" و "جەمال عبدالناصر"دا زۆر خراپ بووە . هاریل بڕوای وابوو کە زۆر بەرژەوەندی هاوبەش لەنێوان "عبدالکریم قاسم" و ئیسرائیل دا هەن.

هاریل دەڵێت : زیاتر لەجارێك بەشدار بووین لەڕزگارکردنی "عبدالکریم قاسم" لەتیرۆرکرانی بەدەستی "جەمال عبدالناصر" ، جارێکیان ئاگادارکردنەوەیەکمان بە"بەختیار"دا نارد ، "بەختیار"یش لایەنگری و هاوسۆزی خۆی بۆئیسرائیل لە"قاسم" نەشاردبوەوە، پێشی وتبوو کە ئەو ئاگادارکردنەوەیە لەخودی "ئیسرائیل"ەوە یە .

لەوانەیە ئەوە هۆکارێك بوبێت کە "هاریل" توانی بەکرێگیراوی جولەکە لە عێراق "یەهودا تیجەر" ڕزگاربکات کە لە ساڵی ١٩٥١ لە بەغداد دەستگیرکراو بەتۆمەتی شۆفاری بەزیندانی هەتاهەتایی حوکم درا ، بەر لەبەردانی کە ماوەی ١٠ ساڵ لەزیندان دا بوو داوای بینینی قاسم ی کردبوو ئەویش ڕێگەی پێدابوو .

"بەختیار" بووبوە میوانێکی هەمیشەیی لەئیسرائیل و وای لێهاتبوو کەمتر سەردانی ئێرانی دەکرد ، هەتا پەیوەندی لەنێوان ئەو و "شا"دا تێکچوو ، "شا" لە پۆستەکەی لایبرد "بەختیار" ڕۆیی بۆ سویسرا و لەوێوە دەستی کرد بەهەوڵدان بۆدۆزینەوەی ڕێگایەك بۆتۆڵەسەندنەوە لە شا ، بەڵام لەساڵی ١٩٧٠ تەرمی بەختیار دۆزرایەوە کە هند ترەقەیەکی ئاگرین جەستەیان کون کردبوو، هەندێك وتیان لە لوبنان گوژراوەو هەندیکی تریان وتیان لە ڕوداوی ڕاوکردندا کوژراوە.

جێگرەوەکەی "حسن فقرقان" بەردەوام بوو لەپەیوەندی و ئاڕاستە دۆستانەکانی لەگەڵ ئیسرائیل ، بەڵکو هاریکاری هەواڵگری فراوانتر کرد.

کە ئەو هاریکارییە گوزارشتی لەبواری کوردیش دەکرد ، عێراق لەو ماوەیەدا لەسەرئاستی نێوخۆیی دەکولا ، تا کارگەیشتە کودەتای چەکدارانە و لەکارخستنی "قاسم" لەدەسەلات لە٨ی شوباتی ١٩٦٣ ، مارشاڵی سوننی "عبدالسلام عارف" جێگەی گرتەوە ، کەهاوڕێیەکی کۆنی سەرۆکی پێشوو "عبدالکریم قاسم"بوو لەدەسەڵاتی پاشایەتی و هەر بەئامۆژگاری "قاسم" چووە ڕیزی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانەوەو سەرکردایەتی ئەو هێزەی دەکرد کە بەغدادی داگیرکرد لەکودەتای تەمموزی ١٩٥٨ دا ، سەرەتا قاسم پۆستێکی باڵای پێدا لەسوپا و حکومەتدا بەردەوام بوو تاگەیشتە پلەی کەسی دوەم لەحکومەتدا بەڵام "عارف" پیاوێکی ناصری بوو و حەزی خۆی نەشاردەوە بۆ داگیرکردنی کورسی سەرکردایەتی لەشوباتی ساڵی ١٩٥٩ خرایە بەردەم دادگا بەتۆمەتی هەوڵدان بۆ کوشتنی سەرۆکی حکومەت وبڕیاری لەسێدارەدانی بۆدەرچوو ، بەڵام "قاسم"

لێی خۆش بوو له زیندان ئازادی کرد ، بەڵام عارف بەردەوام بوو لەهەوڵدان بۆ پیلان گێڕان لەچوارچێوەی حیزبێکی نوێدا که ئەویش "حیزبی بەعس" بوو ، له کۆتایدا توانی ئامانجەکەی بەدی بێنێت و "قاسم" ی لەسەر کارلاداو لەسێدارەی دا.

کوردەکان دواتر بۆ "شمیدت" یان باسکردبو که لەکاتی ڕوداوەکاندا لەساڵی ١٩٦٣ گەڕایەوە بۆ کوردستان کەبەشدار بوون له کودەتاکەدا ، ئەوەش بەوئومێدەی سیستەمی نوێ چارەسەر بۆکێشەکانیان بدۆزێتەوە ، بەڵام ڕوداوەکان دواتر دەریان خست که عارف و هاوڕێکانی پلان بۆ شتێکی تەواو پێچەوانەی ئەوە دادەڕێژن ، ئەوان هەوڵیان دەدا دەرئەنجامەکانی کودەتا ڕەگ داکوتان و پاشان گورزێکی گورچکبڕ له کورد بدەن.

* * *

له ٨ی ٢ی ١٩٦٢ واته ساڵێك پێش کودەتاکە "تاهیر یحیی تکریتی" که لەسەرۆکایەتی پۆلیسی عێراق لابرابوو و پەیوەندی کردبوو به دوژمنەکانی "قاسم" ەوە پەیوەندی کرد به "ئیبراهیم ئەحمەد" سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان و پیاوی دووەم لەسەرکردایەتی پاخیبوە کوردەکان ، داوای هاوکاری کرد لەکوردەکان دژی دەسەڵات.

وه له ١٨ای ٤ی ١٩٦٢ "ئیبراهیم ئەحمەد" وەڵامی دایەوە : کوردەکان خوازیاری پەیوەندی ئاشتەوایین لەگەڵ عەرەبدا ، وه تەنها داوای دو شت دەکەن : حکومەتێکی نێوەندی دیموکراتی کەکورد ڕۆڵێکی شیاوی تیا بگێڕێت لەگەڵ پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی بەکورد ، "یحیی" وەڵامی نەبوو تەنها لەئابی ١٩٦٢دا نەبێت که بەتێبینی نوسیوبوی بەروارەکە دیاری کرا ، وه دواتر ڕون بووەوە کەمەبەست بەرواری کودەتاکە بووە، پاشان بەکوردەکان ڕاگەیەنرا که کاتی کودەتاکە لەنێوان کۆتایی شوبات وه ناوەڕاستی ئازاری ١٩٦٣ دەبێت ، پاشان لەسەر داخوازی "یحیی" ناوی شەش کەسی کورد خرایەنێو لیستی "حکومەتی

کودەتا"وە ، ئەو کوردانەی کە ئەزمونی پێشتریان لەگەڵ حکومەتە عێراقیەکاندا هەبوو ، داوای پابەند بونی نوسراویان کرد سەبارەت بەومەرجانەی خراونەتە ڕوو بەڵام دیداری نێوان هەردولا کە بڕیاردرابوو بەکاسێتی دەنگی تۆماربکرێت ، لەدواساتەکانیدا هەڵوەشێنرایەوە ، و بەهانەیان بەوە هێنایەوە کەخەریکی دیاریکردنی بەرواری جێبەجێکردنی کودەتاکە بون ، بەم شێوەیە هیچ بەڵگەیەك بەدەستی کوردەکانەوە نەما سەبارەت بە پابەندنەبونی عێراقیەکان، هەروەها ئاگادارنەکرانەوە لە بەرواری ساز کردنی کودەتاکە.

کوردەکان هەستکردن بەسوکایەتیان قوت دایەوەو وەفدێکی ٣ کەسیان نارد بۆ کۆبونەوە لەگەڵ ئەنجومەنی کودەتا نوێیەکە، بەمەبەستی پیرۆزبایی و دەربڕینی ئەسەفیان لەوەی کەڕێگەیان پێ نەدراوە ڕۆڵێکی کارا بگێڕن لە کودەتاکەدا ، ئەندامانی ئەنجومەنەکە ڕوونیان کردەوە کە ڕوداوەکان لەپێشبینی ئەوان خێراتر بوون ، بۆیە کاتی کودەتاکە بە کوردەکان ڕانەگەیەنرا.

وەفدی کوردی داوای جێبەجێکردنی پەیمانەکان و چارەسەرکردنی کێشەی کوردی لەلایەنی عێراقی کرد ، بەڵام کوردەکان ئەو داوایەیان ڕەتکردەوە کە لەڕادیۆوە پیرۆزبایی لەسەرکردەکانی کودەتاکە بکەن، هەرچەند ئەوان لەڕادیۆوە ڕایانگەیاندبوو کوردەکان پشتگیریان لێ دەکەن ، ئەمە وەك بانگەوازێك وادەبوو بۆ کوردانی تر تالایەنگری لە کودەتاکەو سەرانی بکەن، مەلا مستەفا بارزانی لەوکاتەدا هێرشێکی بەرفراوانی کردبوە سەر سوپای عێراقی لەهەموو لایەکی کوردستانەوە ، بەڵام خێرا فەرمانی دا بەڕاگرتنی تەقە لەهەموو لایەکەوە ، و حکومەتی نوێ ڕاگەیەنرا.

وادەرکەوت کەچرکەساتی گفتوگۆ لەنێوان کوردەکان و عێراقیەکان دەرکەوت ، بۆیە بارزانی نوێنەرەکانی خۆی بۆئەوە دیاری دەکرد بە سەرۆکایەتی "جەلال تاڵەبانی" کەیەکێك لە سەرکەوتووترین سەرکردەکانی یاخیبونەکە بوو ، سەرەڕای ئەوەی خەڵکی ناوچەی "سۆران" بوو وڕۆشنبیریەکی خاوەن بیرۆکەی

لیبراڵی هەبوو یەکێ لە دامەزرێنەرانی هێزی پێشمەرگە و فەرماندەی شەڕەکەی باشور بوو لە ڕوبەڕوبونەوەی عێراقیەکاندا ، جگە لەڕۆڵ و ئەرکەسەربازیەکانی تاڵەبانی چەندەها ئەرکی سیاسی بەسەرکەوتوویی لەدەرەوە ڕاپەڕاندبوو وە لەقۆناغێك لەقۆناغەکاندا سەرنوسەری گۆڤاری "کوردستان" بووە، وە تاڵەبانی زاوا و هاوپەیمانی سیاسی "ئیبراهیم ئەحمەد" سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، و "تاڵەبانی" و "ئیبراهیم ئەحمەد" گلۆپی سەوزیان بۆ هێزە کوردیەکان داگیرساند تا دەست بکەن بەشەڕی پارتیزانی لەساڵی ١٩٦١ دوای ئەوان بارزانی بڕیاری دا.

"لوقمان"ی کوڕی دووەمی بارزانی لەنێو وەفدەکەدابوو کەلەکاتی کودەتاکەدا لە زیندان ئازاد کرابوو ، وە "عبدالله صالح یوسفی" کە دەرچووی زانکۆ و بەرپرسی لقی بەغدادی پارتی دیموکراتی کورد بوو ، کە پێشتر چەندجار دەستگیر کراوەو گواستراوەتەوە بۆخواروی عێراق ، جگە لە دوو کوردی تر کە دانرابوون بە وەزیر لەحکومەتی کودەتادا ، ئەوانیش وەزیری کاروباری دەوڵەت "فواد عارف" و وەزیری کشتوکاڵ "بابا علی شێخ محمود" بوون.

ئەندامانی وەفدەکە لەبەغداد زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێکرا ، بە سەرۆکایەتی "ئەحمەد حەسەن بەکر" کە ئەفسەرێکی پلەبەرز و یەکێ لە ئەندامەکاراکانی حیزبی بەعس و سەرۆکی حکومەت بوو ، وە پێشتر بەشداری کودەتای ساڵی ١٩٥٨ ی کرد دژی ڕژێمی پادشایەتی، وە پلان داڕێژەری سەرەکی کودەتاکە بوو دژی "قاسم" ، ئەمە جگە لەوەزیری بەرگری "صالح مهدی عماش" کە ئەفسەرێکی پلەبەرز و ئەندامێکی حیزبی بەعس بوو ، لەگەڵ ژەنەڕاڵ "یحیی تکریتی" کە پەیوەندی نهێنی یەکەمی لەگەڵ "ئیبراهیم ئەحمەد" گرێدابوو بەر لەساڵێك لە کودەتاکە ، هەروەها فەرماندەی هێزی ئاسمانی ژەنەراڵ "حەردان عبدالغفار تکریتی" و وەزیری دەوڵەت "حازم جواد".

له یەکەم دیداردا کەلە ١٩ی شوبات سازکرا ، "تاهیر یحیی" بەڵێنی ئەومیدا بە "تاڵەبانی" کە هەمووشتێك لەجێی خۆی دەبێت ، رێکەوتوین و بەیانی مافی ئۆتۆنۆمیی بۆکورد ڕادەگەیەنین.
له بەیانی ڕۆژی دواتردا کە ٢٠ی شوبات دەکات ، بەڵێنی ئەوە درا بە "تاڵەبانی" کە کوردەکان بەهەموو مافەکانیان دەگەن، بەڵکو وەزیری بەرگری "مهدی عماش" ویستبوی فەلسەفەی سیاسەتی پەیڕەوکراوی سەرانی کودەتا ڕوون بکاتەوەو ، بەتاڵەبانی وتبوو ((وەك هەموو گەلێك کوردەکانیش مافەکانی خۆیان دەستەبەر دەکەن، ئێستا بێت یان دواتر لە بەرژەوەندی عێراق نیە ، کە دژی کوردەکان بێت ، وە ئەگەر بیانچەوسێنینەوە ئەوا بەدڵنیاییەوە پاش سێ ساڵی تر شۆرش دەکەنەوە ، ئەوەش عاقڵانە نیە کەدوژمنێك لەلای ڕاستەوە بۆ خۆمان دروست بکەین لەکاتێکدا ئیسرائیل لە لای چەپمانە جگە لەوەش. کوردەکان ئێستا لەدەرەوەی عێراق دەنگی خۆیان هەیە دەبێ چیمان لێ بەسەربێت ئەگەر گەلێکی ئازاد بچەوسێنینەوە)).
تاڵەبانی وەڵامی ئەو قسانەی بەڕستەیەك دابویەوە ((سوپاست دەکەم بۆ ئەو وتانەت هیوادارم نیومیان بێنە دی)).
نوێنەرانی حکومەت و ئەوانەی کوردیش کۆکبوون لەسەرئەوەی کە کێشەکە فراوانتر و گشتگیرترە لەوەی کە لەدانیشتنێکدا تەواوبێت بەڵکو پێویستی بەگفتوگۆی گشتگیر هەیە ، بەبەشداریەکی زیاتری هەردوولا و "عماش" ڕۆژی ٢٢ی شوباتی دانا بۆ ئەو کۆبونەوەیە ، کە تا ئەمڕۆش ڕێکنەخراوە..!!
عێراقیەکان لە هەوڵدابون بۆبەکارهێنانی کوردەکان لەپێناو ڕەگداکوتانی شەرعیەتی دەسەڵاتەکەیان لەچاوی سەرکردەکانی عەرەبدا لە٢٠ی شوبات تاڵەبانی ڕویکردە میسر بەسەرۆکایەتی وەفدێکی رەسمی عێراقی بۆ قاهیرە و بەمەبەستی پیرۆزبایی لەسەرکردایەتی میسر بەبۆنەی یادەوەری پێنجەم ساڵەی دامەزراندنی "کۆماری عەرەبی یەکگرتوو" کەدواتر هەڵوەشایەوە ، جێی باسە

تاڵەبانی دەیویست بەر لەڕۆشتنی بارزانی ببینیت ، بەڵام نەیتوانی ، لەوێ لەگەڵ سەرۆکی میسر "جەمال عبدالناصر" و دوو لەسەرکردەکانی کۆبوەوە، وتەی زۆر جوان و بریقەداری لێ بیستبون ، "عبدالناصر" کە خوازیاربوو دەست بەسەر هەمووجیهانی عەرەبیدا بگریت پێی وتبو : کەس نایەوێت خراپە بەرامبەر گەلی کورد بکات و مافی ئۆتۆنۆمیەکەیمان پێ ڕەوایە ، جا "عبدالناصر" ڕوویکردبووە ئەندامانی عێراقی لەوەفدەکەو پێی وتبون : (( نازانم چی ترساندونی لەگوزارەی "ئۆتۆنۆمی" ..؟ ، بەدڵنیاییەوە گەرەنتیکردنی پاڵپشتی کورد بۆ عەرەب کاریگەرە لەبەهێزکردنی نەتەوەیی عەرەبدا ، دوژمنانی عەرەب هەتا ئێستا تورکیا و ئێرانن ، هەربۆیە میسر پەیوەندی لەگەڵدا بچڕاندون)) .

وە لە جەزائیر تاڵەبانی گوێبیستی هەمان قسەبوو بوو لە سەرکردەکانی ئەوێ بەتایبەت "ئەحمەد بین بیللا"ی پەروەردەی عبدالناصر کە "جەزائیر" پێش ساڵێك سەربەخۆیی وەرگرتبوو بە هاوکاری میصر ، "بیللا" سەرۆکی یەکەمی جەزائیر بوو پیشنیاری کردبوو کە عێراق هەمان هەڵەی فەرەنسا دوبارەنەکاتەوە ، کاتێ ڕەتی کردەوە کە سەربەخۆیی بدات بە وڵاتەکەی .

بارزانی توڕەبوو لەوگەشتانەی کەتاڵەبانی پێ هەڵدەستا ، وەدەیگوت : ((ناردومی بۆ بەغداد نەك لەم پایتەخت بۆئەو پایتەخت گەشت بکەن)) ، بە نیسبەت ئەوەوە ئەمە مانای ئەوە بو کە حکومەتی عێراقی داواکاریەکانی کورد بەجددی وەرناگرێت ، هەرچەندە تاڵەبانی پێی وابو کە کۆدەنگیەکی نیمچەگشتگیری عەرەبیی بۆکێشەی کورد بەدەستهێناوە ، بەڵام بارزانی دەرەنجامی خێرای دەویست بۆیە داوایکرد کە عێراقیەکان لە ی ئازاری ١٩٦٣ مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکان ڕابگەیەنن ، ئەگەر وانەکەن ئەوا درێژە بەجەنگ دەدات و سەربەخۆیی کوردستان ڕادەگەیەنێت و لەوانەیە جیابونەوە لەعێراق ڕابگەیەنێت تا دەری بخات کە ڕاست دەکات وە فەرمانی بەهەموو پیاوەکانی کرد کەبگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان لە مەیدانەکانی جەنگ.

لەوماوەیەدا "شمیدت" لەبارزانی پرسی : مەبەستت چیە لە خۆبەڕیوەبەری "ئۆتۆنۆمی"؟

بارزانی وەڵامی دایەوە : ((گرەنتی ئاسایشی گەلی کورد ، لەبارودۆخێکدا بژین کە هیچ لایەنێك نەتوانیێ لە چرکەساتی کۆتایدا گورزمان لێ بوەشێنێت .

پ/ واتە ئیوە داوا دەکەن کە هێزی چەکدارتان هەبێت ؟

بارزانی: ئایا دەتوانرێت هێمنی و ئاسایش بە ێ هێزی چەکدار بپارێزرێت؟ ، وە ئاماژەی بەداخوازییەکەی پێشووی کرد بە دروستکردنی لیوایەکی چەکداری کورد لەناو سوپای عێراقیدا و دامەزراندنی پۆلیسی کورد لەناوچەکانی کوردستان.

((مافی خۆبەڕیوەبەری بەمانا تەواوەکەی کەبەشێوەیەکی پلەبەندی جێبەجێبکرێت ، بەڵام دەبێت عێراقیەکان سەرەتا دان بنێن بەمافی خۆبەڕێوەبەری و مافی چارەی خۆنوسین بە گەلی کورد ، ئەگەر ئەوەیان ڕاگەیاند ئەوا هیچ ڕونادات ، وە ئەگەر قبوڵی نەکەن ، بارودۆخ وەك جارانی لێ دێتەوە ، کوردەکان هەتا دەمرن شەڕ دەکەن و داوای جیابونەوە دەکەن ، لەوانەیەپێویست بێت کەجیابونەوە ڕابگەیەنین)) .

لەای ئازاری ١٩٦٣واتە کۆتایی مۆڵەتەکەی کە بارزانی دیاری کردبوە ، حکومەتی عێراقی ڕونکردنەوەیەکی هێورکەرەوەی بلاْوکردەوە ، هەرچەند ئاماژەی بەمافی ئۆتۆنۆمی نەکردبوو بەڵام ڕایگەیاندبوو کەگرەنتی هەموو مافەکانی کورد دەکات ، لە ٤ی ئازار حکومەتی عێراقی ڕایگەیاند کە کۆبونەوەیەك لە نێوان هەردوولا ئەنجام دەدرێت لە"قەڵادزێ" بەبەشداری دو وەزیرە کوردەکە و فەرماندەی سوپا و "علی حیدر سلیمان" کەئەوسا وەك باڵوێزی عێراق لەئەمریکا کاری دەکرد و بە بنەچە کورد بوو .

لەبەرئەوەی بارزانی پێی وابوو لەپشت ئەو خاوەخاوەی کە حکومەت دەیکات پیلانێك هەیە بۆیە سوربوو لەسەر ئەنجامدانی کۆبونەوەکە لە"کارمی ماران"[1]دا بێت کەوای هەستدەکرد ئەوێ لەڕووی ئاسایشەوە باشترە ، هەموو کارتەکانی خستە سەرمێزەکە : (( کارگێریەتی هێمایەتی کوردی ، ئەنجومەنێکی دادوەری لەناوچە کوردنشینەکان ، دانانی جێگرێکی کورد بۆسەرۆکی عێراق ، دروستکردنی لیوایەکی سەربازی کوردی لەژێر سەرکردایەتی ناوەندىدا ، دامەزراندنی پۆلیسی کورد وەك لەویلایەتەکانی ئەمریکادا هەیە ، دامەزراندنی کوردەکان لەهەموو پێگەو ئەرکەحکومیەکانی کوردستان ، و دانىان بەزمانی کوردی وەك زمانی ڕەسمی لە پاڵ زمانی عەرەبی)).
هەروەها داوای کشانەوەی هەموو هێزی عێراقی کرد لە ناوچەکانی کورددا، وە ڕێگەنەدریت بەگەڕانەوەی تەنها لە حاڵەتی بونی مەترسی جەنگی دەرەکی و بەگەڕخستنی سەروەتی نەوتدا نەبێت کە لەزۆربەی خاکی کوردەکاندا هەیەو تا بەشێوەیەکی ماقوڵ بەسەردانیشتوانی کورد و عەرەبدا دابەش بکرێت ، لەڕاستیدا بارزانی داوای دروست کردنی حکومەتێکی کوردی دەکرد لەهەموو بوارەکاندا ، تەنها بواری دەرەکی و ئاسایش نەبێت کەخستونیە بەردەستی حکومەتی عێراقی "ناوەندی" ، عێراقیەکان یەمەرجەکانی ڕازی نەبون "مەهدی عەماش" کە دەستی بەچەناگەیەوە گرتبو وتبوی : "وەڵاهی ئەگەر ڕازی بین بەداواکانتان "عبدالناصر" سەرمان دەبڕێت".
یەکسەری تاڵەبانی وەڵامی دابویەوە : "لە کاتی گفتوگۆمان لەگەڵ "عبدالناصر" ڕازیبووە بەپرەنسیپی مافی خۆبەڕێوەبەری بۆکورد دەتوانین خۆمان بگەینە ڕێکەوتن" بەڵام عەماش و وەزیری دەرەوە "علی صالح السعدی" وەڵامیان دابووەوە : ""عبدالناصر" بەئێوە شتێکی وتووە و بەئێمە شتێکی تر".

---

[1] پێدەچێت (کانی ماران) بێت وەرگێر

لە٧ی ئازار شاندێکی تری عێراقی پلەبەرز کە هیچ نوێنەریکی فەرمی تێدانەبوو هاتن بۆ"شافارکردنە"[١] ی نزیك ڕانیە بۆ بینینی بارزانی داوایان کرد کەبارزانی واز لەزاراوەی ئۆتۆنۆمی بهێنیت ، بارزانی ڕازی بوو چونکە زاراوە هیچ مانایەکی نەبو لای ئەو ، گرنگ لای ئەو جێبەجێکردنی جەوهەر و ناوەڕۆك بوو.

نێردەکان ڕازیبوون لەسەر داخوازیەکان بەمەرجێك حکومەتی عێراق دەستبەجێ چەند داخوازییەکی کوردەکانی جێبەجێ بکات لەپێناو باشترکردنی ژینگەی گفتوگۆکان لەناویاندا : هەڵوەشاندنەوەی بچڕاندنی پەیوەندی ئابوری لەناوچە کوردیەکان و هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو فەرمانانەی دراون بە دەستبەسەراگرتنی موڵکی کوردەکان ، گەڕانەوەی هەمو فیرقەکانی سوپای عێراقی بۆشوێنەکانی خۆیان جگە لەفیرقەی "دوو" ، کە بە شێوەیەکی گشتی هەر لە"باکور"ە ، و گۆڕانکاری لەکارمەندان لەناوچە کوردنشینەکاندا ، لیبۆردن و ئازاد کردنی هەموو گیراوە سیاسیەکانی کورد و هەموو ئەوانەی گیراون بەهۆی هاوکاریکردنی یاخیبوونی کوردەوە.

حکومەتی عێراقی ئازادکردنی ٣٠٠ زیندانی کوردی ڕاگەیاند لە کۆی (٣،٥٠٠) بەندکراو ، بۆ سەرکردە کوردەکان دەرکەوت کە فەرمانی ئاشکرا بەنهێنی هەڵوەشاوەتەوە ، بەڵام گوێیان نەدایە لەبەرئەوەی دابڕینی پەیوەندی ئابوری بەشێوەیەکی لاوەکی لابرابوو ، بەڵکو پەیوەندیەکی ئازاد لەنێوان ناوچە کوردی و عەرەبیەکان کرابووەوە ، بەڵام باقی خاڵەکانی تر کە تاوتوێ کرابون بەمردویی مانەوە.

لە ٩ی ئازار حکومەتی عێراق ڕونکردنەوەیەکی بڵاو \کردەوە تیایدا دانی نا بەمافە نیشتمانیەکانی کورددا و زاراوەی ئۆتۆنۆمی گۆڕدرا بە "نێوەندی لاوەکی=بەشە نێوەند=" کە لە ڕاستیدا لە ئۆتۆنۆمی کەمترە وە بەتەواوەتی

---

[١] ئەم کتێبە هەڵەی زۆری لە ناو ناوچە و شارەکاندا کردوە ئەمەش هەڵەیەکی ترە (وەرگێر)

دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیەوە، دواتر دەرکەوت کە زاراوەی نێوەندی لاوەکی هیچ مانایەکی نیە.
بارزانی سەرەڕای لاوازی دەستکەوتەکە وای هەستکرد کە گۆڕانکارییەك ڕویداوە بۆیە بڕیاریدا کە لەدانوستانی کۆتایدا هەموو چین و توێژەکانی گەلی کورد بەشداری پێ بکات بڕیار درا بە دروستکردنی لیژنەیەکی دانوستانکاری بنکەفراوان کە توانای خۆی لەکۆنگرەیەکی بنکەفراوانەوە وەردەگرێ نوێنەرەکانی نارد بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان کۆنگرەکە کارەکانی لە "سنجاق"[1] بەست ، لەماوەی نێوان ١٨ بۆ ٢٢ی ئازار نزیکەی دوو هەزار کورد لەهەموولایەکی کوردستان بە جلوبەرگی نیشتمانیەوە هاتن لە نێوانیاندا سەرۆکخێڵ و ڕۆشنبیران و گەنجان و ژنان و قوتابیان و سەرکردە ئاینیەکان و سەرکردەی چین و توێژەکان و فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە بەشدار بوون.
سەرەڕای گەشبینی زۆریان بەڵام لەشەودا کۆنگرە کارەکانی خۆی دەکرد لەترسی ئەوەی نەوەك حکومەت فڕۆکەکانی بنێرێت بۆبۆمبارانی کۆنگرەکە ، ترس زیاتر بوو بە بڵاوبونەوەی چەند هەواڵێك سەبارەت بەوەی کە سوپای عێراقی بڵاوبۆتەوە بۆ هێرشکردنە سەر چەند ئامانجێکی لە هەموو لایەکی کوردستاندا.
لە ٢١ی ئازار یەکەیەکی سوپای عێراق گوندی "هۆمەر بەگ" یان لەناوچەی کەرکوك سوتاند وە یەکەیەکی تری سەر بە گاردی کۆماری هێرشی کردە سەر گوندێك لە ناوچەی "قووش" کوردەکان لەهەردو هێرشەکەدا خۆڕاگر بون و حەوت سەربازیان کوشت و چواردەی تریان دەستگیرکرد ، سەرەڕای ئەوانە کۆنگرە بەردەوام بوو لەکارەکانی و بریاری دا کە بارزانی نامەیەکی سوپاسگوزاری بنێریت بۆحکومەتی عێراقی ، کە لە٩ی ئازاردا دانی نا بەمافە نیشتمانیەکانی

---

[1] پێدەچێت (کۆیە –سنجاق) واتە (کۆیە) بێت – وەرگێر-

کورددا ، ١٤ ئەندام دیاری کران بۆ ئەنجامدانی دانوستانی گشتگیر بەسەرۆکایەتی "تاڵەبانی"

گومان لەوەدا نیە کەئەنجامدانی ئەو کۆنگرەیە دەستکەوتێکی گەورەبوو بۆبارزانی ، بۆ یەکەمجار لەژێرسایەی ئەودا کۆنگرەیەکی وا گەورە رێکخرا، ئەو هەمو جەماوەرە زۆرە لە رەوتە کوردیەکان لەخۆ بگرێت ، کە پەیوەندی نێوانیان لاوازبووە بارزانی سەلماندی کەبیرمەندێکی ستراتیژی و سیاسەتمەدارێکە ماندووبوون نازانێت ، لەکۆنگرەکەدا جەختی کردەوە لەسەر نەهێشتنی جیاوازی و ناکۆکی لەنێوان سەرۆکخێڵەکان و خۆیاندا و لەگەڵ سەرکردەکانی حیزبدا وە هەلێکی رۆحی دەست کەوت بۆ لێکنزیك کردنەوەی نێوخۆیی کورد لەپێناو سەرخستنی بریارێك کەجەخت دەکات لە ئەرکی هۆزە کوردیەکان کەهاوکاری حکومەتی عێراقیان کردوە یەکبگرن و ریزەکانیان یەکبخەن لەپشت ئامانجەکانی کوردەوە لەژێر سەرکردایەتی ئەودا بەوشێوەیە دەیتوانی بڵێت کۆدەنگی کوردی لەدایك بوو.

* * *

تاڵەبانی زوو لەوەتێگەیشت کە ئەو تیشکی خۆرەی کوردەکان پێیان وایە درەوشاوەتەوە نەگەیشتۆتە حکومەتی عێراقی لە ٣٠ی ئازار شاندی چواردەئەندامیی دانوستانکاری کورد گەیشتنە بەغداد بەسەرۆکایەتی تاڵەبانی ، بەڵام هەرزوو بۆیان دەرکەوت کەسەرکردەکانی عێراقی نوێ پەرۆشی گفتوگۆ نین دانوستکارە عێراقیەکان کەسانێکی بێتوانا بوون و هیچیان نازناوێکی فەرمیان نەبوو ، پاش چەندرۆژێك کۆبوونەوە تاڵەبانی پرسیارێکی فەرمی لێ کردبون ئایا ئێوە رێگەپێدراون بەناوی حکومەتەوە دانوستان بکەن؟ وەڵامیان دانەوە بە "نا" ...!!

تاڵەبانی داوایکرد لەگەڵ "البکر" سەرۆکی حکومەت کۆببێتەوە بەڵام پێی راگەیەنرا کەدانوستانەکە بۆ ٦ی نیسان دواخراوە ، هەر پاش نزیکەی ٢ کاتژمێر

لەڕادیۆوە گوێبیستی ئەوەبوو کەسەرۆکی حکومەت "البکر" ڕوویکردۆتە قاهیرە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی میصری ، تاڵەبانی و هاوڕێکانی ٥ ڕۆژی تر چاوەڕوان بوون تا "البکر" لەقاهیرە گەڕایەوە ، لەو ماوەیەدا لەسەر قسەی دانوسانکاران یاداشتێکیان نوسی بوو لەسەر چوار داواکاریەکانیان.

دانوستانی عێراقیەکان لە قاهیرە ترسی لەناوەندەکانی کورددا بڵاوکردەوە ، چونکە دەیانزانی ئەو گفتوگۆیانە بۆ دروستکردنی یەکێتیەکە لە نێوان میصر و عێراقدا و سەرکەوتنی ئەو گفتوگۆیانە کاریگەری دەبێت لەسەرژێرخانی دەوڵەتی عێراقی و پێگەکەی و هەروەها چارەنوسی دانوستانەکانیش لەگەڵیدا دیاری دەکات ، بۆیە هەرزوو پرسیاریان وروژاندو بڕیاریاندا کە ئەگەر عێراق بەم شێوەیەی خۆی بمێنێتەوە ئەوا کوردەکان ئامادەن بیرۆکەی "نێوەندە لق" قبوڵ بکەن بەڵام ئەگەر عێراق ببێتەبەشێك لە "کۆنفیدراڵیەتی عەرەبی یەکگرتوو" ئەوا داوای مافی خۆبەڕێوەبەریەکی فراوان دەکەن ، وە ئەگەر عێراق ببێتە بەشێك لە یەکێتیەکی عەرەبی گشتگیر ئەوا هیچ هەڵبژاردنێکمان لە بەردەمدا نابێت جگە لەجیابونەوە.

لە ٢٤ی نیسان پێیان وترا کەئەمڕۆ دانوستانتان لەگەڵدا دەکرێت ، وورەی دانوستکارەکان زۆر دابەزی بوو، چونکە لە کارمەندەکانی حکومەت بیستبوویان : ئەو مافانەی کە پێیان دەدرێت زۆر کەم دەبێت ، جگەلەوە ئەو هەواڵانەی لە کوردستانەوە دەگەیشتن دەیانوت : حکومەتی عێراق داخستنی ڕێرەوی ئابوری توندکردۆتەوە و ڕێگاکانی ڕۆشتن بۆ کوردستانی بەبەربەست داخستوە ، و هێزی ئاسمانی بڵاوکردتەوە ، تۆپ و دەبابەکانی ڕوبەڕووی ناوچە کوردیەکان ڕێکخستوە.

شاندی کوردی لەسەعات (٩:١٥) گەیشتنەماڵی سەرۆکی حکومەت ، پێیان وترا سەرۆك خەوتوە ، شاندەکە هیچیان بۆ نەما ، جگە لەوەی کەیاداشتەکەی ئامادەیان کردبوو ، بدەنە دەست یاریدەدەرەکەی ، ڕایبگەیەنن کەدەگەڕێنەوە بۆ

کوردستان ، بەر لەدەرچونی شاندەکە لەرێگای گەرانەوەیاندا روویان لەوەزیری کورد "فواد عارف" کرد کە وەك سکرتێری دەولەت بۆکاروباری کورد کاریدەکرد ، بریاری خۆیان پێ راگەیاند ، ئەویش تەلەفۆنی بۆ"یحیی"ی فەرماندەی سوپا کرد کەرایگەیاند لە ماوەی کاتژمێرێکدا لەگەڵ شاندی کوردی کۆدەبێتەوە ئەندامانی شاندەکە پێیان وت : هاتوین ماڵئاوایی بکەین بەرلەوەی بگەرێینەوە ، تاڵەبانی وتی : "ئیستا تەواو دڵنیا بومەوە کە عێراق نایەوێت دانوستان بکات و جددی نیە لەگەڵماندا " .

"یحیی" : ئەگەر بەغداد جێبهێڵن کارێکی زۆرخراپ دەکەن.

"تاڵەبانی" : دانوستان دەکەن لەگەڵمان؟

"یحیی" : بەڵێ ئێمە زۆر بەگرنگیەوە لەداواکانتان دەکۆڵینەوە ، تاڵەبانی لەسەرهەڵویستەکەی سو بوو لەوکاتەدا "یحیی" بەپەلە چوو قورئانەکەی لەنوسینگەکەی هێناو سوێندی لەسەرخوارد کە حکومەتی عێراق هیچ نیەتێکی خراپی نیە لەگەڵ کورددا و ئەگەر درۆبکات خوا کوێری بکات ، داوای لە شاندەکەکرد تا دوای جەژنی قوربان چاوەرێ بکەن ، ئەوکات دانوستان پێگەیەکی جددی وەردەگرێت ، داواکاریەکانتان دەگوێزرێتەوە بۆ میسر وسوریا ، کەدوو وڵاتی هاوبەشی عێراقن لەیەکێتی سیاسی دا ئەگەر ئەو یەکیەتیە جێ بەجێ بکرێت.

شاندی کورد رازی بوو کە تا جەژن بمێنێتەوە زۆر بەبێزاری و ناخۆشی لە٥ای ئایاری ١٩٦٣ تاڵەبانی بێبەش نەبوو لەتانەو تەشەر بە هۆی دواکەوتنی و ئەو ئامادەکاریە جەنگیانەی کە سوپای عێراق خەریك بوو دەیکردن ، کاتێك "البکر" ئەو رەخنانەی بیستەوە قورئانی خستەسەر سەری سوێندی خوارد هیچ نیەتیکی خراپی نیە لەبەرامبەر کورد ، داخوازیەکانی کورد نێردراون بۆ هەردوو حکومەتی قاهیرەو سوریا ، تاڵەبانی زۆر بەبێزارییەوە وەڵامی دایەوەو ووتی : واگریمان سوێندەکەی تۆ راستی بوو، بەڵام هەموو نیازەکانی حیزبی بەعس

بەرامبەر كورد خراپە ، داوای لێ كرد ڕێگەی سەفەری بدات بۆ میصر بۆ ڕوونكردنەوەی سروشتی داخوازیەكانی كورد بۆ "عبدالناصر" ، چونكە بەهۆی ئەو دیدارانەوە كە پێشتر لەگەڵ سەرۆكی حكومەت و ئەفسەر و پلەدارەكان و سەركردەكانی تردا ئەنجامی دابون بۆی دەركەوتبو كە باشترین شت بۆئەوەی وابكات كارەكان بەئاراستەیەكی یەكلاكەرەوەدا بڕۆن هەوڵدانە بۆئەوەی كە "عبدالناصر" بڕیارێكی یەكلاكەرەوە بدات.

پاش چەند كاتژمێرێك ڕێگەی گەشتی بۆ قاهیرە پێدرا بەڵام پاش سێ هەفتە توانی "عبدالناصر" ببینێت لە٢٥ی ئایار عبدالناصر و هاوڕێكانی زۆر بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ تاڵەبانی كردو ، جەختیان لەوەكردەوە كەداخوازیەكان ماقوڵن و وە هەر ئەوڵدانێكیان بۆ چارەسەركردنی مەسەلەی كورد بەهێز بەكارێكی خراپ دابووە قەڵەم ، دیدارەكە لەگەڵ "عبدالناصر" زۆرباش بوو، تاڵەبانی هەستی بە سەربەرزییەكی زۆركرد ، یەكەمجار بوو كەگەورەترین سەركردەی عەرەب گوێ بۆداخوازیەكانی گەلی كوردستان بگرێت و بەئامادەبوونی هەموو هۆكارەكانی ڕاگەیاندنی عەرەبی بەتایبەتی میدیای میسری كەهاوسۆزییان لە بەرامبەر مەسەلەی كورد پێوەدیاربوو.

تاڵەبانی دەیویست بگەڕێتەوە بۆ بەغداد و لەگەڵ خۆیدا ئەو دەستكەوتەی هەڵگرتوە بەتایبەتیش دەستكەوتێكی تاكە كەسی گەورە بوو بەگریمانەی ئەوەی كە ئەمجارەیان ئەو دەسكەوتە ڕێگا بۆ بەعس خۆش دەكات كە ڕێكەوتننامەكە لەگەڵ كوردەكاندا ڕیكبخات ، بەڵام ئەندامانی شاندەكە لە بەغداد بون بەنهێنی پێیان وتبوو كەحكومەتی عێراقی دەیەوێت دەستگیری بكات ، لەكاتی گەڕانەوەی بۆ بەغداد بۆیە واباشترە نەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ ، ئەمەش وایكرد كە بڕیاربدات بە گەشت كردن بۆ ئەورووپا و لەوێ لەگەڵ هاوڕێكانیدا كار بۆ ڕۆڵەكانی گەلەكەی بكات.

★ ★ ★

ئەندامانی شاندی دانوستکاری کورد لەهۆتێلی "سمیرا میس" مابوونەوە لە بەغداد ، بۆیان دەرکەوت کەلەژێر چاودێرییەکی توندان دەستەی لێکۆڵینەوەو پۆلیس دەرگای ئوتێلەکەیان تەنی بوو ، ئەوەبوو ئەندامانی وەفدەکە شکایەتنامەیەکی نوسراویان نارد بۆ "البکر" ئەویش فەرمانی دا بە کەمکردنەوەی چاودێری ، بەڵام ئەم هەنگاوە ترسی کەمنەکردنەوە لەنیازی حکومەت بەرامبەریان ، ئەوان دەیانزانی کەسوپای عێراقی لەسەرەتای ئایارەوە سەربازگەکانی بەکوردستاندا بلاو کردۆتەوە ، یەکەکانی بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز هات و چۆ پێدەکات ، هەواڵگری کوردی بۆی دەرکەوت کەحکومەت بڕی سەد هەزار دیناری عێراقی بە نهێنی تەرخانکردوە بۆ ئەو کەسەی کەبارزانی بۆ دەستگیربکات ، لەماوەی نێوان ٥و٦ی حوزەیرانی ١٩٦٣ سوپای عێراقی هەستا بەئەنجامدانی مانۆڕی سەربازی لە هەردووشاری سلێمانی و کەرکوك ، تانکەکانی بەئاراستەی شاخەکان ڕاگرتبوو ، لە٧ی حوزەیراندا تۆپخانەی عێراقی تۆپبارانی چەند پێگەیەکی کوردی لەسەرچیای "ئەزمەڕ" کرد و کەتیبەیەکی سوپای عێراق هەوڵی داگیرکردنی چەند پێگەیەکی سەربازی کوردەکانی دا.

لە ٦ی حوزەیران وەفدەکە لەسەر داوای خۆیان لەگەڵ "البکر" دا کۆبوونەوە ، بەڵام ئەو هەموو شتێکی ڕەتکردەوە وتی : کە ئەو بلاوکراوەیەی هانی دەستگیرکردنی بارزانی دەدات هەوڵی فێڵبازانەی شیوعیەکانە بۆ نانەوەی ئاژاوە لەنێوان عێراقیەکان و کوردەکاندا، سوێندی خوارد بەقورئان کە هیچ پەیوەندیەکی بەوەوە نیە ، پاشان بۆندێکی نوێی خستە ڕوو سەبارەت بە "نێوەندەلق"بۆ کوردەکان ، "یوسفی" سەرۆکی شاندەکە بە وەکالەت بینی کە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ بۆندەکەی پێشویان کەڕەتیان کردەوە ، بەڵام عێراقیەکان سوربون لەسەر ئەوەی کەبنێردرێت بۆبارزانی و هاوڕێکانی تابڕیاری لەسەر بدەن.

"یوسفی" وتی : سەرکردایەتی کورد بەم وەفدەی ڕاگەیاندوە کە پێشنیارەکەی پێشوو ڕەت بکاتەوە ، چ جای ئەم پێشنیارە کە هیچ شتێکی وای تێدانیە.
لە ٨ی حوزەیران کۆبونەوەیەکی ترکرا ، یوسفی گەڕایەوە نیمچە ئومێدێکی مابوو کە ئەم پێشنیارە نوێیەیان مانی ئەوەیە کە هێشتا بڕیاری جەنگ هەڵایساندن نەدراوە، داوای مۆڵەتی کرد تا بگەڕێتەوە باکور لەگەڵ بارزانیدا کۆببیتەوە و ڕاوێژی پێ بکات ، بۆ ئێوارەکەی "یحیی"لەگەڵ وەزیرە کوردەکە "عارف" هات بۆ ئوتێل "سمیرا میس" ، پەیمانیدا کە فڕۆکەیەك بێت بۆ گۆڕەپانی سەربازگەی رەشید لەوێوە هەڵت بگرێت بۆ باکور.
لە ناو چالاکوانانی کورددا دەنگوباسی ئەوە بلاو بوەوە کە بەرەوپێشچون لەدانوستانەکاندا ڕویداوە ، کەئەمەش دڵخۆشی کردن ، وایان دەزانی ئەوگومانانەی بەرامبەر حکومەت هەیان بوە ، هیچ بنەمایەکی ڕاستی نەبووە ، بەرەبەرە ئەو کوردانەی لەترسی پۆلیس خۆیان شاردەوە لەحەشارگەکانیان هاتبونە دەرەوە ، ئەو ساویلکانە نەیاندەزانی لە کاتی بڵاوبونەوەی پڕوپاگەندەی پێشنیارە نوێیەکاندا سوپای عێراقی گەمارۆی هەرسێ گەورە شاری سلیمانی و هەولێر و کەرکوکی داوە، ئەوەبو سوپا قەدەغە کردنی هاتوچۆی بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر ڕاگەیاند، پاشان پرۆسەی دەستگیر کردنی بنکەفراوان بەڕێوە چوو ، نزیکەی سێ هەزار کەس لەسلێمانیدا دەستگیرکرا، زۆرینەی دانیشتوانی کەرکوك دەرکران ، کەنزیکەی ١٥٠,٠٠٠ هەزار کەس دەبون ، ماوەیەك دواتر گۆڕێکی بە کۆمەڵ لە سلێمانی دۆزرایەوە کەتەرمی ٢٨٠ کوردی تێدابوو، گەڕەکە کوردیەکانی کەرکوك بەشۆفلێ و بلدۆزەر خاپورکران، لە ٩ی حوزەیراندا چەند ئۆتۆمبیلێك هاتن تائەندامانی شاندەکە بگوازنەوە سەربازگەی ڕەشید وەك ئەوەی کە "یحیی" بەڵێنی دابوو ، بەڵام لەجیاتی ئەوەی بیانبەن بۆ سەربازگەکە ڕێك بردیانن بۆ زیندانەکان، هەروەها پۆلیس دەستیکرد بەهەڵمەتی ڕاوەدونانی بەرفراوانی چالاکوانان لە بەغداد، نزیکەی (٧٠٠)کەس دەستگیر کران، سەربازە کوردەکان

لەیەکەکانیان جیاکرانەوە و نێردران بۆباشور کارمەندە کوردەکان لەئەرکەکانیان دەرکران، وەزیری دەرەوە "السعدی" کۆنگرەیەکی میدیایی بەست و شەڕی دژی کوردەکان ڕاگەیاند (٢٤) کاتژمێر بۆبارزانی دیاریکرا بۆ خۆبەدەستەوەدان ، "مەهدی عماش" وەزیری بەرگری هەوڵی بۆ کەمکردنەوەی بارستایی کوردەکان داو وتی: "ئەمە جەنگ نی یە بەڵکو هێزەکانی سوپا لەسەیرانێکی نیشتمانی دان".

سوپای عێراق دابەشکرا کە ٤ فیرقەی لەکۆی ٥ فیرقە لە باکور بوو لەناوچە کوردیەکان بۆ دووکەرتی کارکردن .

کەرتی باکور: کە لەسنوری سوریاوە درێژدەبوەوە بۆ "عەمادییە و عەقرە" وە کەرتی ڕۆژهەڵات: لە ڕەواندزەوە هەتا سلیمانی.

تەنها سێ فیرقەی عێراقی بەپێکهاتەی تەواوە بوون ، بەڵام فیرقەی چوار نیوەی لە "حەبانییە" بوو، نیوەکەی تریشی بەسەریەکەکانی دیکەدا دابەشکرابوو، سوپای عێراقی زۆر بە باشی بەچەکی سۆڤیاتی پڕچەك کرابوو، بەتایبەت تۆپی "٥ملم" ، و زیاتر لەگەڵ زرێپۆش و تانك، ئەمە جگە لە پڕچەككردنی بە چەکەمەنی بەریتانی کۆن ، نزیکەی (٥\٤)ی سوپای عێراقی کە نزیکەی ٤٠ هەزار سەرباز دەبوو مامەڵەکردن لەگەڵ کوردەکان تەرخان کردبوو.

بەڵام هێزی ئاسمانی عێراقی پڕچەككرابوو بەفڕۆکەی سۆڤیاتی، " ٤٠ فڕۆکەی شەڕکەر لەجۆرەکانی "میك ١٥،١٧،١٢" و فڕۆکەی بۆمبهاوێژ لەجۆری "یۆشن" لە ١٠ فڕۆکەی بۆمبهاوێژ لە جۆری "تۆبۆلۆڤ ١٦ " ، ئەمە جگە لە فڕۆکەی بەریتانی کۆن ، عێراقیەکان بە شێوەیەکی گشتی فڕوکەیان بەکاردەهێنا بۆڕوخاندنی گوندەکان و سوتاندنی دانەوێڵەکان ، بەڵام زوو بۆیان دەرکەوت کەفڕۆکەکان کارانین ، فڕۆکەی "میك" لەبەرزایی زۆر بەسەرشاخەکاندا دەفڕن و فڕۆکەی "یۆشن"یش زۆر ووردنەبوو لەئامانجەکانیدا ، بۆمبارانی کوردەکان بەفڕۆکەی شەڕکەری سۆڤیاتی کاریگەری کردە سەرئاستی پشتگیریکردنی سۆڤیەت

بۆحکومەتەکەی عارف ، بەرە بەرە پەیوەندی نێوان سۆڤیەت و حکومەتەکەی عارف کاڵ بووەوە، ڕوسیا پرچەککردنی عێراقی ڕاگرت ، بەمەش بۆمبارانەکان ڕێژەیان کەمبوەوە.

"مۆسکۆ" چەند نازناوێکی بەسەرحکومەتی عێراقدا بڕیەوە ، لەوانە "باندی پیاو کوژان" ، "پلانگێڕە نازی و فاشیستەکان" و حکومەتی سۆڤیەت بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە تێیدا پشتگیری لەمافی کوردەکان کردوە، وە ئەو مامەڵەی کە عێراقیەکان لەگەڵیانی دەکەن بە خیانەت لە شێوازی هیتلەر و بەربەریەتێکی فاشیانە ناوبردووە..

پاش ٥ مانگ لە سەفەری قاهیرە ، تاڵەبانی لەئەوروپاوە گەڕایەوە بۆکوردستان و لەتشرینی دوەمی ١٩٦٣ گەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی شەرکەرەکان ، لە "چەمی ڕەزان" ، وپاش ماوەیەکی کەم دوو ئەفسەری پلەبەرزی عێراقی هاتن بۆلای تا لەئەگەری ئەوە لێی بپرسن کە ئایا ئارەزوی بەردەوامبوونی دانوستان دەکەن یان نا؟؟، تاڵەبانی زۆر بەڕقەوە پێیوتن کە دەستەی دانوستانی پێشوو کەخۆی سەرۆکایەتی دەکرد ئێستا وا پشت شیشەکانی زیندانەوەن، لە ئایاری ١٩٦٣ ەوە لە بەغدادن بڕۆن ئازادیان بکەن و لەگەڵیاندا دانوستان بکەن".

وە لەوماوەیەدا تاڵەبانی خەریکی ئامادەکاری بوو بۆ ڕاگەیاندنی مافی خۆبەڕێوەبەری یەکلایەنە و دامەزراندنی کارگێڕیەکی شارستانی بەدەستپێشخەری ئەو گوند و شارۆچکەکان نوێنەری خۆیان هەڵدەبژارد ، بەڵام بارزانی دەیزانی کە پیلانی نوێ چاوەڕێی دەکات ، بۆیە دەستی کرد بە دروست کردنی پەیوەندی ڕاستەقینە لەگەڵ ئیسرائیل.

## بەشی شەشەم/ ڕادیۆی بەغداد نهێنیەك ئاشكرا دەكات

بەدرخان لەسەردانەكەیدا كە لەساڵی ١٩٦٣ بۆ ئیسرائیل ئەنجامیدا بەنهێنی "دەستپێشخەری"یەكی بارزانی هێنابوو تا بیگەیەنێت بە لایەنە پەیوەندیدارەكان لەئیسرائیل.

بەئاشكرا دیاربوو كە ئەو ئاگاداری وردودرشتی ئەو شتانە نیە كە لەو ماوەیەدا ڕویان داوە بەڵام هەمان ڕوداوەكان ئاگادارە بۆیە هەموو ووشەكانی زۆر بەتوندی دەوتن و هەوڵی دەدا شێوازێكی خێرایان بداتێ.

لەسەردانەكەیدا بەدرخان لەگەڵ سەرۆكی حكومەت "دەیڤید بن گۆریۆن" كۆبوەوە ،هەروەها لەگەڵ "گۆڵدا مائیر" و لەگەڵ سەرۆكی ئەركان "زەڤی زامیر" و سەرۆكی پۆلی هەواڵگری سەربازی "مائیر عمیت" كە لەوكاتەدا ڕاسپێرابوو بۆ سەرۆكایەتی "مۆساد"یش بەهۆی دەست لەكاركێشانەوەی "ئایسەر هاریل" و چەند كارمەندێكی پلەبەرز.

لە ٤/٥ دا بن گۆریۆن لە ڕۆژانەكەیدا تۆماری كردوە دیدارێك لەگەڵ ئەمیرێكی كورد "هاوڕێكەی ڤیشەر" سەردانی خاكی ئیسرایلی كردوە ، لەساڵی ١٩٤١سەردانی ئیسرائیلی كردووە ، شەش ملیۆن كورد لەتوركیا هەن ، چوار ملیۆن لە ئێران و دوو ملیۆن لەعێراق و ٨٠٠ هەزار لەسوریا و ١٦٠ هەزار لەڕوسیا و لەبەریتانیا ٨٠٠ قوتابی كورد هەن ، عێراقیەكان بۆمبارانی ١٥٠٠ گوندی كوردیان كردوە كە ٣٠٠ لەوگوندانە بەیەكجاری داڕوخاون داوای ناردنی ئامێری گەیاندن و ڕۆژنامەنوسێكی كرد .لەڕێگەی ئێرانەوە ، لە سەردانی دوەمیدا بۆ ئیسرائیل بەدرخان داوای ئامێرێكی ناردنی بەهێزی ٥ كیلۆواتی دەكرد وە ١٢ ڕاجیمەی "بازوكا" و ژمارەیەك تۆپی دژە فڕۆكە وە یارمەتی دارایی بەدرخان پێشنیاریكرد پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بارزانی ئەنجام بدرێت بەجۆرێك سەرەتا بەدیداری ئەو و كەسێكی نائیسرائیلی دەست پێبكات كەجێی بڕوایی ئیسرائیل بێت وەك ڕۆژنامەنوسێك ئەم بارودۆخە بۆ بارزانی هیچ نامۆ و نا

سروشتی نەبوو ، پەیوەندی بەجیهانی دەرەوە هەبوو لەڕێی ڕۆژنامەنوسەکانەوە ، بەتایبەت ڕۆژنامەنوسە ناودارەکان وەك "شمیدت" لەڕۆژنامەی "نیۆرك تایمز" و "دەیڤید ئادەمسۆن" لە ڕۆژنامەی "واشنتن ستار" و "ئاریك ڕۆلۆ" لە ڕۆژنامەی "لامۆند" و "فرانسۆ شوپا" لەڕۆژنامەی "لۆفیگارۆ" ، ئەو ڕۆژنامەنوسانە گەشتی ماوەدرێژ و ماندوکەریان ئەنجام دەدا بۆ چیاکانی کوردستان لەڕێگای ئێرانەوە و لەگەڵ بارزانی کۆدەبونەوە ، لەناوچەی جەنگەکاندا دەژیان هەواڵیان لەسەر قەبارەی ئەو نەهامەتیانەی کەکوردەکان تێیدا دەژین بۆ جیهان دەگواستەوە.

لەیەکێ لەوبەڵگەنامانەدا کە مۆساد دەربارەی کێشەی کورد پاراستویەتی هاتوە : پەیوەندی لەگەڵ کوردەکاندا بەڕێکەوت دروستبوو ، لەوانەیە بەهۆی سوربون و دەستپێشخەری بەدرخان بووبێ کەتوانی پەیوەندیەکی باش لەگەڵ زۆر کەسایەتی باڵای ئیسرائیلی دروست بکات.

پاش تێپەڕینی مانگێك بەسەر سەردانەکەی بەدرخان بۆ ئیسرائیل ، بڕیاردرا بەڕاسپاردنی مۆساد بەسەرۆکایەتی "مائیر عەمیت" بۆچارەسەری کێشەی کورد.

لە ئایاری ١٩٦٣ دا "عەمیت" گەیشتە تاران بۆ ئامادەبون لە کۆبونەوەی خولی دەزگا هەواڵگریەکانی ئیسرائیل و ئێران ، لەوێ سەرۆکی دەزگای "ساواك" "فەفرفان"ی لەنزیکەوەناسی و لێپرسراوێکی ئێرانی هەڵوێستی ئێرانی ئەوسای سەبارەت بە بارودۆخی کورد بەمجۆرە لێکدایەوە " ئێمە لەگەڵ یاخیبونی کورد لەعێراق وەك هەلێك مامەڵە دەکەین کەناگەڕێتەوە سەرەڕای ئەوەش بەهۆی کەمینەی کوردی ئێرانەوە و بەهۆی پەیوەندیمان لەگەڵ تورکیا ناتوانین بەئاشکرا پشتگیریان بکەین، وە ئێمە حەزناکەین یاخیبونەکە پەرەبسێنێت و دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی لێ بکەوێتەوە".

وە لەچاوپێکەوتنیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی "لۆمۆند"ی پاریس "شا" وتبوی : "ئێمە لەگەڵ سەربەخۆیی کوردەکاندا نین لەعێراق بەڵام دەمانەوێت کوردەکان

بەهەموو مافەکانیان بگەن، کوردەکان جیاوازن لەعەرەب" ، جێی ئاماژەپێدانە شا هەمیشە جیاوازی کردوە لەنێوان ئێرانیەکان ، "هیندۆئەوروپی و ئاریەکان" لەگەڵ "عەرەبە سامیەکان" ، ئەو جیاکاریەش زۆر بەجوانی دەردەکەوێت لەپەیوەندی بەستنی لەگەڵ کوردەکان کە سەر بەڕەگەزی "هیندۆئەوروپی"ن ، سەرەڕای ئەوەی کە موسوڵمانی سوننەمەزهەبن ، وە لە پێشانگایەکدا کەسایەتیەکی ئێرانی پلەبەرز وەڵامی کەسایەتیەکی ئیسرائیلی دابوەوە سەبارەت بە بارودۆخی کورد لەعێراق ، لێپرسراوە ئێرانیەکە وتبوی : ئێمە ئارەزومان هەیە کە ئاگری یاخیبونی کورد لەعێراق بەردەوام بێت بەڵام بەمەرجێك نەبێت بەئاگر کەوتنەوەیەکی گەورە.

لە ژێر ڕۆشنایی ئەو بیرۆکانەدا ئیسرائیل لەم قۆناغەدا هیچ بیرۆکە یان پێشنیار یان ئاماژەیەکی بەئەگەری هاریکاری ئیسرائیلی - ئیرانی - کوردی نەدا بەدەستەوە ، هیچ گومان لەوەدا نەبوو کە بەردەوامبونی جەنگەکە بەشێوەیەکی ڕێك و چاودێری کراو مەسەلەیەکی هەستیاربوو ، ئێرانیەکان لەم ماوەیەدا نەیاندەویست زۆر لەبارەیەوە بدوێن ، لەلایەکی ترەوە ئیسرائیل دۆسیەی کوردی بەهەلێك دەزانی کە بەزێڕ ناکڕدرێت ، ئەمە تەنها ناگەڕێتەوە بۆ بەهائەخلاقیەکان بەڵکو هەلێکیش بوو بۆ لاوازکردنی سوپای عێراقی کە ڕۆژانی زووی بە بیردەهێنایەوە و هۆکاری تریش هەبون.

لەسەر ئەوبنەمایە سەرۆکی موساد پێشنیاری بۆ "بن گۆریۆن" کرد لەبەردەم سەرۆکی حکومەتدا کاربکەن بۆبەکارهێنانی شێوازی گونجاو بەبێ ئەوەی توشی کێشەبین لەگەڵ تورك و ئێرانیەکاندا ، ڕەزامەندی ئەوی بەدەستهێنا ، "عمیت" زۆر دودڵ بوو تا لەدوایدا "ڕ" ی هەڵبژارد کە ئیسرائیلی نەبوو وە هەتا ئیستا ناوەکەی ئاشکرا نەکراوە.

لەکتێبەکەیدا بەناوی "العراق والکردستان" توێژەری عێراقی "سەعد الجواد" نوسیویەتی دوو بەکرێگیراوی ئیسرائیلی هاتن بۆکوردستان لەوماوەیەدا لەژێرناوی ئەوەی کە دوو ڕۆژنامەنوسی ئەڵمانین ، لەوانەیە مەبەستی "ڕ" بێت.
لە ٢٥ی حوزەیرانی ١٩٦٣ پیاوانی مۆساد توشی شۆك بون کاتێك وەرگێردراوی بڵاوکراوەی هەواڵی عێراقیان دەخوێندەوە کەدەیوت پەیوەندیەکی پتەو هەیە لەنێوان مەلا مستەفار بارزانی و ئیسرائیل ...!
دەسەڵاتدارانی عێراق زانیاریان دەستکەوتوە جەخت لەوە دەکاتەوە کەئیسرائیل هاوکاری بارزانی کردوە لەو نێوەندەدا وێستگەیەکی ناردن و پارەی پێداوە ، ڕاستی ئەو زانیاریانەی لە هەواڵەکەدا هاتبوو ، کاتی بڵاوکردنەوەی هاوکاتی نادرنی "ڕ" بوو بۆ کوردستان ئەمە بیرۆکەی ڕێکەوتبونی ئەو هەواڵەی دورخستەوە ، "مۆساد" گومانی لەسەر زۆران لا دروست بوو لە نیویاندا "ڕ" خۆی کە وەك ڕۆژنامەنوس کاری دەکرد ، جگەلەوەی کەدەوروبەری بارزانی زۆرجێگەی متمانە نەبوو ، ئەگەری دزەکردنی زانیاری هەبوو ، تەواو ڕون بوەوە کە بەنهێنی کارکردن لەم جۆرە پرۆسانەدا کارێکی کورتخایەنە و بەبێ هاریکاری ئێران و ساواك ناتوانرێت پەرە بە "پرۆژەی ئیسرائیلی – کوردیی" بدرێت.
ساواك لەوکاتەدا بەشێوەیەکی سنوردار دەستی هاوکاری بۆ یاخیبوەکان درێژدەکرد ، بەڵام سەرکردایەتی کورد متمانەی بەئێرانیەکان نەبوو و لەوماوەیە بارزانی و "ئیبراهیم ئەحمەد"ی سکرتێری گشتی پارتی دیموکرات گەیشتبونە لێکتێگەیشتنێك هەرچەند گومانی زۆریان لەیەکتر هەبوو ، کە ئەمەش کاریگەری لەسەرناوچەکانی باکوری ناوچە کوردیەکان کە بەدەستی بارزانیەوە بوو ، لەگەڵ ناوچەکانی باشور کە لایەنگرانی "ئیبراهیم ئەحمەد"ی لێ کۆبوبوەوە هەبوە، ئیبراهیم ئەحمەد بە بارزانی وت: "ئێرانیەکان داخوازن ئێمە بەڕادەیەك بەهێزبین کەتوانای بەرەنگاری عێراقیەکانمان هەبێت لەهەمان کاتدا حەزدەکەن لاوازبین تانەتوانین بگەینە بەدەستهێنانی سەرکەوتن" ، بارزانی

هاوڕا بوو لەگەڵی ، ئیسرائیل نامەیەکی نارد بۆبارزانی داوای لێ کردبوو کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵدا ببەستێت ئیبراهیم ئەحمەدیش لیستێکی فراوانی داخوازیەکانی یاخیبوانی ئامادەکردبوو بەم شێوەیە،" ١٠ هەزار کلاشینکۆف ، ڕاجیمەی بازۆکا ، ژمارەیەك مین ، دەزگای پەیوەندی و ، وێستگەی ناردنی بەهێز ، وە پارە و هەستانی ئیسرائیل بە ڕاهێنانی کردەیی بەشارەزایانی تەقینەوەو هونەری ڕادیۆ".

* * *

لە ٢٦ ی حوزەیرانی ١٩٦٣ "لیڤی ئاشکۆڵ" بووە سەرۆکوەزیرانی ئیسرائیل هەروەها بووە وەزیری بەرگریش "ماهیر عمیت" هەرزوو چۆنیەتی پەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی تێگەیاند.

عمیت دەڵێت ئاشکرابوو کەپێویستە پەیوەندیەکانمان لەگەڵ ئێراندا بەردەوام بێت ، بەلام دۆسیەی کورد لەخشتەی کارەکاندا بوو، سەرۆکی حکومەتم ڕازی کرد ڕێگەمان بدات بە کارکردن لەگەڵ کوردەکان ، چونکە کارکردن لەگەڵ کوردەکان لەبەرژەوەندی خودی ئێرانیەکانیشە.

"ئاشکۆڵ" و "عمیت" لەسەرئەوە ڕێککەوتن کەهاوکاری کردنی کوردەکان بەهاوکاری ئەو لێپرسراوە ئێرانیە بێت کە وتبوی دەبێت ئاگامان لە دارەئاگراویەکە بێت کە نەبێتە هۆی ئاگرکەوتنەوە.

عمیت لەوماوەیەدا بۆیدەرکەوت کە کوردەکان سەرکەوتوو بون لە جێبەجێکردنی ئۆتۆنۆمیی یەکلایەنە لەناوچەیەکی دیاریکراو لەکوردستانی عێراق ئەو ناوچەیەی کە ڕوبەرەکەی نزیکەی ٣٥ هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشە بوو ، لە ڕۆژهەلاتەوە خانەقین هەتا زاخۆ ، لە ڕۆژئاوا کە نزیکەی یەك ملیۆن کوردی لێ بوو لە کۆی دوو ملیۆن و نیوەکەی کە لە عێراقدا هەن.

بارزانی زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە وەسیەت و ئومێدی باوکی جێبەجێکردوە بەکۆنترۆڵکردنی نێوچەیی دیاریکراو ، بەڵام عارف و حکومەتەکەی ڕەتیان دەکردەوە دان بەو حەقیقەتەدا بنێن بەتایبەت کەپێیان وترا سوپای عێراقی گیری خواردوە لە ناوەڕاستی ئەو ناوچەیەدا ، جگە لەچەند گوندێك و ڕێگەی سەرەکی شارەکان هیچی تری بەدەستەوە نیە .
"تالب حسین شبیب" وەزیری دەرەوەی عێراق ڕایگەیاند کە پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی بەکورد هیچ کات باس نەکراوەو لە بەرنامەی ئێمەدا نیە.
لەودیدارەدا کەلەگەڵ "ئەریك ڕۆڵۆ" ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی لەڕۆژنامەی "لۆمۆند" سازی کردبوو لە ٧ی ئایاری ١٩٦٣ وە هەروەها لە ڕۆژنامەی "هائاریتس" ی ئیسرائیلیش بلاْوکرابۆوە ، بارزانی بە تاوانبار ناوبردوە و وتویەتی : پێویستمان بە ماوەیەکی کەمە تا ئەم یاخیبونە بۆ هەتاهەتایە تێك بشکێنین.
بارزانی بەم وتانەی هیچ کاریگەر نەبوو ، بەتایبەت بەهۆی هاوکاری هەندێ وڵاتانی عەرەبی بۆداخوازیەکانی ، کە پێیان وابوو کورد مافی ئەوەی هەیە بەشی خۆیان لەقازانجی ئەو نەوتە وەربگرن کە لەبیرەنەوتەکانی نێوچەکوردیەکان هەڵدەقوڵێت ، بەڵکو هەمیشە ئامادەبوو بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ سوپای عێراقی ، بەڵام ئەو ڕێکەوتنی بەستبوەوە بەدامەزراندنی وڵاتێکی دوو نەتەوەیی عەرەب و کورد .
بە زمانە شێوەکاریەکەی ، و بە کارهێنانی پەند و وتە کە زمانی کوردی زۆری تێدایە بارودۆخی عێراقی بەمجۆرە بۆ "ئەریك ڕۆڵۆ"ی ڕۆژنامەنوس شیدەکردەوە : (( ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕاوچیەکی چەکدار لەناوچەیەکی شاخاوی تەقەی لە گورگێك کرد و برینێکی بکوژی تێکرد، بەڵام گورگەکە توانی هەڵبێ، بەرەولەوەڕگایەك ، بەڵام لەوێ شوانێك بەردێکی تێگرت و گورگەکە مرد، شوانەکە وایزانی کە بەهێز و قوەتی خۆی ئەو گورگەی کوشتوە، هەمان شت

ڕوده‌دات به نیسبه‌ت حکومه‌تی عارفه‌وه ، که‌پێی وایه ئه‌و "عبدالکریم قاسم"ی کوشتوه ، ئه‌وه له‌کاتێکدا ڕاسته‌قینه ئه‌وه‌بوو که قاسم و حکومه‌ته‌که‌ی له‌هه‌ناسه‌دانی کۆتایدا بوون به‌هۆی ئه‌و گورزانه‌ی که کورد تێی سره‌واندبوون)).
((دادپه‌روه‌ری وایه که ڕاوچی وشوانه‌که زمانێکی هاوبه‌ش بدۆزنه‌وه بۆ له‌ناوبردنی هه‌موو ئه‌و گورگانه‌ی له‌سه‌رخاکی عێراقن ))
به‌ڵام ئه‌م قسانه گوێیه‌ك نه‌بوو بیان بیستێت .
له‌وماوه‌یه‌دا په‌یوه‌ندی له‌نێوان "عارف" و "جه‌مال عبدالناصر"دا زۆر به‌تین بوو ، نزیکبونه‌وه‌یه‌ك وای لێکردن هه‌وڵده‌ن بۆ دروستکردنی یه‌کێتی له‌نێوان هه‌ردو وڵات دا ، به‌ڵام له‌کۆتایدا نه‌گه‌یشتن به هیچ.
خۆرهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست له‌وده‌می دا له زۆر ڕووه‌وه له کوڵاندا بوو، "محمد ره‌زا په‌هله‌وی" شای ئێران یه‌که‌م سه‌رکرده بوو که هه‌ستی به ترس ده‌کرد.

## بەشی حەوتەم/ پرۆسەی ئەسینا بە پاریس دەستی پێکرد

کارمەندێکی باڵای ئیسرائیلی لەو کۆبونەوەیەدا کە لە ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٦٣ لەپاریس رێکخرابوو بەهاوتا ئێرانیەکەی ووت " کوردەکان داوای هاوکاریان لێ کردوین، بەرژەوەندیەکانمان وادەخوازێت کەیارمەتیان بدەین، بەڵام ئێمە نامانەوێت ئەو کارمبکەین بەبێ رازی بونی ئێوە ".

ئەو زانیاریانەی کەکارمەندە ئیسرائیلیەکە خستبونیەروو و ئەودیدارانەی لەگەڵ بەدرخان و ناردنی "ر" بۆ کوردستان لە خۆگرتبوو ، ئێرانیەکە خۆشحاڵ دیاربوو کەلەئیسرائیلیەکەی دەبیست کەدەیانەوێ هاوکاری کوردەکان بکەن ، بەپارەو وێستگەی ناردن و وتی: "پارە شوێنەوار لەدوای خۆی بە جێناهێڵێت"

ئەو دیدارە پاریسی یە رێکەوتنێکی پێنج خاڵی لێکەوتەوە لەنێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا بۆهاوکاری کردنی کوردەکان کە ناونرابوو پرۆسەی "ئەسینا" ، شیاوی باسە ئەم ناوە ناوێکی وەهمیە و ناوی راستەقینەی پرۆسەکە تائیستاش رانەگەیەنراوە ، ئیسرائیل لەئێران زیاتر گرنگی دەدا بە دروستبونی ئۆتۆنۆمی بۆکوردەکان ، چونکە ئۆتۆنۆمیەکە هەرچۆنێك بوایە سودی بۆ ئیسرائیل دەبوو.

"ماهیر عمیت" لەدیدارێکی رۆژنامەوانیدا دەڵێت : "شا" چەندهەستێکی دژیەکی هەبوو لەلایەکەوە خۆشحاڵ بوو بەدروستکردنی کێشە و ململانێ بۆ عێراقیەکان لەلایەکی ترەوە ترسی هەبوو لەوەی کە سەرکەوتنی کوردەکان لەبەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی کاریگەری دەبێت لەسەر ئەو ملیۆنان کوردەی لەوڵاتەکەیدا هەبون.

یاخیبونی کورد لەداهاتوی نزیکدا خزمەتی هەردوو وڵاتەکەی دەکرد ، وایدەکرد لەحاڵەتی جەنگدا سوپای عێراق نەتوانێت هێزی پاڵپشت بنێرێت بۆ "سوریا" یان بۆ "ئەردەن" ، هەروەها وایدەکرد کە عێراق ناچاربێت هێزەکانی لەناوچەی

"شط العرب" و "خوزستان" بكشێنێتەوە بۆكوردستان ، كە ئەو دوو ناوچەیە زۆرگرنگ بوون بۆ ئێران .

هاریكاری ئیسرائیلی - ئێرانی بەزۆر حاڵەتی هەڵكشان و داكشاندا دەڕۆشت ، هەندێ جار ئێرانیەكان دەیانویست سزای كوردەكان بدەن ، چونكە هەنگاوێكیان ناوە بەدڵی ئەوان نەبوە ، بۆ نمونە پەیوەندیكردن لەگەڵ لایەنی عێراقی بەبێ ئەوەی ئێران ئاگادار بكەنەوە .

جێگەی ووتنە كەیەكەم ئامادەكاری ئیسرائیل بۆهاوكاری كوردەكان لەسەرخاكی ئێران و لەوێوە بووە، لەوێوە ئیشی "ساواك" بوو بیگەیەننە دەستی كوردەكان .

عمیت لەوبارەیەوە دەڵێت : (( هەرچەندە ئێمە هەردەم هەوڵمان دەدا كە لەڕێكەوتننامەكە لانەدەین ، بەڵام پەیوەندیمان لەگەڵ ئێرانیەكان هەڵكشان و داكشانی زۆری بە خۆوەدەبینی زۆرجار ئێرانیەكان بەئەنقەست ئەو شتانەی كە ئێمە پێمان دەوت "گوازراوەكان" كە بریتیبوون لەكەلوپەلە نێردراوەكان بۆ كوردەكان ، ڕایاندەگرت و نەیان دەهێشت بگات)).

((ئێمە هەموو كەل و پەلەكانمان دەگواستەوە بۆئێران ئەویش دەیگواستەوە بۆ ناوچەكوردیەكان ئەگەر بیانویستایە ، ئەگەر نەشیانویستایە لای خۆیان گلیان دەدایەوە)).

توێژەر "ئەدمۆند گاریپ" لە كتێبەكەیدا "دۆسیەی كورد لە عێراق" دەڵێت : ((مۆساد و ساواك دەزگایەكی هەواڵگری كوردی زۆر زیرەكیان دروست كردبوو بۆكۆكردنەوەی زانیاری لەسەرعێراق ، بارودۆخ و هێزەكانی عێراق بەدڵنیاییەوە ئەو دەزگایە هیچ زانیارییەكی كە دەستی دەكەوت لەدەزگای هەواڵگری ئێرانی و ئیسرائیلی نەدەشاردەوە ، دەتوانین بەڵگەی ئەو قسەیەمان لە لێدوانەكانی "نێوەندە" عێراقییە نیمچە فەرمیەكان دا دەست بكەوێت)).

له ۳۰ی کانونی دوەم و ۲ی شوباتی ۱۹۷۲ ڕۆژنامەی "الثورة"ی نزیك لەحکومەتی عێراقی بلاّوی کرۆدتەوە "کوردەکان زانیاری گشتگیریان بۆ هەریەك لەهەوالگری ئێران و ئیسرائیل گواستۆتەوە" و لەکتێبەکەیدا "جاسم م. عبدالجهانی" کە لەزانیاریەکانیدا پشتی بەلێپرسراوێکی بالاّی حکومەتی عێراقی بەستووە دەڵێت: "عێراقیەکان لەو شەڕانەدا کەلەنێوان ئەوان و کوردەکاندا ڕویداوە لەسالاّنی ۱۹۷۳ -۱۹۷٤ لەسەرکردایەتی هاوینەی مستەفا بارزانی لە "حاجی ئۆمەران" چەند بەلگەنامەیەکیان دەست کەوتوە ، کە پەیوەندی هەوالگری لەنێوان مەلا مستەفا و ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل دەسەڵمێنێت".

ئێرانیەکان زۆر بە وشیاریەوە بەردەوام بون لەمامەڵەکانیان هەرگیز ئەو گۆڕانکاریە سیاسیانەیان لەیاد نەدەکرد کە ڕویان دەدا لەسەر گۆڕەپانی عێراقی ، وە ئەو ڕەهەندانەی کە کاریگەری لەسەر ناوچەکە دەبێت.

لەو نامەیەدا کە عێراقیەکان ناردویانە بۆ میسریەکان : (( ڕازی نابین ئەگەر ئەو گۆڕانکاریانەی لە گۆڕەپانی عێراقدا ڕودەدەن ببنەهۆی لاواز کردنی حیزبی بەعس و بەهێزکردنی ناصریەکان)).

"دەیڤید کرۆن" کە٤سالّ لەماوەی نیوەی دووەمی شەستەکاندا کاری کردوە دەڵێت : شێوازی دژیەکی ئیرانییەکان نامۆ نەبو بەنسبەت ئیسرائیلیەکانەوە بەلاّم ئەو بارودۆخەبووە هۆی زۆر بەهەلەتێکەشتن ، ئیمە دەمانزانی لەڕێگەی ئێرانیەکانەوە نەبێت هیچ یارمەتیەکمان ناگات بەکوردەکان بۆیە هەوڵماندا تا ئەوپەری توانا بەهەڵەتێگەشتن لای ئەوان کەم بکەینەوە".

* * *

"پرۆسەی ئەسینا" لەتەموزی ۱۹٦۳ دەستی پێکرد ، نوێنەری مۆساد لەتاران کەناوی "ئە" بو ڕاسپێردرا بۆ بەدواداچونی پەیوەندی لەگەڵ ئەو کەس و لایەنانەی کە ئیسرائیل پەیوەندی ڕاستەوخۆی پێیانەوە نیە، بەهاوکاری لەگەڵ

ژەنەڕاڵ "موسازد" جێگری سەرۆکی ساواك ، و لێپرسراوی پۆلی پرۆسەکان ، ئەم دوانە هەڵسان بەپێکهێنانی دەزگایەکی دینامیکی کەپێکهاتبوو لەڕاوێژکارانی ئیسرائیلی و ئێرانی "ئەفسەر و ڕاوێژکاری هونەری" تا بەشێوەیەکی هەمیشەیی کاربکەن بۆخزمەتکردنی سەرکردایەتی بارزانی، پێویست بوو لەسەر ئەوڕاوێژکارانە کەلەسەرکردایەتی بارزانی بمێننەوە، بۆ ماوەی دیاریکراو -٣مانگ- بەجۆرێك لێپرسراوانی موساد بەشێوەی خولی سەردانیان دەکردن، ئەمە جگە لەسەردانی کارمەندی ئیسرائیلی تربۆلایان، لەجێگر وەزیر و ئەفسەر بەپلەی "لیوا" لەسوپای ئیسرائیلی ، هەمو ئەو ئەفسەر و لێپرسراوانە لەگەڵ چەك و کەلوپەلەکان بە ناو (ئێران)دا دەڕۆیی ، پاشتر هاوکاریەکانی ئێران کەتیبەی تۆپخانەی چەك و تەقەمەنیەکی زۆری لەخۆگرت.

لەتەمموزی ١٩٦٣ لەسەرداخوازی "ئیبراهیم أحمد" و لەسەر داوایی "ڕ" یەکەم کەس ڕاهێنانی پێکرا لەسەر"ڕادیۆ" و ناویان نا "ئەندازیار" ، ئەو ئەندازیارە لەسەربازگەی "ئیبراهیم احمد"ەوە بۆسەربازگەکەی بارزانی گوازرایەوە لەوێوە ڕادیۆکەی بەڕیوەدەبرد تا کۆتایی یاخیبون لەساڵی ١٩٧٥.

ئیبراهیم ئەحمەد بەهەمانشێوە پەیوەندی هەبوو بەناردنی یەکەم باربووی چەکی ئیسرائیلی بۆکوردستان کە پێکهاتبوو لە "دە" ڕاجیمەی "بازوکا" تەقەمەنیەکانی لە١٨ی تەمموزی ١٩٦٣ گەیشتنە شوێنی دیاریکراوی خۆی.

ڕۆژنامەنوس "ئەریك هۆلنسیدۆرۆف" کەسەردانی قەڵای کوردەکانی کردبوو ، پاشان لە١٣ی تەموزی ١٩٦٣ لە ڕۆژنامەی "فرانکفۆرت ئالگامینا تستۆنگ" بڵاویکردۆتەوە : ((کوردەکان وێستگەیەکی ناردنیان لایە کەتوانای کارپێکردنی ٣٠ دەزگای پەخشی هەیە ، هەروەها ئەو وێستگەیە دەتوانێت هیمای هەر شەپۆلیك شیبکاتەوە کەعێراقیەکان پەخشی دەکەن لەماوەی ١٢ کاتژمێر لەکاتی دەرچونیەوە".

بەردەوام دەبێت : " عێراقیەکان دەیانەوێت کێشەی نێوخۆیی لەناو کوردەکاندا دروست بکەن، ڕاگەیاندنی عێراقی هەڵدەستێت بەبڵاوکردنەوەی ناوی کۆمەڵێك کەسایەتی کوردی کەپشتگیری لەسوپای عێراقی دەکەن، ئەو کەسایەتیانەش خاوەن مولکن و لەوشوێنانە دادەنیشن کە جەنگ وکاولکاری دەستی بەوان و بەئارامیان ڕادەگات ، سەرەڕای ئەوە سەرکەوتنی عێراق لەجەنگدا پێدەچێت دووربێت فڕۆکەوانە عێراقیەکان نازانن چۆن لەشەودا بۆمبارانی ئامانجەکان بکەن، بۆیە تەنها لەڕۆژدا بۆمباران دەکەن، بەڵام کوردنشینە کوردەکان لەوکاتەنەدا گوندەکانیان چۆڵ دەکەن، وە ڕوو لەکێڵگەو ناوچە شاخاویەکان دەکەن، بۆیە بۆردومانەکە سودێکی ئەوتۆی نابێت".

"عێراقیەکان ناچارن بۆمبی ناپاڵم بەتایبەتی بەکاربهێنن، بەڵام ئەو بۆمبانە زۆر ترسناك نین ، بەتایبەت لەبەرئەوەی شوێنی دوور لە ئامانجەکانیان دەپێکێت".

زانیاری زیاتر دەدات: ((چوار فڕۆکەی "ئالیۆشن" و دوو فڕۆکەی "میگ" ، نزیکەی ١٦ بۆمبیان بەخانوەکانی گوندی "ماوەت"ەوە نا ، کەژمارەی ماڵەکانی "٢٥٠" ماڵ زیاتر نابێت ، جگە لەوەی تەنها چوار ماڵی خاپورکرد و یەك کەسی کوشت ، کەچی پاش چەند سەعاتێك ڕادیۆی عێراقی بڵاویکردەوە کە ئەو دێیە لەسەرڕوی زەوی سڕاوەتەوە..!!)).

خەیاڵکاری و زیادەڕەوی تەنها عێراقیەکان نایکەن، بەڵکو کوردەکانیش هەمان شت دەکەن، بۆ نمونە کاتێك کوردەکان دەتوانن چەند سەربازێکی عێراقی بکوژن ، لە کەمینێکدا ، لە ڕادیۆوە ڕایدەگەیەنن کە"٢٠٠" سەربازی عێراقیان کوشتوە ، ئارەزوی خەفەکراوی خۆیان نەشاردەوە بۆڕۆژنامەنوسان بە ئەنجامدانی پرۆسەی پاڵەوان بازی وەك تەقاندنەوەی بیرە نەوتەکان لە کەرکوك یان موسڵ یان لەسەرخاکی کوردستان".

ڕاگەیاندنی ئەم نیەتە لەلایەن کوردەکانەوە بووتەهۆی دەستکەوتنی پارەیەکی باش ، پێدەچێت پارەی زۆر لە کۆمپانیای نەوتی عێراقی وەربگرن ، لەبەرامبەر ئەنجامنەدانی هیچ پرۆسەیەك لەسەر بیرەنەوتەکان ، بەڵام کوردەکان بەوپارەیە چەك دەکڕن بۆ هێرشکردنە سەر ئامانجە عێراقیەکانی تر.

★ ★ ★

"ئیبراهیم احمد" و زاواکەی "تاڵەبانی" ڕاهاتبون کە ماوەماوە سەردانی ئەوروپا بکەن، بۆئەنجامدانی پەیوەندی پێویست لەگەڵ ئەوروپیەکاندا ، هەروەها بۆچاوپێکەوتن لەگەڵ هۆکارەکانی میدیا لەوێ ، یەکێ لەو دیدارانەی بەر پەیامنێری رۆژنامەی "حیرۆت" لە پاریس "هارون بن ئەفیگدۆر" کەوت لە ۲۳ ی حوزەیرانی ۱۹٦۳ تاڵەبانی بانگەوازێکی زۆر کاریگەری کرد بۆپڕچەککردنی شەڕکەرە کوردەکان ، بەتایبەت چەکی قورس.

پاش چەند مانگێك واتە لە تشرینی دوەمی ۱۹٦۳ تاڵەبانی و ئیبراهیم بە بێ ئاگادا کردنەوەی پێشوەخت گەیشتنە باڵوێزخانەی ئیسرائیل لەپاریس، خۆیان ناساندو داوای کۆبونەوەیان لەگەڵ نوێنەری ئەوسای موساد لەوێ کرد، نوێنەری ئەوسای موساد "مناحیم نەفوت" هەرگیز گەرم وگوڕی ئەودیدارەی بیرناچێتەوە و دەڵێت: "لەیەکێ لە ئوتێلەکان "ئیبراهیم" کە لە بەرامبەرم بوو ووتی: "ئێمە برسین، نان نیە، شەکرو چا نیە" ، تائیستاش شێوازی دەم و چاویی و قسەکانی لەگوێما دەزرنگێتەوە ، بە خۆمم ووت تەماشاکە گەیشتوینەتە کوێ ، ئێمە جولەکە شەڕ دەکەین لە پێناوی مانەوەدا؟ ، گەلێکی تەواو لەبەردەمماندا وەستاوەو داوای هاوکاریمان لێ دەکات".

"ئیبراهیم ئەحمەد" لەگەڵ سەرۆکی موساد "مائیر عمیت" کۆبوەوەو داوای تەقەمەنی "بازۆکا" و کلاشینکۆف و فیشەك و پارە و هاوکاری تری دەکرد، بەڵام مائیر عەمیت وەڵامی دایەوە کە پارەمان لانیە تابتان دەمینێ، چونکە ئیسرائیل

خۆی وڵاتێکی هەژارە ، بەڵام پەیمانی پێ دا کە یارمەتی چەکەمەنی و ئامێرسازی بۆ زیاد بکات ، بەڵام توانی برێکی کەم هەر وەربگرێت.
بەڵام بایەکان بەو ئاراستەیە وانارۆن کەکەشتی دەخوازێت ، ئێرانیەکان دەستیانکرد بەرێگریکردن ، کاتێك "ئیبراهیم ئەحمەد" لەگەڵ نوێنەری موساد لە پاریس دەدوا، "ئە"ی نوێنەری موساد لەتاران رۆیی بۆ لای "فقرقان" و داوای لێ کرد رێگەی بدات کەکوردەکان پرچەك بکات ، بە چەك و ئامادەکاری جەنگی ، سەرۆکی ساواك وەڵامی دایەوە: ((ئێستا مەحاڵە بتوانین چەك بنێرین یان هەر شتێکی تر بەڵام لە دوو بۆ سێ مانگی تردا لەوانەیە...)).
پاش لێکۆڵینەوە دەرکەوت کە ئێرانیەکان تورەبون لەوەی کە کوردەکان بەنهێنی دانوستانیان لەگەڵ عێراقیەکان کردوە بۆ راگرتنی شەڕ.
ئێرانیەکان هەنگاو و جوڵانەوەکانی خۆیان لەگەڵ کوردەکان بە پێی کۆمەڵێك هۆکار و گۆڕاو بەرنامەرێژ کردبوو ،لەوانە: پەیوەندی "ئێرانی- عێراقی" "عێراقی - کوردی" "ئێرانی — کوردی" لەهەندێ باردا هەندێك هۆکار و گۆڕاوی نێو خودی ئێران خۆشی.
مۆساد ئەوکاتە زۆر پەرۆش نەبوو بۆمەسەلەی ناردن و زیادکردنی هاریکاری بۆکوردەکان لەچوارچێوەی "پرۆسەی ئەسینا" دا، بەڵگەم بۆ ئەوە ئەو ئامادەکاریانەن کە بۆناردن لە تشرینی دووەمی ١٩٦٣ دا کراون کەخۆیان لە ١٠ بۆمبهاوێژی بازۆکا و تەقەمەنیەکانی و فیشەکی کلاشینکۆف دەبینێتەوە، بەڵام ئەم ئامادەکاریانە نێردرا وەك پێشتر ئاماژەمان پێ دا ، جگە لەوە رەتکردنەوەی ئێران نەبووە هۆی ئەوەی ئیسرائیل فشاربخاتە سەرئێران، بەهەمانشیوە نوێنەری موساد لەپاریس نەیتوانیبوو کە وەڵامێکی ئیجابی بە "ئیبراهیم ئەحمەد" بداتەوە.

★ ★ ★

"عیزرا دەنین" پیاوی وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیل ، هەوڵی دەدا لە گرنگی پەیوەندی ئیسرائیلی - کوردی کەم بکاتەوە، ئەو کەشارەزا بوو لە بواری خۆرهەلاتی ناوەڕاست ، وە ئەوکاتە لەئێران بوو کاری دەکرد لەبواری هاریکاری کشتوکاڵی ئیسرائیل بۆ ئێران، لەماوەی بونیدا لەئێران زانیاری سەبارەت بە بارودۆخی کوردستان لە عێراق کۆبکاتەوە.

لە کۆتایی ١٩٨٧ "دەنین" ڕایە خودپارێزەکەی خۆی لەوبارەیەوە بڵاوکردەوە لەکتێبێکدا بەناوی "زایۆنی لەهەموو بارودۆخەکاندا" کە وتبوی: (( ڕایە خۆپاریزەکەم لەسەرەتای شەستەکان دا لەپاش ئەو دیدارانەوە دروست بوو کە لەگەڵ بەدرخان و قوتابیە کوردەکان دا ئەنجامم دابون)).

((ئامانجی دیدارەکانم درککردن بەوە بوو کە تاچەند ڕۆشنبیرە کوردەکان ئامادەن واز لە خۆشیەکانی خۆیان بهێنن و کار لە پێناوی نیشتمانەکەیان و ئامانجە نەتەوایەتیەکاندا بکەن، ئایا ئامادەن بگەڕێنەوە بۆ عێراق و دانیشن لەناو گەلەکەیان داو شارستانیەتی و زانیاری بۆ بگوازنەوە؟.

هەرزوو درکم بەوە کرد کە ئەم ئامادەگییە لای ڕۆشنبیر و قوتابیە کوردەکان بونی نیە و ئامادەی قوربانیدان نین لە پێناو ژیاندنەوەی گەلەکەیان و ڕاپەراندنی)).

سەرەڕای ئەوە دەنین درکی بەوەکرد کەپرۆسە سەربازییەکانی عێراق دژی کوردەکان کەپرۆسەی کوشتن و وێرانکاری و لاقەکردنی بە کۆمەڵی لەگەڵدا بوو ، برینێکی لەدەرونی ئەو گەنجانەدا دروست کردبوو ، کە هەرگیز سارێژنابێت ، درکی بەوە کرد کە ئاگری تورەیی و تۆڵەسەندنەوە سالآنێکی زۆر گڕ دەگرێ ، قەرەبووکردنەوەو سازشەکانی عێراقیەکان ناتوانێ بکوژێنێتەوە.

(( بۆم ڕون بۆتەوە کوردەکان نهێنی ناپارێزن ، گەورە بێت یان بچوك ناتوانن لە سنگیانا بیشارنەوە ، و بەکەسی تر نەڵێن هەر نهێنیەکی کوردەکانت دەوێت دەبینی خێرا لەسەر هەموو زمانێکە.

دەنین زیاتر دەڵێت : (( کوردەکان حەز بە فێربونی شێوازی جەنگی چەتەگەری و جەنگی ڕوبەڕو ناکەن ،زۆرکەم خۆیان لەجەنگدا پێکدادان دەست پێ دەکەن بە تایبەت جەنگی شێوازی بەرز و گەورە لەبەرئەوەی لەهەموو ناوچەکانی عێراقدا هەن ، ئەمە هەلی ئەوەی پێداون کە بەکاری تێکدەرانە ژیانی ئابوری لەعێراقدا ئیفلیج بکەن ، بەتایبەت لە بیرەنەوتەکان و هێڵی شەمەندەفەرەکان و پردەکان و ...هتد، هیچ شتێك هێندەی ئەوە ئاسان نەبوو بۆیان بەلاّم نەیان کرد)).

دەنین لەوەش دەترسا هاریکاری ئیسرائیل بۆ کوردەکان جەخت لەسەر ئەو بیرۆکەیەی عەرەبەکان بکاتەوە کەدەڵێت : ((ئیسرائیل دەستی ئیمپرالیزمی جیهانییە)) ، پێی وانەبوو هیچ پێویستیەك هەبێت بۆ ئەوە و هۆشداریدا ، کەئەگەر کوردەکان بکەونە جەنگێکی کاولکارییەوە ، و هاواربکەن بۆ ڕزگاربون ، بەلاّم ئیسرائیل نەتوانێت دەستی هاوکاریان پێبگەیەنێت.

دەنین تا جەخت لەسەر قسەکانی بکاتەوە بەشێکی لەو نامەیە بلاّوکردۆتەوە کە هاوڕێ ڕۆژهەلاّتناسە ئیسرائیلیەکەی بۆی ناردوە لەتەموزی ۱۹٦۳ دا و تێیدا دەڵێت : ((هاوکاری کوردەکان وەك یاریکردن بەئاگر وایە تا ئەگەر دەوڵەتی کوردیش دروست بێت دان بە ئیسرائیل دا نانێت ، باوەڕیش ناکەم ئەو دەوڵەتە دروست ببێت ئەمڕۆ و سبەی ، هەروەها پێویستە پەلە نەکەین لەبەکارهێنانی زاراوەی گەل بۆ کوردەکان)).

دەنین دەڵێت : هەمو ئەم دراوانە لەگەڵ ئەو دیدارەی کە لەگەڵ بارزانیدا ئەنجامم دا بونەهۆی دروست بونی ئەو ڕایە لای من ، وە بە خۆ بەدورگرتن لە تێوەگلانی ئیسرائیل بە هاوکاری کوردەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە تەواوەتی دڵنیا بومەتەوە لەوەی کە هیچ هەلێك نیە لەبەردەم کوردەکاندا بۆ دەستکەوتنی پارچەزەوییەك تاسەربەخۆیی خۆیانی لەسەر ڕابگەیەنن ، جگە لەوە هیچ سنورێکمان نیە هاوبەش بێت لەگەڵیدا بۆیە هاوکاری لەڕێگەی لایەنی سێیەمەوە دەبێت وادەکات کە پابەند بین بەگۆڕانکاری و دەرەنجامەکانیەوە.

گۆرانكارييەكی نوێ بە سەر بەرژەوەندييەكانی ئێراندا هات، لەناوەڕاستی كانونی دووەمی ١٩٦٤ ئێران داوای لە"ئە"ی نوێنەری موساد لەتاران كرد كەبەردەوامی بدات بەناردنی هاوكاريەكانی بۆ كوردەكان بەزوترين كات ، مۆساد دەستبەجێ وەڵامی داواكەيانی دايەوە ، لەهەمان مانگدا دوو بار يارمەتی گەيەنرايە كوردەكان ئەوەی دووەميان پەنجا هەزار فيشەكی ئاگرين لەجۆری ٣٠٣ و ٧٠٩٢ ملم لەخۆگرتبو ، بەڵام باربووی سێيەم كە پەنجا چەكی ڕەشاش لە جۆری "برن" و فيشەكەكانيان بوو بۆی جێبەجێنەكرا ، چونكە ئێرانيەكان ڕەتيان كردەوە بيگەيەنن ، بەبيانوی ئەوەی كەكوردەكان و عێراقيەكان لە ١٠ی شوباتی ١٩٦٤دا گەشتونەتە ڕێكەوتن لەسەر ئاگربەست.

شياوی وتنە ئەگەری ئەوەهەبوو ڕێكەوتن بكرێت چونكە عارف حيزبی بەعسی لەحكومەتەكەی دەركرد ، خەريكبوو جێبەجێبكرێت پاش ئەوەی سەرۆكی عێراق لەكۆنگرەيەكدا وتی: كە ياسای كاتی دان بەمافە نيشتمانيەكانی كوردەكاندا دەنێت لەچوارچێوەی گەلی عێراقدا و لەچوارچێوەی يەكيتی نيشتمانی دا ، حكومەت كاردەكات بۆ گرەنتيكردنی مافە ڕێپێدراوەكان بۆكوردەكان ، و لێبوردنی گشتی بۆ بەندكراوان دەردەكات ، وە هەرزوو دەستدەكات بە تاپۆكردنی شوێنەكانی نيشتەجێ بونيان لەباكور ، و كارگێری شارستانی ڕێپيدراو چالاك دەكات و دەياندات بەخۆيان و گەمارۆی ئابوری لەسەر باكوور هەڵ دەگرێت و قەرەبووی ئەو خاوەن موڵكانە دەكاتەوە كە بەهۆی دروستكردنی بەنداوی "دوكان" و "دەربەنديخان" زەرەرمەند بون و وەزيری كورد دادەمەزرێنی و دان بەزمانی كورديدا دەنێت لەناوچە كورديەكاندا.

وەڵامی بارزانی زۆر بەوشياريەوە بوو كاتێك وتی : ئاگربەست لە نێوان هەردولادا بۆ پێداچونەوەی هەلێكە بۆ جێبەجێكردنی بەڵێنەكان ، كوردەكان خەونيان بە دەستپێكردنەوەی دانوستانەكانەوە دەبينی سەبارەت بە پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی پێيان ، پێيان وابوو كە ئەو فشارە ناوخۆيانەی كە "عارف" توشی بوە ناچاری

دەكات بەپێدانی مافی ئۆتۆنۆمی ، كوردەكان پێیان وابوو كەئەمجارە "عبدالناصر" ناوبژیوانی دەكات لەنێوان عارف و كوردەكان ، چونكە پێی وایە كوردەكان گەورەترین كێشەن لەبەردەم ئەوەدا كە سەركردایەتی جیهانی عەرەبی بەدەستەوە بگرێت.

لەسەرئەو بنەمایە بارزانی بڕیاریدا بەوشیارییەوە مامەڵە بكات و بیرۆكەی چەكداماڵینی كوردەكانی ڕەتكردەوە ، و تا هەستی مەترسی خۆی پیشان بدات ، داواكاری "عارف"ی ڕەتكردەوە بۆ ڕۆشتن بۆ "بەغداد" تا لەڕادیۆی ئەوێوە بانگەوازی راگرتنی شەڕ ڕابگەیەنێت.

بەڵام ئێرانیەكان "عبدالناصر" یان بەگەورەترین دوژمنی خۆیان دادەنا ، بۆیە دانپیدانانیان بەڕێكەوتنەكەدا ڕەتكردەوە ، كە بەدەست هاتبوو گومانیان بە مستەفا بارزانی زۆر زیادی كردبوو.

* * *

لە زەمینەی ئەو بارودۆخەدا كە باسكرا ، دابەشبون لە نێوەندی كوردەكاندا زیادی كرد ، ئەو لایەنەی كەتاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد سەرپەرشتیان دەكرد پەیوەندییەكی پتەویان بەئێرانەوە هەبوو، بارزانی و لایەنگرانیان بە بەكرێگیراوی عەرەب ناودەبرد ، ئەو دوانە زۆر لەبارزانی جیاواز بوون لەبارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی كاروباری كوردەكانەوە ، ئەو دوانە كەبیرۆكەی لیبراڵیان هەبو ، كە زۆرجار وای دەكرد بە شیوعی وەسف بكرێن ، پێیان وابوو بارزانی ستەمكارە هەوڵیان دەدا كە دەسەڵاتی خۆیان لەڕێگەی چینی ڕۆشنبیرە شارییەكان و گەنجانەوە كەتێڕوانینی لیبراڵی پێشكەوتویان هەبوو بچەسپێنن و دەیانخواست كە بیربۆچونە خێڵایەتیەكان كەمبكەنەوە.

ئەو دوانە ئاگربەستی پێشنیاركراویان ڕەتكردەوە ، وەك بەڵگەی لاوازی بارزانیان لەقەڵەم دەدا ، دەستیان كرد بە ناونانی لەنێوان خۆیان و خەڵكی تریشدا بە"خیانەتكار".

له راپۆرتی پۆلی هەوالگری سەربازی ئیسرائیلی دا هاتوە دەربارەی ئەو دوو پیاوە "ئەحمەد و تالەبانی - وەرگێڕ –" ، ئەوان دەیانەوێت لە ڕێگەی چەکەوە بگەنە چارەسەر و هەمو پەیوەندیەکان لەگەڵ حکومەت بپچڕێنن.
"مستەفا قەرەداغی" کە ئەوسا وەك سکرتێری بارزانی کاری کردووە دەڵێ : بارزانی "ئیبراهیم ئەحمەد"ی خۆش نەدەویست تەنانەت لەوڕۆژانەشدا کە بەیەکەوە کاریان دەکرد.
لە ١٠ی ئازاری ١٩٦٤ لە ماڵی ڕۆژنامەنوس "ئەریك ڕۆلۆ" کۆبونەوەیەکی کوردی - فەرەنسی ڕێکخرا بەبەشداری "بەدرخان" و "تالەبانی" و "وانلی" و ژمارەیەك کەسایەتی کوردی تر ، لەوێ تالەبانی ووتی: ((داهاتوو لەناو دەستی پارتی دیموکراتی کورددایە کە ئارەزوی بەردەوامیدانە بە جەنگ ، بەلام بارزانی پێچەوانەی ئەوە دەکات)).
ووتی کە ئەو - تالەبانی - نوێنەری خوازراوی ئەو حیزبەیە ، هەروەها تورەیی زۆری خۆیی لەئیسرائیل نەشاردەوە کە هاریکاری بارزانی دەکات ، و تاوانباری کرد بەنەپاراستنی نهێنیەکان.
لەهەڵسەنگاندنەکانی ئیسرائیل بۆ هەڵوێستەکانی پارتی دیموکراتی کورد هاتوە (( نازانین ئەو هەڵویستە سەربازییەی پارتەکە بەهۆی پەیوەندیوەیەتی بە"ساواك"ەوە کەدژی ڕێکەوتنی کوردی – عێراقیە ، یان بەهۆی هۆکاری ترەوەیە.
جیاوازی نێوان تالەبانی و بارزانی گەیشتە ئاستی جیابونەوەی ئاشکرا و سنوردانان لەنێوان باکور و باشوردا ، هەردولا هێرشی تۆمەتبارکردنی یەکتریان بە خیانەتکار دەستی پێکرد ، هەرزوو جەنگێکی خوێناوی لەنێوانیاندا بەرپابوو، کە لە تەموزی ١٩٦٤ دا گەیشتە لوتکە، بارزانی تێیدا سەرکەوتوو بوو، کە وای کرد "ابراهیم احمد" و سەدان لایەنگری ڕابکەن بۆ ئێران ، پاشان تالەبانیش هەڵات بۆ ئێران، کوردەکان و "بارزانی" داوایان لە ئێران کرد کە "ئیبراهیم

ئەحمەد"یان تەسلیم بکات، بەڵام ئێرانیەکان پێشیان کەوتن و مافی پەنابەری سیاسیان پێدا، بەمەش خۆیان لەداخوازییەکە دزیەوە.

"ساواك" لایەنگرانی ئیبراهیم ئەحمەدی پڕ چەککردو لە ئابی ١٩٦٤ دا ناردنیەوە بۆ کوردستان ، بەڵام هێزەکانی بارزانی گورزێکی کوشندەیان لێدان و ناچاریان کردن بگەڕێنەوە بۆ ئێران ، کە ئەمجارەیان لەچەکی داماڵین و سەربازگەیەکی لە نزیك "هەمەدان" بۆ تەرخان کردن.

بارزانی لەو ئەزمونانەوە کە بەدەستی هێنابون لەئەنجامی شەڕی نیوخۆوە ، پاش کۆتایی هاتنی شەڕەکە دوبارە ڕیزەکانی خۆی ڕێکخستەوە تۆڕی پەیوەندییە دەرەکیەکانی خۆیشی گۆڕی .

"شا" هەستی بەمەترسی دەکرد کە بارزانی بەئەنقەست کوردەکانی ئێرانی لێ هان بدات ، بۆیە بە "شیوعی" وەسفی دەکرد.

لێپرسراویکی باڵای ئیسرایل دەڵێت: ((هەوڵێکی زۆرم دا تا شا قەناعەت پێ بکەم ، بەوەی کە بارزانی دژایەتی ئەو ناکات وە بارزانی تاکەکەسە کە گرەنتی بەرژەوەندییەکانی ئێران دەکات لەگەڵ عێراق بەڵام ئێرانیەکان ڕێگەیان بەبارزانی نەدەدا کە ئاودیوی سنوری ئەوان ببێت ، سنورەکانیان نەدەکردەوە تەنها بەدەستێوەردانی من نەبێت، "شا" هەمیشە لەڕابوونی کوردە ئێرانیەکان دەترسا)).

بەڵام هەرزوو ئێرانیەکان بۆیان دەرکەوت کەناتوان لە کوردستان جگە لەبارزانی پشت بەهیچ لایەنێك ببەستن ، تاڵەبانی و ئیبراهیم ئەحمەد دەستیان لە کارکێشایەوە یان دەرکران لەسەرکردایەتی پارتەکە ، بەهۆی ڕوداوەکانی پێشوەوە کەحیزبەکەی کرد بە دوولەتەوە ، بەڵام بەشی گەورەی لەگەڵ بارزانی مایەوە لەگەڵ فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە کە لەگەڵ ئەودابوون ، لەگەڵ بارزانی و سەرکردایەتیەکی نوێش بەرەبەرە دروست دەبوو ، کە ناونرا بە "پۆلێت بیرۆ" ، لە ئەندامانی ئەم سەرکردایەتیە دوو کەس ناسرابوون کە هەردوکیان پەیوەندیان

بەئیسرائیلەوە هەبوو، ئەوانیش " حبیب محمد کریم" کوردێکی فەیلی بوو کە کۆمەڵەیەکی شیعەن لە ئێرانەوە کۆچیانکردوە بۆ عێراق لە ناوەڕاستی ئەم سەدەیە بەڵام بە خێرهاتنیان لێ نەکراوەو دەرکراون ، دوەمیان "دکتۆر مەحمود عوسمان" دەرچوی هەردوو کۆلیژی ماف و پزیشکی ، سەبارەت بە "دکتۆر مەحمود" "دەیڤید کرۆن" دەڵێت: ((لە تەنیشت تاڵەبانی و ئیبراهیمەوە کاری دەکردو پشتگیری لەبیروبۆچونی لیبراڵیٚ دەکرد ، بەڵام لەکاتی یاخیبونیان لەوان جیابوەوە بەتایبەتی لەبەرئەوەی بەتەواوەتی باوەڕی بەوەبوو کە بەکۆتایی هاتنی بارزانی یاخیبونی کوردەکانی عێراق بەیەکجاری کۆتایی دێ)).

هەرزوو "دکتۆر مەحمود" نەك تەنها بووە دکتۆری تایبەتی بارزانی بەڵکو بووبوە وەزیری دەرەوەشی ، کاتێکیش ئارەزوی فێربونی فەرەنسی کرد ئیسرائیل ئامێریکی ڕیکۆردەری دەستی بۆ نارد کە چەند کاسێتێکی فێرکاری فەرەنسی لەگەڵدابوو.

★ ★ ★

مۆساد ئاگادار نەبوو لەو ڕوداوانەی کە لەسەرئاستی نێوخۆیی کوردەکاندا ڕویدا، کاتێك لەتشرینی دوەمی ١٩٦٤ مۆساد گفتوگۆی دەکرد لەسەر دۆسیەی ناردنی چەك بۆ کوردەکان ، قسەکردن لەسەر "ئیبراهیم ئەحمەد" وبارزانی بوو ، بەیەکەوە کە "مائیر عمیت" پاش چەند ڕۆژێك زانی کاتێ وەختی کۆبونەوە خولیەکەی هات لەگەڵ "فقرقان" لە تاران ئەوکات ئەو لێکپچڕانە گەورەیەیەی زانی کە لەسەرکردایەتی کورددا ڕویداوە ، و زانی کە "ساواك" سەرەڕای ئەوەی ڕویدا کار لەگەڵ بارزانیدا دەکات، چونکە ئەو تاکەکەسە کەخاوەنی قسەیە ئێستا لەکوردستاندا ، بەڵام بەداخەوە ئەو ئێستا جەنگ ناکات لەگەڵ عێراقیەکان بەهۆی ئاگربەستەوە کە لە نێوانیاندایە.

بەڵام ڕوداوەکان لەکوردستان هەرگیز بەردەوام نابن ،.کوردەکان پێیان وابوو کە عێراقیەکان خۆیان دەدزنەوە لە پێدانی مافەکانیان ، داوای ئەوەیان دەکرد کە

حکومەت ئاگاداربکەنەوە تا وەفای بۆ بەڵێنەکانی هەبێت ، ئەگینا کوردەکان دەسەڵاتێکی کوردی سەربەخۆ دروست ئەکەن ، لەو یاداشتەدا کە بارزانی لە ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٤ بۆ "عارف"ی نارد هاتوە : ((گەلی کورد کیانیکی خەیاڵ نیە ، کەمایەسی لە خاکدا نیە تا بتوانی گفتوگۆ و بڕیاردان لەسەر مافەکانی دوا بخەێت، بەڵام هەمیشە ئەم گەلە پاپەند بوە بە چارەسەری ئاشتیانەوە بۆ کێشەکەی وە ئامادەی هەمو قوربانیدانیکە بۆ پاریزگاریکردن لەو مافە و داخوازیەکانی)). پاش نزیکەی مانگێك عارف "تاهیر یحیی" سەرۆکی ئەرکانی گشتی کردە سەرۆکی حکومەت کەپەیوەندی بەردەوامی هەبوو لەگەڵ کوردەکاندا و دەستیکرد بەهەوڵدانی زۆر بۆ پەرەپێدانی ناوچە کوردیەکان ، وەك ئەوەی کە لەرێکەوتننامەی شوباتی ١٩٦٤ بڕیاری لەسەردرابوو ، بەڵام هەرزوو ڕون بوەوە ، کە نیەتێکی جددی لەپشتەوە نەبوە بەرەبەرە سەرۆکی حکومەتی نوێ دەنگی دەخستە پاڵ دەنگی ئەوانەی دەیانگوت : ((کوردەکان وازناهێنن بەوەی پێیان دەدەن داوای سازشی زیاتر لە عێراق دەکەن)).

لە تشرینی دوەمی ساڵی ١٩٦٤ ژەنەراڵ "عزیز الجنابی" کرایە سەرۆکی ئەو دەستەیەی کەبڕیاربوو چارەسەری مەسەلەی پەرەپیدانەکە بکات ، ڕاگەیەنرا کە بڕی ١٠ ملیۆن دینار بۆ جێبەجێکردنی تەرخان کراوە ، بەڵام پاشان ڕون بویەوە زۆرینەی ئەو بڕە پارەیە وەك بەرتیل دراوەتە چەند کەسانێك لەسەرکردایەتی کوردی بۆ ئەو جەنگەدەرونیەی دەیانویست لە دژی بارزانی بیکەن.

کوردەکان بۆیان دەرکەوت کەحکومەت زۆر لاواز بوەو مەترسی کودەتا بێبڕانەوە بە سەرسەری ئەندامەکانیدا دەخولێتەوە.

وە لەوماوەیەدا دەزگاکانی هەوالگری ئیسرائیل وەك لە بەلگەنامەیەکی نێوخۆی هاتوە کەبەرواری ٢٧ی نیسانی ١٩٦٥ی پیوەیە ئەو وەسفەیان بە هەند وەرگرت کە ڕۆژنامەنوسیکی بەریتانی وەسفی کوردەکانی پێکردوە کە دەڵێت: ((مەحاڵە کوردەکان تێکبشکێنرێن بەڵام کوردەکانیش توانای ئەوەیان نیە کە چۆك بەدوژمنەکانیان دابدەن، ئاشکرایە دوژمنەکانی کورد تا ڕادەیەکی زۆر هەمان دوژمنەکانی ئیسرائیل بون )).

## بەشی هەشتەم/ جۆنسۆن نامەکەی بارزانی ڕەت دەکاتەوە

کاتێك "ئۆلف هرۆبن" پلەی مقدم ی هەبوو لە پۆلی هەواڵگری سەربازی لە هەیئەی ئەرکانی ئیسرائیل دیاری کرد بۆ کارکردن لەبواری توێژینەوەو پەیوەندی لەگەڵ هەواڵگری بیانی ، کاتێك بوو بەپاشکۆی سەربازی ئیسرائیل لەپاریس لە ساڵانی نێوان ١٩٦٢ – ١٩٦٤ دەستیکرد بەنوسینی ڕۆمانیکی سەرکێشانە سەبارەت بەبەکرێگراوێکی هەواڵگری نێردراوە بۆ یەکێ لە دەوڵەتە دوژمنەکان تاپەیوەندییەکی ئاشتەوایی لەگەڵیدا دروست بکات.

لەمیانەی نوسینی ڕۆمانەکەدا ، دەرئنجامەکەی پوخت کردەوە لەوەی کەخەیاڵ دەکرێت ببێتەڕاستی ، لەسەر ئەو بنەمایە ڕویکردە سەرۆکی مۆساد "مائیر عمیت" و داوای لێ کرد کە یارمەتی بدات لەوەی کە دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازی لەسەرئاستی دروستکردنی پەیوەندی کاربکات لەنێوان ئیسرائیلْ و هاوسێکانیدا ، عمیت پێی وت کە ڕاستی پێکاوە و سەرۆکی حکومەتیش لیڤی ئاشکۆڵ هەمان شت دەخوازێت.

عمیت وەڵامی داواکەی "هرۆبن" ی دایەوە بەگواستنەوەی لە سوپای ئیسرائیلەوە بۆ موساد و خستیە پۆلی - تیڤڵ – جیهان کەکاریان دەکرد لەئاستی دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی بیانی دا تالەوێ کاربکات لەبواری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و چواردەورەکەی ، لەگەڵ ئەو وڵات و گەل و هۆز و جالیە و ئۆپۆزسیۆنانەی کە پەیوەندیان نیە لەگەڵ ئیسرائیل کاربکات.

بەپێی ژمارەیەکی زۆر بڵاوکراوە مۆساد جگە لەتورکیاو ئێران ، لەگەڵ زۆر لایەنیتردا کاری کردووە، لە "یەمەنی باکور" و "یەمەنی باشور" و "عەممان" دەستێکی درێژی هەبووە، لە لوبنان دا لەسەرەتای حەفتاکانەوە ، ئەو چالاکیانە گەیشتە لوتکە لەماوەی پرۆسەی "ئاشتی جەلیل = جەنگی لوبنان" ١٩٨٢ دا.

لەتشرینی دووەمی ١٩٦٤ باڵوێز "فیشەر" ئەفسەری پەیوەندیداری سەرەکی لەگەڵ "بەدرخان" بێزاری خۆی پیشاندا بەهۆی ئەوەی کەئیسرائیل هاریکاریەکی

ڕاستەقینە پێشکەشی کوردەکان ناکات ، بەڵام "هرۆبن" موژدەی ئەوەی پێدا کەدۆسیەی کوردی گۆڕانکارییەکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێت بەنیسبەت ئیسرائیلەوە ، هرۆبن نەیدەزانی کە ئێرانیەکان هەمان ئەوانەی کە ئیسرائیلیان توشی شۆك کرد لە کانونی دوەمی ١٩٦٤ کاتێ داوایان کرد هاریکاری کوردەکان بکات ، جارێکی تر توشی شۆکی دەکەنەوە لە٢٤ی کانونی یەکەمی ١٩٦٤ لەڕۆژی دواتردا "فقرفان" ئیسرائیلی ئاگادارکرد کە "عصمت شریف وانلی" ڕوو لەئیسرائیل دەکات بە ڕازیبوونی ئێران ئەویش لەسەرئاستی فکری و کەسایەتی ، لە"ئیبراهیم ئەحمەد" و "تاڵەبانی"ەوە نزیك بوو، بڕیاری دابوو لەگەڵ بارزانیدا کاربکات ، دیاریکرا بەئەندامی سەرکردایەتی باڵای یاخیبونی کوردی ، و بەنوێنەری تایبەتی یاخیبونی کورد لەدەرەوە ، و وتەبێژی بارزانی سکرتێری گشتی لیژنەی داکۆکی لەمافەکانی گەلی کورد.

★ ★ ★ ★

"وانلی" بووەمیوانی "هرۆبن" ، هرۆبن هاوڕێیەتی کرد لەوکۆبونەوەیەدا لەگەڵ "عمیت"ی سەرۆکی مۆساد و لەگەڵ جێگرەکەی "کرۆز" ە بەڕێوەبەری گشتی لە وەزارەتی دەرەوە "یعقوب لبی" و سەرۆکی پۆلی هەواڵگری سەربازی "ئەهارۆن یاریف" و هەردوو لێرسراوی پۆلی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە وەزارەتی دەرەوە "یاعیل فارد" و "عیزرا دەنین" ، وانلی بۆ هەریەك لەوانە نامەیەکی بارزانی پێ بوو کەئەوی داناوە وەك وتەبێژی فەرمی بەناوی یاخیبونی کوردەکانەوە.

لەو کۆبونەوەیەدا وانلی وتی : کە بەدرخان لەیاریەکە چوەتەدەرەوە ، وتی : بەدرخانی ئەرستۆکراتی بەکەڵکی ئیشی کردەیی نایەت ، وە نوێنەرایەتی هیچ لایەنیکی فەرمی ناکات وە هەروەها "وانلی" پێنشیاری کۆمەڵێك مەسەلەی کرد کە هەرگیز بلاونەکراوەتەوە و بەنهینی ماوەتەوە.

لەپاش ئەو سەردانەی کردی و ئەو مەسەلانەی خستنیەڕوو ، دەزگای ئیسرائیل خێرا دەستی بەکارکرد ، مۆساد دەستی کرد بەئامادەکردنی لیستێك لەوچەتانە

که "وانلی" داوایکردبوو ، وه ئامادەکاری کرا بۆگواستنەوەی بۆتاران و لەوێشەوە بۆ کوردستان ، وە لەچوارچێوەی هاریکاریە میدیاییەکانیشدا ، دیباجەیەکی میدیایی ئامادەکراو بەهەموو لایەکی جیهاندا بلاوکرایەوە.

دەستەی ئیسرائیلی ناوبراو پێشنیاری کرد کەدەستەیەکی تایبەتی کوردی دروست بکات بۆئەوەی بیان نێریت بۆ ئەمریکا بۆکارکردن بۆ بەدەستهێنانی هاریکاری سیاسی و دارایی و پێی وترا کە ئیسرائیل تێچوی دارایی سەردانەکە لە ئەستۆدەگرێت.

پارەهەمیشە بۆ کوردەکان مەسەلەیەکی گەلێك گرنگ بوو، تا ئاستی حوکمی بون و نەبونیان ، لەو ووتارەدا کە "جاك ئەندەسۆن" ی ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی نوسیویەتی کە ڕۆژنامەنوسێکە زۆر پشت بەزانیاریە هەواڵگریەکان دەبەستێت لە ١٧ی ئەیلولی ١٩٧٢ لە "واشنتن پۆست" دەڵێت : "نێردراوێکی ئیسرائیلی هەموو مانگێك بەئێراندا دزە دەکات بۆ کوردستان لەگەڵ خۆی بڕی پەنجا هەزار دینار دەبات بۆ بارزانی کەئەوەش بەشی ئیسرائیلە لەهاوکاری یاخیبونی کوردی ، جێی بیر خستنەوەیە کە سەرۆکی حکومەت "مەناحیم بێگن" لە ئەیلولی ١٩٨٠ دا جەختی لەوەکردەوە کە ئیسرائیل یارمەتی کوردەکانی داوە بە چەك و بەپارەش.

"وانلی" پەیوەندی خۆیی بە "ئیبراهیم ئەحمەد"ی ڕکابەری بارزانی کە لەتاران دادەنیشت نەشاردەوە ، دەریخست کە بەرلەوەی ڕوبکاتە ئیسرائیل لەگەڵ "ئەحمەد" کۆبوەتەوە و ڕازیبونی ئەوی وەرگرتوە بۆ ڕووکردنە ئیسرائیل ، پێویستە ئیسرائیلیش بە هەمان شێوە بێت پەیوەندی بە "ئەحمەد"ەوە نەپچڕێنیت ، هەرچەند ئەحمەد و تاڵەبانی هەڵیان کرد کاتێك لەبەهای بارزانیان کەمکردەوە وەك سەرکردەیەکی نیشتمانی بۆ کوردەکان.

دۆسیەی "وانلی" وەك دۆسیەی مامەڵەکردن وابوو لەگەڵ هەردوو لایەنی یاخیبونی کوردی بەنیسبەت مۆسادەوە ، مۆساد دەرمنجامێکی بۆ دەرکەوت

کەچەند داوێك لەگەڵ "ئیبراهیم ئەحمەد" هەبێت ، بەلام لەبونی پەیوەندی کرداری دور بکەونەوە.

"وانلی" داوایکرد زانیاریەکانی سەردانەکەی بۆ ئیسرائیل بە ئەحمەد نەڵێین ، وە ئیسرائیل بۆی رون بکاتەوە کەسەرەڕای ئەو ڕێزەی کە ای ئەو هەیەتی بەلام ناتوانیت و نایەوێت تێوەگلێن لەناکۆکی نیوان کوردەکاندا ، ئیسرائیل بەو ڕۆحیەتەوە مامەڵەی کرد کاتێك ئیبراهیم ئەحمەد داوای هاوکاری دارایی کرد.

وانلی لە ڕۆژانی سەرەتایی کانونی دوەمی ١٩٦٥ ئیسرائیلی بەجێهێشت ، سەردانەکەی بەهەنگاوێکی یەکلاکەرەوە وەسف کرا بۆ دروستکردنی پەیوەندی ئیسرائیلی - کوردی .

"وانلی" گەڕایەوە کوردستان و ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلی سەبارەت بەدەرەنجامی سەردانەکەی بۆ ئیسرائیل پێشکەش کرد، لە شوباتی ١٩٦٥ ڕوی کردە ئەوروپا لە ڕێگەیدا بەرەو ئەمریکا بۆئەوەی هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن ئەنجام بدات لەوێ.

وەزیری دەرەوەی عێراقی "صبحی عبدالحمید" لەوماوەیەدا لێدوانێکی دا بۆ ڕۆژنامەی "الاخبار"ی میسری و وتی: ((داخوازیەکانی کورد لەلایەن هیچ حکومەتێکی عێراقیەوە قبوڵ ناکرێت ، هێشتا ئەو عێراقیە لەدایك نەبوە کە ڕازی بێت بە جیابونەوەی بەشێك لە ولاتەکەی (کوردستان) وە ڕێگە بدات بە دامەزراندنی حکومەتێك)).

گومان لەوەدا نیە ئەو کاتێك وایدەگوت دڵنیابوو کە کوشتارەکە بەهەموو هێزێکەوە بەردەوام دەبێت.

لەکاتی ئەو گەشتەدا کە "وانلی" کردی بۆ ئەمریکا لە ناوەڕاستی نیسانی ١٩٦٥ بارزانی ڕایگەیاند :

(( هەردەوڵەتێك ناتوانێ بمێنێتەوەو بژی تەنها ئەگەر لە لایەن یەکێ لە دوو کوتلە گەورەکەوە پشتیوانی لێ نەکرێ)).

بەزانینی ئەوەی کەتێڕوانینی کوردەکان نەدەگونجا لەگەڵ ئەو بیرۆکانەی سۆڤیەت هەیبوو ، ئاسایی بوو کە ڕوو لەئەمریکا بکەن بۆیارمەتی، سەرەڕای ئەوە ئەمریکا هەتا ئەمڕۆش وەڵامی داخوازیەکانی کوردی نەداوەتەوە، جێ بیرخستنەوەیە کە بارزانی داوای لە ئیسرائیل کردبوو لەوبارەیەوە هاوکاری بکات ، بەڕاستی ئیسرائیل بێ ئومێدی نەکرد و ڕاوێژکاریکی تایبەتی خستەخزمەتیەوە بۆ ئامۆژکاری و سەرپەرشتی کردنی بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەکاتی گەشتەکەیدا بۆ ئەمریکا ، هەروەها لە کۆمپانیاکانی پەیوەندی گشتی ئەمریکی شارەزایان بۆبەکرێ گرت.

لەهەمان کاتدا باڵوێزخانەی عێراق لە "واشنتن" هەوڵێکی زۆریدا لە پێناو فەشەلهێنان بە گەشتەکەی "وانلی" ، وە فشارێکی زۆریان خستەسەر وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی و لەسەرئەو ئاستە سەرکەوتنێکی بەرفراوانی بەدەستهێنا بە جۆرێك هەمو لایەنە باڵاکان جگە لەهەندێك ئەندامی ئەنجومەنی پیران و هاوکارەکانیان ئامادەنەبون پێشوازی لێ بکەن و لەگەڵی بدوێن ، کاتێك وانلی پەیوەندی کرد بە "فیلیپ تالبوت" یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ کاروباری خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و یاریدەدەرەکەی ڕەتیکردەوە پەیوەندییەکە بەو بگەیەنێت و بە "وانلی" وت : کە هیچ کارمەنێك لەوەزارەتی دەرەوە ئامادە نیە لەگەڵیدا کۆبێتەوە ، کاتێکیش ڕاویژکارە ئیسرائیلیەکەی "وانلی" پەیوەندی کرد بە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە زۆر بە ڕاشکاوی پێی وترا بارودۆخی عێراق زۆر ئاڵۆزە و ئەمریکاش نایەوێت پەنجەی تۆمەتی بۆ ڕابکێشرێت بەوەی کەیارمەتی کوردەکان دەدات ، بەڵکو وەزارەتی دەرەوە سەرکەوتوو بو لەهەڵوەشاندنەوەی ئەوە کۆبونەوەیەی کە وانلی دەیویست گرێی بدات لەگەڵ سەرۆکی یەکێ لەلیژنە لاوەکیەکانی سەر بەلیژنەی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران ، هەروەها کۆبونەوە لەگەڵ داداوەری دادگای باڵای "ولیەم دۆگلاس" کە بەڕاستگۆیی لەگەڵ کوردەکان ناسراوە بەم شێوەیە وانلی هیچی بۆنەمایەوە ،

جگە لەو دیدارانەی ئەنجامی دا، و پەیوەندی کردن بەسەرۆکانی ڕێکخراوە خۆبەخشەکان و گرێدانی کۆنگرەی ڕۆژنامەوانی ، وچەند وانەیەك لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا ، وە پێشکەش کردنی یاداشت بە چەند شاندێکی نەتەوە یەکگرتوەکان.

وە لە ١ی ئایاری ١٩٦٥ وانلی ژمارەیەکی زۆر نامەی نارد بۆ کۆمەڵێکی زۆر لەئەندامانی "ئەنجومەنی پیران" و "ئەنجومەنی نوێنەران" ، زانیاری تەواوی لەسەر ئەوە تێدابوو کە لەکوردستاندا دەگوزەرێت : ((پەنجا هەزار سەربازی عێراقی بەشدارن لەجەنگەکاندا بەپاڵپشتی بۆمب و هێزی ئاسمانی وە چەندەها هاونیشتمانی لە ژنان و پیرەپیاو ومندالْ بەرکەوتون بەهۆی بۆمبارانکردنیان بەبۆمبی ناپاڵم لە فڕۆکەی "مێگ و ئالیۆشن" و "هۆکەرهەنتەر"ی عێراقی ، بۆتەهۆی سوتانی دانەوێڵەکان و کشتوکاڵ و هەروەها کوژرانی مانگا و مەڕو ماڵاتەکانیان ، جەماوەری ئیمە لێی دەکوژرێ وبرسی دەکرێ و لەسەرخاکەکەی خۆی دەردەکرێ و هەردو کۆماری "میسر" و "سوریا" هێزەکانی عێراق پڕچەك دەکەن بەچەکی جیاواز و دەمامکی دژەگاز و ڕێژەیەکی زۆر لە چەکی کیمیایی ، ئەوە هەمان ئەو چەکانەن کەمیسریەکان بۆ چەوساندنەوەی خەڵکی یەمەن بەکاریان هێنا، پێنج هەزار  سەربازیان ناردوە بۆعێراق ئەمەش بۆپشتیوانی سوپای عێراق کەهونەری و شارەزایان لەجەنگی شاخاوی تیدایە، سەربازی هەردوودەوڵەتەکە کە لە "خەلیفان" شارێکە لە عێراق ڕاهینانیان کردوە)).

((کۆماری عەرەبی یەکگرتو ڕێژەیەکی زۆر چەکی نوێی داوەتە عێراق بەتایبەت چەکی سۆڤیەتی و پەنجا فڕۆکەی "هەلیکۆپتەر" بۆدابەزاندنی سەربازانی سوپای عێراقی لە شاخەکانی کوردستان لەفڕۆکەخانەی موصلْ ١٢ فڕۆکەی سەربازی سەر بەهێزی ئاسمانی کوماری عەرەبی یەکگرتو ڕاگیراون لەگەڵ ٢٤ فڕۆکەی تر لەکەرکوك، و سەرکردەی سوپای عێراقی ڕایگەیاندوە کە "سۆڤیەت" و "یۆغوسلافیا" چەکیان پێ داوە)).

((له شوباتی ١٩٦٥ دوو كەشتی جولێنراوه لەبەندەری "ئەسكەندەرییە"وه بۆ بەندەری "بەسره" كه چەكیان هەلگرتووه ، من زۆر دلگرانم بەوەی كه حكومەتی ئەمریكی چەك بدات بەعێراق وەك چۆن پێشتر بەفەرمی ڕایگەیاندبوو ، چونكه ئێمه دلنیاین كه هەرچەكێك بدرێت بەعێراق ڕاستەوخۆ لەدژی كوردەكان بەكاردەهێنرێت)).

((له پاش ڕێكەوتننامەی ئاگربەست له ١٠ی شوباتی ١٩٦٤ ڕێكخراوی "CARE"ی سەر به نەتەوەیەكگرتووەكان خۆراكی بەبڕی پێنج ملیۆن دینار بۆ كوردەكان ناردبوو، بەلام ئەو خۆراكه چنگی حكومەتی عێراقی كەوت و هەرگیز نەدرا به ئێمه)).

((ئێمه داوای یارمەتی خۆراكی و پۆشاك و چادر و خێمه دەكەین ، وه داوادەكەین ل ڕێی بەغدادەوه نەنێردرێن ، بەلكو له ڕێگەی خاچی سور و ڕێكخراوه كوردیەكانەوه بێت)).

له یەكی ئایاردا "وانلی" نامەیەكی له هۆتێلەكەی بۆ هاتبوو ، بەپەیامنێری "ئاژانسی دەنگوباسی سۆڤیەتی" ناسراو به "تاس" داوای كۆبونەوەیەكی بەپەلەی كردبوو لەگەل "وانلی" ، لەدیدارەكەدا كه لەنوسینگەی ئەو پارێزەرەدا ئەنجام درا كه ئیسرائیل خستبویه خزمەتی "وانلی"ەوه ، پەیامنێرەكه خۆی به "لۆسبا" ناساند و بەیاننامەیەكی چاپكراوی دا به "وانلی" كه ئەمەی تێدابوو : (( هاوڕیكانم پێیان وتم كه "وانلی" لەوه ئاگاداربكەمەوه كه "ئیبراهیم قەلیلات" لەبەغدادەوه نێرراداوه بۆئەوەی بیكوژێت پێدەچێت "قەلیلات" لەنیۆرك بێت هەرچەنده زانیاریەكان پشتڕاست نەكراونەتەوه ، بەلام پێویسته ئاگاداری خۆی بێت)).

بەپەله پارێزەرەكه پۆلیسی نیۆركی لەنامەكه ئاگادار كردەوه ئەویش ئامۆژگاری "وانلی"یان بەوەكرد كەبڕواته هۆتێلیكی تر و لەژێر ناوێكی خوازراودا خۆی ناونوس بكات.

"وانلی" تەواو ورەی دابەزی بوو کاتێك گەڕایەوە ئەوروپا و بۆیدەرکەوت کەپەیوەندی کورد بە مۆسادەوە تەواو پەرەی سەندوە بەڵام لەڕێگەی خەڵکی ترەوە نەك ئەو ، پاشان بۆی دەرکەوت کەپێگەکەی لەنێوەندەکانی سەرکردایەتیدا دابەزیوە ، زانی کەبارزانی کەیفی بە پەیوەندیە بەهێز و جەریئانەکەی ئەو لەگەڵ "ئیبراهیم ئەحمەد" و هاوڕێکانی نایەت ، جگە لەوە وانلی ڕۆشنبیرێك بوو تەواو لە ئازارەوە دور بوو.

لە ئەیلولی ١٩٦٥ لەبەرامبەر پیاوانی مۆساد دا "وانلی" دانی بەوەدا نا کە بەتەواوەتی متمانەی لەدەستداوە لای بارزانی ، و هەوڵی داوە کە ڕۆڵی نێوەندگیرو ئاشتیخوازانە ببینێت لەنێوان "بارزانی" و "ئیبراهیم" و "تاڵەبانی" ، بەڵام بارزانی زۆر بە توڕەییەوە وەڵامی داوەتەوە.

لەو کاتەوە زۆرینەی کاتەکانی لە ئەوروپا دەبردەسەر ، وە کەسایەتی زۆری تری کورد جێگەی ئەویان گرتەوە ، بەڵام "وانلی" لە یادەوەری ئیسرائیل ناسردرێتەوە.

* * *

سەرۆکی حکومەت "لیڤی ئاشکۆڵ" لە ١٥ی نیسانی ١٩٦٥ کۆبونەوەیەکی ئەنجامدا کەوەزیری دەرەوە "گۆڵدا مائیر" و سەرۆکی ئەرکان "ئیسحاق ڕابین" و سەرۆکی مۆساد ئامادەی بون ، سەرۆکی مۆساد دۆسیەی کوردەکان و ئەو پرۆسە تایبەتیانەی کەئیسرائیل پێی هەڵدەستێت خستەڕوو ، هەموویان لەسەر بڕیارێك کۆ بون دەقەکەی دەڵێت: ((پێویستە ئەولەویەت بدرێت بە دۆسیەی کورد)).

پاش چەند ڕۆژێك لەم کۆبونەوەیە فڕۆکەیەکی ئیسرائیلی لە جۆری "ستارتۆ کرۆز" کە بارێکی تری هاوکاری بۆ کوردەکان لەخۆگرتبو "چەك" وە پێکهاتبوو لە کلاشیکۆف و بازۆکا ، مین و تەقەمەنی کیشەکەی ٧ تەن بوو هەڵفڕی لە تاران نیشتەوە و لەوێوە لەڕێگەی ساواکەوە گەیشتە نامانجەکەی خۆی ، بارزانی

بەنامەیەکی کاریگەر وەڵامی ئیسرائیلی دایەوەو وتبوی (( زۆر لایەن بەڵێنیان دا چەکمان پێبدەن بەڵام نەیان دا، کەچی ئیسرائیل بەڵێنیداو بەڵێنەکەشی بردە سەر)).

لە ١٠ی نیسانی ١٩٦٥ نوێنەری کوردەکان نامەیەکی گەیاندە نوێنەری مۆساد لە تاران تێیداهاتبوو ((بارزانی ئامادەیە بۆ کۆبونەوە لەگەڵ هەرنێردراوێکی ئیسرائیلی گەورە لە کوردستان و ئامادەیە بە هەمانشێوە بۆ ناردنی نێردراوێکی گەورە لەلایەن خۆیەوە بۆکۆبونەوە لەگەڵ نوێنەری ئیسرائیل لە دەرەوەی کوردستان)).

## بەشی نۆیەم/ فرۆکە (میگ) ە کان هێرشیان کردە سەر بارزانی و دەیڤید قەمحی ...

"مائیر عمیت" هەستا بەدیاریکردنی "دەیڤید قەمحی" بۆ ئەنجامدانی یەکەم پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بارزانی لە کوردستانی عێراق ، "ساواك" سەرەتا پێی خۆش نەبوو کە "قەمحی" بێت بۆکۆبونەوە لەگەڵ بارزانی پاشان ڕایانگەیاند کە ڕازین بەمەرجی کۆبونەوەی "قەمحی" لەگەڵ سەرۆکی ساواك بەرلەوەی ڕوبکاتەکوردستان.

"قەمحی" لە گەورەپیاوانی مۆسادەو لە "بەریتانیا" لەدایك بووە ، بەشداریکردوە لەجەنگی ١٩٤٨ دا و لەشەڕی "قودس"دا بریندداربووە ، لەگەڵ "جۆن"ی برایدا، کە ڕۆژنامەنوسێکی بەریتانی ناودارە، کتێبێکیان نوسیوە بەناوی "لە هەردو دیوی گردەکەوە" ئەوەش یەکەم کتێب بوو کە چەند چیرۆکێکی سادەی ئاشکرا کرد لەبارەی جەنگی ١٩٤٨ لەوانە چیرۆکی یاخیبونی ئەفسەرەکانی سوپا دژی "بن گۆریۆن".

وە کاتێك کەوەك بەڕێوەبەری گشتی لەوەزارەتی دەرەوە کاری کردوە لەماوەی نێوان ١٩٨٠ بۆ ١٩٨٧ لە کتێبەکەیدا "دواهەمین ئەگەر" هێمای بۆ هەندێ بەسەرهات کردوە لە کاتی کارکردنی لەمۆساد بەسەری هاتووە ، دیاریکردنی بۆ دیداری بارزانی تەنها بەهۆی بەتوانایی لەکاروباری هەواڵگری و دیبلۆماسیدا نەبوو ، بەڵکو بەهۆی ڕوخسارە ئەنگلۆسەکسۆنیەکەشیوە بوو[1].

لەپاش ڕاوێژ و ڕاوێژکارییەکی زۆر کە "بن گۆریۆن" خۆیشی تیا بەشدار بوو ، بڕیاری دا "قەمحی" بنێریت بۆ ناسینی سەرکردایەتی کوردی لەنزیکەوە ، و توێژینەوە لەپێکهاتەی دەزگای یاخیبون و "پارتی دیموکراتی کورد" ، و زانینی داخوازیەکانیان بەشێوەیەکی باش ، و دانانی بیرۆکە و پلان بۆ ئیمکانیەتی

---

[1] شێوە ئینگلیزی (موسور) وەرگێر

باشترکردنی بارودۆخی یاخی بونەکەو ، دوبارە دروستکردنەوەی توانستی هاوکاری لەگەڵ خستنەڕوی بۆچونی نوێ ل ئەگەری ڕودانی گۆڕانکاری لەتێروانینی ئێرانیەکان سەبارەت بە کورد.

پێدەچێت تاکە ڕوخساری خوێنشیرن کە "قەمحی" لە تاران بینیبێتی لەڕێگەی دا بۆکوردستان نوێنەری کوردەکان لە تاران "شمس الدین موفتی" بووبێت ، کە ئێرانیەکان بە"شیفری - ئەمیرێکی کاشانیە-" ناویان دەبرد ، موفتی دەرچوی کۆلیژی مافی زانکۆی بەغداد بوو ، تەمەنی نزیکەی ٥٠ ساڵی دەبوو لەکاتی ڕودانی جەنگەکاندا برینداربوو، بەڵام "ئیبراهیم ئەحمەد" ناردی بۆ تاران بۆچارەسەر ، وە لەکاتی ئەو لێکجیابونەوەی کەڕوویدا لەسەربازگەی کوردەکاندا موفتی وەك لایەنگری بارزانی مایەوە ، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ سەربازگەکەی تردا بەردەوام بوو ، بەتایبەت لەگەڵ تاڵەبانی و هاوریکانی ، هەموو ناسراوەکانی جەخت لەوە دەکەنەوە ئەو یەکێ بوە لەباشترین هاوڕێکانی ئیسرائیل و زۆرترین حماسی هەبوە بۆی و پەیوەندییە ئیسرائیلیەکان بەنیسبەت ئەوەوە کرانەوەیەکی زۆریان بەخۆوەدیوە "فقرفان" ڕێگەی لێ دەگرت لەوەی کەهاوڕێیەتی "قەمحی" بکات بۆلای بارزانی بەڵام سوربوونی "قەمحی" بووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ڕێگرتنەکە سەرەڕای ئەوەش فقرفان چەند کۆت و پەیوەندیکی تری دانا کە تائیستاش نەهێڵراوە بلاوبکرێتەوە.

ئەم دوانە بەئۆتۆمبیلیك کە پیاوێکی سەر بە"ساواك" لێی دەخوڕی ڕویان کردە لای بارزانی ئەمە جگە لەڕاوێژکارە هونەرییەکەی قەمحی کە وەك وەرگێڕیش کاری دەکرد ، وە لە ٥ی ئایاری ١٩٦٥ ئۆتۆمبیلە جێبەکە سنوری ئێران و عیراقی بڕی و چووە ناو "حاجی ئۆمەران" و لەو گوندەداو لەسەر یەکێ لەبەردەکانی شاخەکە "کۆشك" هەبوو ، کەهاوینەهەواری بارزانی بوو ، لەنزیك بەفرەکانەوە لە "کۆشك"ەکەدا بارزانی فەرشێکی عەرەبی ڕاخستبوو کە لەگەڵ ژیانی

کوردەکاندا دەگونجا ، بارزانی زۆری لەئیسرائیلەکان کرد کە بەهەمانشێوەی کوردەکان دابنیشن.

"قەمحی" سەبارەت بەڕوخسار و شێوەی بارزانی لەنزیکەوە دەڵێت : "کەسایەتیەکانی سەرەتای مێژووی بیردەخستمەوە ، کە زۆریان لە تەورات دا باسیان کراوە ، لەتەنیشت بارزانیەوە "ئیدریس"ی کوڕی دانیشتبوو کە لێپرسراوی "هەیئەی پلاندانانی سەربازی" بوو ، لەگەڵ "دکتۆر مەحمود"دا ، دەرکەوت کەخاوەنماڵەکەمان زۆر دەزانێت لەو شتانەدا کە پەیوەندیان بەئیسرائیلەوە هەیە، دەستکەوتەکانی بەرز دەنرخێنێت و ئەو دەیزانی کەئیسرائیل لە١٦ی ئایار ئاهەنگ دەگێڕیت بەبۆنەیساڵیادی ١٧ هەمینی سەربەخۆییەوە ، پێی وتم کە ئەو هەمیشە گوێ لەدەنگی ئیسرائیل دەگریت بە عەرەبی و فارسی".

زۆربەی قسەکان لەنێوان هەردوولادا تایبەت بوو ، بە ئیمکانیەتی هاریکاری لەنێوان ئیسرائیل و کوردەکاندا ، قەمحی پێی وت : کە ئیسرائیل هاوسۆزی زۆرە لەگەڵ کوردەکاندا ، کوردەکان وەك گەلێك ل پێناو ئازادیەکانی خۆیدا خەبات دەکات "وە ئێمە پێمان وایە لەکۆتاییدا هەر دەگەن بە ئامانجەکانتان".

قەمحی وتی : ئیسرائیل درك بەوەدەکات کە خەباتەکەتان درێژە دەکێشێت لەوبارەیەوە سیاسەتێکی درێژخایەنی دارشتوە هاوسۆزی ئیسرائیل تەنها بەو هۆیەوە نی یە کە ئەو دوو گەلە هەمان دوژمنی هاوبەشیان هەیە ، بەڵکو بۆ ئەوەش کەکورد گەلیکی دێرینەو تا ئێستاش خەبات دەکات لەپیناوی نیشتمانەکەیدا لەپێناو دەستکەوتنەوەی ناسنامە سەربەخۆکەیدا ، ئیسرائیل ڕقی لەعەرەب نیە ، بەڵام کاتێك کە عەرەب هەوڵ دەدەن گەلێك لەناوبەرن کە عەرەب نیە لەناوچەکەدا ، پێویستی ناچارمان دەکات دەستی یارمەتی بۆ ئەو گەلە ڕادێرین، و کاربکەین بۆ تێکشکاندنی پلانەکانی عەرەب".

وه قەمحی ئاماژەی بۆ ئەو سەردانەکرد کە "وانلی" کردی بۆ ئیسرائیل وەك نوینەری بارزانی لە کانونی یەکەمی ١٩٦٤ ئیسرائیل بەشێك لەو ڕێکەوتنەی جێبەجێکرد کە لەگەڵ "وانلی"دا ڕێکەوتبوو ، بەناردنی فرۆکەیەکی پڕ لەچەکیشەوە لەنیسانی ١٩٦٥ و دامەزراندنی هەیئەیەکی تایبەت بۆکۆکردنەوەی پارە بۆکوردەکان و ڕێکخستن و سەرپەرشتی دارایی گەشتەکەی وانلی بۆ ئەمریکا".

وە لەڕاپۆرتەکەیدا بۆ ئیسرائیل "قەمحی" وتویەتی : بارزانی پێی وتوە "ئەوەی کە هەمیشە کوردەکان پێوەی دەناڵێنن کەمی هەمیشەییە لەچەك و خواردن و پارەدا ، زۆر پیویستیان بەیارمەتی دەرەکی هەیە، و ڕێکەوتننامەی ئاگربەست پێش دوومانگ هەڵوەشاوەتەوە ، و شەڕ بەردەوام دەبێت و داوای تۆپهاوێژی دەکرد کەماوەکەی بگاتە ١٠ کیلۆمەتر ، لەپێناو دروستکردنی گۆڕانکاری لەجەنگەکاندا لەگەڵ چەك و ڕاجیمەی ٨١ ملیم و مین و بازوکا و تەقینەوەی تر".

قەمحی بەپەلە ڕونیکردەوە کە ئیسرائیل دەوڵەتیکی گەورەنیە بتوانێت هەموشتێك بکات ، هەروەها هەموو ئەو چەکە داواکراوانەی نیە ، بەوجۆرە لەو وێنە گوڵینەی کەمکردەوە کە بارزانی بۆ ئیسرائیل "لە خەیاڵی خۆیدا کێشابوی" و وتی: کە ئیسرائیل هەوڵ دەدات لەسەرچاوەی بیانیەوە ئەو چەکانەی دەست بکەویت وەك "ڕاجیمە، بازۆکا، تۆپی تایبەتی دژەفڕۆکە" و ڕونیکردەوە کە ناردنی چەك بۆکوردەکان لەڕێگەی ئاسمانی و پەرەشوتەوە هەرزوو ڕادارەکانی دوژمنی عێراقیەکان ئاشکرای دەکەن و بۆیە زەمینەی ئەوە لە ئارادا نیە .

((ئیسرائیل ئامادەیە شەڕکەری کوردەکان ڕاهینان پێ بکات و فێری جەنگی چەتەگەری و کاری تێکدەرانەیان بکات ، ڕونی کردەوە کە چەند کوردێکی کارامە دەتوانن کاری زۆر کاریگەر و کارا لەناو عێراقدا ئەنجام بدەن بەجۆرێك کاریگەری دابنێت لەسەر کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی)).

وه "قەمحی" جەختیکردەوە لەسەر دانانی نوێنەرێکی هەمیشەیی کورد کە لەئەمریکا دابنیشێت ، هەرزوو بارزانی کاندیدی خۆی بۆ ئەو پۆستە دیاری کرد ، پاشان ئەو نوێنەرە سەردانی ئیسرائیلی کرد بەڵام پاش ماوەیەك بارزانی لە پۆستەکەی لایبرد.

بەڵام لەسەر ئاستی سیاسی بارزانی ووتی: ((من رازیم بەهاوپەیمانی لەگەڵ ئیسرائیل ، لەعەرەب بێ ئومید بوم ، هیچ باکم نیە کەئاشکرا ببێت پەیوەندیم بە ئیسرائیلەوە هەیە یان نا)) ، وە بارزانی پەیمانی دا کە وەڵامدانەوەیەکی جوانی بۆ ئیسرائیل دەبێت لەحاڵەتی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی دا ، بەڵکو بەرلەوەش وەکو نیشانەیەك لەسەر جددیبونی نیەتەکەی نامەیەکی نوسی بۆ سەرۆکی حکومەت "لیفی ئاشکۆڵ"و تێیدا پیرۆزبایی لێ کردبوو بەبۆنەی سەربەخۆییەوە ، هەروەها هەمو لێدوان و پەیمانەکانی کە بە قەمحی دابونی لەخۆگرتبوو ، وەك رێگرتن لەهەر هەنگاوێك یان رێوشوێنێك کە زیان بەئیسرائیل بگەیەنێت لە هەر پەیوەندییەك کەلەگەڵ لایەنێکی تردا دەبەسترێت ، هەروەها ئامادەی دەربڕیبوو بۆ هاندانی پێکەوەژیانی ئاشتیانە ل نێوان ئیسرائیل و دراوسێکانی ئەگەر کوردەکان سەرکەوتنیان بەدی هێنا وە سەربەخۆییان وەرگرت، کەئەمە هەموی بەندبوو بە پەرەسەندی سیاسی و سەربازی لەداهاتوودا.

* * *

قەمحی دەڵێت : ((ئەو باوەڕەم بۆ دروستبوو کەبارزانی دەیەوێت ئەو بۆچونە لای من و ئیسرائیلیش دروست بکات کە هیچ پەیوەندی وپێکبەستێك لەنیوان کوردەکان و عەرەبدا نیە، و عەرەب رێگری دەکەن لەوەی کوردەکان مافی سەربەخۆیی بەدەست بهێنن ، وە بەپێی ئەو خوونەریتانە بژین کە هی باوباپیرانیانن)).

بارزانی داوای له قهمحی کرد که دوو یان سێ ههفته بمێنێتهوه تا بهچاوی خۆی ببینێت کهکوردهکان چیان بهسهر دێت بهدهست سوپای عێراقیهوه ، پێی وت: ((لهگهڵ شهڕکهرهکاندا بهو گهشتێك به ناوچهکهدا بکه تا لهنزیکهوه چاوت بهسوپای عێراقی بکهوێت ، قهمحی بهبهشێکی داواکهی ڕازی بووکه چهند ڕۆژێك بمێنێتهوهوبهمجۆره جلوبهرگی کوردی لهبهرکردو تفهنگیکیان کردهشانی و ئهسپێکیش له ژێری دهستیکرد بهگهڕان لهکوردستاندا بههاوڕێیهتی کۆمهڵێك پێشمهرگه ، تا ئیستاش ئهم چیرۆکهی ههر لهبیر ماوه : "به شاخێکدا ههڵدهگهڕاین کهناوی "زۆزگ"ه ، پاشان بهڕیچکۆڵهکاندا هاتینهخوارهوه بۆ دۆڵی "ڕهواندز" ، وه له دوری چهند مهترێکهوه چهند لیوایهکی سوپای عێراقی مۆڵگهیان دانابوو ، بیرم لهوهلأمدانهوه کردهوه ئهگهر عێراقیهکان دهستگیریان کردین ، کاتێکیش نزیك بوینهوه له گوندێك که ناوی "جهلاله"[1] بوو ، بارزانیمان دهگهڵ کهوتهوه ، لهوێ وهستاین گفتوگۆمان دهکرد لهههمانکاتدا چهند فرۆکهیهکی "مێگ" دایان بهسهرماندا و بۆمبهکانیان فرێدا خۆمان دا بهزهویدا و بارزانیش بهههمانشێوه ، جارێکی تریش لهڕێگهی گهشتهکهماندا بهفرۆکهی مێگ بۆمباران کراین ، بۆنی جهنگم دهکرد لهسهرووی خۆمانهوه، بۆم دهرکهوت که فرۆکهکانی "مێگ" ههرشتێك بۆمباران دهکهن کهبجوڵێتهوه زهرهرو زیانێکی زۆر بهگونده کوردیهکان و دانیشتوانهکهی دهگهیهنن".

لهڕێگهکهیدا قهمحی ژمارهیهکی زۆر ئاماژهو هێمای دۆزینهوه که بهکرێگیراوانی مۆساد لهکوردستان بهجێیان هێشتوه ، یهکێ لهکوردهکانیش داوای لێ کردوه کهسلأوی ئهو بگهیهنێته شۆفاری ئیسرائیل "یههودا تێجهر" که لهزیندان بهیهکهوه بوون ، "تێجهر" ئهو کهسهبوو که موساد بهڕێکهوتن لهگهڵ

[1] پێدهچێت ئهمهش ههر ههڵهی وهرگێر یان نوسهر بێت ، لهوانهیه گهلاله بێت (وهرگێر).

"عبدالكريم قاسم" گەڕاندیەوە بۆ ئیسرائیل ، پیاوە کوردەکە وتبوی " هەردوکمان زیندانی بوین لە بەندینخانەی عێراقی دا.
لە٩ی ئایار واتە دوای پێنج ڕۆژ لەگەیشتن بەکوردستان قەمحی گەڕایەوەو سنوری عێراقی بڕی بەرەو ئێران.

★ ★ ★

لەگەڵ گەڕانەوەی بۆئیسرائیل قەمحی لەگەڵ "مائیر عمیت" و "هرۆبن" و سەرۆکی وەزیران "لیڤی ئاشکۆڵ" کۆبوەوە دەڵێت : (( داوام لێکردن هاوکاری کوردەکان بکەن بەئەوپەڕی توانا ، چونکە نیوەی سوپای عێراقیان سەرقاڵ کردوە ، ئەم ڕاستیە ئێرانیەکانیش پێی خۆشحاڵن)).
قەمحی ژمارەیەك پێشنیاری تریشی کرد بۆ لێپرسراوەکان کە تائێستاش پاش تێپەڕبوونی نزیکەی ٣٥ ساڵ بەسەر ئەو ڕوداوانەدا ڕێگری دەکرێ لەبلاوبوونەوەیان.
ڕاپۆرتەکەی قەمحی زۆر هاندەر بوو ، ئارەزوی درێژکردنی دەستی یارمەتی ئیسرائیلی بۆ کوردەکان زیادکرد ، تەواو ڕوونبووەوە کە پێویستە کەسێکی سەربازی بنێرین کەتایبەتمەندە لەو بواری کارانەی کە بارزانی داوای دەکات یان پێویستی پێیەتی.
ئەوەبو ئەفسەر "ب" هەڵبژێردرا کە هێشتا ناوی بلاونەکراوەتەوە ، بەڵام ئەوئەرکانەی کە پێشتر کردبونی وای دەکرد کە گونجاوبێت بۆئەوکارە ، دەیزانی ئەوکارەی کە دەیکات ئاسان نیە و ماوەکورتیش نیە، کە پێی وترابوو نزیکەی ٣ مانگ لەوێ دەمێنێتەوە ، هەرچەندە ئارەزوی نەدەکرد خێزانەکەی بەجێبهێڵێت کە لەمانگی کۆتایی سکەکەیدابوو ، بەڵام نەیتوانی هەلی دروستکردنی مێژوو لەدەست بدات، و سەرکردایەتی ئەو شاندە ئیسرائیلیەی کرد کە یەکەم جار نێردرا بۆ سەرکردایەتی یاخیبونی کورد.

ئەو ڕێنماییە سەرەتاییانەی کە "ب" لە موسادی وەرگرتبوو سەرەتا ئاسان نەبوون بۆی ، بەڵام ئەم ڕاستیە ڕاڕای نەکرد ، چونکە لە ئەزمونی خۆیەوە دەیزانی کە کەموکورتیەکان لە زەمینەی واقیعیدا چارەسەر دەکرێن ، لەوماوەیەدا دەستی کردبوو بەخوێندنەوەی کتێب لەبارەی کوردستانەوە ، بە کتێبەکەی ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی "شمیدت"یشەوە ، کە پێشتر ئاماژەمان پێدا ، دەیزانی کە دەبێت نەخشەڕێگایەکی گشتگیر دابنێت کە بواری زۆر لەخۆبگرێت.

"ب" لەنیوەی دوەمی تەموزی ١٩٦٥ گەیشتە تاران ، یەکەم وێستگە کە سەردانی کرد "م"ی سەرۆکی دەستەی مۆساد بوو لە تاران ، کە یەکتریان دەناسی بەهۆی کارێکی هاوبەشی پێشویانەوە ئیستا دەبوو بەیەکەوە ڕێگا ببڕن بەرەو کوردستان ، سوربون لەسەرکڕینی ژمارەیەکی زۆر لەخواردنی لەقتوکراو تا بیبەن لەگەڵ خۆیان ، فەرمانێکیان لەئێرانیەکانەوە پێگەشت کەدەبێت بە تاریکەشەو بڕۆن و زۆر وریا و هۆشیاریش بن ، بەئۆتۆمبیلیکی جۆری جیب بەڕێگەیەکی شاخاوی پێچاوپێچ دا بردیانن ، لەناکاو شۆفێرەکە وەستاو وتی "ئەوە سنورە"و ، ڕەتیکردەوە یەك سانتیمەتری تر بجوڵێت.

هیچ چارەیەکیان نەما جگەلەوەی کە بەپێ بڕۆن بۆ لای ئەو کوردانەی کەچاوەڕێیان بون.

بەم شێوەیە چیرۆکی شاندی ڕاوێژکاری ئیسرائیل لەکوردستان دەستی پێکرد ، هەردوکیان ناوێکی جفرەیان پێدرا ، کە هەتا ئیستا یەکێکە لەونهێنیانەی کەناهێڵرێت بڵاوبکرێتەوە.

یەکەم دیمەن کە ئەو دوانە ڕوبەڕووی بوونەوە پێشمەرگەیەك بوو کەتفەنگەکەی لەم دەستەیەوە بۆدەستەکەی تری دەگواستەوە کە پڕبوو لەخوێن ، هەرزوو بۆ دوو ئیسرائیلیە پەشۆکاوەکە دەرکەوت کەئەو پێشمەرگانە توانایەکی لەڕادەبەدەریان لەئارامگری و خۆگری و باوەڕ بەخۆبون هەیە، ئەمە جگە لە

پاپەندبونی تەواوەتی و دڵسۆزی زۆریان بۆ بارزانی، و هەڵسوکەوتیان لەگەڵ چەکەکانیان وەك هەڵسوکەوتە لەگەڵ پارچەیەکی جەستەی خۆیان.

یەکێ لەو پێشمەرگانە باسی ئارەزوی قوربانیدانی خۆی کردبوو لەسەردەمی جەنگی ساڵی ١٩٤٨ دا.

*  *  *

"ب" و هاوکارە هونەرییەکەی پاش کاتێکی کەم لەماڵەکەی خۆی لەگەڵ بارزانی کۆبونەوە ، کەچەند کیلۆمەترێك لە "حاجی ئۆمەران"ەوە دووربوو، ئەو سێ کەسە هەمو ئەو کێشانەیان باسکرد کە سەرکردایەتی یاخیبوان توشی بوەو دەبێت ، لەکەمی پارەوە هەتا ئیمکانیەتی پێشکەشکردنی هاوکاری بۆخاووخێزانی ئاوارەکان و گرنتیکردنی سەرچاوەی بژێوی ماقوڵ و کەمهێنان لەژمارەیەکی زۆر چەك تەقەمەنی ئەمە جگە لەنەبونی وێستگەیەکی پەخشی بەهێز ، لەپاش کۆتایی دیالۆگ و یەکترناسین بارزانی و هاورێ ئیسرائیلیەکانی ڕویانکردە حاجی ئۆمەران تا بارزانی لەگەڵ "م" کۆببێتەوەو قسەی لەگەڵ بکات، لەگەڵ نەمانی تاریکی "م" بەپەلە بەرەو تاران گەڕایەوە ، فەرمانەکان جەختیان لەوەدەکردەوە کە هەر گەشتیارێکی پلەبەرز کەدێت بۆ سەردانی کوردەکان دەبێت بە تاریکی شەو بێت و بەرەبەیان یان ڕۆژی دواتر بگەڕێتەوە.

لەکوردستان ئیسرائیلیەکان دەبوو لەسەر شێوەی کوردەکان بن، بۆیە جلی ئەوانیان لەبەرکرد کەڕەنگاوڕەنگ بوو، و پشتێنە چەند مەتریەکەشیان لەخۆیان بەست کە هەشت مەتر دەبوو، وە جامانەیان کردە سەریان ، بەوشێوەیە لەبەرامبەر بارزانی دادەنیشتن کاتێك سەردانیان دەکرد ، بەهەمانشێوە کاتێك ئەو دەهات بۆ شوێنەکانیان.

بارزانی تەواو ئیسرائیلیەکانی بەشێوازی قسەکردن و گفتوگۆی جوانی خۆی کاریگەرکردبوو، سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی کە ئەو زۆر توندە بەرامبەر دوژمنە کوردەکانی ، ئیسرائیلیەکان درکیان بەوەکرد کە ژمارەی دوژمنەکانی بارزانی

لەنێو کورددا کەم نیە ، عێراقیەکانیش سەرکەوتووبوون لە هەلومەرگرتن لەو ڕقەی کەئەوان هەیانە، و دوژمنایەتی بارزانیان لەدڵیاندا چاندبوو.
وە لەژمارەیەك لەوڕاپۆرتانەدا کە ناردویانە بۆئیسرائیل جەختیان لەوەکردۆتەوە کە بۆ بارزانی باشترە لەگەڵ بەشێك لەودوژمنانەدا ئاشت ببێتەوە.
وە بۆ ئیسرائیلیەکان ڕوونبوەوە کە ڕای بارزانی لەو مەسەلانەدا کەئەزمونی تیایاندا هەیە باش و ماقوڵە ، بەڵام لە باقی مەسەلەکانی تردا کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەو ئەفسەرە کوردانەی کەپێشتر لەسوپای عێراقیدا خزمەتیان کردوە ، و هەڵهاتون لەسوپا ، هەرچەندە هەمیشە گومانی هەبوو لێیان ، بارزانی دەیزانی کەبوونی ئەو لەجەنگەکاندا زۆرگرنگە ، چونکە دەتوانێ سەرپەرشتیان بکات و جەنگەکە بەڕێوە بەرێت ، هەرزوو "ب" و هاوڕێکانی بۆیان دەرکەوت کە زۆرینەی هەرەزۆری سەرکردە مەیدانیەکانی دەوروبەری بارزانی کەموکوڕیان لەڕۆشنبیریی سەربازی فەرمی دا هەیە ، سەرەڕای ئەوەش توانستێکی باڵایان هەیە لەسەرکردایەتی و جورئەتدا ، لە پەیوەستبون بەئامانجەکانەوە و ئارەزوی زۆریان بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی کەپێیان ڕاسپێراوە.
گران بوو بۆ ئیسرائیلیەکان کەبارزانی لەوە بگەیەنن کە پێویستە پشت بە ئەو سەرکردانە ببەستێت و سەلاحیات و تایبەتمەندیان پێ بدات ، ئەو ناتوانیت لەهەمان کاتدا سەرپەرشتی چەند جەنگێك بکات ، بەڵام زەمەن کاری خۆی کرد و ئەوەی تێگەیاند.

بارزانی بەردەوام بوو لەجەختکردنەوەی بۆڕاوێژکارە نوێیەکانی "ئیسرائیلیەکان" کە ئەو ئیسرائیل وەك دەوڵەتێکی گەورە دادەنێت ، ئەو بەسەرسوڕمان و بەهاوە دەیوت : کە جولەکە دەستیان بەسەر هەموو جیهاندا گرتوە ، نازانێت هۆکاری ئەوە چیە کەئیسرائیل بۆ نمونە مانگانە ملیۆنێك دیناری بۆ تەرخان ناکات یان قەرزێکی وەك بودجەی ساڵانە پێ بدات؟ جەختی لەوە دەکردەوە کە ئەو پارانە تا دواهەمین سەنت بۆ ئیسرائیل دەگێردرێتەوە

کاتێك کوردەکان بەسەر عێراقیەکاندا سەرکەوتن ، لەهەمانکاتدا بارزانی جامی تورەیی خۆی بەسەر ئەمریکیەکاندا دەڕشت و دەیگوت: ((ئەمریکیەکان بیریان چووە کەزۆرینەی بیرەنەوتەکانی عێراق لەناوچەکوردیەکاندان ، وە کوردەکان کۆنترۆڵی ئەو ناوچانە دەکەن پاش ئەو سەرکەوتنەی کە هەردەبێت ، دەیگوت : کە ئەو هەموو جارێ ئامادە بوو کەبیانکاتە هاوبەش بەلاّم ئەمریکیەکان تەواو پشتگوێیان خستووەو هیچ پەیوەندییەکی پێوەناکەن، بۆیە هیچ سەیرنەبوو کە بیرلە پەلاماردانی بیرەنەوتەکانی عێراق بکاتەوە ، پاش ئەو بیرۆکەیە دەیگوت : دەبێت ئەمریکیەکان لەوە تێبگەن کەشتەکە جددیە! .

★ ★ ★

هەڕەشەکانی کوردەکان بۆ خاپورکردن وتەقاندنەوەی بیرەکانی نەوت لە پێناو دەستکەوتنی پارە بوو لەکۆمپانیاکانی نەوت، کە پارەیان دەدا تاوەکو مەترسیەکان لەخۆیان دوربخەنەوە ، "عمیت" جەخت لەوەدەکاتەوە کە ئیسرائیلیەکان هانی بارزانیان دەدا کە ئەو نەخشەیە جێبەجێ بکات ، وە ئەو شێوازە بگرێتەبەر لەبەرئەوەی پارە کاریگەر ترین هۆکار بوو لەسەر بارزانی ، چونکە زۆری پێویست بوو تاکرێی مانگانە بداتە چەکدارەکانی و وەك پێویستیەکی ئەخلاقی تا پارەیەکی مانگانە بدات بەخێزانی ئەو چەکدارانەی کە لەجەنگدا دەکوژران لەگەڵ بریندارەکان.

پیویستی بە سەلماندن نەدەکرد تا ئیسرائیلیەکان لەوەبگەن کوردەکان چۆن دەژین ، ئەوان زۆربەی ڕۆژەکان تەنها دوو ژەمیان دەخوارد کەپێکهاتبوو لەپارچە نانێك وشیر یان خەیار، ئەو کەموکوڕیە ترسناکەی خواردن هۆکارەکەی بۆمبارانی فرۆکە عێراقیەکان بوو ، بۆمبەکان مێگەلی مەڕو بزن و مانگاکانیان دەکوشت و کێڵگەی دانەوێڵەیان دەسوتاند ئەمە جگە لەتێکدانی ئەو کارەکشتوکاڵیانەی کەبەروبومیان دەپاراست و هەڵیان دەگرت لەهاویندا تا لەزستاندا پێی بژین و بیخۆن ، کار گەیشتە ڕادەیەك کە دابینکردنی خواردن بوو بەپێویستی بنەڕەتی

لەناوچەکانی یاخیبواندا کە مەسەلەکە پەیوەست بوو بەهاوردەکردن لە تورکیا و لەئێرانەوە ، بەرامبەر پارە کەدەست نەدەکەوت.

بارزانی وتبوی : ((کەمی پارە بۆتە هۆی کێشەی تەندروستی بۆ شەرکەرەکانمان ، وە لێکدابرانی ریزەکانیان ، ئەمەش هەرەشەیە و هەرەسی یاخیبونەکەیە ، کوردەکان ناچاربوون لەو ناوچانە پاشەکشەبکەن کەدەستیان بەسەراگرتبوو لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی خواردنی پێویست بگەیەنن بەو جەنگاوەرانەی کە لەو ناوچەیەدا بون، جگە لەوە نەیاندەتوانی هێرشی تر رێکبخەن بۆناوچەی تری گرنگ ، هێرشە ئاسمانیەکانی عێراق زیانی مرۆیی زۆری لە کوردەکان داو ، قوربانی زۆری لێخستەوە ، هەروەها کوردی زۆر دەکوژران لەکاتی هێرشکردنیان بۆسەر پێگەکانی عێراقیەکان بەهۆی فیشەکەوە بێت یان بەتەقینەوەی ئەو مینانەوە بێت کە عێراقیەکان پێشتر چاندبویان.

لەوماوەیەدا سێ کورد لەئیسرائیل وەرگیران تا بەشداری بکەن لە خولێکدا ، بارزانی داوای لە ئیسرائیلیەکان کرد کە لەو جۆرە خولانە زیادبکەن ، کەکارکردن بوو لەسەرچۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی کێڵگەکانی مین و کردنەوەی رێگا.

جێی بیرهێنانەوەیە کە ناوبانگی جەنگاوەریی کوردەکان زۆر بوو بەڵام ئێستا کاتی ئەوەبوو کەتوانستی جەنگی نوێ فێرببن.

لەئیسرائیلەوە راجیمەی تیرە ١٢٠ ملم یان دەستکەوت کە نزیکەی ٦ کیلۆمەتر دەرِوات وە لەوخولانەدا کە سوپای ئیسرائیلی لە تاران بۆی گردبونەوە فێری چۆنیەتی بەکارهێنانی بون ، لەحوزەیرانی ١٩٦٥ ، بەڵام لێرەوە توشی کێشەیەکی نوێ هاتن ، ئەویش لەوکاتە بەدواوە تەنها پێویستیان بەتوانای هێرشبردن نەبوو لەجەنگدا بەڵکو تەنسیق "رێککاری" لەنێوان هێزی هێرشبەر و هێزی تۆپخانەی پاڵپشت.

بارزانی زۆر دڵخۆش دەبوو بەدەنگی راجیمەکان کەبۆمبەکانیان دەهاویشت ، ئەمە جگە لەو کوشتارەی کەدەیکرد ، باوەری بەوەدەکرد کە راجیمەکان

بۆشاییەك لە هێزەسەربازیەکەی پڕدەکەنەوە ، وە ترس دەچێنن لەدڵی سەربازانی عێراقیدا لەسەر ئەوبنەمایە بارزانی دەستیکرد بەبەکارهێنانی ڕاجیمەکان ، بەشێوەیەکی بەرفراوان بەبێ گوێدانە ئەوەی کە ئامانجەکان بەووردی دیاری دەکرێن یان نا.

ئامانجی بنەڕەتی بارزانی کەدەیویست لێی بدات لیوایەکی عێراقی بوو ، کە پاڵپشتێکی پێکهاتوو لەتۆپهاوێژی ٥٠٥ ملیم شەش دانەیان لابوو ، لەجەبهەی پشتەوەی یەکێ لەپێگە ستراتیژیەکانی کوردەکان کەشارۆچکەی "ڕەواندز"ە نیشتەجێ بوبون ، نەخشەکان جەختیان لەوەدەکردەوە، کەڕاجیمەکان ناگەنە نیوەی ئەو ڕێگایەش کە ڕوو لە شوێنی هێزەکە دەکات ، بۆیە بارزانی داوایکرد کە تۆپهاوێژی ئاست بەرزتر بەڕادەی دوو ئەوەندەیان لەئیسرائیلەوە بۆ بنێرن ، چونکە ئەو دەتوانێ بەو هێزەی کەپێشتر هیچ نمونەیەکی نەبوو لە زاراوەی سەربازی کوردیدا ئەو ئامانجەی بەدی بهێنێت.

لە ژێربالێ تاریکی تۆپهاوێژ و چەکە داواکراوەکان گەیشتن ، بەڵام ئیسرائیلیەکان بۆ کوردەکانیان ڕوونکردەوە کە مەحاڵە هەموو نیشتمان تەنها بەودوو تۆپهاوێژە ئازاد بکرێت.

لە ٦و ٧ی ئابی ١٩٦٥ کوردەکان بەبەکارهێنانی ڕاجیمەو ئەو دو تۆپهاوێژەی کە تازەهاتبوون هێرشیان کردەسەر پێگەیەکی عێراقیەکان کە کۆنترۆڵی چیای "کۆڕەك"یان کردبوو، عێراقیەکان توشی شۆك بون ، بەبەکارهێنانی ئەو چەکە نوێیانەوە ژمارەیەکی زۆرکوژراویان دا، بەڵام شەڕەکە یەکلانەبووەوە، کوردەکان هێرشەکەیان تەواو نەکرد بە بەکارهێنانی ئەو هەنگاوانەی کەمابون ، وە دەبوو ئەنجامیان بدایە ، کۆنترۆڵی ڕێگای خولگە سەرەکیەکانیان نەکرد، بەمەش هەلیان دا بەعێراقیەکان کەهێزی زیاتر بنێرن دژە هێرشێکی زیاتر و بەهێز و جددی بکەنە سەرکوردەکان بەم شێوەیە دوبارە چیای "کۆڕەك"یان داگیرکردەوە.

پاش ئەوە تاکۆتایی ١٩٦٥ کوردەکان دوو ناوچەی ستراتیژی تریان لەدەست دا ، ئەوانیش "پێنجوین" و "قەڵادزێ" بون ، لەئەنجامی پرۆسەی پاکسازی کەسوپای عێراقی دەستی پێکرد و ژمارەیەکی زۆر ڕاجیمەیان لەکوردەکان گرت کە دروستکراوی ئیسرائیل بون ، ڕۆژنامەی عیراقی "بەغداد نیوز" کە بەزمانی ئینگلیزی دەردەچوو ، لە ژمارە یەکی تشرینی دوەمی ١٩٦٥ جەختی لەوەکردۆتەوە.

هێرشی عێراقیەکان زۆر کتوپڕ بوو بەنیسبەت کوردەکانەوەو چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد کەعێراقیەکان لەزستاندا هێرش بکەن، زستانهات بەبێ ئەوەی سوپای عێراقی بەردەوامی بدات بەهێرشەکەی بە هۆی گرانی و سەختی ئاووهەوای ناوچەکە لەنیوەی کانونی دوەم ، عێراقیەکان ناچاربوون بکشێنەوەو ناوچەکە چۆڵ بکەن بەبێ ئەوەی نیازی خۆیان بشارنەوە لەوەی کە لەهاوین و بەهاردا بگەڕێنەوە بۆ دوبارەداگیر کردنەوەی ناوچەکە ، و پێشووەچوون تا سنورەکانی ئێران ، کەوەك خوێنهێنەری سەرەکی وابوو بۆکوردەکان.

کوردەکان زانیان کەپەیوەندیەك لەنیوان عێراقی وئێرانیەکاندا لەسەر ئاستی باڵا لەتەموزی ١٩٦٥ ەوە لە بەغداد بەڕێوەدەچێت ، وە بەپیی هەڵسەنگاندنەکان لەئابی ١٩٦٥ بۆی هەبوو هەوڵەکانی ئەو دوو وڵاتە بگاتە لوتکە لە پێناو گەیشتنەوە بەڕێککاریەك لەو کێشانەی کە ناکۆکن لەسەری ، ئەو هەڵسەنگاندنانە ئەوەیان دەخستەڕوو کە ئێرانیەکان ، کوردەکان وەکو هۆکارێکی فشار بەکاردەهێنن بە پێی بەرژەوەندی خۆیان ، بەڵکو بۆی هەیە وەك قوربانیەك لەسەربرپینخانەی ڕێککردنەوەی ناکۆکیە سەخت و درێژخایەنەکەیان لەگەڵ عێراقدا پێشکەشی بکەن.

کێشەی سەرەکی کە بەشی زۆری ناکۆکیەکەی پێکدەهینا کێشەی زاڵبوون و کۆنترۆڵکردنی "شط العرب" بوو کە ڕێژگەی هەردوو ڕوباری "دیجلە"و

"فورات"ه ، بەرەو ئەو کەنداوەی کە دوو وولاتەکە لەیەك جیادەکاتەوە ، و وەك دەمارێکی ژیانی ئابوری و ژیاری دادەنرێت ، تێپەڕگەی بەشێکی زۆری بازرگانی دەرەکی عێراقیە لە ڕێگەی "بەسرە"وە ، وە هەروەها ڕێگەی بازرگانی دەرەکی ئێرانی لە ڕێگەی "خورەمشەهر"ەوە و تێپەڕگەی نەوتە لەباشوری عێراق و پاڵیوگەی نەوتی ئێرانی لە "ئەبەدان".

ڕێکەوتننامەی ١٩٣٧ کەلەسەر ڕێکەوتنەکانی پێشوتری نێوان هەردوو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی دروست بووبوو ، تێکست لەسەر ئەوەدەکات کە"شط العرب" ناوچەیەکی عێراقیە جگە لە پارچەزەوییەکی بچوك کە نزیکە ١٥ کیلۆمەتر دەبێت و دەکەوێتە بەردەم "ئەبادان" ، سنورەکە بەوێدا تێپەڕدەبێت لەناوەڕاستی ڕوبارەکەوە بە درێژایی هێڵیکی گەورە و قوڵ ، پرۆفیسۆر "یعقوب شەمعونی" لە "المعجم السیاسی للعالم العربی" دا دەڵێت: ((ئەم دابەشکردنە هەردولای ڕازی نەدەکرد بەتایبەت ئێران کە دەیویست سنور بەناوەڕاستی "شط العرب"دا تێپەڕببێت ، ئەم بارودۆخە بووە هۆی دروستبونی کێشەی گەورە و توند بە تایبەت مەسەلەی دەریاوانی و دانی گومرگ و کارگێری کەشتیەکان لەسالانی شەستەکاندا.

بەلام پەیوەندیەکانی نێوان عێراقیی و ئێرانیەکان ((لەساڵی ١٩٦٥ — وەرگێر- )) بەنهێنی ئەنجام دەدرا، هەمووولایەك دەیانزانی کە هەر ڕێکەوتنێك ئەنجام بدرێت لەسەرحسابی کوردەکان دەبێت ، هەمان شت ڕوی دا کاتێك هەردولا گەیشتنە ڕێکەوتن لەسەر کێشەکان لەئازاری ١٩٧٥ .

"ب" ماوەی ڕاوێژەکاریەکەی لەکوردستان کۆتایی پێ هینا لە ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٥ و "م" کە بارودۆخی کوردستانی لە تارانەوە بەڕێوەدەبرد پێی وابوو کەپێویستە شاندێکی هەمیشەیی ئەندامانی مۆساد لەکوردستان دا بوونی هەبێت ، سەبارەت بەوە نامەیەکی بۆ لێپرسراوە ئیسرائیلیەکان نارد ، وتبوی "

دەبێت ئەو وەفدە ڕاوێژکاریە سەربازیی ئاستبەرز لە خۆبگرێت کەتێگەیشتنێکی تەکنیکی وستراتیژی هەبێت ، ئەمە جگە لەتوانای هونەری".

ئەم پێشنیارە لە دوو لاوە ڕووبەرووی نارەزایی بوەوە ، یەکەم لەسەر ئاستی کوردەکان کە پێیان وابوو ، توانستی تەکنیکی و ستراتیژی بارزانی تەواوەو بەسە بۆئەوان لەلایەکی ترەوە لەسەرئاستی ئێرانی کە لەوەدەترسان مانەوەی شاندێکی هەمیشەیی سەربازی ئیسرائیل لەکوردستان ببێتە هۆی ئەوەی کوردەکان ئەزمونی نوێ پەیدابکەن کەببێتەهۆی ئەوەی یاخیبونی کوردەکان لەکۆنترۆڵی ئەوان دەربچێت و دەسەلاتیان بەسەریدا نەمێنێت ، بەڵام لەکۆتایدا هەردوولا بە پیشنیارەکەی ئیسرائیل ڕازی بون.

مۆساد و سەرۆکی حکومەت دەستبەجێ بیرۆکەکەیان قبوڵ کرد ، بڕیاردرا شاندەکە لەیەکێك لەڕۆژەکانی بەهاردا بنێردرێت نەك لەسەرەتای زستان ، کەهەمیشە لەای تشرینی یەکەم دەست پێدەکات و لەسەرەتای نیسان تەواو دەبێت.

کاتێ: "م" زانی مۆساد لەکەسێك دەگەڕێت تا کۆتایی بەخزمەتەکەی بهێنێت و لەسوپای ئیسرائیلی بینێرێت بۆ کوردستان بەپەلە خۆی کاندید کرد بۆ ئەو ئەرکە ، بەهۆی ئەو توانستەوە کە لەتاران نواندبوی دەستبەجێ مۆساد ڕازی بوو لەسەری.

لەکۆتاییدا هەواڵی بوونی شاندی ڕاویژکاری ئیسرائیل لە کوردستان هەر ئاشکرا بوو بۆ عێراقیەکان ئەمەش ئەو شتە بوو کە مۆساد بە هەندی وەردەگرت ، مۆساد دەیزانی کە ژمارەی شاندەکە هەرچەند بچوکیش بێت بەڵام ناوچەی کوردستان خیانەتی زۆری تیدا دەکرێت.

جێی باسە شاندی ئیسرائیلی لەزۆربەی کاتەکاندا ژمارەیان ٣ بۆ ٤ کەس دەبوو، تەنها لەهەندێ حاڵەتی دیاریکراودا نەبیت دوو ئەوەندە زیادکراوە یان سێ ئەوەندە بۆمەبەستی ئەوخولانەی کە بۆ کوردەکان دەکرایەوە لەوێ ، بەم شێوەیە

خیانەتکارە کوردەکان هەواڵ بونی ئیسرائیلیان لەکوردستان گەیاندە ناوەندە عێراقیەکان ، لەنێو ئەو خیانەتکارانەدا ئەفسەریکی پلە بەرز هەبو بەناوی "عەقراوی"وە هەروەها کوڕەگەورەکەی مەلا مستەفا کەناوی "عبیداللە"بوو ، کە بە ڕۆژنامەنوسی میسری "محمد حسنین هیکل"ی وتبوو: "ئەو ئیسرائیلیانەی کە هەمیشە هاوڕێی باوکم بوون بەئامێری بێ تەل هەمیشە پەیوەندییان هەبوو بەئیسرایلەوە و کاری شۆڤارانەیان لە عێراق ئەنجام دەدا".

بەڵام "عەقراوی" بەپەیامنێری ڕۆژنامەی "کریستشیان ساینس مۆنیتۆر"ی وتبو لەژمارەی ١٢ای کانونی یەکەمی ١٩٧٤ دا کەئەرکی ئەوئیسرائیلیانەی لەکوردستانن کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەیە کە بۆ ئیسرائیل گرنگن ، ڕۆژنامەنوسی فەرەنسی "جاك لارنجی" دەڵێت : "ئیسرائیلەکان لە کوردستان تۆڕێکی پەیوەندیان دروست کردبوو".

کاتی نزیکبونەوەی کۆتایی ماوەی کاری "م" لەکوردستان "عمیت" لەجێگرەوەیەك دەگەڕا بۆی ، لایەنێکی سەربازی پێشنیاری ئەفسەری یەدەك "دەیڤید کرۆن"ی کرد، جێی بیرهێنانەوەیە کە ناوی "کرۆن" پەیوەندی هەیە بەمەسەلەی دۆسیەی کوردی - ئێرانی لە پێشترەوە ، لە ئازاری ١٩٦٥ بەر لەوەی بڕیار لەسەر اردنی "دەیڤید قەمحی" بدرێت بۆ کوردستان لایەنێك پێشنیاری کردبوو کرۆن بنێردرێت بۆ ئەو ئەرکە.

کرۆن ڕازی بووبەوەی ڕوبکاتە تاران خۆی فێری زمانی فارسی کردو ، وە هەرچی کە لەهەواڵگری سەربازیدا هەبوو سەبارەت بەو مەسەلەیە خوێندیەوە.

کرۆن لەگەورەترین پیاوانی هەواڵگرییە لەسەرئاستی پیشەیی و تەمەنیش ، ئەزمونێکی دەوڵەمەندی هەیە چالاکیەکانی لەسەردەمی جەنگی میللی "ئیسپانیا"وە لە ساڵانی ١٩٣٧-١٩٣٨ دەستی پێکردوە ، یەکێ لەو خۆبەخشە ئیسرائیلیانە بوو کە شانبەشانی "کۆماری ئیسپانیا" جەنگاوە لە چوارچێوەی ئەو تیپە نێودەوڵەتیەی کە بەسروشی سۆڤیەت پێکهێنرابوو.

کرۆن دەڵێت : ((ڕێژمیەکی زۆر خوێن وفیشەکم بەچاوی خۆم بینی لەوێ کە ئەوسا دژی فاشیەت بوم ، پاشان پەیوەندی کرد بە "کیبوتس - پاسەوانە گەنجەکە"وە ، ئینجا چووە ناو هەوالگری ڕێکخراوی "هاگانا"وە و فێری زمانی عەرەبی بوو ، وە زۆر بەگرنگیەوە ئاگاداری ئەو تێکهەڵچوون ڕوداوانەدەبوو کە لەباشوری فەلەستین لە نێوان عەرەبەکاندا ڕویان دا، پاشان ڕاسپێردرا کە ئەو هێڵانەی ناو بپارێزێت کە بەبێ ئەوان مەحاڵ بوو بتوانرێت نشینگەسەرەتاییەکانی ئیسرائیل لە "نەقەبی باکور" دروست بکرێن.

لەلوتکە جەنگی ١٩٤٨ دا بانگکرا تاپەیوەندی بکات بە هەوالگری سەربازییەوە لەبواری وەرگرتن و کارپێکردنی بەکرێگیراوە عەرەبەکاندا ، لەساڵی ١٩٥٠دا لەسوپای ئیسرائیلی بەپلەی "ڕائید" خانەنشین کراو گەڕایەو بۆ "کیبوتسە" ، کاتێك جەنگی ١٩٥٦ هەلگیرسا گەڕایەوە بۆ خزمەتی ئاسایش و سروشتی کارەکەی شاراوەتەوە و کەس نیە کە ستایشی کرۆنی نەکردبێت ، لەکارەکانیدا پاش ساڵی ١٩٥٦ زۆر مەدح کراوە.

ئێستا کاندیدە بۆ بەڕێوەبردنی چالاکیەکانی ئیسرائیل لە کوردستان لەپێگەی پێشکەوتوی هەوالگرییەوە لەتاران ، لە کاتێکدا کەخۆی ئامادە دەکرد بۆ تاران سەرۆکایەتی مۆساد لەگەڵ هەیئەی ئەرکانی گشتیدا تاوتوێ کەسێکیان دەکرد تا وەك ڕاوێژکاری سەربازی کار بکات لەگەڵیدا ، ناوی "ئاریل شارۆن"[1] درا بەڵام سەرۆکی ئەرکان "ئیسحاق ڕابین" داوای کرد وازی لێ بهێنریت ، شارۆن ئەوکات پۆستی سەرۆکی هەیئەی ئەرکانی کەرتی باکوری بەدەستبوو، بەپلەی "عقید" لەکۆتایدا مقدم "تسوری ساجی" هەڵبژێردراو بەکردەیی نێردرا بۆکوردستان ، ئەم ئەفسەر توانی متمانەی ئێرانی کوردەکان لە هەمان کاتدا بەدەست بهێنێت.

---

[1] لە پاش دوهەزار بوو بە سەرۆکوەزیر – وەرگێر-

## بەشی دەیەم/ هەرگیز وەك سوپای ئیسرائیل نابن

"مقدم تسوری ساجی (شینکین)" لەتشرینی دووەمی ١٩٦٥ بانگکرا بۆ لقی ئاراستە کردن لەهەیئەی ئەرکان لەبەرئەوەی ئەو سەرکردەی کەتیبەی ٨٩٠ی سەر بە لیوای پەرەشووتەوانی بوو ، تاڕای وەربگیرێت سەبارەت بە ئەو کارە نوێیەی کەپێی دەسپێردرێت ، لەوێ پێیوترا کەڕودەکاتە تاران بۆئەوەی خولێکی تایبەتی بکاتەوە بۆ هێزێکی تایبەت لە سوپای ئێرانی ، کاتێك خولەکەی کۆتایی پێهێنا لە تاران بەڕێوەبردنی خولێکی تری خرایە بەردەم ، بەڵام شاگردەکان ئەمجارە لە کوردەکان بوون.

"ساجی" کەبەناوی یەکەمیەوە "تسوری" ناسرابوو ، شەڕکەرێکی باش بوو و توانست و جیاکەرەوەی زۆری هەبوو لەجەنگی بچوکدا ، لە ساڵی ١٩٥٢ پەیوەندی کردبو بەسوپای ئیسرائیلیەوە و پەیوەندی کرد بەهێزی پەرەشوتەوانیەوە ، وە بەشداری زۆربەی ئەو کاری تۆڵەسەندنەوانەی کرد کەسوپای ئیسرائیلی لەپەنجاکاندا لە "غەززە" و لە "کەناری خۆرئاوا" ئەنجامی دان ، و لەدەرەوەی سنوری ئیسرائیل لەژێر فەرماندەیی "ئارێل شارۆن" و "ڕافائیل ئیتان" دا.

جگەلەوە خولێکی پێشکەوتوی لەهێزەتایبەتیەکانی سوپای ئەمریکا بڕیوە ، و خولێکی بۆ هێزە تایبەتەکانی سوپای "ئەسیوبیا" کردۆتەوە و ئەوکەسەی کەپێشنیاری کرد ئەو لە تاران کاربکات ، یاریدەدەری سەرۆکی لقی ئەرکان لیوا "ڕەحبعام زەئیفی" بوو.

سێ ئەفسەر بە پلەی "نەقیب" خرانە ژێر فەرمانی "تسوری"دوە بەمەبەستی کردنەوەی خولەباسکراوەکان ، ئەوانیش "یەهودا برینج" سەرکردەی سرییەی[1] ئەندازەیی لە لیوای پەرەشوتەوانی ڕژێم و "عەوزی فرومر" سەرکردەی سریە لە

---

[1] ڕێکخستنی سەربازی لیوا← بچوکتر ، فەوج ←بچوکتر ، سریە (وەرگێر)

لیوای یەدەکی سەر بە هێزی پەڕەشوتەوانی و "نەتان ڕاهیب" سەرکردەی بنکەی تێکدان لەسرییەی ١٣ای سەر بە هێزی دەریایی.
هەرچواریان لەکانونی یەکەمی ١٩٦٥ لە تاران نیشتنەوەو بۆ یەکەم جار چاوین کەوت بەپاشکۆی سەربازی ئیسرائیل "یعقوب نەمرودی" کە پاشتر بوو بەملیۆنێریکی ناسراو، تسوری دەڵێت : ((نەمرودی یەکەم پاشکۆی سەربازییە لە ئێران گومان لەوەدا نیە ، کە ئەو بەتەنیا هەموو دەزگای مۆسادە)).
زانیاریەکانی ئەو بە نهێنیەکانی حکومەتی ئێران و سوپاکەی سەرسوڕهێنەر بوو، هەموو وەزیرە پایەبەرزەکانی دەناسی لەگەڵ هەموو ئەفسەرە گەورەکان ، هەرزوو کۆبونەوەیەکی ئەنجامدا بۆ "تسوری" لەگەڵ هەندێك لە ناسیاوەکانی ، لەوانە ژەنەڕاڵ "عزیزالله کمال" سەرۆکی هەوالگری ئێران و ژەنەراڵ "نیعمەالله ناصری" سەرۆکی نوێی ساواك کەهاتبووە شوێنی "فقرقان".
جێگەی وتنە "کەمال" بە بنەچە کوردە بەڵام ئەم ڕاستیە ڕێگر نەبوو لەسەرکردایەتی ئەو یەکە ئێرانیەی کەکۆماری کوردیی مەهابادی دروستکرد ، کە لەساڵی ١٩٤٦ دروست کرا و بارزانی لەوێ دا پۆستی سەرۆك ئەرکانی هەبوو، ئەمەو "ناصری"ش لەساڵی ١٩٨٠ لەلایەن پاسەوانی شۆرشی ئێرانەوە لەسێدارەدرا، ئیسرائیل ئەو خزمەتانە لەبیرناکات کە "ناصری" پێشکەشی کردوە ، بۆیە گرنگی بەخێزانەکەی و ژنەکەی دەدات.
"ناصری" و "کەمال" یارمەتی "تسوری"یان دەدا لە تێگەیشتنی سیاسەتی ئێرانی وەك ئەوەی پێویستە ، تسوری دەڵێت : (( هەرزوو لەتێۆری ئاسایشی ئێرانی تێگەیشتم ، ئێرانیەکان هەمیشە حەزیان بەوەدەکرد کە جەنگی بەردەوام هەبێت لەنێوان ئیسرائیل و عەرەبەکاندا ، بەجۆریك کە سوپای عەرەبی سەرقاڵ بکات و بواری ئەوەیان نەداتی کە ئاوڕ بۆ ئەم بدەنەوە تا کار لەدژی بکەن بەتایبەت داگیرنەکردنی "خوزستان".

ئیسرائیلەکان هەموو ئامادەکاریەکی پێویستیان بۆ ڕوبەڕووبونەوەی هەموو ئەگەرەکان کردبوو ، بە ئەگەری دروستبونی شەڕ لەگەڵ عێراقیەکانیشەوە .

*　　*　　*

ئەو کۆمەڵەیەی کە "تسوری" ڕاهێنانی پێکردن لەژێرناوی شیفرەیی "مربید" لەهەڵبژێردراوانی ئێران بوون زۆربەیان ئەکادیمی و وەرزشەوان و ئەو موسوڵمانە بێدینانە بون کە زۆر ڕقیان لە ئوسوڵیە ئیسلامیەکان بوو ، تسوری درکی بە چۆنیەتی مامەڵە و سروشتی ئەوان کرد بەرامبەر بە ئسوڵی ئیسلامیەکانیان لەڕیی بۆچونەکانیانەوە لەکاتی خولەکەدا ، دەڵێت کاتێك بەوبیابانەدا دەڕۆشتین کەدەکەوێتە نیوان ناوچەی "قەزوین" و "قوم" کە "ئایەتوڵڵا سەید ڕوح الله الموسوی الخمینی" پاش ١٥ ساڵ کردی بە شوێنی نیشتەجی بونی خۆی ، ئێرانیەکان کاتێك گەیشتنە ناوچەکەی قوم پێشنیاری ئەوەیان بۆ کردم کە بەڕادەی پێویست خۆمان بشارینەوە ، لەبەرئەوەی ئەمە ناوچەی دیندارەکانە.

خولەکە لەوبەندینخانەیەدا سازکرا کەلەسالانی پەنجادا سەرۆکی حکومەتی لەسەرکارلابراوی ئێرانی ئەوسا "محمد مصدق" لێی زیندانی کرابوو ، ڕاهێنەرە ئیسرائیلیەکان هەموو هەوڵیکی خۆیان خستەگەڕ تا شاگردەکانیان ئەزمون وەربگرن لەسەرتیۆری جەنگی بچوك لەسوپای ئیسرائیلیدا بەلەبەرچاوگرتنی مەرجەکانی ناوچەکە و ئامانج لەجەنگی ئێران ، خولەکە خولانەوەو دژەهێرشی تایبەت بەپاراستنی بیرمنەوتەکانی لەخۆگرتبو ، لەکەنداو دژی ئەگەری هێرشی عێراقی.

"برینج" دەڵێت : کەئەفسەرە پلەدارەکانی ئێران لەوە دەترسان کە ڕاهێنراوەکان ئەو شێوازانەی کەفێری دەبن جێ بەجێ بکەن لەکودەتایەکی نێوخۆیدا ، بۆیە ڕاهێنراوەکانیان دەبرد بۆچێشتخانەکان و لەدەرچونەشەوانەکان دوریان دەخستنەوە ، و ئەو ئەفسەرانەی کەپێشتر لەسوپای ئەمریکادا ڕاهێنانیان پێ

کرابوو داوایان دەکرد ئەو شێوازانە بەکاربهێنن کە پێشتر لە فلیمەسەرکێشەکان دا بینویانە ، لەوانە خنکاندن بە پەتی پۆلاین.

لەکۆتایی خولەکەدا "تسوری" و "زەفورە"ی خێزانی ڕویان کردە کەنداو لەسەربانگهیشتی سەرکردەی هێزی دەریایی ئێرانی ، تا ئەوکاتەش بەلەمە سەربازیەکانی عێراق گەشتیان بە "شط العرب"دا دەکرد ، ئەمەش کێشە و مەترسیەکی ڕاستەقینە بوو بۆ "خوزستان" ، بۆیە سەرکردەی هێزی دەریایی داوای لە "تسوری" کرد کەپێشنیارەکانی بڵێت بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە.

"تسوری" پاش بیرکردنەوە وتی : چارەسەرێکی زۆر سادە هەیە بۆ ئەو کێشەیە ، دووتانك لە "خوڕەمشەهر" دابنێن کە بەسەر "شط العرب"دا دەروانێت ، پاشان دەتوانیت تۆپەکانیان هەر بەلەم و کەشتیەك دەخوازن نقوم بکەن ، بەڵام ئێرانیەکان پلانی کامڵ و گشتگیریان دەویست ، بۆیە ژوریکی کاریان بۆ "تسوری" دابین کرد لەسەرکردایەتی فیرقەی زرێپۆش تا کاربکات بۆدانانی پلانی ئەوکارە.

تسوری دەستی کرد بەگفتوگۆ لەگەڵ سەرکردەی فیرقەکە و هەیئەی ئەرکانەکەی و لەگەڵ سەرکردەکانی هێزی دەریایی لە نێوانیاندا ئەفسەری پرۆسەکان ، پاش ئەوەی کە لەسروشتی بیرکردنەوەی سەربازی ئەوان حاڵی بوو ، پلانی چاوەڕوانکراوی ئامادەکرد ، و بەئێرانیەکانی وت دەبێت هێزێکی ئێرانی دزەبکاتە ناوخاکی عێراقەوە و باخەکانی خورما تێ بپەڕێنێت ، ئەوانەی دەکەونە لای ڕۆژهەڵاتەوە لەبەردەم کەناراوەکانی بەسرەوە جێ بگرێ ، بە تانکەکان هەموو کەشتیە عێراقیەکان نقوم بکات.

لەو ڕاپۆرتانەدا کە ب ئیسرائیل نێردراوە هاتوە : سوپای ئێرانی زەمەنێکی زۆری دەوێ تا ببێتە سوپایەکی زیرەك.

★ ★ ★

ئەو ڕاهێنانەی کە تایبەتکرا بەهێزە کوردیەکان ناونرا بە ناویکی جفرمیی "ڕاهینەریکی باش"ەوە کە یەکانگیربوو لەگەڵ ڕێکەوتننامەی ئێرانی و ئیسرائیلی و ، ڕێکەوتننامەی مۆرکراو لەنیوان بارزانی و سەرۆکی حکومەتی ئێران "ئەمیر عباس هومیدا" لەکانونی یەکەمی ١٩٦٦کە تێکستی دەکرد لەسەر یارمەتی کوردەکان بەچەك و ڕاوێژکاری سەربازی لەهەمان مانگدا عێراق ناڕازیبونی خۆی نارد بۆ ئێران سەبارەت بەناردنی چەك بۆکوردەکان ، لەوەبەدوا ئەوەی کە ئێران بۆتە تێپەڕگەی چەکە ئیسرائیلیەکان بۆ کوردەکان ، بووە ڕاستیەکی بەربلاو.

"برینج" لەگەڵ "تسوری" مایەوە ، پاشان ڕائیدی یەدەك "مەناحم سیلع پەیوەندی کرد پێیانەوە ، کە لەناو هاوڕێکانیدا بە"مراك" بانگ دەکرا.

ساواك بۆ ئەم خولە سەربازگەیەکی لەتاران تەرخانکرد ، لەوێدا شاگردە کوردەکان کۆکرانەوە کەتەواو لەگەڵ ئەوپێوەرانەدا دەگونجان کە "تسوری" دیاری کردبون ، هەمویان شاخاوی بون و بەتەواوی شێوازی "لێبدەو ڕاکە"یان دەزانی ، ژمارەیەکی زۆریان لەوانەبوون کە لەسوپای عێراقی هەڵهاتبون ، هونەرەکانی جەنگیان دەزانی و فێربووبوون ، ژمارەیەکی زۆریشیان ئینگلیزیان دەزانی ، کەئەمەش یارمەتی دەربوو ، بۆ وەرگێرانی مادە نوسراوەکە.

لەوانەکانی سەرەتاوە "تسوری"و"برینج" و "مراك" شارەزاییان لەسروشتی گۆڕەپانی شەری عێراقی - کوردیدا پەیداکرد، ڕاهێنراوەکان نەیاندەزانی کەڕاهینەرەکانیان ئیسرائیلین ، بەڵام هەندێکیان وایان هەست دەکرد.

تسوری دەڵێت: "ئەوسا یاخیبونەکە لەسەر ئاگرێکی هێواش دەکوڵا، یاخیبوان جارجار هەڵیان دەکوتایەسەر ناوەندەکانی پۆلیس یان تەقەیان دەکرد بەزۆری لەناوچەی "پێنجوین" کە دەکەوێتە باشوری یاخیبونەکە ، بەڵام ئەم پرۆسانە هێرش یان دەستکەوتی یەکلا کەرەوەیان لەگەڵدا نەبوو.

"تسوری" بێسنوور فزوول بوو ، دەیویست هەموو شتێك لە هەموو شتێك بزانیت ، تابتوانێت وێنەیەکی ئاشکرا و نمونەیی دروست بکات ، و لە بەختی ئەو ڕاهێنراوەکان لەشەڕکەرە مەیدانیە کۆنەکان بوون ، ووردترین شتیان بۆ باسکرد سەبارەت بەوناوچەیەی کەکۆنترۆڵیان کردوە، و شێوازی وێنەی ئەو جەنگانەی کەئەنجامیان داوە ، و پێکهاتەی عێراقیەکان و چەکەکانیان و شێوازی جەنگی یان.

کوردەکان ئاماژەیان بۆشێوازیك کرد کەزۆر بەربلاو و بەکاردێت لای ئەوان ، ئەوان بۆ نمونە لەناوچەیەکی سەخت دەکشێنەوە کەشاخاوییە و گەیشتن بەوێ گرانە ، و لەو بەرزاییانەی کەبەسەر ناوچەکەدا دەڕوانێت بڵاودەبنەوە کاتێك سوپای عێراقیی دێت ناوچەکە داگیربکات و تێیدابمێنێتەوە و بنە و بارگە بخات، گوللە باران و بۆمباران لە شاخەکانەوە دەست پێ دەکات بەسەریاندا.

ئیسرائیلیەکان بۆیان دەرکەوتوو ئەم شێوازە کاریگەریەکی زۆری لەسەر وورەی سوپای عێراق هەبووە ، ئەمەش لە کۆتایدا ناچاری کردن کەهێزێکی زۆری سوپاکە تەرخان بکەن ، بۆ پاراستنی ڕێگاکانی دەرچون و ڕێگەی پێگەیشتنی هاوکاری و کۆمەك ، شێوازێکی تریش هەیە کوردەکان بەکاری دەهێنن ، دابەش دەبیت بۆ دوو قوناغ قۆناغی یەکەم بەڕۆژ ئەو شوێنانەی کۆنترۆڵ دەکرد کەبەسەر ئەوناوچانەدا دەڕوانێت کە ئامانجن ، پاشان بەشەو هێرش دەکرێتەسەر ئامانجەکان وە دەستیان بەسەردا دەگیرێت و هەروەها هەندێ فیداکاری کورد دەنێرن بۆ کردنەوەی ڕێگا لە کیلگە مینرێژکراوەکان تا شەرکەرەکان بەسەر جەستەی ئەواندا برۆن ، بەلام ئەم ڕێگەیە قوربانی زۆری لێ دەکەوێتەوە.

کوردەکان زۆر باسی پێگە سەربازیەکانی خۆیانیان دەکرد ،کە لە ڕاستیدا تەنها چەند شوێنیکی نیشتەجێ بوون بوو ، کە لەبەردو دار دروست کرابون ، وە سایە"سەقف"ەکانیان نزم بوو لە شوێنی وادا دروستکرابوو کە لەڕوی سروشتیشەوە پارێزراوبوون ، وەك قەدپاڵی چیاکان و ڕێگا شاراوەکانی نێوان

گردەكان ، وە خانوەكان لەناوەوە بەچاكی دەگیران تاوەكو جەنگاوەرەكان بتوانن خۆیان لەبەرامبەر سەرمای جەستە تەزێندا بگرن ، و كاتێكیش بەفر لەناوچەكەدا دەباری ، خانوەكان بەتەواوەتی دەشاردرانەوە لەژێریدا و دۆزینەوەیان گران بوو ، تەنانەت لە نزیكیشەوە.

لەكۆمەڵە خانویەكی لەو شێوەیەدا نزیكەی ٥٠ شەڕكەر نیشتەجێ دەبوون ، هەندێكیان هەمیشە هەوڵیان دەدا دەست بەسەر ناوچەكانی چاودێریدا بگرن ، بەڵام بارودۆخی سروشتی ناوچەكە وایدەكرد گران بێت چاودێری نزیكبونەوەی دوژمن بكرێت، جاشەكانیش ئەوەیان دەزانی ، بۆیە هەمیشە بەهێرشەكانیان كێشەیان بۆ ئەو دانیشتوانە دروست دەكرد.

پێشنیار بۆ ئەم مەسەلەیە زۆر سادەبوو، بریتی بوولە دەرچوون لەو شێوەخانوانە ، و ناردنی هێزی بچوك بۆ ئەو شوێنانەی دەگەیشتنە خانوەكان ودۆزینەوە وهەست كردن بە دوژمن بەرلەوەی ئامادەبیت بۆ هێرش.

لە دەفتەری ڕۆژانەكەیدا "تسوری" نوسیویەتی : "ئەو شێوازەی ئێمە دەیزانین بۆ هێرشكردن و یەكلایكردنەوە زۆر نامۆ بوو بۆ ئەوان ، هەروەها ئێمە هیچ شێوازێكی بەرگریمان لە شێوازە زانراوەكان بۆڕووبەڕووبونەوەی سوپای عێراقی نەبینی ، ئەوەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە كەبارزانی پێی وابوو ناتوانێت ڕوبەڕوی سوپای عێراق بێتەوە، لەبەرئەوەش ئێمە شارەزای نێوچەكوردیەكان نەبوین ، و ئێمەش سوپای عێراقیمان وەك سوپا عەرەبیەكانی تر دەهاتە بەرچاو ، وە زانیمان كە سوپای عێراق ڕاهاتووە هێرشەكانی لەبەهاردا ئەنجام بدات ، پاش توانەوەی بەفرەكان ، هەروەها زانیمان ئەو ناوچەیەی شەڕەكانی تێدادەكریت پڕە لە دەرچە و ڕێگەی بەردینی تەسك و درێژ كە لەباكورەوە بۆ باشور درێژدەبێتەوە و لە ڕۆژئاواوە بەرز دەبێتەوە بۆ ڕۆژهەڵات تا دەگاتە بەرزایی ٤٠٠٠ هەزار مەتر و لە لێوارو هەڵدێرەكان و لەناوەڕاستی چیاكان ڕێژەیەكی زۆر لە جەنگەڵی چڕ و ب تایبەتی درەختی "بەڕوو" و "مازوو" هەیە ، و تێپەڕگەی

تەسك بەردەكان لە یەكتری جیا دەكاتەوە ، كە زرێپۆش و تۆپهاویژەكان ناتوان لەوێدا جوڵە بكەن.
ئیسرائیلیەكان گەیشتنە دەرەنجامێك كە ئەویش ئەوەیە سوپای عێراقی ناتوانێت بێتە ناوچەكە تەنها لە دوو ڕێگاوە نەبێت یەكەم خولگەی "ڕەواندز" و "حاجی ئۆمەران" كە ئەو شوێنەیە سەنتەری یاخیبونەكەی لێیە ، و ڕێگای دووەم بەدرێژایی ڕوباری "زێی بچوك" و قولایی "قەڵادزێ" و دەریاچەی "دوكان" ، داگیر كردنی هەریەكێ لەو دوو ڕێگایە دەبووە هۆی دابەشكردنی كوردستان بۆ دوو بەش ، و ڕێگەی كۆمەكەكانی كوردی دەگرت.
لە پاش توێژینەوەیان لەمەیدانی جەنگەكە ، "تسوری" گەیشتە ئەنجامیك كەكوردەكان دەتوانن خۆیان رابگرن لە بەرامبەر هێرشەكانی سوپای عێراقی لەناوچە شاخاویەكان ، بەڵام زۆر گران دەكەوێت لەسەریان ڕووبەڕوی ببنەوە لەو ناوچانەدا ، كەتانكەكان بەئاسانی دەیانگاتێ ، بۆیە ناتوانرێت ئەدای كوردەكان لەبواری جەنگی بچوكدا كەلەسەرەتای یاخیبونەوە ئاڵاكەی هەڵكرابوو باش بكرێت، بۆیە باشتر وایە كوردەكان فێری شێوازەكانی جەنگی بەرگری بكرێن ، وەك خۆئامادەكردنێك بۆئەگەری جەنگی هاوینی داهاتوو ،لەگەڵ لەخۆگرتنی شێوازو بیرۆكە و تیۆری هێرشكردنەسەر فڕۆكەخانەو بیرەنەوتەكان.
لەبەررۆشنایی ئەو دەرەنجامانەو لەسەر دوو نەخشەی تۆبۆگرافی یەكێكیان بەریتانی و ئەوەی تریان ئەمریكی وە لەسەر مێزیك كە لەبەرد دروستكرابوو ، ئیسرائیلیەكان دەستیانكرد بە یاریەكانی جەنگ لەسەری هەرزوو "تسوری" بۆی دەركەوت كە چەكدارە كوردەكان سەرەڕای زۆری نەخوێندەوار لەڕیزەكانیانیان ، بەڵام توانای وەرگرتنی زانیاری سەربازیان لە ڕاهێنراوە ئێرانیەكان زۆر باشترە.
لەكۆتایی خولەكەدا "تسوری" ویستی كە مانۆڕیكیان بە فیشەكی زیندوو پێ ئەنجام بدات ، بەڵام كوردەكان ڕەتیان كردەوە ، بەڵام تسوری كە پێی وابوو زۆر

گرنگە ئەو مانۆڕە بکرێت و بەشێوەی کرداری ڕابهێنرێن لەسەری ، پەیوەندی بە لێپرسراوەکانیەوە کرد لەئیسرائیل.
لەکۆتایدا ناوچەیەکی شاخاوی لە باکوری ئیسرائیل دۆزرایەوە ، وە کوردەکان بە فرۆکەیەکی "ستارتۆکرۆز" گوازرانەوە بۆ ئەوێ و لە نۆتیلیکی نزیك شاخەکە نیشتەجێ کران، تسوری دەڵێت : "هەڵساین بە ئەنجامدانی مانۆڕێکی بەرگری بە فیشەکی زیندوو لەشێوەی دامەزراوەی بەرگری دا ، چەند یەکەیەکی سوپای ئیسرائیلی بەشداریان کرد بەتەقەکردن" لە کۆتایی خولەکەدا تسوری هاوڕێیەتی ڕاهێنراوەکانی کرد لە گەشتێکدا بەناو ئیسرائیل دا و ئاهەنگێکیان بۆ سازکرا کە سەرۆکی ئەرکان "ئیسحاق ڕابین" ئامادەی بوو.
"برینج" دەڵێت : "لەسەرەتاوە هەستمان بەوەکرد کە ئەوان ناتوانن توانایان وەك سوپای ئیسرائیلی لێ بێت بۆیە پێویستە کاربکەین تا ئەوپەڕی توانا زانیاریان سەبارەت بەسوپای ئیسرائیلی پێ بدەین، لەگەڵ گونجاندنی ئەوە لەگەڵ ئەو چەك و ئامادەکاریانەی کە ئەوان هەیانە تا بتوانن پارێزگاری لەناوچەکانی خۆیان بکەن و هێرش بکەنە سەر کۆگا عێراقیە بچوکەکان و هەمیشە بە کاری تێکدەرانە بیانخەنە دڵە ڕاوکێوە.
لەئازاری ١٩٦٦ ڕاهێنراوە کوردەکان لەئیسرائیلەوە گەڕانەوە بۆ وڵاتەکەیان و ڕاستەوخۆ ڕویانکردە گۆڕەپانەکانی جەنگ .

## بەشی یانزەیەم/ ڕۆژانەی جەنگ ١٩٦٦
## لە بێئومێدیەوە بۆ سەرکەوتن

لەئازاری ١٩٦٦ دا چوار ئیسرائیلی ڕویانکردە کوردستان ئەوانیش : "کرۆن" و "م" کە شوێنی "کرۆن"ی وەرگرتبو لە تاران ، و "تسوری" و یاریدەدەرە هونەریەکەی لە ئۆتۆمبێلێکدا هەردوو شۆفیری ئێرانی "ڕەجەبی" و "کاسەری" کەهەوالگری ئێران زۆر بە نهێنی و گرنگی هەڵی بژاردبوون بۆ گواستنەوەی لێپرسراوە ئیسرائیلیەکان بۆ کوردستان گواستیاننەوە.

دەبوایە بارزانی لە پێشوازی شاندەکەدا بوایە ، بەڵام کاتی گەیشتنیان پێیان ڕاگەینرا ، کە بارزانی لە شەڕگەی "پێنجوێن"ە لە کەرتی باشوری کوردستان ، بۆ بەڕێوەبردنی چەند جەنگێك کەجێی دڵەڕاوکێی ئێرانیەکانەو پاش هەفتەیەك دەگەڕێتەوە.

ئیسرائیلیەکان توشی سەرسورمان بون بەدەرچونی بارزانی لە ناوچەکەو لەم کاتە ناخۆشەدا کە عێراق خۆی ئامادە دەکات بۆ ئەنجامدانی هێرشی بەهارەی خۆی ، بەڵام هیچ ڕونکردنەوەیەکیان لەوبارەیەوە چنگ نەکەوت.

* * *

هەمو زانیاریەکانی ئیسرائیل تا ئەو کاتە سەبارەت بە بارزانی و خێزانەکەی و سەرکردایەتی کوردیی لەو هەواڵانەوە وەرگیرابون کە لەڕۆژنامەو چاوپێکەوتنەکان کە لەگەڵیان ئەنجام درابوو بڵاوکرابونەوە ، وە ئەو ڕاپۆرتانەی کە لەو کەسانە وەرگیرابون ڕوبەڕوو دیتبویان لەگەڵ زانیاریە هەوالگریەکان ، بەڵام مێژوی ژیانی نەنوسرابوەوە ، و هەر زانیارییەك لەو بارەیەوە زۆر گرنگ بوو ، لەو بوارەدا "کرۆن" زانیاری زۆر گرنگی دابوو بەدەستەوە بەهۆی ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی لەگەڵ "شمس الدین موفتی" نوێنەری کوردەکان لە تاران هەیبوو کە مەسەلەی چارەسەرکردنی نەخۆشەکان و بریندارەکان و گواستنەوەیان بۆنەخۆشخانەکان و گێڕانەوەیان بۆ وڵاتەکەیان و ڕێکخستنی

پاسپۆرتی ئەو کوردانەی دەبوایە گەشتی دەرەوە بکەن ، یەکێ لە ئەرکە سەرەکیەکانی ئەوبوو، ئەم ئەرکە تەواو وورەی ڕوخاندبوو ، چونکە ئاسان نەیدەیتوانی جێبەجێیان بکات ، ئەوەی زیاتر گۆشەگیری کردبوو و ورەی ڕوخاند بوو ، مردنی خێزانە ئێرانیەکەی بوو ، پاش ئەوەی کچیکی بۆ بەدنیاهێنا ، کە ناچاربوو بینێرێتەوە بۆ ماڵی باوکی لە هەولێر، ئەمە وای کرد کە "کرۆن" وەك هاوڕێیەکی خەمڕەوین تەماشابکات سەبارەت بە هەموو بابەت و کێشەکان لەگەڵی بدوێت.

"کرۆن" دەڵێت: " لەموفتیەوە زۆر زانیاریم لەسەر سەرکردایەتی کوردی و کەسایەتی و ڕەمزەکانی دەست دەکەوت ، بەڵکو ئەوەی لە ئەو وەرم گرت ، زیاتر بوو لەوەی لە هەرکەسێکی تر وەرم گرتبوو.

"فەرهاد بارزانی" نەوەی بارزانی دەڵێت : مردنی باوکی بارزانی ئاسایی بوو، بارزانی هێشتا تەمەنی شەشساڵان بوە ، جێی وەبیرهینانەوەیە کە بارزانی زانیاری زۆری سەبارەت بە مردنی باوکی بەئیسرائیلیەکان وتبوو ، کرۆن دەڵێت : بارزانی پێی وتم کەتورکەکان باوکیان لەسێدارە داوە و لای برا گەورەکەی "شێخ ئەحمەد" پەروەردە بووە ، و مستەفا لە منداڵیدا لەش و لارێکی پتەوی هەبوە".

لەگێرانەوەیەکی تردا بارزانی بەڕاویژکاریکی ئیسرائیلی بە ناوی "ئەلیشع ڕۆئی" کە لەساڵی ١٩٦٦ هاوڕێیەتی کردوە وتوە : ((کاتێك تورکەکان باوکمیان لەسێدارە دا ، هێشتا لە سکی دایکما بووم، کاتیك لەدایکبوم مامەڵەیەکی تایبەتیم لەگەڵ کرا ، دایکم و برا گەورەکەم زۆر نازیان دەکێشام ، شێخ ئەحمەدی برام ئەو کاتە ١٥ ساڵان بوو ، کاتێك تەمەنم گەیشتە شەش ساڵان بەخوشکە گەورەکەمم وت کە ئاوم بۆ بهێنیت ، بەڵام ئەو پێی وتم کەهێندە گەورە بوم، بۆخۆم بچم ئاوبخۆمەوە ، بەردێکم بۆ هاویشت و سەریم شکاند)).

بارزانی بە "کرۆن" و "ڕۆئی" ووتبوو : بەریتانیەکان هەوڵیان دەدا کە بەشێوەیەکی ناسروشتی بمخەنەپاڵ خۆیان ، ئەوەبوو ژنێکی بەریتانیان لێ

مارەکردم و کەخوشکی ئەفسەریکی هەوالگری بوە لەسیەکاندا لە عێراق کاری کردوە ، ئەو ژنە گوایە سوکایەتی بەژیانی هۆزەکەی کردوە ، و کوڕیکی لێ بوە بەڵام ڕۆژێ لەناکاو ژنەکەی و کوڕەکەی بۆ هەمیشە بزر بون ولەژیانی دورکەوتونەتەوە ، گێرانەوەیەك دەڵێت گوایە لە ڕێگەی هەڵاتنیان بۆ بەریتانیا لەڕوداوی فڕۆکەدا کوژراون ، بارزانی دەیوت کە ئەو ڕوداوە ڕوداوێکی سیاسی بوە.

لە پاش مردنی ئەو بارزانی سێ ژنی کوردی تری هێناوە کە ٩ کوڕ و پێنج کچی لێیان بوە ، یەکەم ژنی کە ناوی "مەحبوب" بوە ، سێ کوڕی "عبیداللە" و "لوقمان" و "سابیر"ی بۆ بەدنیا هیناوە لەگەڵ دوو کچ ، ژنی دووەم "حەفصە" کوڕیکی بەناوی ئیدریس و کچێکی لێ بوە، ژنی "سێیەم" کە خۆشەویسترینیان بووە لای بارزانی ناوی "حەمایل" بووە ، لەهەمویان بچوکتر بووە ، هەریەکە لە "مەسعود" و "دڵشاد" و "سداد" و "شیهاد" و "ناجی" لێ بوە لەگەڵ دوو کچ.

بارزانی لە"عبیداللە"ی کوڕ ڕازی نەبوو ، "کرۆن" دەڵێت کە عبیداللە لەکەسایەتە دیارەکانی یاخیبون بوو لەساڵی ١٩٦١ دا جەماوەرێکی زۆری هەبوو، پاشان پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ کچێکی "ئاشوری" بەستوە و بەوهۆیەوە ژنەکەی خۆی کوشتووە ، کەکچی "ئەحمەد"ی مامی بوە ، کاتێك ئەوە ئاشکرا بووە ڕایکردوە بۆبەغداد و هەموو ئەو پارەیەی لە خەزێنەی شۆرشدابووە بەبڕی "سێ هەزار" دیناری عێراقی مەزەندە کرا لەگەڵ خۆیدا بردووە ، لە"بەغداد" ڕویکردۆتە باڵویزخانەی "یەکێتی سۆڤیەت" ، داوای ڕێپێدانی کردوە تا لە "مۆسکۆ" بخوێنێت ، ئەوانیش لەوانەیە لەبەر ڕێزی باوکی وەڵامیان داوەتەوە بەڵام هەرزوو دەرکەوتوە کە گرنگی بە خوێندن نادات ، گواستوێتیەوە بۆ "پراگ" پاشان لەوێ بۆ "ڤیەننا" و داوای کردوە لە ئەمریکیەکان کردووە کاریان لەگەڵدا بکات ، بەڵام پێدەچێت ئەو زانیاریانەی کەلای بوە بە کەیفی "سی ئای ئەی" نەبووبێت ، هەرزوو ئەمریکیەکان بۆیان دەرکەوتوە کە دووڕوەو تەسلیمی ئێرانیان کردوە .

کرۆن دەڵێت : بارزانی فەرمانی کردوە لەسێدارە بدرێت، بەڵام "شێخ ئەحمەد"ی باوکی ژنەکەی تەداخولی کردوەو نەیهێشتوە و لەوچارەنوسە ڕزگاری کردوە ، پەیمانی لەبارزانی وەرگرتوە کە نەیکوژێت، بەڵام بارزانی دەستبەسەری کردوە .

دکتۆر "نجم الدین کریم" دەڵێت : ((عبیداللە نەیتوانیوە بەرگەی ئەو بارودۆخە بگرێت هەوڵی تیرۆرکردن لە نیوان کوڕ و باوکدا زۆربووە لەکۆتاییدا ناچاربووە هەڵبێت بۆلای "ئەحمەد"ی مامی ، بەڵام چیرۆکی "عبیداللە" لێرەوە کۆتایی پێ نایەت ، دواتر بە ئەنقەست خیانەت لەباوکی دەکات و پەیوەندی دەکات بەعێراقیەکانەوە)).

"دکتۆر مەحمود" کەپێشتر ئاماژەمان پێکرد ، یەکێ لە کەسایەتیە نزیکەکانە لەبارزانی یەوە ، کرۆن دەڵێت : دکتۆر مەحمود کەسێکی زۆر جددی و کارامە بوو ، تەنها بەهێزی خۆی فێری "فارسی" و "فەرەنسی" بوو ئەمە جگە لە "عەرەبی" و "ئینگلیزی" ، دکتۆر مەحمود پەیوەندییە دەرەکیەکانی یاخیبونی بەڕێوەدەبرد ، ڕاسپێردراوە بۆ ئەنجامدانی چەندان کار لەئیسرائیل و ئێران و ئەوروپا و ئەمریکا.

کرۆن دەڵێت : (( بارزانی و دوو کوڕە زۆر نزیکەکەی "ئیدریس" و "مەسعود" باوەڕی تەواوی بەوەهەبوو کە تەنها ئیسرائیل دەتوانیت دانپێدانانی ئەمریکایان بەئەوان بۆ وەرگرێت ، دکتۆر مەحمود تێروانینیکی زۆر پراگماتیانەی هەبوو ، پێ وابوو ئیسرائیل "شەڕێکە هەر دەبێت بکرێت" مەحاڵە بە بێ ئەو کارەکە بەردەوامی هەبێت)).

((بارزانی بۆیە لەدایك بووە تا ببێتە سەرکردە)) ، گومان لەوەدانیە هەرکەسێك کەلێی نزیك بووبێت هەستی بەو هەیبەتەی کردوە کە بەسەر دەوروبەریدا دەیسەپاند ، دوو جیاوازی بەیەکەوە کۆکردۆتەوە پیاوێکی سەربازی بێبەزەیی لەهەمان کاتدا باوکێکی دڵسۆز و زۆر خەمخۆر بۆئەوانەی لەگەڵیدا بون)).

بارزانی زمانەکانی "کوردی" و "عەرەبی" و "فارسی" دەزانی ، هەرچەندە ڕۆشنبیریەکەی خۆی لەزمانی عەرەبیەوە بە دەست هێنابوو ، هەروەها بەشێکی زۆری لەزمانی "ڕووسی" دەزانی کە لەوکاتەدا لە ڕوسیا بوو فێری بووبوو .

* * * *

کرۆن و ئیسرائیلیەکان بۆیان دەرکەوت کە بارزانی لە سێ شوێنی سەرەکیەوە سەرکردایەتی یاخیبوون دەکات لە هاویناندا لە "حاجی ئۆمەران"ی نزیك لەسنوری ئێران کە شوێنێکە پێشتر وەك نشینگەیەکی هاوینەی دەوڵەمەندە عێراقیەکان سودی لێ دەبینرا ، لەسەروی هەمووشیانەوە پادشا و نزیکەکانی و سەرۆکی حکومەت و وەزیرەکان و سەرکردەکانی سوپا لەخانوی لە بەرد دروستکراودا دەمانەوە لەکاتێکدا بەفری هەمیشەیی لوتکەی شاخەکان بایەکی نەرم ژێنەرەوەی بۆ دەهێنان.

لەزستاندا بارزانی لەگوندی "دیلمان" نیشتەجێ دەبوو کە نزیکەی ٤٠ کیلۆمەتر لە "حاجی ئۆمەران"ەوە دورە ، بارودۆخی جوگرافی ئەو گوندە وای لێکردوە کە لەهەڵکردنی بایە توندەکاندا پارێزراو دەبێت "تینی بایەکەی بۆنایەت".

وەك لە نزیك "حاجی ئۆمەران" و "دیلمان" بارەگای "مەکتەبی تەنفیزی یاخیبونی کورد"ی لێ بوو، کە وەك "ئەنجومەنی شۆڕش" و "باڵی جێ بەجێ کردن و پەرلەمان" وایە و لەساڵی ١٩٦٩ دەستی بە کارکرد ، و ژمارەی ئەندامانی گەیشتە نزیکەی ٦٢ کەس ، کەنوێنەری پێشمەرگە و پارتی دیموکراتی کورد و هۆزەکان و لایەنی سەربەخۆی لەخۆدەگرت.

"لیژنەی تەنفیزی" وەکو حکومەتی کوردی کاری دەکرد ، ژمارەی ئەندامەکانی ١٧ کەس بوو ، کەتوانای بڕیاردانی زۆریان هەبوو ، وەك سەرپەرشتی پێشمەرگە کە لەساڵی ١٩٦٦ دا ژمارەکەی نزیکەی ١٤ هەزار پێشمەرگە دەبوو، وە بەڕێوەبردنێکی گشتگیری ناوچە کوردیەکان لەهەموو ئەو شتانەدا کەپەیوەندیان بە"دادوەری" و "باج" و "پۆلیس" و "بەندینخانە"وە هەیە، بۆ ئەم مەبەستە

هاوکاری له دەزگایەکی هەواڵگری نهێنی وەردەگرت ، و ڕۆژنامە و ئێزگەی تایبەتی خۆی هەبوو.
وە ڕون بوو لای ئیسرائیلیەکان کە سەرچاوەی هەموو توانا و بڕیارەکان خودی بارزانی خۆیەتی بەسیفەتی ئەوەی بەرپرسی "ئەنجومەنی شۆرش" و سەرۆکی "پارتی دیموکراتی کورد" بوو.
هەر ماوەناماوەیەك بارزانی ڕوبەڕووی کێشەیەکی نێوخۆیی یان دەرەکی دەبوەوە ، جا بەئارەزووی ئیران بووبیت یان بە ئارەزوی خۆی ، دوژمنە سەرسەختەکەی "تاڵەبانی" بەخۆی و "٣٠٠" شەڕکەرەوە هاتەوە ناو سنوری کوردستان ، بارزانی کە زۆر بەوە پەست بوو ، فەرمانی دا بەناچارکردنی تاڵەبانی بە مانەوەی لەناوچەی "دولروجە - پێدەچێت دۆڵەڕووت بێت – و:" کەدەکەوێتە نزیکەی "١٢٠" کیلۆمەتر دورە لە سەرکردایەتی یاخیبوانەوە ، لە ژێرپاسەوانییەکی توندا.
بارزانی دەگوت: ((ئەو کارە وەك پلانێکی ئێرانیەکان وابوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی یاخیبونی کوردی ، و بەڕێوەبردنی بەپێی پێویستیەکانی "شا")).
هەرچەندە بەشێکی هەرە زۆریان چونە ناوپێشمەرگەوە بەبێ هیچ مەرجێك ، بەڵام کەسەسەرەکیەکانیان کەوتنە ژێرچاودێریەکی توندەوە ، سەرەڕای ئەوەش بارزانی ئیسراحەتی نەدەکرد ، و هیچ گۆڕانکارییەك لەدوژمنایەتی کردنی بۆ "تاڵەبانی" ڕووینەدابوو.
ڕاویژکارە ئیسرائیلیەکانی بۆیان دەرکەوت کە لقەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بەهەموو ناوچەکانی کۆمەڵگا کوردیەکەدا بلاّوبوەتەوە ، کاری زۆر دەکەن ، پەیوەندی کردن بەلایەنە دژەکانی ڕژیمی عێراقی ، و کۆکردنەوەی پارەو کۆمەك، وکوکۆکردنەوەی زانیاری و بەخشینەکان و ...هتد.
دەزگای پزیشکی کوردەکان زۆر جێگەی دڵەراوکێ بوو، چونکە یاخیبوان تەنها ٣ دکتۆریان لەگەڵ بوو ، هەندێ لە برین پێچەکان وەك دکتۆر کاریان دەکرد ، بەڵام

لەوە بترازێ چاری تریان نەبوو، وە چەندماڵێك دیاریکرابون وەك نەخۆشخانە بۆ چاودێریکردنی ئەو حاڵەتانەی پێویستیان بەخەوتن هەیە ، یەدەگی داوودەرمان زۆر کز بوو، کەم و کورتی زۆر لە دژەزیندەگی و ئارامکەرەوەکان دەرکەوتبوو ، ئەمە لە کاتێکدا زۆر کەس توشی نەخۆشیە درێژخایەنەکان بوبوون ، بەهۆی مانەوەی زۆر لەناوچەی شێدار و ئەو ناوچانەی کە هەڵمی ئاوی زۆر لێ یە.

* * *

هێرشی بەهارەی عێراقیەکان بەڕێوەبوو، کوردەکان ڕاوێژکارەکانیان دڵنیاکردەوە کە ئامانجی هێرشەکە خولگەی "ڕەواندوز – حاجی ئۆمەران"ە وەك "تسوری ساجی" پێشتر پێشبینی کردبوو ، ئیسرائیلیەکان لەڕۆژی دوهەمی هاتنیان بۆ کوردستان گەشتێکی ئامادەکاریان بە پێگەکەدا کردبوو ، درێژی ئەو خولگەیە نزیکەی ٦٠کیلۆمەتر دەبێت ، چاودێری پێگەکانی عێراقیەکانی کردبوو ، لەدۆڵی "ڕەواندوز" ، وە ڕوونکردنەوەیان لە"ئیدریس" و "بارزانی" و سەرکردەی مەیدانی هێزە کوردیەکانیش وەرگرتبوو.

"تسوری" پلانێکی بەرگری و ڕوبەڕوبونەوە و هێرش بەپێی ئەو هیلانەی کە لەخولی "ڕاهێنەرە باشەکە"دا خرابووە ڕوو، دیسان بۆی خستنەوە ڕوو.

تسوری دەڵێت : ئەو تیۆرەی کە دامان ڕشت ناومان نا تیۆری "بڕنەو" ئەوەش ناوی ئەو چەکە تایبەتیەیە کە کوردەکان بەکاری دەهێنن و کوشتاری پێدەکەن.

پلانی بەرگری بریتی بوو لەداگیرکردنی لوتکەکان لەپاش دەستبەسەرا گرتنی ئەو ناوچانەی کە ڕێگای گەیشتنن بۆ ئەو لوتکانە ، کوردەکان پێویستیان بەچەند دەستەیەکی قەناسە هەبوو بۆ دەست بەسەراگرتنی هێزە تێکشکاوەکە و ناچار کردنی دوژمن بەمانەوە لە شوێنی خۆیدا ، تسۆری جەختی لەوە کردوە کەنابێت سەنگەری کلاسیکی لێ بدەن ، تا فڕۆکەوان و چاودێرە عێراقیەکان تێبینی

ئامادەکاری کوردەکان نەکەن ، بۆیە پێویستە سەرکردەی هێزەکان بەرز و نزمیە سروشتیەکان تا ئەوپەڕی توانا بۆ خۆحەشاردان بە کاربێنن.

★ ★ ★ ★

تسوری سەبارەت بە یەکەمین دیداری لەگەڵ بارزانی دەڵێت: ((دیمەنی بارزانی ترسناك بوو بارزانی لە "پێنجوێن"ەوە هاتبووەوە ، لەسەر ئەسپیکی ڕەنگ خۆڵەمیشی بەچەندەها چەکدار دەورەدرابوو کە سواری ئەسپ و وڵاخ بووبوون ، جل وبەرگی کوردی لەبەردابوو و خەنجەرێکی زێرکفتکراوی گەورەی بەخۆیدا کردبوو ، ژمارەیەکی زۆر فیشەکدان لەگەڵ تفەنگێکی لولە درێژ )).

لەسەرەتادا بارزانی بەدودڵیەوە لەگەڵ ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکاندا مامەڵەی دەکرد ، بەتایبەت لەگەڵ ڕاوێژکاری سەربازی کەوا دەردەکەوت تەحەدایەك بێت بۆسەرکردایەتی کردن و توانای سەربازی بارزانی.

ئیسرائیلیەکان قەبارەی ئەو نەهامەتیەیان دەزانی کە بارزانی پێوەی دەناڵێنێت و ئەو کێشانەی کە لەئاستی نێوخۆیی و دەرەکی پێیانەوە گیرۆدەبووە ، بۆیە خۆیان پاراست لە هەموو جۆرە فشارێك بۆسەری ، وە پەنایان بردە بەرشێوازی قەناعەت پێکردن و گفتوگۆ و لەیەکەم گفتوگۆدا کە لەنیوان بارزانی و ئەواندا ڕوویدا هەندێ شتی جێی دڵەڕاوکێیان لێ بیست.

بارودۆخی ئابوری زۆر سەخت بوو ، زەرەری زۆری لە یاخیبونەکە دەدا ، باربووی چەکەکان کە تەرخان کرابوو بۆ زیادکردنی توانستی شەڕو هێزی جێبەجێکردنی ژمارەی چەکدارانی زیادکردبوو ، لەهەمان کاتدا کێشەی پێویستی بە جلوبەرگ و خواردنی بۆ زیادکردبون ، و خۆراکدان بەخێزانی چەکدارەکان ئەمە لەکاتێکدا کە بەرهەمی کشتوکاڵی لاواز بوو بەهۆی بۆمبارانی هێزەعێراقیەکانەوە.

هەرچەندە کوردەکانی ئێران و تورکیا خۆشگوزەران و دەوڵەمەند بوون ، بەڵام دەستی یارمەتیان بۆ براکوردەکانیان لەعێراق درێژ نەدەکرد، ڕووبەرێکی زۆری ئەو زەویانەی کە بەزۆر لەهۆزەکانی جاشەکان سەنرابون ، بەکرێ درابوو بە

کشتکارەکان ، کەئەوانیش لەبەرامبەردا بەشێك لەخۆراکەکە بدەن بەیاخیبوان ، لەگەڵ پەیمانی سەرکردایەتی یاخیبوون بەکڕینەوەی ئەوەی ماوە ، سەرەڕای ئەوەش بەرهەمەکەی لاواز بووو.

کاریگەری بارودۆخی ئابوری بۆ سەر یاخیبوان زۆر سەخت بوو تا ڕادەیەك کە وایکرد وەڵامی هەڵفریواندنەکانی ئێران بداتەوە ، لە بەرامبەر ئەوە ئێرانیەکان پەیمانی "نیو ملیۆن" دیناریان پێ دا لەگەڵ زیاد کردنی یارمەتییە داراییە مانگانەکەی ، بارزانی فەرمانی دەکرد بەهێرشکردنەسەر پێگە عێراقیەکان کە دەکەوتنە سەر شاخی "پێنجوێن" لە باشور لە کانونی یەکەمی ١٩٦٥ ئەمەش پاش سێ مانگ لە بەناچاری کشانەوەی چەکدارە کوردەکان لەوێ.

ئێرانیەکان تەنها نیوەی برە بڕیار لەسەردراوەکەیان دا ، سەرەڕای ئەوەش ئەوە بەس بوو بۆبەڕیوەبردنی قوتی یاخیبوان بۆ چەند مانگێك ، بەڵام هەرزوو پارەکە تەواو بوو ، وەك چۆن ئەو پارمیەش تەواوبوو کە لە ئێران – ئیسرائیل وەك یارمەتی وەریان گرت ، بەتایبەتی لە کاتی لە دەستدانی قەڵادزێ لەئەیلولی ١٩٦٥.

کوردەکان بڕیکی زۆر "تنباك"یان لەوێ هەبوو تا بەنرخێکی تایبەت بەئێرانی بفرۆشن بەڵام ئێرانیەکان خاوەخاوەیان دەکرد لەکڕینی ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کەئەو برە بکەوێتە دەست عێراقیەکان.

ئەم خاوەخاوکردنەی ئێرانیەکان ، ئەڵقەیەك بوو لە زنجیرەیەکی درێژ کە پرسیاری زۆری دروست کرد بۆ کوردەکان و لە کۆتایی دا گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کەئێران نایەوێت یاخیبوون کۆتایی پێ بێت ، بەڵام لە هەمان کاتدا وا دەکات ژیانی یاخیبوان سەخت بێت ، "ساواك" لەمامەڵەدا لەگەڵ کوردەکان چنگی خۆی گیرکردبوو ، ئەو پەیمانانەی کە دابونی بە شێوەیەکی کەم و بچوك جێ بەجێی دەکردن.

کرۆن دەڵێت : ((هۆکاری سەرەکی کە وایدەکرد ئێران وابکات ، ترسی بوو لەکەمینەی کوردی ناو ئێران ، کەئەویش تێهەڵبچیتە ناو چوارچێوەی یاخیبوانەوە)).

کرۆن دەڵێت: ئەو بارودۆخە لەڕونترین مانادا ڕویدا و بەرجەستەبوو ئەویش کاتێك کە یەکێ لەسەرکردەکانی کوردە-ئێرانیەکان ڕایکردوو هاتەئەو ناوچەیەی کە بارزانی تێدایەو ژێر دەسەڵاتی ئەوە ، داوایکرد لەوێ بمێنێتەوە ، ئێران داوای کرد کە دەستگیربکرێ و تەسلیمی بکرێتەوە ، هەرەشەی ئەوەی کرد کە ئەگەر ئەوەنەکریت هەموو پەیوەندیەکانی بە کوردەکانەوە دەبرێت ، بارزانی خۆی لەبارودۆخیکدا دیتەوە کە ئیرەیی پێ نابرێت ، بڕیاریدا ئەو کێشەیە بەشێوازێکی ئەوپەڕی ناشرین چارەسەر بکات، ئەویش بە لەسێدارەدانی ڕاکردووەکە و تەسلیمکردنەوەی جەستەکەی بەئێران ، بارزانی دەیویست پێشینەی تەسلیمبوون بەئیران بۆخۆی درووست نەکات لەهەمان کاتدا نەیدەتوانی ڕێ بەخۆی بدات پەیوەندی لەگەڵ ئێرانیەکاندا ببچڕێنێت)).

ئەو بارودۆخە خراپە ئابوریەی کەتوشی کوردەکان بووبوو کاریگەری یەکلاکەرەوەی لەسەر جاشەکان دادەنا ، جگە لە دۆخی ئابوری کە توشیان بووبوو ، درکیان بەوەکرد کە عێراقیەکان ئامادەیان دەکەن تا ببن بەخۆراکی تۆپەکان لە شەڕیاندا دژی برا کوردەکانیان بۆیە ژمارەیەکی زۆریان دەستیانکرد بەهەڵاتن و پەیوەندیکردن بەڕێزەکانی بارزانیەوە ، بەڵام بارزانی نەیدەتوانی بەشێوەیەکی باش وەریانبگرێت ، بۆیە نازناوی جاشە باشەکانیان لێنرا بەتایبەت لەبەر ئەوەی تەقەمەنی سۆفیەتیان پێشکەشی هێزەکانی بارزانی کرد کە سەرچاوەکەی کۆگاکانی سوپای عێراقی بوو.

★ ★ ★

بارزانی بە ڕاوێژکارەکانی ووت کە "دوانزە هەزار" شەڕکەر لە ژێر فەرمانی ئەودان کە بەسەر چەند لیوایەکی هەرێمایەتیدا دابەشکراون ، ئەو لیوایانە

ئامادەن بۆ هەرجەنگێك بارزانی خۆی بیكات ، "هەزار" شەرکەری پێ بدەن، بارزانی سەرپەرشتی دەزگای چەکدارانی دەکرد و دوای بارزانی ئینجا "دکتۆرمەحمود" و "ئیدریس" و "مەسعود".
ئیسرائیلیەکان پێشنیاریان بۆکوردەکان کرد، کە بۆمبی چینراوی گەورە ئامادەبکەن ، کە لە بەرمیلێکی گەورە پێکدێت پڕبکریت لەبەردی گەورە و تەقینەوەکە ، کە تەقاندنەوەیان ئەو ڕێگایانە دەگرێت کەبەرەو پێگەکان دێن ، بارزانی هەرزوو پێشنیارەکەی قبوڵ کرد ، ئەوەبوو "ملازم ئەوەل زاهیر"ی بۆ ئەوە ڕاسپارد کە یەکێك بوو لەوانەی خولی "ڕاهێنەرەباشەکە"ی بینیبوو ، کە لەلایەن"تسوری"ەوە سەرپەرشتی دەکرا ، بەهەمانشێوە یەکێ لە قوتابیانی تری خولەکەی بە ناوی "یوسف جمیل" ڕاسپارد بۆ دروستکردنی بۆمبی دەستی نێوچەیی ، پاش ئەوەی زانی کە یەدەگی ئەو بۆمبانە تەواوبووە، هەروەها کوردەکان فێری پوچەڵکردنەوەی مینە عێراقیەکان بووبوون ، دەیانگواستەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان.
بارزانی لە ئیمکانیەتی ئەگەری خاپورکردنی بیناحکومی و سەربازیەکانی دەگۆڵیەوە بەدامەزراوەکانی نەوتیشەوە ، بەڵام بیرکردنەوەی بارزانی لەوکاتەدا پاپەندبوو بەوهێرشەی کە عێراقیەکان پلانیان بۆدادەنا لەژێر ناوی"نعتمد علی الله" ، بارزانی لەوە ئاگادار بوو سەرۆکی نوێی حکومەتی عێراق "عبدالرحمن البزاز" دژایەتی پرۆسەکە دەکات.
"بەزاز" لەئەیلوی ١٩٦٥ شوێنی "تاهیر یحیی"ی گرتەوە باوەڕی وابو کەمەحاڵە کێشەی کورد بەیەك گورز چارەسەربکرێت ، هەوڵی دەدا بە لێکتێگەیشتن بەڵام هێزی سوپا لەوکاتەدا گەورەتر بوو ، هەیئەی ئەرکانی سوپای عێراقی پێی وابووکەدەتوانێت یاخیبونی کوردەکان هەرەس پێ بهێنێت ، لەڕێگای بەکارهێنانی هێز و تەقەمەنیەکی چڕو زۆرەوە ، دەتوانێ زاڵ بێت بەسەر گۆڕەپانی جەنگی سەختی شاخاویدا.

لەئازاری ١٩٦٦ چەند لیوایەکی زرێپۆش و تۆپخانە دەستیان کرد بەجوڵە بەئاراستەی هێڵەکانی شەڕگە و بەئامانجی دەستگرتن بەسەر چەند خاڵێکی ستراتیژی گرنگدا ، و پچراندنی هێڵی یارمەتی بۆ کوردەکان ، ئامانجی پلانەکە داگیرکردنی پارچەزەوییەك بوو کەنزیکەی ٥٠ کیلۆمەتر دەبوو، لە ڕێگەی "هاملتۆن"ەوە لەباکوری عێراق دەستی پێدەکرد.

ئەو ڕێگایە بەدرێژترین ڕێگای سەرەکی دادەنرێت لە کوردستان ، درێژدەبێتەوە هەتا بەرزاییەکانی ئێران و دەریای قەزوین ، بەناوی ئەندازیاری نیوزلەندی "ئارچیبێلت میلۆن هاملۆتۆن"ەوە ناونراوە کەدروستی کردوە کاتێك لەکۆتایی بیستەکاندا لەعێراق کاری کردوە.

سەرکردایەتی سەربازی و سیاسی بارزانیش لەو ناوچەیە خۆی داکوتابوو، پلاندارێژەرانی هێرشەکە چاویان بڕیبووە ئامانجێکی تریش کەخۆی لەداگیرکردنی ڕێگاکانی "پێنجوێن" بۆ "سلێمانی" دا دەبینیەوە لە باشور ، هەیئەی ئەرکان پێی وابوو کە پرۆسەکە یەك مانگ دەخایەنێت وە چوار فیرقەی بۆ دابین کرد کە هەریەکێکیان لە کەرتێکا دانرابون.

*** *** ***

شەڕەکان لە ٨ی نیسانی ١٩٦٦ دەستیان پێکردەوە ، بۆئەوەی هێزە کوردیەکان لەناوچەی ئامانجی چونەژورەوە دوربخەنەوە، لیوایەکیان نارد بەرەو ئەوچیایانەی کە بەسەر "عەقرە" دا دەڕوانن کە لەسەر سنوری تورکیایە ، ئەمەش بەو ئەگەرەی کە بارزانی هێزەکانی دەکشێنێتەوە لە"ڕەواندوز" بەرەو ئەوێ بەم شێوەیە پرۆسەی چونەژورەوەیان لەوناوچەیەدا ئاسان دەبێت.

لە١٣ی نیسان واتە دوای ٥ ڕۆژ لەدەستپێکی جەنگ سەرۆکی عێراقی "عبدالسلام عارف" لەڕوداێکی "هەلیکۆپتەر"دا کوژرا کە بووەهۆی وەستاندنی دەستپێشخەری هێرش هەتا بارودۆخی عێراق دەگەڕێتەوە دۆخێکی بەرقەرار ،

لەجێگەی سەرۆکی کوژراو ، برا گەورەکەی "عبدالرحمن عارف" کە جێگری سەرۆکی ئەرکان بوو ، ئەو پۆستەی وەرگرت ، کە کەسێتیەکی مامناوەندی هەبوو ، و زیرەك و زمانپاراو نەبوو ، کە ئەمانە سیفەتی برا کوژراوەکەی بوون.
"تسوری" پێی وابوو کە ئەم قۆناغە گونجاوە بۆبەکارهێنانی ئەوشێوازەی کە فێری جەنگاوەرە کوردەکانی کردبوو لەخولی "ڕاهێنەرە باشەکە"دا ، و چاندنی وەك شێوازێج لەناو کوردەکان دا، بەڵام هەر زوو بۆی ڕوونبوەوە کەجێبەجێکردنی ئەو ئامانجە مەحاڵە ، هەموی ئەوەی کە توانی بیکات ئەوەبوو هەندێك سەرکردەی مەیدانی فیکرەکەیان وەرگرت ، بە ئومێدی ئەوەی بیگەیەنن بە سەربازەکانیان لەداهاتووی دوردا.
تسوری دەستی کرد بەکۆششکردنی زۆر بۆ زانینی نیازی ئەم جەنگەی عێراقیەکان ، بەپێی بارودۆخەکە لە زەمینەی واقیع دا، بە پێی ئەو نەخشانەی لای بوو، لە ئەنجامدا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە لەماوەیەکی کورت دا جەنگ دەست پێدەکاتەوە ، بە کردار ئەوە ڕویدا ، هەتا کۆتایی مانگی نیسان پرۆسەی تۆپبارانکردنی یەکتری بەردەوام بووبەدرێژایی شەڕگەکە[1]، لە هەفتەکانی سەرەتادا کوردەکان چێژیان لەیاریە تازەکانیان وەردەگرت ، ڕاجیمەکان ماوەکەیان لەنێوان ٣، ٤ کیلۆمەتر دەبوو ، تۆپهاوێژی ٢٥ ڕەتڵی کە ماوەکەی تانزیکەی ١٤ کیلۆمەتر دەبڕی ، لە٣١ نیسانەوە تۆپخانەی عێراقی بە جۆرێك کەوتە باراندنی تۆپ بەسەرکوردەکاندا کەپێشتر وێنەی نەبووە ، پاش ئەوانە فڕۆکەکان دەهاتن تابۆمباران بکەن بەبۆمبی ناپاڵم ، لەدوای ئەوە هێزەکانی عێراق کۆتاییان بەبۆمباران هێنا بەتۆپبارانێکی ساروخی بەبێ جیاوازی.

---

[1] وشەی (شەڕگە )م لە جیاتی ( جەبهە )بەکارهێناوە -وەرگێڕ-

له پاش ئەو بۆمبارانە دەرکەوت کە "چوار" لیوای عێراقی نزیکن ئەوانیش لیواکانی "یەکەم" و "چوارەم" و "سێیەم" و "چواردەهەم" بوون ، کە هەمیشە لە شێوەی "فەصیل"دا دەجوڵانەوە لەکاتی هێرشدا.

ژمارەی ئەو هێزە عێراقیە نزیکەی ٤٠ هەزار سەرباز دەبوو لەنیوانیاندا "دوو هەزار" جاش هەبون ، ئەوە لەکاتێکدا ژمارەی سەربازە کوردەکان تەنها ٣٥٠٠ جەنگاوەر بوون ، لیوای "سێ" هێرشی کردە سەر چەند پێگەیەکی کوردەکان لە ناوچەی "چرۆ عمرئارە"[1] و شاخی "زۆزك" وە لەو ناوچەی "ئاکۆیان"ەوە دوو کەتیبەی سەر بەلیوای "چوار" پاڵپشتیان کردن لە هێرشبردن بۆسەر ناوچەی "هەندرێن" لەکاتێکدا "کەتیبەی سێهەم" لەهەردوولای ڕێگاکەوە بڵاوبوبونەوە ، وە هێزەکانی لیوای ١٤ هێرشیانکردەسەر ناوچەی "قەڵادزێ" و "ئیلانە" ، گومانەکان زیادی کرد کە چەند یەکەیەکی لیوای "چوار" جوڵاون تا بەرێگەشاخاویەکانی ناوچەکە هەڵگەڕێن لەلای باشوری هەندرێنەوە لەپێناو داگیرکردنی گوندی "گەڵاڵە" لەپێناو لێکدابڕینی پێگەکانی پێشەوەی کوردەکان لە دۆڵی "ڕەواندز" ، جێی وتنە کە لەدواتردا بۆمان ڕون بووەوە کە پرۆسەکە و ئاراستەکانی هێزەعێراقیەکان بەپێی پلانەبەریتانیەکان جێبەجێکراوە و بووە کەزانیاریەکانی ناویان ڕاست نەبون.

لەیادەوریەکانیدا "تسوری ساجی" سەبارەت بەو شەڕانەی کە ئەنجامی داون نوسیویەتی :

* دووی ئایار : گوللە و تۆپبارانی بەرگریکەران هەموو هێرشەکانی هێرشبەرانیان تێك شکاند لەهەموو کەرتەکان وە لەچیای "زۆزگ" کەبەرزاییەکەی دەگاتە ١٨٠٠ مەتر هێزێکی کوردی دژەهێرشێکیان بەشەو بۆ گرد ، گەمارۆی لیوا هێرشبەرەکانیان داو چواردەوریان گرت ، سەرکەوتوو بون لەوەی

---

[1] هەڵەیزمانەوانی یە حونکە لە زمانی کوردی بۆ عیبری پاشان بۆ عەرەبی دواتر منکردومەتەوە بە کوردی لەمەشە گۆڕانکاری زۆری بەسەر ناوی شوێن و کەسەکاندا هێناوە کە من هەندێکیانم ڕاست کردۆتەوە . – وەرگێڕ –

که پشتەوەی لێ بگرن ، وە دەستیان کرد بە گوللەباران ، لە سەرەتادا عێراقیەکان وایان زانی ئەوەی کە تەقەیان لێ دەکات هێزێکی عێراقی ترە لەپشت خۆیانەوە هاتووە ، هاواریان دەکرد تەقە ڕاگرن ، بەلاّم هاوارکردنەکەیان تەنها شوێنەکەیانی ئاشکراکرد ، کوردەکان نزیکەی هەموو ئەندامانی ڕیزی پێشەوەیان کوشت .

سەرکردەکوردەکەی شەڕەکە وتی ٧٥ جەستەمان ژمارد هێزەکە گەڕایەوەو دەستکەوت ٤٥ تفەنگ و سێ ڕەشاشیان لەگەڵ خۆیان هێناوبوو ، بەلاّم لەوەزیاتریان دەست نەکەوتبوو لەبەرئەوەی تەقەی هێزەکانی دوژمن ڕێگەی نەدابون.

لەکۆتایی ڕۆژی یەکەمدا سوپای عێراقی سەرکەوتوو نەبوو لە داگیرکردنی هیچ پێگەیەك ، ناچاریکردن کەدووری قەمچی تفەنگێك دور بکەونەوە و دووبارە شێوازی تۆپبارانی زەمینی ئاسمانی دەست پێبکەنەوە.

* سێی ئایار : هێزەکانی عێراق لەهەموو کەرتەکانەوە پەلاماریان دا، بەلاّم نەیانتوانی هیچ گۆڕانکارییەك لەئەنجامی ڕۆژی یەکەمدا بکەن ، سریەیەکی هێزەکانی عێراق توانی دزە بکات بەناو ڕیزەکانی هێزەکوردیەکە لەچیای "هەندرین" و گەیشتنە لوتکەی چیاکە ب بەیانی کوردەکان هێزی نابراویان هەست پێ کرد ، هێرشیان کردە سەری ناچاریان کرد پاشەکشە بکات بۆبناری چیاکە،پێدەچێت مەلا مستەفا هەست بەوەبکات کەعێراقیەکان سوکایەتیان پێ کردوە ، وای لێ هاتوە کەتۆمەت دەخاتەپاڵ پاریزگارەکانەوە و پێیان دەڵی کە کەمتەرخەم بون ، وەتوانای ڕوبەڕوبونەی هێزە هێرشبەرەکەیان نیە.

ئێوارە ئاگاداریەکمان لەهەموو لایەکەوە بەدەست گەیشت کە تەقەمەنی لەجۆری "٧,٩٢" ملم تەواو بووە ، فشاری توندی عێراقیەکان وای پێویست دەکرد کە بەچڕییەکی زۆر ئاگربارانیان بکەین ، هەمو دۆشکەکان لەجۆری "مێگ٢٤"

تەقەمەنیان تەواوبوو کەتەنها دوو هەفتەبوو لەئیسرائیلەوە هاتبوون ، ئەمەش بەهۆی ئەوەی بەهەموو هێزێکەوە بەکاردەهات .

★ چواری ئایار : فەرمان درا بەهەموو هێزەکان کە هەڵمەتیکی دژەهێرش ئەنجام دەدرێت لەهەموو شەرگەکانەوە تەنانەت ئەگەر بەهێزی بچوکیش بێت ، عێراقیەکان شەش جار هەوڵی داگیر کردنی پێگەکوردیەکانیان دابوو لەهەموو جارەکاندا ، پاشەکشەیان کردبوو ، دوبارە دەستیان دەکردەوە بە ئامادەکردنی تۆپخانە بۆ هێرشکردنەوەی دووبارە ، هەروەها عێراقیەکان هێرشی ئاسمانیان کردەسەر پێگەی چونەناوەوەی خولگەی "رەواندزو – حاجی ئۆمەران" چوارفڕۆکە بەدرێژایی ڕۆژ بەبۆمبی ناپاڵم ناوچەکەیان بۆمباران کرد ، بێ ئەوەی یەك کەس بکوژرێت.

★ پێنجی ئایار : ئەوهێزە کوردییەی کەناوچەی "چرۆ عمرارە"ی چۆڵکردبوو تەقەمەنی و کەل وپەلی پێگەیشت کە لێرەولەوی لەشەرگەکانی تر کۆکرابوەوە ، هێرشی کردەسەر هێزەکانی عێراق بۆگێرانەوەی پێگەکەی ، سەرکردەی هێزە کوردیەکە کوژرا ، ئەمەش کاری کردە سەر تەواوی شەرگەکە ، بگرە سەر سەرکردایەتی کوردیش ، ئەمەش وایکرد بارودۆخی تەقەمەنی زۆر خراپ بێت ، بیروڕای ڕووخێنەر پەیدا ببن ، کە باسیان لە مەحاڵی خۆڕاگرتن دەکرد.

یاریەکە ئەوکات وەك یاری پەنجەگەستن وابو ، کاملا لە پێشەوە دان بەئازارەکانیدا دەنێت ، تسوری بەهاوکاری هاوڕیکانی هەوڵی دەدا کەرۆحی خۆڕاگری لەدەرونی کوردەکاندا بچێنێت ، هەوڵی دا وایان لێ بکات ڕێگەی دوژمن و جوڵەکانی شیبکەنەوە.

"تسوری" دەڵێت : ((بارزانی وادەردەکەوت وەك ئەوەی هەموو شوێنێکی کوردستان لەسەردڵی دەپارێزێت چاوی دەنوقاند پاشان دەیگوت پێگەی ئەو هێزە لە کوێیە؟ ئەی ئەوە ؟ کە ئەمەش یارمەتیدەر بوو لەدیاریکردنی شوێنی هێزەکانی دوژمن)).

"تسوری" جارلەدوای جار بیرۆکەی بەکارهێنانی پلانی "بڕنەو"ی دەخستەبەردەم بارزانی کەدەڵێت یەکەی سەربازی پێکهاتوو لە "١٥٠" کەس بنێردرێت بۆ دەست بەسەراگرتنی ناوچەی چیاکان و لەبناری چیای "زۆزك" و"هەندرین" و "کۆڕەك" و ناوچەی "چرۆعەمرارە" بەپانی " ١٥"کیلۆمەتر تسوری جەختی لەوە دەکردەوە ، کەداگیرکردنی ئەو ناوچانە بەبێ سەنگەرلێدان دەبێت ، بەڵکو لە خۆڵەنێوچەییە سروشتیەکاندا پەنادەدرێ و دەشاردرێتەوە ، هەروەها ئاماژەی بە شێوازی ڕاجیمەکان دابوو لە هێرش و بەرگری دا.
ئەوە یەکەمجار بوو کەبارزانی بەپلانی سەربازی بەو قەبارەیە ئاشنا ببێت ، بۆیە وەڵامی دایەوە : "پیاوەکانم ڕانەهێنراون بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی ئاشکرا و شەڕگەیی لەگەڵ سوپای عێراقی بە درێژایی ژیانمان ئێمە دەستمان وەشاندوەو ڕامان کردوە ، ئەگەر هێرش بکەینە سەر سوپای عێراقی ناتوانین خۆمان ڕابگرین ، ئیمە لەوە لاوازترین کە پارێزگاری لەناوچەیەك بکەین لەبەرامبەر هێرشی سوپای عێراقی".
تسوری دەڵێت : (( بۆچونی ئەوەم لادروستبوو کە بارزانی ڕانەهاتوە کارێك بکات لەدەرەوەی بیرکردنەوەی خۆی بێت ئامادەبوو کەپرۆسەی تەنگ پێ هەڵچنین ئەنجام بدات ، لەگەڵ هێرشی سادە ، بەڵام بۆ هێرشی گشتگیر ... نا.. ، ئەمە لە کاتێکدا کە سەرکردەی هێزەکان بڕوایەکی تەواوی بەوە هەبوو کەئەگەر تۆپهاوێژی ماوەی ٣٠ کیلۆمەتری دەست بکەوێت دەتوانێ سەرکەوتنێکی مەزن بەدەست بهێنێت)).
دەیگوت : "ئەو جۆرە تۆپهاویژەمان بۆ بنێرن"
تسوری وەڵامی داخوازیەکەی بەوەدایەوە کە "تۆپهاوێژ باشە بەلام ئەو بەشێکە لەدەزگای جەنگی بەرگری یان هێرش بردن نەك مەسەلەی ئەوەی بەشێوەیەکی سەربەخۆ بەکاربێت" گەڕایەوەو دوبارە هەوڵەکان دەستی پێکردەوە بۆ ڕازیکردنی بارزانی بەبەکارهینانی شێوازیکی جەنگی نوێ ، و وتی: ((ئەگەر

سوپای عێراقی هێرشێکی تر بکات دەتوانێت "حاجی ئۆمەران" بگرێت ، بەمەش دەتوانێت کوردەکان کەنارگیر بخات و بێبەشیان بکات لە هاوکاری دەرەکی)).
بارزانی وەڵامی دایەوەو وتی: ((ئەوە ڕاستە بەڵام ئیمکانیەتی ئەوەم نیە)).
لە ٥ی ئایاردا وا دەردەکەوت کەکوردەکان تەسلیمی بارودۆخەکە ببن ، ئەمەش وایکرد کە "تسوری" هەست بە ڕوخانێکی توند بکات.
کوردەکان بە ئیسرائیلیەکانیان وت: ((بەباشترین شێوە کە توانیمان جەنگاین ، گرنگیەکی ئەوتۆ نابینین لەچیای "زۆزگ"دا کە لەدەستمان داوە ، ئێرانیەکان ڕێگرن لەو پێویستیانەی کە دەبێ پێمان بگات، ئێوەی ئیسرائیلی ئەوەی بۆتان دەکرێ کردوتانە ، بەڵام ئێمە لەسایەی ئەم بارودۆخەی ئێستادا ناتوانین هیچ بکەین ، ئەگەر بمانزانیایە پێشتر مەرجەکانی جەنگ بەم شێوەیە دەبێت ئەوا بەوپێوەرە فراوانانە ئەمان دەکرد)).
تسوری کەسێکی پۆڵاین بوو پێشتر شەڕی تری زۆری لەژێر مەرجی زۆر قورسدا کردبوو ، بەڵام ئەمجارە خۆی لەبەردەم تاقیکردنەوەیەکی نوێدا دەبینیەوە ، ئەو لەسەرخاکی دوژمن شەڕدەکات لە ناوکۆمەڵێك جەنگاوەردا کە ئامادەن بۆ مردن ، بەڵام ئەمانە لەو جۆرەنین کە لە یەکەتایبەتیەکانی ئیسرائیل دا دیبوونی ، بۆیە کاتێك کەبارودۆخەکە قورس دەبوو لەسەری بەخۆی دەگوت: "با دەروونت بەهێز بمێنێتەوە" دەڵێت : ((ئەوەی توانیمان بیکەین ، هاندانی سەرکردە بوو تا ئەو چیرۆکانە بگێڕیتەوە بۆیان کەباس لە پەرجوو"معجیزە" دەکەن بەجەختکردنەوە لەوەی کە کاروانی تەقەمەنی و یارمەتی بەم زوانە دەکات ، وە وتمان کە سەرۆکی مۆساد هاتوە بۆ تاران تا کاربکات لەسەر خێراکردنی ناردنی کاروانی تەقەمەنیەکان، شیاوی بیر هێنانەوەیە کە لەو ماوەیەدا "عمیت" دەیویست بچێت بۆ وڵاتێکی ئاسایی بەڵام لەسەر داوای وەفدەکەی مۆساد لەتاران نیشتبووەوە تا کاربکات تەقەمەنی و کەلوپەلەکان خێراتر بگەن ، لەسایەی ئەو بارودخەڕەشەدا چەپکێك تیشك دەرکەوت کاتێك یەکێك لە کاروانەکانی

تەقەمەنی و کەل و پەل توانی بگاتە ئامانجەکەی لەگەڵ خۆیدا ، تەقەمەنی (٧,٩٢) ملم بۆ تفەنگ و ڕەشاشەکان وە تۆپهاویژی ٢٥ ڕەتڵی وە ڕاجیمەی عەیارە ١٨ و ١٢٠ ملیم وە قومبەلەی دروستکراوی ئیسرائیلی لەخۆگرتبوو ، کاتێك ناوبراو گەیشت شادی هەموانی گرتەوە، هەموو شتێك سەراوبن بوەوە.

لە٨ی ئایاردا تسوری لەڕۆژانەکەیدا نوسویەتی : ((کە پێمان وابو هێرشکردنەسەر لیوای ٤ دەبێتەهۆی ئەوەی دوژمن هاوسەنگی خۆی لەدەست بدات، بەمەش بۆماوەیەك هێرشەکانی ڕادەگرێت ، بارزانی پێشنیاری کرد کە تێپەڕگەی "گەلی عەلی بەگ" چۆڵ بکەین لەباکور ، بەلام ئەم پرۆسەیە پێویستی بە"هەزار" چەکداری تر هەبوو ، وە داوا کردنی ڕێپێدان بەناوچەی "بێلایەن – بارزان" کە"شێخ ئەحمەد"ی برای بارزانی بەڕێوەی دەبرد ، لەمەوە پرۆسەکە بوو بە پلانێك.

* لە ٩ی ئایار هیزەکانی "فارس"ی سەرکردەی ناوچەی هەولێر کەنزیکەی ٢٠٠ چەکدار دەبون نێردران بۆ لێدانی دامەزراوە نەوتیەکان و ئۆتۆمبیل و ئەو پردانەی کەلەسەر "زێی بچوك"ن ئەمەش بەئامانجی ئەوەی وا لەعێراقیەکان بکات هێزەکانیان لەشەڕگەکە بکێشنەوە، سوپای عێراقی بەردەوام بوو لەهێرشەکانی ، فڕۆکەکان بۆمبارانی خولگەی "حاجی ئۆمەران"یان کرد، لەگەڵ پێگەکانی "لیژنەی تەنفیزی پارتی دیموکراتی کورد".

* لە ١١ی ئایار سوپای عێراقی توانی ناوچەی "چرۆعمر" و هەموو لێوارەکانی چیایی "زۆزگ" داگیر بکات .

"لیوای پێنج" کەناوبانگێکی گەورەی لەجەنگدا هەبوو بەشداری جەنگەکەی کردو توانی بگاتە ناوەڕاستی چیاکە ، بەردەوام بوو لەپێشڕەوی کردنی بەرەو لوتکەکە ، بارزانی لەوەدەترسا کە چیای زۆزگ لەدەست بدات ، بەرێکەوت بۆ هاندانی هێزەکانی لە منجامدا بۆی دەرکەوت ، ئەگەر دژەهێرشێك نەکرێت ئەوا لەوانەیە هەمو چیاکە لەدەست بدرێت.

تسوری دەڵێت : ((هەستمان کرد کە خۆمان لەجەنگێکەوە گلاندووە کەزۆر گەورەیە لەچاو ئەو هۆکارانەی بە دەستمانەوەن ، ئەو ئومێدانەش کەکوردەکان بەئێمە هەیان بوو زۆر گەورەبوو، بۆیە خۆمان خەریك کرد بەبیروبۆچون و ڕاگۆڕینەوە)).

هەروەها مەترسی لەدەستدانی ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکانیش لەئارادا بو ، کەبکەونە دەستی عێراقیەکان ، لەسەر ئەوە "م" و "تسوری" و هاورێکانیان نەخشەیەکیی ڕاکردنیان دانا بۆ ئێران ، بڕیاریان دا کاتێك جێبەجێی بکەن ، کەهەموو ئەگەرەکانی خۆڕاگرتن لەبەرامبەر عێراقیەکاندا فەشەلی هێنا، بەڵام عێراقیەکان هەلی دەربازبوونیان بۆ کوردەکان ڕەخساند لەو کێشەیە .

★ "تسوری" لە ١٢ای ئایاردا : دەڵێت لیوای "چوار"مان هەڵبژارد وەك ئامانجێك لێی بدەین لەپێناو کەمکردنەوەی ئەو گوشارەی کە لەسەر کوردەکان بوو، ئاشکرایە کە بارودۆخی ئەو لیوایە نارەحەت بوو ، بەدرێژایی زنجیرە شاخێك بەرەوپێشەوە دەهات لەسەر ڕێگایەك کەبەرەو لوتکەی چیای "هەندرێن" دەچوو ، لە ئەملاولای ئەوزنجیرەیە ناوچەی بڵند وبەرز هەبوون ، ئەو لیوایە هەمیشە داوای پاڵپشتی تۆپخانە و ئاسمانیی دەکرد، هێزەکوردیەکان چاوەڕێی لیواکەیان دەکرد لەناوچەیەکی دیاریکراودا، کاتێك گەیشتە ئەوێ پێشنیاری دژەهێرشم بۆ سەری کرد.

پێگەیەکی کوردەکان هەبوو، دەبووە ڕێگر لە گەیشتنی لیواکە ، بۆ ئەو خاڵەی کە دامان نابوو، هێرشەکەی بۆ سەربکەین ، فەرمانمان پێدا کە ڕێگەبدات لیواکە تێپەڕێت ، بەڵام سەرگردەی هێزەکە فەرمانەکەی ڕەتکردەوە ، ئەو نەیدەزانی کەبۆچی دەبێت پاشەکشەبکات لەکاتێکدا ئیشەکەی خۆی بەباشترین شێوە جێبەجێدەکات ، و تەواو ئامادەیە بۆ جێبەجێکردنی دروشمی پێشمەرگە "ئێمە ئامادەین بمرین".

من و "میرخان" کەئەفسەرێکی گەورەی لەنزیکەکانی مەلا مستەفا بوو چوین بۆ پێگەکە لەپاش هەوڵیکی زۆر باوەڕمان پیّ هێنا کە پاشەکشەبکات، پاش ئەوەی بە توڕەییەوە تەماشای کردین وتی: ((لەبیرتان بیت ئێوە بەزۆر ناچارم دەکەن پاشەکشە بکەم)).

لیوا عێراقیەکە هاتە ناوچە چۆڵکراوەکەوەو ژمارەیان نزیکەی چوار هەزار سەرباز دەبوو زۆر بەباشی پڕچەککرابون ، ژمارەیەکی زۆر ولاّخیان پیّ بو لەگەڵ تۆپهاوێژ ، ڕیزی سەربازەکانی زۆر لەیەکەوە نزیك بون ، لیوا عێراقیەکە کەوتە ناو نیوە بازنەیەکەوە ، لەکاتێکدا پاڵپشتی لیواکەو سەرکردایەتیەکەی لەدواوەی بوو.

هێزە کوردیەکان بە سەرکردایەتی سەرکردەی هەندرێن "فاخر محمد بارزانی" بەرەبەرە نزیك دەبونەوە لەهێزەکە لە سیّ ئاراستەوە خۆیان دابەشکرد بە "چوار" بەش هەر بەشەی نزیکەی ٢٢٠ سەرباز دەبوو، لەهەمان کاتداهێزێکی ٣٠ جەنگاوەری بەسەرکردایەتی "ڕەقیب یونس" بە جوڵەیەکی خولانەوەی بەرفراوان ڕاسپێردرا بەئامانجی داگیرکردنی سەرکردایەتی لیواکە ، و دەستگیر کردنی فەرماندەی لیواکە بە زیندویی بۆمەبەستی دەروونی و هەوالگری ، کاتێك لیواکە هاتەناوچەی تەڵەکەوە هەرچی فیشەك وئاگر هەبوو لە ئامێری بەرگری پێوەی نرا بە تۆپهاوێژەکەشەوە کە بریتی بوو لە چوار تۆپهاویژی ٢٥ ڕەتڵی و دوو ڕاجیمە لە جۆری ١٢٠ ملیم و ٧ ڕاجیمە لەجۆری ٨١ ملیم ، گومان لەوەدا نیە کە ئەم هێزی تۆپخانەیە هێندە گەورە نەبوو بەتایبەت ئەگەر چڕی تۆپهاوێژەکانی دوژمنت لەبەرچاو بگرتایە ، بەلاّم ئەو بارودۆخەی تیایدا بەکاردەهێنرا وایدەکرد ، پاڵپشتێك بێت زۆر لە هێزە ڕاستەقینەکەی خۆی بەهێزتر بێت.

******************

هیچ فەرمانێکی پێشتر ئامادەکراو بۆ هێزەکان نەبوو ، بەڵکو فەرمانەکانی لەکاتی هێرشکردندا دەدران، بەلاّم ئەمە یەکەمجاربوو کوردەکان بەو چڕیە گوللە و تۆپخانە بەکاربهێنن بەر لەهێرشکردن ، جگە لەوە یەکەمجاربووکە هەستیان بەئاستی گرنگی گواستنەوەی فەرمانەکان دەکرد، لە ڕێگەی ڕادیۆوە لەکاتی جەنگدا ، پاش نیوسەعات لەبۆمبارانی تۆپخانەی ناوبراو عێراقیەکان توشی شۆك بون بەو هێرشەی کوردەکان ، کە پێشتر بەنیسبەت ئەوانەوە نمونەی نەبوە، جەنگاوەرەکان لە سەرەتادا تفەنگیان بەکارهێنا پاشان ڕەشاشی بەریتانی لەجۆری "سترلینگ" زۆر بێ بەزەییانە گورزیان لە عێراقیەکان دەوەشاند.

هێزەکە ب سەرکردایەتی "یونس" گەمارۆی لیواکەی دابوو، بەلاّم نەیتوانی بەزیندوویی فەرماندەی لیواکە بگرێت بێگومان ئەگەر ئەو فەرمانە نەبوایە فەرماندەی لیواکە نەیدەتوانی ڕابکات ، و "یونس"یش نەدەکوژرا ، ئەوە وای کرد هەلی ڕاکردن بۆ فەرماندەکە بڕەخسێ و یونسیش کە ڕایکرد بەدوایدا تا بیگریت لەدوری ١٠ مەتریك لێیەوە کوژرابوو ، جەنگەکە یەك سەعاتی خایاند هەمو ئەو سەربازانەی لیواکە کە لەپێشەوە بون کوژران ، جگە لە٥ بەندکراو و ژمارەیەك سەرباز کە توانیان هەڵبێن.

بەلاّم لیستەی دەستکەوتە لاوەکیەکان ئەمانەی لەخۆ گرتبو : شەش تۆپهاوێژی شاخاوی عەیارە ٧٥ ملیم ، چوار تۆپهاویژی تر ، سێ ڕاجیمەی بەریتانی لەجۆری "سێ ئینج" ، چوار ڕاجیمەی عەیارە ٨١ ملیمی ئەمریکی ، چوار دۆشکەی مامناوەند لەجۆری "فیکرس ٤٥" ، تۆپهاوێژی جۆری "برن" وە هەزار تفەنگ لە جۆری "مۆزر" ، و سێ هەزار ڕەشاش لە جۆری "سترلینگ" ، ٤٦ ئامێری پەیوەندی و ئامێریکی پەیوەندی بۆ بانگکردنی پاڵپشتی ئاسمانی ، و "شەش" هەزار بەتانی و ڕێژەیەکی زۆر خواردەمەنی و تەقەمەنی.

ژمارەی کوژراو بریندارانی کورد بە١٥٠ کەس خەمڵێنرا لە کاتێکدا کوژراوی عێراقیەکان گەیشتە نزیکەی "دو هەزار پێنج سەد" کەس.

لەلێدوانێکدا بەرپرسێکی عێراقی بۆ گۆڤاری "میدڵ ئیست جنراڵ" وتبوی : ((ئەو چەکانەی کە لەکوردەکان گیراون لە ماوەی پرۆسەکەدا هێما و نیشانەی ئیسرائیلیان پێوەبووە)).

* لە١٣ی ئایاردا تسوری نوسیویەتی : ((دوژمن توانی بگاتە لوتکەی چیای زۆزگ و هێرشەکانی بەردەوام بوولە "هەندرین" ، هەموو پاڵپشتیەکانی تۆپخانەی خۆی ڕێکخستەوەو چەند هەوڵێکی دا بۆ دەربازبوون و تۆڵەسەندنەوەی ئەو شکانەی لیوای "چوار" بێنەوەی هیچ ئەنجامێکی هەبێت .

سوپای عێراقی دەستی کرد بە پرۆسەگەلی تۆڵەسەندنەوەی بەرفراوان بەفرۆکە لەنزمی دەفرین و هەر شتێك بجولایەتەوە بۆمببارانیان دەکرد، زۆرشێتانە هێرشیان دەکرد و کوردەکانیش یەکەی بچوکیان پێکهێنا بۆ ئەنجامدانی کاری تێکدەرانە، پردی "زێی بچوك"یان تەقاندەوە ، وە پردی "تەقتەق" و پردی "ئالتون کۆپری" و ویستەگەی وزەی کارەبای "دوبز"یش .

"تسوری" پێشنیاری کرد بۆ بارزانی تا ئەو سەرکەوتنە تەواو بکات کە بەدەستی هێناوەو ، پلانی دانا بۆ ناردنی دوو کەتیبەی گەورە بۆ شاخی "کۆرەك" کە بەرزاییەکەی دەگاتە "دو هەزار و پێنج سەد" مەتر تا دەستی بەسەردا بگرن و بەمەش پێگەی "گەلی عەلی بەگ" دادەخەن، و ئەوسریەیەی کە زۆر بەباشی پرچەك کراوەو دانراوە بۆ پاراستنی ناوچەکە لەناودەبەن، بەمەش زنجیرەبەردینەکە هەموی کۆنترۆڵ دەکەن، وە لیوا هێرشبەرەکانی عێراق گەمارۆ دەدەن و لێکیان دادەبڕن ، بەڵام بارزانی بە شێوەیەکی تر بیری دەکردەوە.

* لە١٤ی ئایار بارزانی ڕویکردە چیای زۆزگ کەلیوای "پێنجەم" دەستی بەسەردا گرتبوو ، "ئازاد" پێی وتین بارزانی دەیەوێت هێرش بکاتە سەر ئەو لیوایە ، بەهەمان ئەو شێوازەی کە لیوای "چوار"ی پێ لە ناوبرا ، بەو باوەڕەی کە دەتوانن بەبەکارهێنانی ئامێری پەیوەندی و تۆپهاوێژی "میگ"ەوە ئەو لیوایە لەناوبەرن.

★ لە١٥ی ئایاردا هێزێك كە لە٢٥٠ كەس پێكهاتبوو ڕێكدەخرا بۆ هێرشكردنەسەر لیوای "پێنجەم" ، ڕێگایەكی تایبەتیان بڕی و لەوێوە تۆپهاوێژەكان گواسترانەوە بۆناوچەی "كۆسن" وەك پاڵپشتی هێرشەكە ، هێزی تۆپخانە ڕێكخرا بەسەركردایەتی "عقید عبدالرحمن قازی" كە شەش تۆپهاوێژی عەیارە ٧٥ ملیم و هەشت ڕاجیمەی عەیارە ١٢٠ ملیم لەخۆگرتبوو.

★ لە١٨ ئایار لەگەڵ بارزانی كۆبوینەوە لەیەكێ لە حەشارگەكانی نزیك گوندی "گەلاڵە" پلانی داگیركردنی چیای "كۆڕەك"م بۆ خستەوەڕوو، بەڵام پێی وابوو كە ئەوپلانە لە قەبارەی یاخیبونەكە گەورەترە، بارزانی تائەوكاتەش بەو مەبدەئە كاری دەكرد كە دەڵێ "بەبێ عێراقیەكان ناتوانین هیچ بكەین" بۆیە نەیدەویست هەموو ئەو داوانە بپچڕێنێت كە دەیانگەیاند بەدانوستان ، پێی وابوو ئەمجارە عێراق لێی خۆش نابێت ئەگەر سەركەوتنێكی تازەی بەسەر هێزەكانیدا بە دەست هێنا.

بارزانی بەپێی پلانەكانی خۆی پەلاماری عێراقیەكانی دا، بەڵام ئەوان نەكەوتنە تەڵەكەوە ، لەهێرشی یەكەمدا ١٨ كورد كوژران و هێرشەكە وەستا ، پاشان بارزانی ڕازیبونی خۆی لەسەر نەخشەكەم بۆ ڕزگار كردنی كۆڕەك نیشان دا ، لە گفتوگۆكانی نێوان بارزانی و نزیكەكانیدا بڕیاری دا ١٢٠٠ كورد بەشداری ئەو پرۆسەیە بكات ، بارزانی شەڕی دەستەگەری دەكرد بەتەواوی مانای ووشە ، كاری دەكرد بۆ تەگەرەخستنە بەردەم عێراقیەكان و دەست لێ وەشاندنیان ، كاتێكیش دەیزانی كەئەوان هێزێكیان كۆكردۆتەوە كەئەم دەرەقەتی نایە هێزەكانی خۆی بەنهێنی دەگواستەوە بۆ ناوچەیەكی دور لە ناوچە وروژاوەكە.

دەیگوت: ((بۆچی سووربم لەسەرمانەوە لەسەرئەم چیا یان ئەو چیا ، ئایا كوردستان چیای تری لێ نیە؟ مادەم عێراقیەكان سورن ئەم چیایە بگرن بابیبەن ، بەڵام پاش ئەوەی نرخەكەی بە كوژراو دەدەن منیش دەچم بۆ چیایەكی تر)).

بەڵام ئەمجارەیان شتەكە تەواو جیاواز بوو ، چونكە عێراقیەكان هەڕەشەیان لەبڕینی ئەو كۆمەكانە دەكرد كە لە ئێرانەوە دەهات بەمەش شادەماری سەرەكی ژیانیان لێ دەبڕی.

## بەشی دوازدەیەم/ پلەی لیوا بۆ سەرکردەی یاخی بونی کوردی

دەستکەوتەکانی کوردەکان سەرنجی ئەو سێ بەرپرسە ئیسرائیلیەی بۆ لای خۆی ڕاکیشا کەسەرپەرشتی هاریکاری و یارمەتیدانی کوردیان دەکرد.

سەرۆکی حکومەت و وەزیری بەرگری ، سەرۆکی ئەرکان ، سەرۆکی موساد ، دەرکەوت هۆکارێکی سەرەکی هەیە وا دەخوازێت قەبارەی هاوکاری کوردەکان زیادبکرێت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی عێراقیەکان.

لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەدا کەسەرۆکی حکومەت و وەزیری بەرگری "لیڤی ئاشکۆڵ" لەگەڵ سەرۆکی ئەرکان "ئیسحاق ڕابین" و سەرۆکی پۆلی ئەرکان "عێزرا وایزمان" ، و سەرۆکی مۆساد "مائیر عمیت" بەیەکەوە کردیان بڕیاریان دا بازێك لە پێشکەشکردنی هاریکاریەکان بچنەپێشەوە ، بەناردنی شاندێکی پلە بەرز بۆ کوردستان.

"عمیت" ڕایگەیاند کەمن ڕازیبونم لەئێرانیەکان وەرگرتووە تا وەفدەکە بەوێدا بچێت بۆ کوردستان.

لەوچاوپێکەوتنەدا کە "عێزرا وایزمان"لەساڵی ١٩٩٥ لەگەڵی دا ئەنجام دراوە دەڵێت ((بیرم لەوەکردەوە کە کوردەکان لە بەرەبەیانی ژیانیانەوە چەوسێنراونەتەوە ، و ناچارکراون هەر لەلوتکەی چیاکان بمێننەوە بەبێ ئەوەی دەرچەیەکیان بەرەو دەریا هەبێت، کەواتە بۆ دەستی یارمەتیان بۆ درێژنەکەین؟ جگە لەوەش بەرژەوەندی ئیسرائیل وای دەخواست کە لە کۆتایی سنووری عێراقیەکان دا دۆستێکی هەبێت)).

((کە لەجێیەکانیان دەریان بهێنن و لەئیسرائیل دوریان بخاتەوە)).

بەو پێیە وایزمان داوای کرد کەجێگرەکەی لە پۆلی هەینەی ئەرکان لیوا "ڕەحبەعام زەئیفی(گاندی)" بنێرێت ، دیاریکردنی "زەئیفی" لەسەر بنەمای ئەو ئەزمونە زۆرە دێت کە لەبواری کاری ئەرکاندا بەدەستی هێناوە ، لەکۆتاییدا بڕیار درا کە "زەئیفی" لەگەڵ "عمیت" و "دێڤد کرۆن" ڕوبکەنە کوردستان.

له ٢٤ ی ئایار "وایزمان" بەفڕۆکەیەکی سەربازی فڕی بۆ تاران کە "پێنج" تەنی لەئامادەکاری سەربازی تێدابوو، بەنیاز بوو لە تاران لەگەڵ "شا" کۆببێتەوەو بینێریت بۆ کوردەکان.
لە ١٠ی حوزەریرانی ١٩٦٦ شاندەکە ڕویکردە کوردستان لە فڕۆکەیەکی بچوکدا کە "ساواك" پێیدابون لە "تەورێز" نیشتەوەوە لەوێوە بەئۆتۆمبیلیی "مارسیدس" گواسترانەوە بۆ شوینی ئامانجەکە ، ئێرانیەك هاوڕییان بوو.
"زەئیفی" دەڵێت : کاتێك سنوری عێراقمان بڕی بە هاوڕێیەتی "کاك علی" سەرکردەی ناوچە کوردیەکە ، ناوچەکە تاریك داهاتبوو ، بەو ئۆتۆمبیلەجێبەی کە لە ئێرانەوە وەك دیاری بۆسەرکردایەتی یاخیبون هێنابومان ، بە لایتی نزم لەترسی ڕوودانی هەر ڕوداوێکی نەخوازراو.
لەناکاو لەبەردەممماندا چەند کەسێکمان بینی ، کەسێکیان لێمان نزیکبووەەوە و گرتمیەباوەش و بە"عیبری" پێی وتین : "شلوم" خۆم بینیەوە ڕووبەڕوی "تسوری" پێی وتم : ((بارزانی لێرەیە سێ سەعات بە پێ بەڕێگادا هاتوە خۆی و کوڕەکانی و دەست پێوەندەکەی ، تا لێرە لەپێشوازیتدا بن، کە ئەمە پێشتر نمونەی نەبوە .
بەرلەوەی تێبگەم لەوەی چی ڕو دەدات، خۆم ڕوبەڕوی بارزانی بینیەوە، وەك چۆن لەو چرکەساتە گەورانەدا ڕوودەدات ، هیچ وشەیەکم لەسەردەم نەبوو لەگەڵ ئەودا نیگایەکی درێژی پڕ لەخۆشەویستی و ڕێزمان گۆڕیوە ، پاشان تەوقەیەکی گەرم و گوڕمان کرد ، بەسواری جێبەکەو ئەسپەکان بەرەو بارەگاکەی بارزانی بەڕێکەوتین کەنزیکەی ٣ کم دوربوو.
بارودۆخەکە زۆر هەستیار بوو ، لەنێوان کوردەکان و ئەو ئێرانیانەی کەدەهاتن بۆ سەربازگەی کوردەکان تا سەرپەرشتی بارودۆخەکە بکەن لەژێر چەندان بڕوبیانودا دەمانەوە، کاتێك بارزانی ئەو ئێرانیەی دی کە لەگەڵمان بوو لەڕێگاکەدا لە ئێرانەوە بۆ کوردستان تەواو پێی پەست و توڕە بوو، وتی: ئەو

سەگی کوڕی سەگە شۆفارە هاتووە چاودێریمان بکات چی دەکەین، بەوەوە ناوەستێ بەڵکو ڕاپۆرتی درۆ بۆ سەرۆکەکانی بەرز دەکاتەوە ، بەڵام ئیسرائیلیەکان دەیانویست پەیوەندیەکی باشیان لەگەڵ ئێراندا هەبێت هیچ بەهانەیەکی گومان بردنیان نەدەن بەدەستەوە ، چونکە ئێران تاکەڕێگەی لەبار بوو بۆ گەیشتن بەکوردستان ، گفتوگۆکە لەماڵی مەلا مستەفا ئەنجام درا لەنێوان شاندە ئیسرائیلیەکەو سەرکردەکەدا ، زۆر بەشێوەیەکی دۆستانە ئیسرائیلیەکان دیاریەکیان پێشکەش کرد کەبریتی بوو لەڕادیۆیەکی بچوك و دووربینێك ، زۆر بە خۆشحاڵیەوە قبوڵی کردن ، تسوری بارودۆخی شەڕگەکانی خستەڕوو زۆر بەوردی باسیکردن ، پاشان بارزانی خۆی قسەی کرد باسی لەمێژووی یاخیبونەکەو هۆکارەکانی کرد ستایشی ئیسرائیل و ڕۆڵە گەورەکەی کرد لەبەردەوامی یاخیبونەکە بەدرێژایی ساڵی پێشوو ، لەڕێگەی ئەوهاریکاریانەی کە پێشکەشی کردوین ، چەکدارکردن و ڕاهێنان و یارمەتی دارایی و مەعنەویی و ڕاوێژکاری ناوبەناو ستایشی ڕۆڵی ئێرانیشی دەکرد بۆ ڕازیکردنی چاودێرە ئێرانیەکەی کە لەگەڵماندا بوو.

زەئیفی تا ئەو خۆشەویستی و ڕێزەی کەئیسرائیل بۆ کوردەکان هەیەتی پیشان بدات دەڵێت : ((کاتێك لەقسەکانم بومەوە سەبارەت بەپشتگیری ئیسرائیل بۆکوردەکان ئەو دوژمنە هاوبەشەی کە ڕوبەڕوی بوینەتەوە و هەردوکمان دوو گەلی ستەملێکراوین ، پلە سەربازیەکەی خۆمم داگرت و پێم ووت: کە ئەمە خەڵاتی منە وەك دەلالەتکردن لەو خۆشەویستەیەی کە هەمە بۆ ئەو و بۆگەلەکەی و پلە سەربازیەکەم خستبوە ناو پاکەتێکی ڕەشەوە کە بەکوردی لە ژێریەوە نوسرابوو "بۆ سەرکردەی سەربازی مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ ڕێزدا" ،بارزانی زۆر بە خۆشحاڵیەوە وەریگرت و زۆر کاریگەر بوو.

پاش کۆتایی هاتنی پێشوازی لەوەفدە نوێیەکە لەگەڵ "تسوری" و "م" کەوتینە گفتوگۆ سەبارەت بەبارودۆخەکە و توێژینەوەی پێویستیەکانی کوردەکان یەکەم

شت کەخرایەڕوو مەسەلەی پێویستیە پزیشکیەکان بوو لەکوردستاندا ، تەنها سێ دکتۆر هەبون ، کەیەکێکیان نێردرابوو بەئەرکێکی سیاسی بۆ ئەوروپا.
لەسەر ئەوراپۆرتەی کە "زەئیفی" ئامادەیکردبوو بۆئیسرائیل لەمبارەیەوە بڕیاردرا کەخولێکی تایبەت بەپەرستاران بکرێتەوە لەلایەن ئیسرائیلەوە بۆکوردەکان ، ئەمە جگە لە خولبینین لەسەر چەکەپاڵپشتەکان و بەکارهێنانی ئامێری پەیوەندی و ڕاهێنان لەسەرچەك ، و پێشنیاری خولی تەکنیکی بۆ سەرکردەکان و خولی شارەزابوون لەتەقینەوەی پێشکەوتوو کرا.
کاتێك ئەو پێشنیارانە خرانەبەردەم سەرکردەکەی کورد ، هەموو هەوڵ و فشارەکانی خۆی چڕکردەوە لەسەر ئەو مەسەلەیەی کە هەمیشە خەریکی بوو، باری ئابوری جار دوای جار دوبارەی دەکردەوە، ئەو پێویستە نان و خۆراك بە پێشمەرگە بدات ، زۆر پێویستی بەپارە و خواردن و جلوبەرگ هەیە.
عمیت دەڵێت : (( کاتێك ویستمان گفتوگۆی لەگەڵدا بکەین سەبارەت بەبارودۆخی سەربازی ڕێکخستنی یاخیبونەکە و پێویستی تێسرەواندنی گورزێکی توندی تر لەعێراقیە شکاوەکان ، بارزانی زۆربەی کات باسی لەو بارە ئابوریە خراپە دەکرد کە تەحەمول ناکرێت و زۆر ڕاڕای کردووە کاتێك باسی ئەوەمان بۆ دەکرد کە ئێمە گەلێکی بچوکین و ڕێگرمان زۆرە ئەو پێدەچو گوێمان لێ نەگرێ و تێنەگات ، هەر سور بوو لەسەر ئەوەی "ئێوە دەتوانن هەمووشتێك بکەن ، وە هاوکاریمان پێشکەش بکەن" "خەریك بوو هەستم بە دڵەڕاوکی و دڵتوندی دەکرد بەو باوەڕە بەهێزەی بارزانی بە ئێمە هەیەتی ، وە باوەڕی وایە دەتوانین هەمو شتێك بکەین، گومان لەوەدانیە ئەگەر بارزانی سروشتی ئەو ڕێگریانەی بزانیایە کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە ئەو بارودخە خراپەی تێیدا دەژین هەستی بەبێئومێدی دەکرد)).

((وامزانی خەریکین ئەو کێشەیە چارەسەر دەکەین بەڵام لەو چرکەساتەدا دەترسام کە بارزانی ئاستی سنورداری توانای ئابوری و ئەو خزمەتەی پێشکەش بەئەو دەکرێت لە توانامانداییە هەست پێ دەکات)).

"زەئیفی" دەڵێت: ((لە بارزانیمان پرسی ئایا ئەوە زیانی لێ نادات کە عێراقیەکان بەپەیوەندی ئێمە و ئەو بزانن، وتی ئەو ئامادەیە نەك تەنها پەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل هەبێت ، بگرە فڕۆکە و تانکی ئیسرائیلی بهێنێت کەلێرە لەگەڵ عێراقیەکان بجەنگێت)).

ڕێنماییە ئێرانیەکان بریتی بوو لەوەی کە بەرلەوەی خۆر هەڵبێت دەبێت شاندی ئیسرائیلیەکە کوردستان جێ بهێڵێت ، سەعات ٣ی بەیانی ڕۆژی دواتر شاندەکە کوردستانی جێ هێشت و گەڕایەوە ئێران .

((دەبو زۆرخێرا دەربچین چونکە عێراقیەکان بەڕۆژ هەرچی بجوڵایەتەوە بۆمبارانیان دەکرد، دەبووکوردەکانیش بگەڕینەوە بۆ چیاکان ، گەیشتنیش بەچیا پێویستی بەدوو کاتژمێر ڕۆشتنی جددی هەیە)).

((کاتێك گەیشتینە سنور بەخێرایی خواحافیزیمان لەیەکتری کرد کە ئەوەندە بەس بۆئەوەی هەرچی ئەمانەوێت بە یەکتری بڵێین ، جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ ئێران)).

## بەشی سیانزەیەم / بۆی هەیە سەربەخۆیی کورد ڕابگەیەنرێت

"م" لەگەڵ "عمیت" دا گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل لەبەرئەوەی کارەکەی لەوێ کۆتایی هات ، "تسوری ساجی"یش خەریك بوو کوردستانی بەجێدەهێشت بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی لە کۆلیژی "سەرکردایەتی و ئەرکان" لەئەمریکا ، بۆیە دو کەسی تر دیاریکران بۆجێگرتنەومیان ئەوانیش : "حایم لفکۆف" و "ئەلیشع ڕۆنی" بوون ئەمە جگە لەموقەدەم "ئارییە یەجف" داوا لەو سیانە کرا کەخۆیان ئامادەبکەن بۆسەفەر لە حوزەیرانی ١٩٦٦ دا .

پێیان ووترا کە بارودۆخەکە بەئاراستەیەکی زۆرترسناك دا دەڕوات ، وە ڕاپۆرتەکانی "تسۆری" واپیشان دەدەن کە بارزانی بەنیازبێت سەربەخۆیی کوردستان ڕابگەیەنێت لەژێرسایەی ئیسرائیل دا ، دەبێ زوو بڕۆن و بزانن چی لەپشت ئەمەوەیە.

هەرسێکیان بەفڕۆکەیەك ڕۆشتن کەڕێگای خۆی بڕی بەرەو "قوبرس" و "تورکیا" و پاشان بۆ تاران، لەکاتی دابەزینیان دا لەوێ چاویان کەوت بەپاشکۆی سەربازی ئیسرائیل "ئەمرودی" لەگەڵ "کرۆن" و "مۆتازد" لێپرسراو لە پرۆسەکانی ساواك.

پاش دوو ڕۆژ گەیشتنە "حاجی ئۆمەران" ، داوایان لە تسۆری کرد کە سەبارەت بەمەسەلەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بۆیان بدوێ.

تسۆری دەڵێت: ((لەوکاتەدا کەکوردەکان ئامادەکاری پێویستیان دەکرد بۆ هێرشکردنەسەر "کۆڕەك" لەپشت پەردەکانەوە پەیوەندی هەبوو لەنێوان عێراق و کوردەکان لەزەمینەی ئەو دۆڕانە گەورەیەی کەسوپای عێراق توشی بووبوو لە"هەندرێن".

((بارزانی پێ وتین کەچەند سەیارەیەکی جێب بەڕێوەن بۆناوچەکە و ئاڵای سپیان هەڵکردوە چەند ئەفسەرێکی سوپای عێراقی لەخۆگرتوە ، داوای گفتوگۆیان لەگەڵ ئەودا کردوە ، ئەفسەرەکان وتویانە کە ڕێگەپێدراون

کەدانوستانی لەگەڵدا بکەن ، بەجۆرێك کە لەکۆتایدا ببێتەهۆی پاراستنی مافەکانی کورد بەوجۆرەی کەخۆیان داوای دەکەن )).

((بارزانی پێ دەچوو زۆر بەوەکاریگەر بووبێت ، داوای ڕاوێژی لەمن دەکرد ، منیش پێم وت ئەوانە ئەگەر دوای تێکشکاندنی لیوایەك داوای دانوستان دەکەن ، بەدڵنیاییەوە کاتێك باقی هێزەکانیان خاپووردەکەین بەشێوەیەکی زۆر جیاوازتر دەدوێن، بەڵام بارزانی بڕیاریدا کە چاوەڕێی تێکشکاندنی باقی هێزەکان نەکات ، بەڵکو هەل وەرگرێ لەوبارودۆخەی کە شەڕەکانی ئەم دواییە خولقاندویەتی و دانوستان بکات لەگەڵ عێراقیەکان.

بارزانی لە تۆڵەسەندنەوەی عێراقیەکان زۆر دەترسا ، هەستەکانی پێیان دەگوت کەئەوان هەر زوو تۆڵە دەکەنەوە ، بە هۆی ئەو قوربانیەزۆرەی کە لەجەنگەکانی ئەم دواییەدا دایان ، بە"تسۆری" دەوت : ((هیچ ڕۆژێك لەڕۆژەکان خەونم بەوەوە نەدیوە کەئەفسەری عێراقی بۆلای من بێن و ئاڵای سپیان بەدەستەوە بێت ، داوای دانوستان بکەن و ئامادە بن وەڵامی داخوازیەکانم بدەنەوە ، من نازانم دواتر چی ڕودەدات بەڵام سود لەئەم هەلە وەردەگرم)).

تسۆری دەڵێت: ((بارزانی پرسیاری لێکردم سەبارەت بەڕای من دەربارەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان؟

وەڵامم دایەوە : ناتوانم دەستبەجێ ئێستا وەڵامت بدەمەوە، دەبێت ئەو پرسیارە بەرزبکەمەوە بۆلێپرسراوان لەئیسرائیل ، بەم شێوەیە ئەو مەسەلەیە لەدایك بوو کە وایکرد بەپەلە وەفدە ئیسرائیلیە نوێیەکە بنێردرێت)).

((لێپرسراوانی مۆساد و سوپا پێیان وابوو کەمن لەپشت بیرۆکەی سەربەخۆییەوەم ، من وامکردوە بارزانی بیری لێ بکاتەوە، دەربارەی من وتبویان ئەو پیاوە شێت بووە؟)).

پاش دوو ڕۆژ "تسۆری" کارەکانی تەسلیمی "لفکۆف" و "ڕونی" کرد، بارزانی سووربوو لەسەرئەوەی کە تاسنوری ئێران هاوڕێیەتی بکات ، وە لەگەڵ گەیشتنی

بەئیسرائیل سەرۆکی ئەرکان "ئیسحاق ڕابین" لەگەڵی کۆبوەوە وێنەی ڕوداوەکانی بۆ"ئاشکۆڵ" گواستەوە ئەمەش بووە هۆی بەردەوامی پێشکەشکردنی هاوکاری بەکوردستان.
"ئاریە یگف" کەشوینی "تسۆری" گرتەوە ئەفسەرێکی پلەبەرز بوو لەهێزی پەڕەشوتەوانی و یەکێ بوو لەوکەسانەی کە لەهەموو ئەو جەنگانەدا بەشداری کردبوو کە هێزەکەی ئەنجامی داوە لە نێوانیاندا پرۆسەی دابەزین لە ڕێڕەوەکانی "المتلا" لەجەنگی ١٩٥٦ و پێش هاتنی بۆ کوردستان وەك جێگری "لیوا" کاری دەکرد.
بەڵام "ئەلیشع رونی"ی لە"یگف" گەورەتربوو ژیانی سەربازی خۆی لەڕیزەکانی سوپای بەریتانیا دەست پێکردبوو ، لەجەنگی دوەمی جیهانیدا ، پاشان پەیوەندی کردبوو بە "یەکەی تێکدەران" لەڕێکخراوی "بلماح" ی ئیسرائیلی، پاشان وەك سەرکردەی یەکەکانی "کۆماندۆی دەریایی ئیسرائیل" کاری کردوە ، پاشان بۆماوەی دوو مانگ لەچوارچێوەی یەکەی هاریکاری و پەیوەندییە دەرەکیەکان لە"وەزارەتی بەرگری" کاری کردوە.
"لفکۆف" سەرۆکی دەستەکە لەتەمەنی چواردەساڵیدا پەیوەندی کردوە بەڕێکخراوی "هاگانا"وە پاشان لەیەکەی شەوانەدا بەشداری کردوە کە ئەفسەری بەریتانی "چارلز ئۆرۆوینگیت" ئامادەی کردبوو، کە بەیەکێ لەگەروە داڕێژەرانی تیۆری جەنگی سەربازی ئیسرائیلی دادەنرێت، وە بەیەکێ لەو بە عەرەبکراوە سەرەتاییانە دادەنرێت کە لە ساڵی ١٩٤٤ لەکوردستان کاریان کردوە ، هەروەها لەدەزگای ئاسایش لە "جەلیلی خواروو" ، لە جەنگی ١٩٤٨دا لە لیوای "جۆلان"دا کاری کردوە ، یەکەم کەسیش بوە کەکاری کردوە بۆ دروست کردنی یەکەی کەمینەکان لەسوپای ئیسرائیل دا.
لە ساڵی ١٩٦٥ کاتێك وەك ئەفسەر لەهێڵی "عسقەلان –ئیلات"ی بۆریە نەوتەکان کاری دەکرد، لیوا "هرۆبن" لێی پرسیوە کە ئایا حەز دەکات بەشداری

لەسەرکێشیەکدا بکات؟ کاتێك بە "بەڵێ" وەڵامی داوەتەوە ، هرۆبن ئاگاداری کردۆتەوە بەبونی شاندی ئیسرائیل لەکوردستان و پێیوتوە یەکێ لە کوردەکان بەمزوانە دێت بۆ ئیسرائیل ، داوای لێ کردوە کە هاوڕێیەتی بکات و پێی وتوە: (( ئەو پیاوە دێت تا ڕازیمان بکات بەدانانی وێستگەیەکی پەخشی نهێنی لەناوچەکەدا ، ئەمەوێ پێت بڵێم کەوێستگەیەك لە ناوچەکەدا هەیە، بەڵام ئەو کابرایە بەوە نازانێت ، ناشبێت پێی بزانێت دەبێت یارمەتی بدەیت لەهەوڵەکانیدا)).

هرۆبن باوەڕی وابوو کە "لفکۆف" بەئاسانی زمانێکی هاوبەش لەگەڵ کوردەکە دروست دەکات، چونکە زمانی "عەرەبی" بە لەهجەی عێراقی دەزانی.

لفکۆف کابرا کوردەکەی پێشوازی کرد لەفرۆکەخانە لەژێر ناوی "ئەبو یوسف" لەڕێگادا پێی وت: کە(٢٠٠٠) هەزار ئیسرائیلی خەریکن کەویستگەی ناوبراو دروست دەکەن، پاشان لەسەر داوای کوڕەکە دیدارێکی لەگەڵ یەکێ لەبەرپرسە ئیسرائیلیە باڵاکان بۆسازکرد.

لفکۆف دەڵێت: ((بەرپرسە ئیسرائیلیەکە عەرەبی نەدەزانی ، بۆیە پێم وت تۆ بەس ئەوەندەت لەسەرە قسە بکەیت و من ئەوەی پێویستە بوترێ پێی دەڵێم)).

((ئەو بەرپرسە ئیسرائیلیەش کە دیداری کوردەکەی کرد بریت بوو لە "ئەفرایم هلیڤی" کەدواتر کرا بە"جێگری سەرۆکی مۆساد".

لفکۆف لەپاش گەشتنی بەکوردستان ڕاسپێردرا بۆ گەڕان بە دوای یەکێ لەهاوڕێکانی بارزانی لەحوزەیرانی ١٩٦٦ ئەویش ناوی "داود خواجە خنۆ" بوو کەکۆچی کردبوو بۆ ئیسرائیل پاشان شوێنەواری نەمابوو ، جێی بیرخستنەوەیە بارزانی گرنگیەکی زۆری ب هاوڕێ ناوبراوەکەی دابوو ، لەیەکەم شاندی ئیسرائیلیەوە کەچووبوو بۆکوردستان ، بەڵام پێداچونەوەی تۆمارەکانی دانیشتوان لەئیسرائیل هیچ زانیاریەکی تێدانەبوو سەبارەت بەو ، بۆیە هیچ نەمایەوە ئەوە نەبێت پرسیار لە لایەنە ئاگادارەکانی کۆچی جولەکەکانی

کوردستان بکرێت ، زوو جولەکە ناوبراوەکە دۆزرایەوە لەژێر ناوی "دەیڤید جبای".

"لفکۆف" چوو بۆ"تەبەریا" کە "جبای" لەوێ لە دوکانێکی فرۆشتنی سەوزەدا کاری دەکرد، ڕون بووەوە کە باوکی ئەم پیاوە و خێزانەکەی زۆردەوڵەمەند بوون و لەناوچەی کوردستان ژیاون ، لەگوندێکی نزیك لە "بارزان" ، هاوڕێیەتیەکی قوڵ دروست بووە لەنێوان باوکی بارزانی و باوکی "دەیڤید"دا ، کەئەم هاوڕێیەتیە منداڵەکانیشی گرتۆتەوە ، پاشان خێزانی "جبای" لەساڵی ۱۹۵۱ ڕوویان کردۆتە ئیسرائیل بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لەگەڵ خۆیان ببەن ، لەئیسرائیل لەسەرکاری ڕۆژانە ژیاون.

"لفکۆف" چەند وێنەیەکی ئەو و"دەڤید جبای" گرتبوو کە باوەشیان بەیەکداکردوە لەگەڵ خۆیدا هێنانی بۆکوردستان تا بارزانی بیان بینێت.

کاتێك ئەندامانی وەفدەکە گەیشتنە "حاجی ئۆمەران" لە ڕێکەوتی ۲۵ی حوزەیرانی ۱۹٦٦ بارزانی زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردن ، "لفکۆف" هەریەك لە "ڕیگف" و "ڕوئی" بەزمانی عەرەبی پێ ناساندن ، پاشان وتی چەکێکمان بەدیاری بۆ هێناویت لەهاوڕێکەت "دیڤید خواجە خنۆ" و پاشان ڕەسمەکانی پێ دا ، کاتێك بارزانی بینی ، ناوچاوانی دا بەیەکا وتی: پێدەچێت بارودۆخێکی خراپ بژی ، ئەوجلانەی لەبەری دایە مانای وایە بارودۆخی دارایی خراپە.

ئەو پیاوە لەدەوڵەمەندترین دەوڵەمەندەکانی کوردستان بوو، کەس نەبوو لێرە پارەی لەو زیاتر بێت، بەڵام وێنەکان بوونە هۆی ئەوەی کە پەیوەندی نێوان شاندەکەو بارزانی پتەو ببێت.

لە۲۱ ی حوزەیرانی ۱۹٦٦ واتە لەسەرووبەندی گەیشتنی "لفکۆف" و هاوڕیکانی بۆ کوردستان ، ڕۆژنامەی "الاخبار" ی عێراقی بلاّویکردەوە کە حکومەت کۆتایی بەجەنگ هێناوە، و دەیەوێت کە گفتوگۆ لەگەڵ کورددا بکات ، و لە ۲٦ی هەمان مانگدا هەمان گۆڤار هەواڵێکی تری بلاّوکردۆتەو کەحکومەت لێبوردن

ڕادەگەیەنێت لەو ئۆپۆزسیۆنە کوردانەی کەحوکمی بەندکردنیان بۆدەرچووە ، لەپێنج ساڵی ڕابردوودا و وەفدی عێراقی بەڕێومیە بۆکوردستان تا دانوستان لەگەڵ کوردەکان ئەنجام بدات.

بارزانی دەترسا کە دانوستانەکان تەواو ببن بەبێ ئەوەی هیچ بەرامبەرێکی سیاسی دەستەبەربکات ، ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان پێشنیاریان بۆکرد کەدەست بەدانووستان نەکات هەتا عێراقیەکان جەستەی کوژراوەکانیان لەمەیدانەکانی جەنگدا نەکشێنن ەوە، ئەمە بەکردار ڕوی دا، پاش ماوەیەکی کەم عێراقیەکان جەستەی ١٩٦٦ سەربازیان لە "بفستیان" ی نزیك "دیانا"دا شاردەوە.

لە ٢٩ی حوزەیراندا سەرۆکی حکومەتی عێراقی "البزاز" پێشنیارێکی بۆ کوردەکان نارد کە"١٢" بەندی لەخۆگرتبو ئاشکرا دیاربوو کەئەم پێشنیارەی عێراقی تەواو جیاوازە لە سیاسەتەکانی پیشووی حکومەتی عێراقی تا ئەوکاتە پەیرەو کراوە، پێشنیاری کردوە بۆ کوردەکان: ((دانانن بەنەتەوەی کورددا ، پێدانی ئۆتۆنۆمی بنکەفراوان ، جێبەجێکردنی یاسای لیوای کوردیەکان ، فێرکردن بەزمانی کوردی وەك زمانی دوەم لەناوچە کورد نشینەکان دا ، نوێنەرایەتی ڕێژەیی کورد لە حکومەت و پەرلەمان و دام ودەزگاکاندا ، پێدانی ئازادی ڕێکخراوەیی سیاسی ، لێبوردن لەهەموو یاخیبوان ، هەل پێدان بەدەرکردنی ڕۆژنامە ، گەشەپێدانی ناوچە کوردنشینەکان ، و چەکداماڵینی هێزە کوردیەکان)).

"البزاز" نامەکەی خۆی لەسەر ئەو یاداشتەی بارزانی دارشتبوو کە پێشتر ناردبووی بۆ حکومەت لە٢١ی حوزەیران دا.

بارزانی "حبیب محمد کریم"ی قوتابی پێشوی "البزاز"ی لە کۆلێژی مافەکانی زانکۆی بەغداد نارد بۆ بەغداد بۆ ئەنجامدانی دانوستان ، بەناوی کوردەوە سەرەڕای مەترسی بارزانی لەوەی کە ئەو دووکەسە یەکدی دەناسن ، وە ئەو ڕێزە زۆرەی کە "کریم" لە"البزاز"ی دەگرێت.

مەترسی بارزانی زیادی کرد بەهۆی ئەو لێدوانە ئاسانکاریانەی کە "کریم" بۆ ڕادیۆی عێراقی دانی، بەڵام ئەوەی بە ئارەزووی "کریم" بۆ هێوکردنەوەی بارودۆخەکە و ڕێپیدان بۆ کوردەکان بەوەی کەرایەکیان هەبێت بەبێ ئەوەی هیچ فشارێکی لەسەربێت.

شاندی کورد کارتێکی کاریان پێشکەش کرد لەبەرامبەر ئەو نامەیەی "البزاز" کەکۆمەڵێك داخوازی لەخۆگرتبو لەوانە : لێبوردنی گشتگیر لەسەربنەمای لیستێك کە پێشتر لەسەری ڕێك کەوتون، جێبەجێکردنی یاسای لیوا بۆ کوردەکان ، دامەزراندنی کوردەکان لەپۆستی باڵا لەحکومەت و سوپادا، گێڕانەوەی ئاوارە کوردەکان بۆ خاکەکەیان ، هەڵوەشاندنەوەی یەکەکانی تاڵەبانی و جاشەکان ، گێرانەوەی سوپای عێراق لە کوردستانەوە بۆبنکەکانی خۆی، کوردەکان ئامادەیی خۆیان پیشاندا بە ناونوسکردنیان لەریزی سوپای عێراقی و پۆلیس و گێرانەوەی هەموو ئەوچەکە قورسانەی کە لەسوپای عێراقیان سەندووە لەشەڕەکاندا.

بارزانی بەتەواوی هەموو بیرۆکەیەکی بۆ چەککردنی سوپاکەی ڕەتکردەوە ، گومان لەوەدا نیە کەئەوپێشنیارەی عێراقیەکان هیچ شتێکی لەبیرکردنەوەی بارزانی بەرامبەر عێراقیەکان نەگۆڕی ، دەیگوت ئەگەر بەهێزبن ئەوا گورزی زۆر بەهێزمان لێ دەدەن، باوەڕ ناکەم هیچ پارەیەکمان لەوانەوە دەست بکەوێت ، تەنانەت لەتە نانێکیش.

((کێ گرەنتی ئەوەم بۆدەکات کە ئەوەی ئەمرۆ لەگەڵیدا ڕێك دەکەوم بەیانی لەسەردەسەڵات دەمێنێتەوە؟؟ ئەگەر بەجدی بیربکەنەوە لە جێبەجێکردنی ڕێکەوتنەکە ئەوا توانای جێبەجێ کردنیان نی یە)).

سەرەڕای ئەوە بارزانی هیچ هەڵیکی لە دەست نەدەدا، تا سودی لێ وەرگرێت بۆ بەرژەوەندی دانوستانەکان.

لەبۆنەیەکدا یەکێ لەڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان لەبارزانی پرسی بوو چی وادەکات عێراقیەکان بجولێن و دەستی دانوستان بۆ کوردەکان درێژ بکەن؟ ئەوە ڕای بارزانی بوو سەبارەت بە حکومەت عێراق و ئەو دانوستانانەی لەگەڵ دەکرێن.

*******************

دانوستانی عێراقی – کوردی ئێرانیەکانی تەواو تورەکرد لە بارزانی ، بەپەلە نوێنەری ساواك لەکوردستان "کە بۆ ماوەی دە ساڵ لەوێ مایەوە" ڕای حکومەتی وڵاتەکەی ڕون کردەوەو وتی: ((لە پاش ڕێککەوتنی کوردەکان و عێراقیەکان هیچ بەهانەیەك بۆمانەوەی هەردو شاندی ئێرانی و ئیسرائیلی لێرەدا نەماوە ، چونکە نازانن چی بکەن)).

بارزانی تەواو تورە بوو لەخۆتێهەڵقورتاندنی حکومەتی ئێران و بەئیسرائیلیەکانی وت: ((بۆچی ئێرانیەکان لەوەناگەن کە هۆکاری سەرەکی ئەم دانوستانەی ئێمە بارودۆخی لاوازی ئابوریمانە ، ئەگەر ئەوان هاوکارییەکی گەورەتریان پێشکەش بکردینایە ، و متمانەمان بەهاوکاری ئەوان هەبوایە بەردەوام دەبوین لەجەنگ ، ئەو هاوکاریانەی ئەوان بەئێمەی دەدەن نە وادەکات بژین ، نە وادەکات بمرین)).

بارزانی داخوازی دوو شاندەکەی ڕەتکردەوە و بەئیسرائیلیەکانی وت : ((ڕێگە بەدەرچونی ئێوە نادەم ئێوە دواهەمین چەکی ڕاستەقینەن بەدەست منەوە)).

((ئێرانیەکان دەخوازن کوردەکان و عێراقیەکان یەکتر بکوژن ، بەڵام ئێوە دەخوازن کە لەکاتی ئەوەی انشاالله عێراقیەکان لەناودەچن ئێمە یەك بگرین)).

"لفکۆف" و "ڕونی" دەستیان کرد بەکار لەو بوارەی بۆیان دیاریکرابوو ، بەڵام "ڕیگف" هەستی بەبێزارییەکی زۆر دەکرد "لفکۆف" دەڵێت : ڕیگف لەهەموو بوارەکاندا دەرکەوتووە پیاوێکی قۆز بوو و باڵابەرز بوو ، وەرزشەوانێکی زۆرباش و یاریزانێکی کارامەبوو، و ئەفسەریکی باڵا بوو لەسوپای ئیسرائیل دا بەڵام پێوەرەکانی سوپای کورد لەگەڵیدا نەدەگونجاو بەهۆی بچوکیەکەیەوە ،

جگەلەوەی کە شەڕگە لەو کاتەدا زۆر هێمن بوو ، بۆیە کاتێ کە"العقراوی"دی کە ئەفسەرێکی ڕاکردوی سوپای عێراقی بوو و پێشتر باسمان کرد ، پەیوەندی باشی لەگەڵ ئیسرائیل ،ەبوو ، هەستی بە خۆشیەکی زۆر کرد.

"لفکۆف" دەڵێت : (( ڕیگف خۆشحاڵ بوو بەناسینی عەقراوی کەئینگلیزی دەزانی بۆیە ڕیگف پێویستی بەکەس نەبوو کە وەرگێڕی بۆ بکات ، "عقراوی" بە"ڕیگف"ی وتبوو : چەند خولێکی تۆپهاوێژی لە"بەریتانیا"و "یەکیتی سۆفیەت" تەواوکردووە ، و دەربارەی "تولکەرەم" پرسیاری لێکروە پێی وتبوو بەشداری ئەوهێزە ڕزگارکەرەی عێراقی کردووە کە نێردراوە بۆ "فەلەستین" لەجەنگی ١٩٤٨دا ، یەکێ لە ئەنامانی شاندەکە دەڵێت : لەمیانەی گفتوگۆکانماندا لەگەڵ بارزانی کەسێکی ئایندار دەردەکەوت بەڵام قورئان و کەسایەتیەکانی تەوراتی تێکەڵ دەکرد ، زۆر باسی ڕابردوی خۆی دەکرد ، دەیویست ئەو ئینتیباعە دروست بکات ، کە پیاوەکە گەیشتۆتە ئەوقۆناغەی کە باسی ڕابردووی تێدا دەکەن ، زیاتر لەوەی کەباسی داهاتوو بکەن.

لە١٥ی تەمموزی ١٩٦٦ فەرماندەی فیرقەی یەك گەیشتە "حاجی ئۆمەران" داوای کۆبونەوەی لەگەڵ بارزانی کرد پێی وتبوو : ((سەرۆك "عارف" دەخوازێت لەگەڵتاندا کۆببێتەوە ، بارزانی وتی ناچارم دەکەی داواکەت ڕەتبکەمەوە سەرۆك عارف خۆی لەبەغداد هەست بەهێمنی ناکات ، ئیترچۆن میوانەکانی دەپارێزێت ، تەنانەت ئەگەر پێم بڵێت ڕازیت بەوەی کە گرەنتی ژیانی خۆتەوە ژیانی من بکەیت و بڵێت من وەك بارمتە لێرەدەمێنمەوە هەر ڕازی نابم ، دواهەمین داخوازی کە "عارف" لەبارزانی کرد ، لەڕێی سەرکردەی کەتیبەی یەکەمەوە ئەوەبوو کەبارزانی ناوچەی سەرکردایەتیەکەی چۆڵ بکات بچێتە ناوچەیەکی تر بۆنمونە بارزان واتە ئەو ناوچەیەی کە"شێخ ئەحمەد"ی برای بەڕێوەی دەبات ، بارزانی ئەم داخوازیەشی ڕەتکردەوە، نامەیەکی نارد بۆ "عارف" و نوسی بوی دووجار سەرکردایەتیم گواستەوە بۆ ناوچەی بارزان بەڵام شێخ ئەحمەدی برام

دەری کردم بەفشاری هێزەکانی عێراق ، کەواتە گواستنەوە بۆ ئەوێ بۆ جاری سێهەم هیچ مانایەکی نی یە.

بارزانی پێویستی بەزیرەکی نەبوو تا لەوە تێبگات کە حکومەتی عێراق دمیەوێت لەسەنتەری سەرکردایەتیەکەی دوری بخاتەوە ، بەمەش لاوازی بکات و ڕێکخستنە کوردیەکان بەیەکجاری تێك بدات ، هەرچەندە داخوازیەکەی سەرۆکی عێراقی ڕەتکردەوە ، بەڵام ئەم ڕەتکردنەوەیە نەبوەهۆی برینی پەیوەندی نێوانیان و بارزانی لەوماوەیەدا هەموو هەوڵێکی دەدا تا دژەکەی کەتاڵەبانی بوو لەوێنەکە بکاتە دەرەوە، وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا تاڵەبانی هاتبووەوە لە کوردستان دەژیا.

لە شوباتی ١٩٦٦ بارزانی بۆی دەرکەوت کەپەیوەندیەك هەیە لەنێوان تاڵەبانی پاشکۆی عێراقی لەتاران ئەمەش بە مەبەستی ئەوەی کەجەماوەری کورد لەدژی ئەو هانبدەن ، بارزانی هێزێکی چەکداری نارد بۆ دەستگیرکردنی تاڵەبانی بەڵام توانی ڕابکات بۆئێران و لەوێوە پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ "بەزاز"ی سەرۆکوەزیرانی عێراق، بەڵام ئەو شەڕانەی کە لەنیوان هەردولادا ڕویاندا بەهۆی ئەو جەنگەی کەبووە هۆی لەناوبردنی لیواکەی کەپێشتر چیرۆکەکەی باسکرا ، وایکردبوو بارزانی کەمتر ئاگای لەتاڵەبانی بێت، کە دەوترا عێراق پارەی بۆ چالاکیەکانی دابین کردوەو ، بڕی "سەد"هەزار دیناری لەعێراق وەرگرتوە.

لە ٩ی حوزەیراندا تاڵەبانی لەگەڵ سەرۆك "عارف" دا کۆبوەوە ، کە پەیمانی پێدا یاسایەکی نوێ دابڕێژێت کە پاریزگاری لەمافی کوردەکان بکات ، تاڵەبانی پێی وابوو کە سەرکەوتنەکانی بارزانی لەجەنگدا وای لێکردوە کە توند بێت لەهەڵوێستەکانیدا و هیچ دەستپێشخەریەکی ئاشتیانە قبوڵ نەکات ، بەڵام بارزانی بەشێوەیەکی تەواو پێچەوانە کاری کرد.

لە٢١ ی حوزەیراندا پلانێکی ئاشتەوایی تەواوی پێشکەش بە عێراقیەکان کرد ، لەپاش ئەوەی کە وای پیشانی عێراقیەکان دا کە ئەوتاکە لایەنە کەمافی

دانوستانیان لەگەڵیدا هەیە ، بارزانی دەیویست بە یەکجاری تاڵەبانی لە ناوبەرێت.

لە١٠ی تموزی ١٩٦٦ بارزانی قائید فرقەیەکی عێراقی بینی فەرماندەکە بەبارزانی وت : ((ئەرکی لەناوبردنی تاڵەبانی لێگەڕێ بۆمن)).

بارزانی پێی وتبوو ئەمە مەسەلەیەکی نێوخۆیی کوردییە ، وە هەر دەستێوەردانێکی عێراق لەم مەسەلەیەدا دەبێتەهۆی هەرەسهێنانی دانوستانەکان لەگەڵیدا ، بەڵام ئەفسەرە عێراقیەکە چەند جارێك هاتەوەو داخوازیەکەی دوبارە دەکردەوە تاوای کرد بارزانی بەشێوەیەکی سەرەتایی ڕازی بێت ، کاتێك ئەفسەرەکە گەڕایەوە فیرقەکەی خۆی فەرمانی دا بە هەموو هێزیك کار لەدژی تاڵەبانی بکرێت ، بەکردار یەکە عێراقیەکان هێرشیان کردە سەرتاڵەبانی لەهەمان شەودا سەرکردەی ناوچەی قەرەداخی کوردی ڕایگەیاند و سەرکەوتوو بووە لەڕاوکردنی خیانەتکاراندا.

لەناوبردنی هێزەکانی تری تاڵەبانی بەدەستی هێزە عێراقیەکان دەبێت ، بارزانی هەرکەسێك لەگەڵ ئەودا نەبوایە نازناوی خیانەتکاری لێدەنا ، هێزیکی تایبەتی پێشمەرگە هەبوو ، کاری بۆ لەناوبردنیان دەکرد.

بارزانی دەیگوت : هەرگیز لێپرسراوێتی خۆی لەلەناوبردنی هیچ کەسێك نەشاردۆتەوە ، چونکە ئەوانە لەدژی کورد کاریان کردوە.

ئێرانیەکان زۆر بەگرنگیەوە چاودێری دانوستانەکانی نێوان بارزانی و عێراقیەکانیان دەکرد ، داوایان لەبارزانی کردبوو کە درێژە بەجەنگەکەی بدات لەدژی عێراق ، یان بەلایەنی کەمەوە دەربارەی ئەوەی کە لەدانوستانەکاندا باسدەکرێت ، ڕاویژیان پێ بکات تا ئەو هەنگاوانە دیاری بکەن کە دەبێ بنرێت ، وە لەهەوڵداندا بۆ ناچارکردنی بارزانی تا بە پێی ئارەزوی ئەوان بجوڵێتەوە ، ئێران بەئیسرائیلی وت : کە سنورەکەی لەگەڵ کوردستاندا دادەخات وەفدە

ئیسرائیلیەکەش دەگەڕێنێتەوە و ئەو بریندارە کوردانەی لەنەخۆشخانەکانی ئێراندا تیمار دەکران ، دەگەڕێنێتەوە بۆ کوردستان.
ئیسرائیل داوای لە لفکۆف کرد کاربکات بۆ ڕێکەوتن لەنێوان بارزانی و ئێرانیەکاندا ، کاربکات لەسەر ئەوەی کەبارزانی نامەیەکی دۆستانە بنێرێت بۆ "ناسیری" سەرۆکی ساواك ، و لفکۆف پێشنیاری کرد ، کە "کەریم" بنێردرێت تا بارودۆخەکە بۆ "ناسیری" شیبکاتەوە، بەڵام بارزانی ڕەتی کردەوە کە هیچ نامەیەك بۆ ئێرانیەکان بنێریت و وتی: ((ئێرانیەکان وێنەی نامەکە دەگرن و دەینێرن بۆعێراقیەکان ، ئەمەش وادەکات حکومەتی عێراقی هیچ ڕێکەوتنێك جێبەجێ نەکات، جگەلەوەی کە ئەسڵەن گومانی لەمانەوەی هەیە.
بۆیە دەیەوێت شەڕ لەنێوان عێراقی و کوردەکان بەردەوام بێت لەڕوی دەرونی و کرداریەوە ، بەڵام تا دڵنیا دەبێتەوە لەوەی کەشەڕکەرەکانی پشوویان داوەو ڕیزەکانیان ڕێکخستۆتەوە لەمیانەی دانوستانەکاندا.
بەزاز داوای کردبوو کە بارزانی دەستپێشخەرییەکی نیەتباشی بکات بۆ ئەو، چونکە کەوتۆتە ژێرفشاری نێوخۆیی و وە نایەوێت وەك سەرۆکێك دەربکەوێت کەهەمو شتێکی داوە بە کوردەکان بەبێ ئەوەی هیچ وەربگرێت ، بۆیە بارزانی دەیەها سەربازی سوپای عێراقی ئازاد کرد و ئەو چەکە قورسانەی کە لە جەنگەکاندا لەسوپای عێراقی سەندبوو و بەکاری نەهێنابون گێڕانیەوە.
ئیسرائیلیەکان پێیان خۆش نەبوو بارزانی چەکە قورسەکان بگێڕیتەوە ، تەنانەت ئەگەر بە کاریش نەهاتبن ، بۆ بارزانیان ڕوونکردەوە کەلەوانەیە عێراقیەکان ئەمەبکەن بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی ئەو سەرکەوتنەی کە لە"هەندرێن" بەدەستی هێناوە ، بەڵام بارزانی ووتی کە ئەو نرخەی لەو ڕێگەیەوە ئومێد دەکەم دەستم بکەوێت شایانی ئەوەیە سەرکێشی بۆ بکەم.
لەهەمان کاتدا بارزانی لە ئامادەکارییە سەربازییەکانی خۆی بەردەوام بوو ، وەك خۆئامادەکردنێك بۆ ئەگەری دریژەکێشانی جەنگ ڕایگەیاند بۆئەوەی هیچ

گومانێك نەهێڵێتەوە كە بەهیچ جۆرێك بەهەڵوەشاندنەوەی پێشمەرگە ڕازی نابێت بەڵام ڕازییە بەوەی كە لەخراپترین باردا بگۆڕین بۆ میلیشیای تایبەت یان پۆلیسی نێوچەیی وە ئەو بكرێت بە قائیمقام واتەسەرۆكی لیوای كوردەكان.
ئێرانیەكان لەفشارەكانیان بەردەوام بوون كەوایكرد لەكۆتایدا بارزانی بەسەر ترسدا زاڵ بێت و نامەیەك بنێرێت بۆ "شا" هەرزوو ڕوون بوەوە ، كەئێرانیەكان بەوە ڕازی نابن ، سنوریان داخست و ڕێگریان كرد لە هاتنەناوەوەی هەمووشتێك تەنانەت خۆراكیش بۆكوردستان ، هەروەها هاتنەناوەوەی چەك كە ئەمەش بووەهۆی زیادبونی ئاگری توڕەیی بارزان و كوردەكان.
میرخان وتبوی ئەگەر سود لەتواناكانمان وەرنەگرن لەبنیاتنان و داهێنان دا ئەوە توانای ئەوەشمان هەیە كە هەمووشتێك تێكبدەین و ژیانی عێراقیەكان بۆسالآنێكی دریژ ڕەش بكەین، بەهێزێكەوە كە خۆی لە پێنج بۆ حەوت هەزار جەنكاوەر دەدا ، ڕودەكەینە چیاكان ، هیچ شتێكمان نی یە تا لەدەستی بدەین.
ئیسرائیلیەكان هەوڵیان دا تا ئەوە بۆ "ئیدریس بارزانی" و هاوڕێكانی ڕوون بكەنەوە كەشەڕی خۆكوژی باش نیە ، وە حیكمەت و لۆژیك لەگەڵ ئەوەدایە كەبگەنە ڕێكەوتن لەگەڵ عێراقیەكان ، ئەمە لەكاتێكدا كە ئیسرائیلیەكان گومانیان لەوە هەبوو كەهەنگاوەكەی ئێران "داخستنی سنورەكە" لە چوارچێوەی ڕیكەوتنێكی نیوان عێراق و ئێراندا بێت ، بۆ گواستنەوە ناكۆكیەكان لە كوردستان بۆ قۆناغێكی نوێ.
حكومەتی ئیسرائیل لە٢٢ی نیسانی ١٩٤٦ كێشەی كوردی تاوتوێ كرد بەبەشداری جێگری وەزیری بەرگری "دكتۆر زەفی دینشتاین" و سەرۆكی ئەركان "ئیسحاق رابین" و سەرۆكی مۆساد "عمیت" و بەرپرسی پەیوەندیە دەرەكیەكان لە مۆساد "ئۆلف هرۆبن"و بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی بەرگری عقیدی یەدەگ "موشێ كۆشیت" و سەرۆك پۆلی ئەركان لیوا "وایزمان" و .....هتد.

عميت لەڕاپۆرتەکەیدا وتبوی: ((بارودۆخ باش نیە قەیرانێك هەیە لەنیوان ئێرانی و کوردەکاندا ئێمە پێشبینی ڕوداوی ئەوەمان کردبوو ، ئێرانیەکان لەکاتی سەردانەکانم دا بۆ تاران پێیان ووتوم : وا دەکەن بارزانی لەسەر دەستوپێ بێت بۆ لامان و لێمان بپاڕێتەوە ، پاشان پرۆسەی داخستنی سنورەکانی ئێرانی خستەڕوو و ئاماژەی بەوەکرد کە ئێرانیەکان ئاماژەیان داوە بەکشاندنەوەی شاندە ئیسرائیلیەکە لە کوردستان.

بە پیشنیاری عمیت ، حکومەت ئاماژەکەی ئێرانیەکانی پشت گوێ خست ، لەسەر ئەو بۆچونەی کە هاوکاری ئیسرائیل بۆ کوردەکان لەخزمەتی ئێرانیەکانیشدایە ، "عمیت" پێشنیاری کرد کە کاروانەکانی خۆراك و تەقەمەنی و چەك بۆ کوردەکان بەردەوام بێت.

عمیت دەڵێت : ((لە یەکێ لەسەردانەکانیدا بۆ ئیسرائیل "کمال"ی سەرۆکی هەواڵگری ئێران جەختی لەوەکردەوە کە ئێرانیەکان هاریکاری کوردەکان دەکات تا بجەنگن نەك ئاشتی بکەن، ڕێکەوتوین لەگەڵ کوردەکان لەسەرخاڵێك کە ناکرێت دانوستانی لەسەربکرێت ئەویش ناڕازیبونی عێراقیەکانە بە پێکهێنانی سوپایەکی کوردی ، چونکە بارزانی ناتوانێت سازش لەسەربوونی سوپا بکات، ئێرانیش هاریکاری کوردەکان دەکات لەبواری کەلوپەل و پەیوەندی خۆراك و چارەسەر و بریندااران ویارمەتی دراویی "پارە".

"ڕابین" پشتگیری ئەو هەڵوێستەی "عمیت" ی کرد کە وتی قەیرانەکە کاتی پێویستە و ئارامبگرین و سەرەنج بدەین وە ڕێگایەکی تر بۆ ڕۆیشتنی کارەکان بدۆزینەوە .

ئەم گفتوگۆیە لەنیوان "ڕابین" و "ئاشکۆڵ" و "عمیت" ڕویدا :

ڕابین : کێشەی ئێمە نیە بارزانی ملکەچ بێت .

عمیت : بەڵام کێشەکە هەیە ئێمە پابەندین بەگەڕان لەڕێگای دیکە ، بۆ زیادکردنی هاوکاریەکان.

ئاشکۆڵ : هەرکاتێك باسی داهاتوو دەکەن هەست دەکەم کارەکە ئاسانتر دەبێت.
عمیت : پێم وانیە ئێستا کاتێکی گونجاو بێت بۆ خستنەڕووی ئەو دۆسیەیە.
ئیسرائیلیەکان هەستیان بەوەکرد کەسەرکەوتوبوون لەوەی هەڵویستی بارزانی مامناوەندتر ڕابگرن بەرامبەر بەئێران لەبەرئەوەی ئەو هێڵەی "ئاشکۆڵ" کێشابوی جەختی لەوەدەکردەوە کەسەرەڕای فەیرانەکە بەرژەوەندییەك هەیە لەنێوان ئێران و ئیسرائیل دا.
پێشنیارە تازەکەی "البزاز" بۆکوردەکان کەدوبارە داڕێژرابووەوە لەتەموزی ١٩٦٦ بەپێی ئەو پێشنیارەی کە مانگی پێشوو خرابووەڕوو، تەرخانکردنی بڕی ١٠ ملیۆن دیناری بۆ پەرەپێدانی کوردستان لەخۆگرتبوو ، لەگەڵ گێرانەوەی سوپای عێراقی بۆ ئەو بنکانەی کە لەمانگی ئابدا لەژێردەستیدابوون ، ئەگەر بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەوە بخوازێت وە گێرانەوەی، ئەو هاونیشتمانیە عێراقیانەی کە شوێنی کوردە ڕاگویزراوەکانیان داگیرکردبوو و چەکداماڵینی هێزەکانی (پێشمەرگە) بە شێوەیەکی پلەبەندی ، وە چەکداماڵینی جاشەکان ، و دانانی وەزیرێکی تایبەت بەکاروباری کوردەکان لەحکومەتی عێراقیدا.

**************************

هەر زوو ئەوە ڕونبوەوە کە"البزاز" توشی گرفت بووە لە کۆکردنەوەی پارەی پێویست بۆپەرەپیدانی عێراق لە جێبەجێکردنی بەندەکانی تریش ئەوە لەکاتێکدا کە کوردەکان سوربوون لەسەر گرنتی کۆکردنەوەی پێشمەرگە لەماوەی دوو ڕۆژدا ، وە کۆکردنەوەیان لە ژێر فەرمانی بارزانی.
لەسەر ئەو بنەمایە بڕیاریان دا کە چەکەکانیان نەگێرنەوە بۆ حکومەت ، جگە لەو چەکەقورسانەی کە لەجەنگەکان لەسوپای عێراقیان سەندبوو ، لەشوێنێکی گونجاودا بیان شارنەوەو ژێرگڵی بدەن.
ئێرانیەکان بەردەوام بون لەوەی ڕۆڵی کەسێتی تووڕە ببینن لەڕێگای مۆسادەوە بە کوردەکانیان ڕاگەیاند کە زۆر تورەن بەهۆی ئەو دانوستانانەوە کە بارزانی

لەگەڵ "بزاز"دا دەیکات بەمەش ئێرانی پشتگوێ خستووە لەوکاتەدا "دەیڤید کرۆن" دەیویست ئێرانیەکان ڕازی بکات بەپێویستی گۆڕینی شێوازی هەڵس و کەوتیان و پێی وتن: ((باشتروایە کەبارزانییەکی تێر و پڕچەکمان هەبێت ، نەك بارزانییەکی لاواز و پەشێو کە هیچ ڕێگەیەك لەبەردەم خۆیدا نەبینێتەوە جگە لەئاشتەوایی لەگەڵ عێراق)).

بەڵام ئێرانیەکان وەڵامیان نەدایەوە ، و داواکاریەکەیان ڕەتکردەوە کە داوای کردبوو گەشت بکات بۆ کوردستان تا لەوبارەیەوە لەگەڵ بارزانی بدوێت ، ئێرانیەکان پێیان وتبوو ، تەنها لەکاتێکدا ڕێگە بەبەردەوام بونی هاریکاری بۆ کوردەکان دەدەن ، کەگفتوگۆی نێوان عێراقی و ئێرانیەکان بگاتە بن بەست ، پێویستە لەسەر کوردەکان بەردەوام بن لەجەنگ لەگەڵ عێراق.

ماوەیەك ئیسرائیلیەکان هەستیان بەوەدەکرد کەبارزانی هەموو پەیوەندیەکانیان لەگەڵ عێراق بۆ باس ناکات ، وە لە ناکاو گۆڕانکاری لەهەڵویستی "نەگۆڕ"ی عێراقیەکان سەبارەت بە کوردەکان ڕویدا "میرخان" پێی وتین ئامادەکاریەکانیان لەلایەن ئێرانەوە پێگەیشتوە ، هەروەها حکومەتی عێراقیش لێبوردنی گشتی بۆ هەموو چەکدارە کوردەکان دەرکرد، وە بۆ ئەوانەش کە بە"غیاب"حوکم درابون.

ئەو لێبوردنە کوردەکانی تورەکرد و دەیانگوت کێ داوای لێ کردون کە بیبوورن ، ئەمە چوارەم لێبوردنە دەری دەکەن لە سەرەتای هەڵگیرساندنی شۆڕشەوە.

دکتۆر مەحمود سەبارەت بەوە وتی: ((مادام عێراقیەکان لێبوردنی گشتیان دەرکرد ئەمە مانای ئەوەیە دەیانەوێت لە شوێنێك نیشتەجێمان بکەن ئامانجیان ئەوەیە لەناومان بەرن)).

دکتۆر مەحمود بە پشت بەستن بەو زانیاریانەی پێی گەیشتبوو بەردەوام بوو ((عێراق خەریکە هەنگاوێکی گەورە هەڵێنێت و دەیەوێت کاربکات لەسەرچارەسەرکردنی کێشەکانی لەگەڵ "میسر" و "تورکیا" و "ئێرانگ

لەوچوارچێوەیەدا ڕێکەوتون لەسەر لەناوبردنی کوردەکان ، پاشان سەرۆکی عێراق و سەرۆك حکومەت ڕویان کردۆتە مۆسکۆ ، داوایان لە هاوپەیمانەکانیان کردوە کەیارمەتی سەربازی و ئابوری گەورەیان پێشکەش بکات ، بەڵام نابێت لەحساباتەکانماندا ئەوە بەدووربگرین کە عێراقیەکان کاردەکەن تا کۆششەکانیان کۆبکەنەوەو گورزێکی سەربازی گەورە لەکوردەکان بوەشێنن)).

ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان خۆیان لەبەردەم سەرکردایەتیەکی حیزبیدا دیتەوە ، سەرکردایەتیەك کەجەنگێکی گەورەی ئەنجامداوە، بەڵام ڕوبەڕووی داهاتویەکی داخراوو و تەسك بوەتەوە ، ناتوانێت مووچەی ئەو سەربازانەی خۆی بدات کە خێزانەکانیان توشی برسێتی و هەژاری بوون .بۆیە سەرکردایەتی کوردی هەوڵیدا بۆکۆکردنەوەی خێر و صەدەقە تا بیسەلمێنێت ئەم واقیعە داهاتویەکی باشتر لەهاریکاری کردن لەگەڵ حکومەتی عێراق دابین دەکات.

*****************

لەماوەی نێوان ١-٣ ئابی ١٩٦٦ و لەسایەی ئەو ئاگربەستەی کە هەبوو لەزەمینەی هەستکردن بەوەی کەبارزانی خەریکی دەستلەکارکێشانەوەیە کۆنگرەی سەرکردایەتی یاخیبوان گرێدراو ڕێگری لەبەشداربوان کرا کەباسی دەستکەوتەکان بکەن، بەڵکو دەبێت لە هەڵە و تەنگ و چەڵەمەکان بکۆڵنەوە، و نەخشەکارێك بۆ داهاتوو دابنێن ، بڕیار درا کە بەردەوام بن لەکارکردن لەگەڵ حکومەتی عێراقی بەئامانجی ئاگربەست بۆ پتەوکردنی کارکردن بۆدۆزینەوەی چارەسەری کۆتایی بۆ کێشەی کورد بەگشتی ، بەڵام هەمویان سوربون لەسەر هەڵنەوەشاندنەوەی پێشمەرگەو هێشتنەوەی وەك گرەنتیەکی سەرەکی بۆ مافەکانی گەلی کورد، لەهەمان کاتدا ئەندامانی کۆنگرە بڕیاریان دا کە ئەو پەڕی ئاگاداری و حەزەر وەربگیرێت وپارێزکاری لەپێگەو شوێنەکان و سوپاکەش بکرێت

بەهەموو شێوە وشێوازێکی گونجاو سەرەڕای ئەو گیرو گرفتانەی ڕوبەرویان بوەتەوە لە سەروی هەموشیانەوە کێشەی ئابوری.
لەکاتێکدا کەبەشدار بوان سووربوون لەسەر داواکردن لە حکومەت کەوەفای بۆ پەیمانەکانی هەبیت ، برپاریشیاندا روبەڕوی کێشەکان ببنەوە ، و کارگێری دارایی لەشێوەی دەزگایەکی ڕێکخراودا ئامادە بکەن و بیخەنە بەردەستی کەسێکی سڤیل و دیاریکردنی کارگێر بۆ گوندەکان و دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا ، دوای لێسەندنەوەی لە خیانەتکاران ، و دەرگادانەخستن لەڕووی ئەو جاش و لایەنگرانەی تاڵەبانی کەدەگەڕینەوە ڕیزی شەڕکەرە کوردەکان ، و دامەزراندنی دەزگایەکی هەواڵگری بەهێزو فراوانکردنی چالاکیە نێودەوڵتیەکان.
کۆنگرەکە کارەکانی کۆتایی پێهێنا بەهەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی سەرکردایەتیەکی تێکەڵاو لەشاریەکان و لادێیەکان سەرەڕای ئەو ڕقەی کە بارزانی لەڕۆشنبیرەکان هەی بوو، بەڵام ڕێژەیان لەسەرکردایەتیدا زۆربوو، لە٦ی ئابی ١٩٦٦ "بزاز"ی سەرۆکی حکومەت دەستی لەکارکێشایەوە ، و بەهۆی فەشەلهێنانی لەڕوبەڕووبوونەوەی ئەوسەرکردایەتیە سەربازیەی کە زۆر بەتوندی دژایەتی ڕێکەوتنی نێوان عێراق و کوردەکانیان دەکرد، سەرۆک "عارف" هەستا بەڕاسپاردنی "ناجی تالیب" بۆ پێکهینانی حکومەتێکی نوێ کەژمنەراڵێکی خانەنشین بوو ، یەکێ لەلایەنگرانی "جمال عبدالناصر" بوو هەر لەسەرەتاوە هاوکاری تاڵەبانی و لایەنگرانی بوو ، و ڕقێکی زۆری لە بارزانی و لایەنگرانی هەبوو، دەیگوت : (( ئەو پیاوە خیانەتکارە ، ئەرکەکەم داوام لێ دەکات لەناوی بەرم، خۆی و دەستوپێوەندەکانی لەهەرشوێنێك ڕوبەڕویان ببمەوە دەبێت ئەوە بەهەند وەربگرم کەکێ لەگەڵیانەو لەپشتیانەوەیە ، لە ڕۆژانەکەیدا یەکێ لەڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان نوسیویەتی : ((پێدەچێت بارزانی لەبارودۆخیکی زۆر ڕەشبینانەدا بێت بە درێژی باس لەوبارودۆخە ئابوریە خراپە دەکات کە تێیکەوتووە لەگەڵ خەزێنە بەتاڵەکەی ، لەسەرەتای یاخیبوندا باجی لەسەر لادی

و شارەکاندا سەپاند ، و لەخەزێنەکەیدا ٣٠٠ هەزاردینار هەبوو ، بەڵام ئەو برە زۆر خیرا کەمدەبووەوە ، لە ساڵی ١٩٦٤ەوە بارودۆخەکە تەواو خراپ بوو، بەڵام ئەو چەکە ئیسرائیلیانەی بۆکوردەکان هاتن ، ئاووهەوایەکی شادومانی و ئومێدبەخشی بەهاریکاری بیانی لادروست کردن.

((بارودۆخی ئابوری ئێستا زۆرخراپە ، پارە نیە بۆ پۆشتەکردن و نانپێدانی پێشمەرگەکان گەلی کوردیش هەژارە ، بارزانی پێی وایە کە لەکۆنترۆڵ دەردەچێت ، جەماوەرەکەی ڕوو لەحکومەت دەکات ، بارزانی باسی لەوەکرد گەلی کورد توانا و ئارەزوی هەڵگرتنی قورساییەکەیان نەماوە ، سەرۆك هۆزەکان ڕویان ئاراستەی سەرچاوەکانی پارە وەرگێڕاوە ، بارزانی دەڵێت: (( بارودۆخی ئاوارەکان کاریگەرییەکی نەرێنی هەیە، ئەو ژەنراڵەی لێمان دەباتەوە ژەنەراڵی سەربازی نیە ، ژەنەراڵی ئابووریە کەوادەکات هەموو جەنگەکە بدۆڕێنین)).

((کاتێك "ڕیگف" پێی گوت ئەمە کاتی گونجاوە تا گورز لە هێزەکانی عێراق بوەشێنیت لەبەرئەوەی سوپای عێراقی ئارەزوی جەنگ ناکات ، بارزانی بەشێوەیەکی پچڕپچڕ وتی مەحاڵە ناتوانین دوبارە ڕووبەڕووی کوشتار و برسێتی ببینەوە ، بۆیە جەنگ مەحاڵە لەوبارودۆخەدا لەبەردەم جەماوەر وەك کەسێك دەردەکەوم کە خیانەتی لێ کردبێت ، ئەگەر کاتێکیش گەیشتینە ڕێکەوتن ناتوانم لەعێراق دابژیم نە لەئیران ، لەوانەیە بێم بۆ ئیسرائیل)).

"ئەبو یوسف (لفکۆف)" پێی وت : کارەکە لەسەرەتادا بۆ ئێمەش زۆر سەخت بوو ، دەبوو ئێمە کۆچ بەجولەکەکان بکەین بۆ ئیسرائیل ، پاشان بەپارە زەویان بۆبکڕین و نیشتەجێیان بکەین و بیانژێنین ، پاشان بۆ نزیکەی ٧٠ ساڵ لەجەنگدا بوین لەکۆتایدا گەیشتین بەئامانجەکانمان پاش ئەوە بەسەرپردی ئەشکەنجەدا پەڕینەوە ، بەڵام ئێوە پێویستتان بە کەمترە لەسەرخاکی خۆتانن، تەنها پێویستە خۆتان ڕێك بخەن و ئارام بگرن و ئازا بن .

بارزانی : ئێوه بەتەنیا نەبون ، بەریتانیا و ئەمریکا لەگەڵتان بوون.

لفکۆف : پاش ئەوەی گەیشتینە ئامانج ئینجا کاریان بۆ کردین.

بارزانی گەلەکەی ئێوه عەقڵ و ڕۆشنبیری و مەعریفەیان هەبوو و بەڕێوەبردنی هاوبەش دەزانێ ، بەڵام من گەلەکەم دواکەوتوو و تەمبەڵە و چەمکی هاوبەش لەنیوانماندا نیە، هەموو ئەوەی کەئێمە هەمانە، بوونی سنورداری ئێمەیە لەچوارچێوەی ئەوکێشانەدا کەئەملاولای لێگرتوین ، کەس گرنگی بەئەوی تر نادات، سەرۆك هۆزەکان لەگەڵەکە خراپترن ، ئەگەر وازیان لێ بێنن و دابنیش هەمو شۆڕشەکە هەرەس دێنێ.

دواجار ڕاوێژکاره ئیسرائیلیەکە دەڵێت ((لەم ماوەیەی ئێستادا بارزانی ئارەزوی جەنگ ناکات ، بەڵکو دەیەوێت کاتی دەست بکەویت بۆ ڕێکخستنەوەی هێزەکانی و شەڕ ناکات تەنها ئەگەر ناچار نەبێت)).

## بەشی چواردەیەم/ ئیسرائیلیەکان لەوە دەترسن بفرێندرێن

لەنیوەی یەکەمی ئابی ١٩٦٦ سەرۆکی ساواك "ناسری" و "مۆسازد"ی جێگری یەکێ لەنهێنیەکەیانی وڵاتەکەیان لای "دمیڤید کرۆن" ئاشکراکرد پێیان گوت: ((ئێران پەیوەندی نهێنی لەگەڵ عێراقدا هەیە ، بەم هۆیەوە هاریکاری لە کوردەکان بڕیوە)) ئەو دوانە ڕای خۆیان لەسەر بارزانی نەشاردەوە.

کرۆن لەو نامەیەدا کە بۆ ئیسرائیلی ناردوە : ((ئەو دوانە وتیان کە بارزانی بەنیسبەت ئێرانەوە تەنها کارتێکی سیاسیە و کاتیك ئەو کارتە لە کاردەکەوێت پێویستە لەناوببرێت ، هەمو ئەو فشارانەش کە خراونەتە سەری بەئامانجی ئەوە بوە کە لەشوێنی ڕاستەقینەی خۆی دابنرێت ، جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە کەنابێت هۆکارێك بێت و لەبەردەرگاکان ڕاوەستێت هەر چاوەڕێی خێر بکات دەبێت پێشتر بزانێت کە چۆن هەڵس وکەوت دەکات)) .

((هەردوکیان جەختیان لەوەکردەوە "ئەوە دەڵێن کەدەمێڵێن" ئەمەش دەرەنجامێك نیە کە ئیستا پێ گەیشتبن ، بەڵکو ئەوە پلانێك بوە لەسەرەتاوە عێراقیەکان دەستیان بەدانوستان کرد لەگەڵ کوردەکان تا فێڵیان لێ بکەن ، و ئەو جیاوازیەیان لێ بستێنننەوە کە بەهۆی سەرکەوتنەکانیانەوە لە "هەندرێن" بەدەستیان هێنا ، ئەگەر کوردەکان هێڵێکی توندیان دروست بکردایە نەیان دەتوانی ئەو جیاوازیەیان لێ بسەننەوە.

عێراقیەکان هیچ یەکێك لەو پەیمانانەیان جێ بەجێ نەکرد، کەدابویان ، پێدەچێت هەر نەیانەوێت جێبەجێ بکەن.

کرۆن بڕیاریدا ڕوبکاتە کوردستان تا ڕاستەوخۆ لەگەڵ بارزانی بدوی و بڕوای پێ بهێنێت کە خەباتی جەنگەکەی لە ڕاستیدا پەیوەستە بە ئێرانیەکانەوە ، لەودیدارەدا کە ئەم دوانە لە١٤ی ئابدا بەیەکەوە ئەنجامیان دا بەهێمنی "کرۆن" بەبارزانی وت: ((لەوانەیە ئێرانیەکان هێندە باش نەبن کە تۆ دەتەوێت بەڵام لەهەموان باشترن)).

وه كرۆن پرسی بۆچی كوردەكان هەڵناستن بە تێكشكاندنی فرۆكە عێراقیەكان ، بۆدامەزراوە نەوتیەكان ناتەقیننەوە ، بۆچی زەرەری وا لە عێراقیەكان نادەن ، تاناچاریان بكەن چارەسەرێكی سیاسی بۆ كیشەكان بدۆزنەوە.
لەوێدا بارزانی پێی برِی وتی : "هێشتا كاتی ئەوە نەهاتوە" لەوكاتەدا "رِیگیف" هاتەناو گفتوگۆكەوەو كە لەمەزاجی سادەی بارزانی شارەزا بوو وتی: ((پێویست ناكات بمێنیتەوە لە كوردستان)).
لفكۆف دەڵێت: ((نامەیەكم نارد بۆ ئیسرائیل وتبوم "رِیگف" ئاستەنگی زۆر دەبینیت لەمانەوەی لە كوردستان ، وە نازانیت چی دەكات ، بۆیە مانەوەی لێرە بێ مانایە)).
هەمو ئەو رِوداوانە بونەهۆی ئەوەی بارزانی رِای خۆی بگۆرِێت و لەو نامەیەدا كەیەكێ لەرِاوێژكارەكان ناردویەتی بۆ "تل ئەبیب" دەڵێت : ((رِۆحی بارزانی هەڵدەبەزێتەوە بۆ جەنگ ، خەریكە پرسیاری سەربازی جێ بەجێكاری دەكات بۆنمونە : چۆن بتوانین فشار بخەینەسەر عێراقی و بەریتانیەكان كە هاوبەشیانن لەكۆمپانیاكانی نەوت ، ئایا دەتوانین ئەوە بكەین لەرِێگەی هێرش كردنەسەر دامەزراوەكانی نەوت؟ ، ئیمەش هانمادا بۆ ئەوە)).
بارزانی بە ئیسرائیلیەكانی وت: ((كە عێراقیەكان خەریكن رِێگا لێدەدەن لەناوچەكانی "كۆرِەك" و "زۆزگ" ، ئەمەش وای كرد كە هەموو هەستەوەرەكانی ئیسرائیلیەكان هوشیار ببنەوە ، بۆیان دەركەوت كە رِێگالێدان نیەتی عێراقیەكان نیشاندەدات ، بۆسەركەوتن بەسەر ئەو ئاستەنگانەدا كە رِێگرن لەگواستنەوەی تانكەكان لەوناوچانەدا.
پاش چەند رِۆژێك زانرا كە ئەو رِێگەیەی ساز دەكریت لە "زۆزگ" بۆ ولاخە ، بەلام رِێگاكەی "كۆرِەك" نزیكەی ساڵێك دەخایەنێت ، ئیدریس لەسەر ئەو مەسەلەیە وتی: ((كە رِێگا لێدان هیچ دڵەرِاوكێیەك لای ئەو دروست ناكات)) ،

بەڵام ئیسرائیلیەکان ڕایەکەیان پێ ڕاست نەبوو ، یەکێکیان وەڵامی دایەوە ((هەرگیز ناتوانیت بزانیت کە عێراقیەکان بیر لەچی دەکەنەوە)).
لە ١٥ی ئابدا بارزانی وتی کە پیاوەکانی لەماوەی ١٥ — ٢٠ ڕۆژی ئایندەدا هێرش دەکەنەسەر چەند پێگەیەکی عێراقی ، لەسەر ئەو بنەمایە "ڕیگف" وازی لەداواکانی هێنا بۆ گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل ، بەڵام "لفکۆف" ئاگاداریکردەوەو وتی: ((لە کوردستان قسە و کردار زۆر دورن لەیەکەوە، زوو دەرکەوت کە ئاگادارکردنەوەکە ڕاست بوو ، دەرکەوت کە بارزانی دەیەوێت لەسەرەتادا لە چەند دەرگایەکی سیاسی بدات ، وە دکتۆر مەحمود بنێرێت بۆ ئەمریکا ، وە فەرمان بکات بە "موفتی" نوێنەری کورد لەتاران کە پەیوەندی بکات بە باڵوێزی سعودییەو ە .

********************

ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان هەستیان بەوە کرد کە عێراقیەکان بەبوونی ئەوانیان زانیوە ، لەبەرهۆکاریك کە نەیاندەزانی دنیایان تێ نەگەیاندوە.
بارزانیش ئەوەی دەزانی بۆیە سووربوو لەسەرئەوەی کە پاسەوانیەکی هەمیشەیی لەلایەن پێشمەرگەکانەوە ، لە ئیسرائیلیەکان بکرێت.
مۆساد دەیزانی کە بەرپرسێکی باڵای کورد بۆ لایەنیکی سیاسی درکاندوە کە سێ ئەفسەری ئیسرائیلی لەکوردستانن، ئیسرائیل لە ڕیگەی ئێرانەوە هاریکاری بۆ کوردەکان دەنێرێت، وە ئیسرائیل خولی تایبەت بە ئەفسەران بۆ کوردەکان دەکاتەوەو "کریم"یش سەردانی ئیسرائیلی کردوە.
گومانەکان بە دەوری "وانلی"دا دەخولانەوە، چالاکوانە کوردەکە کەپێگەیەکی فەرمی نەبوو تەنها لە ٩ی ئابدا سەردانی سەرکردایەتی یاخیبوانی کردبوو، و لەگەڵ ئیسرائیلیەکانیش دوابوو ، بەڵام نەیتوانیبوو لەگەڵ بارزانی کۆببێتەوە ، بارزانی فەرمانی کردبوو کە بینێرنە لای "کریم" و "د.محمود".

کاتێك دواتر بارزانی بەوەی زانی کە"وانلی" لە"حاجی ئۆمەران"ەوە چووەتە تاران و لەگەڵ "ئیبراهیم ئەحمەد" ی هاوپەیمانی پێشوی و دوژمنی ئێستایدا کۆبوەتەوە ، وتی: هەمو ئەو زانیاریانەی کە بە "وانلی"دەگات بە هەمان شێوە دەگات بە عێراقیەکانیش و "تاڵەبانی"یش ، لەم ڕووەوە باشترین کار بکریت لە ناوبردنیەتی.

لەڕاستیدا هیچ بەڵگەیەك نەبوو بیسەلمینیت کە وانلی نهێنیەکەی درکاندوە ، بەڵکو بەردەوام بوو لەکارکردن لە بەرژەوەندی یاخیبوون ، تەنانەت لەدوای ئەوەی کە لە هەموو ئەرکە فەرمیەکانیش دەرکرا ، لە ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٦ بەکرێگیراوێکی عێراق هەوڵی تیرۆر کردنی داو فیشەکێکی نا بەسەریەوە ، پاش نەشتەرگەرییەکی بچوك گیانی لەدەست دا مۆساد کوژران و هاوکاریەکانی "وانلی" بیرناچێتەوە.

"زید حیدر"ی سەرۆکی بەشی پەیوەندیە دەرەکیەکان لە حیزبی بەعس لەساڵی ١٩٧٦ دا ئاشکرای کرد کە هەواڵگری عێراقیی ڕاپۆرتێکی بەدەست گەیشتوە سەبارەت بە هاتنی سێ ئەفسەری ئیسرائیلی بۆناوچەی کوردیەکان و گواستنەوەی چەکی سۆڤیەتی و ئیسرائیل بۆ کوردەکان لە ئیسرائیلەوە.

لە ١٦ی ئابدا فرۆکەوانی عێراقی "مونیر ڕەدفا" بە فڕۆکەیەکەوە ڕایکرد بۆئیسرائیل و لەفڕۆکەخانەی "حتسور"ی سەربازی نیشتەوە ، لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا کەدواتر بۆی سازدرا وتی کە گەورەترین پرۆسەی "بۆمباران"ی لەکوردستان ئەنجام داوە.

یەکێ لە ئیسرائیلیەکان دەڵێت ((پێمان وابوو کە عێراقیەکان بە یەکەی کۆماندۆ دێن و دادەبەزن بەفڕۆکەی هەلی کۆپتەر هێرشدەکەنەسەر شوێنەکەو وەك بارمتە دەمان بەن ، تا گێڕاندنەوەی فرۆکەکەو فڕۆکەوانەکەی، ئایا ئێمە وامان نەدەکرد ، ئەگەر ئەوەی بۆ ئەوان ڕویداوە بۆ ئێمە ڕوی بدایە)).

((له "تەل ئەبیب"ەوە نامەیەکمان بۆ هات داوایان کردبوو تا دەکرێت ئاگامان لەخۆمان بێت و بارزانیش ئاگاداربکەنەوە لە مەترسیەکانمان ،"میرخان" پیمانی وت: مەترسن ئەگەر بێن بۆ ڕفاندنتان هەرگیز ناگەڕێنەوە )).

((بارزانی باسی لەپلانێك دەکرد کە خەریکە لەدژی سەرۆکی حکومەت "ناجی تالیب" دەکرێت ، داوی پلانەکە "بەزاز" دەیچێنێت بەمەبەستی گەڕانەوەی بۆدەسەلآت سەرەڕای ئەوە ڕازیبوو بە کۆبونەوە لەگەڵ لیژنەیەکی بالآی عێراقی کەهاتبوو بۆ دانوستان سەبارەت بە دوبارە دەستپێکردنەوەی گفتوگۆ لە نیوان هەردولادا ، "کریم" ڕەتیکردەوە سەفەر بکات بۆ بەغداد ، دوکەسی دیکە لەشوینی ئەو نێردران تا هەواڵەکان لە بەغدادەوە بهێننەوە)).

((لەوماوەیەدا پەتای کولێرا بەعێراقدا بلآوبوبوەوە ، ئیسرائیلیەکان لەوەدەترسان بگاتە کوردستان و توشی پێشمەرگە ببێت ، بارزانی وتی سالێك لەمەوبەر کوتراون، سەرەڕای ئەوە داوای لەحکومەت کرد کە ڕێو شوێنی پێویست لە دژی پەتاکە لە کوردستان ئەنجام بدات ، وە هۆشداری دا کە ئەگەر حکومەت کارنەکات بۆ کوتانمان ، ئەوا خۆمان "لوقاحەکە" دەدزین)).

((جارێکیان بارزانی پێی وتین ئێوەی هاوڕێی ڕاستەقینەمانن ،باسی یەکەم دیداری خۆی کرد لەگەڵ "دێڤد قەمحی" لە ئایاری ١٩٦٤ و ووتی: سەرم سوڕما لەوەی کە لەیەکەم دیدارماندا وتی: ئێمە وڵاتیکی بچوك و لاوازین و دەرامەتمان کەمە ، بۆیە هاوکاریشمان هەر بەو قەبارەیە دەبێت ، پێم وت ئەوە قبوڵ ناکەم ئێوە زیرەکی و مەعریفە و ڕەوشتتان هەیە ، ئێمە دەزانین کە ئەگەر داوا هەزار لە هەرلایەك بکەین لە باشترین بارودۆخدا "پێنج سەد"مان دەدەنێ ، بەلآم لەگەڵ ئیوەدا داوای هەزارامان کرد دووهەزارمان دەست دەکەوێت ، ئەوەی تا ئێستا لەئێوەمان وەرگرتوە تەنها ٤٪ ی ئەوەیە کە دەبێ پێشکەشمانی بکەن)).

"لفکۆف" هەلەکەی قۆستەوەو پرسی لەبارزانی: ((بەڕای تۆ هۆکاری ئەو هاوکاریانە چی یە؟ کە ئیسرائیل پێشکەشی ئێوەی دەکات؟ میرخان تەداخولی کرد

و وتی: ((ئیرانیەکان دەخوازن کە لەڕێگەی ئێمەوە چارەسەری کێشەی "خوزستان" و "کەنداو" بکەن ، بەڵام ئێمەوئێوە هەمان دوژمنی هاوبەشمان هەیە ، کاتێك ئێمە دەگەینە ڕێکەوتن لەگەڵ عێراقدا بەبێ ئێمە ناتوانێت سوپاکەی بجوڵێنێت ، ئێمە ڕێگانادەین سوپای عێراق بجەنگێت لەدژتان هەرچی ڕوویدات)) ، "لفکۆف" سەری ڕاوەشاندو وتی : ئامانجمان ئەوەیە کوردەکان لەناو عێراقدا بە یەکسانی و خۆشگوزەرانی بژین ، ئێمە ئارەزوودەکەین دەوڵەتێك هەبێت کەگرنگی بە کاروبار و کێشە نێوخۆییەکان بدات لەماوەی ١٠ -١٥ساڵی داهاتوودا ، و هەمو گرنگیپێدانی خۆی بۆ پەرەسەندن تەرخان بکات ، لەچوارچێوەی دەوڵەتە دوژمنەکانی ئیسرائیل دەربچێت جا ئاشتەوایی بەدەست بهێنێت یان نا ، بارزانی دیسان دەستی کردوە بەخستنەڕووی باری ئابوری خراپی کوردەکان ، ئیسرائیلیەکان پێیان وت : یەك هۆکار هەیە تا بەزوویی لەو بارودۆخە خراپە ڕزگار بیت ، هێرش بکەرە سەر کۆگاکانی سوپا و خواردن و پۆشاکەکانیان ببەن ، هێرش بکەنە سەر بانکە عێراقیەکان و هەرچی پارەی تیایە ببەن ، ڕێگاکان بگرن و باج لەخەڵك بسەنن ، بەڵام بارزانی بیری لە شتێکی جیاواز دەکردەوە ، دەیویست بەنهێنی سەفەری ئیسرائیل بکات و لەوێوە ڕودەکاتە ئەمریکا ، بەدڵنیایەوە دیداری ڕوبەڕووی لەگەڵ ئەمریکیەکان سەرچاوەی دارایی بۆ دابین دەکات)).

ئیسرائیلیەکان سوربون لەسەرئەوەی کەمەحاڵە ئێرانیەکان تێپەڕینن ، سەرەڕای ئەوە گەشت بۆ ئەمریکا مەحاڵە.

زانرا کە لەو ماوەیەدا ئیدریس لەگەڵ سەرۆکی ساواك لە تاران کۆبوەتەوەو، ئیسرائیلیەکان بۆ بارزانیان ڕونکردۆتەوە کە پێویستە لەسەری ئێرانیەکان ڕازی بکات ، لەهەمان کاتدا ڕێرەوی عێراقیەکانیش دانەخات.

ئەگەر ڕوون بوەوە کە عێراقیەکان بەئاراستەی دانوستانی ئاشتیانەدا ناڕۆن ئەوا دەتوانین ، لەناو عێراقدا هێرشیان بکەینەسەر بەوەش سوپای عێراقی لەبنکەکانی خۆیدا جێگیر دەبێت تا بیان پارێزێت.

لە ٢٤ی ئابی ١٩٦٦ ئەو هۆکارانەی ڕوونکردەوە کەڕێگرن لەوەی ئەو کارانە بکات : (( ئێمە ڕانەهێنراوین لە بەکارهێنانی ئەو شێوازانە ، لەناو شارەکانی عێراقدا ژمارەی پێویستمان بۆ ئەوجۆرە پرۆسانە لەبەردەستدا نیە ، هەروەها ئەگەری ئەوە هەیە کەعێراقیەکان بەتوندی تۆڵە لە هاولاتیان بکەنەوە)).

ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان نامەیەکیان نارد بۆ ئیسرائیل و نوسیبویان : ((پێدەچێت کوردەکان لە چیاکەی بەردەمیان دورتر نەبینن)).

لە ٢٦ی ئابدا "دکتۆرمەحمود" پێی وتن: ((بیرۆکەکانتان لە شارەزایتانەوەیە لە دوژمنی عێراقی ، بەلام ئێوە ئێمەی کورد ناناسن ، ئێمە ئاستەنگی زۆرمان ڕووبەڕوو بومەتەوە وەك دولەتبونی تاڵەبانی و نەبونی ڕێکخراوەیی ، ئاگادار نەبونمان لەزۆرینەی ئەو شتانەی کە ڕوو دەدەن، ئەمە جگە لە بارە ئابورییە زۆر خراپەکەمان)).

لەو ماوەیەدا بەرپرسە ئیسرائیلیەکان لە "تەل ئەبیب" نامە لەدوای نامەیان دەنارد ، بۆ شاندە ئیسرائیلیەکەی کوردستان تا کوردەکان ڕازی بکەن بە قبوڵکردنی بوونی شارەزایەکی ئیسرائیلی تا لەچۆنیەتی دامەزراندنی پرۆژەکان لە کوردستان بکۆڵێتەوە.

وە لەو یاداشتانەدا کە یەکێ لە ئەندامانی شاندەکە نوسیویەتی دەڵێ: ((گرانە ئەوە بۆ بەرپرسەکان ڕوون بکەینەوە کە لێرە دەیبینین ، کوردەکان ڕانەهاتوون بۆ ئەو کارە ، .بەلام بەرپرسە ئیسرائیلیەکان وازیان لەبیرۆکەکە نەدەهێنا ، ونامەیەکیان ناردو وتیان ، "پێنج" کورد بدۆزنەوە ئەوانەی لە دەرەوە خوێندویانە ، وە بیان نێرن بۆ ئیسرائیل تا خولێك ببینن سەبارەت بە پەرە پێدان)) .

شانده ئیسرائیلیەکە لە "تەل ئەبیب"ەوە نامەیەکی پێ گەیی کە حەماسی کوردەکانی زۆر بەرزکردەوە نامەکە دەڵێت کە "عمیت" ی سەرۆکی مۆساد رازیبونی لە سەرۆکی ساواك وەرگرتوە بەناردنی نەخۆشخانەیەکی مەیدانی بەهەموو ئامادەکاریەکانەوە لە لایەن ئیسرائیلەوە لەگەڵ شاندێکی پزیشکی و "پێنج هەزار" بەتانی و چەرچەفی زستانەو "١٥٠٠ " تفەنگ وە زانرا کە حکومەتی ئیسرائیل بڕیاری داوە کە مانگانە خواردن و کەلوپەل بەبەهای ١٠ هەزار دۆلار بۆ کوردەکان بنێرێت ، "ناسیری" مەرجی ئەوەی دانابوو بۆ قبوڵ کردنی کە بارزانی بە تایبەتی داوای لێ بکات ڕێگەی پێ بدات ، بارزانی وەڵامی داخوازییە ئێرانیەکانی دایەوەو بە تفنەگەکان زۆر دڵخۆش بوو.

لە٢٧ی ئابی ١٩٦٦ یەکێ لەئەندامانی وەفدەکە لە ڕۆژانەکەیدا نوسیویەتی: ((بەیانیەکەی "ڕیگف" و "لیفکۆف" دەرچوون تا لەشوێنێك بگەڕێن بۆدانانی نەخۆشخانە مەیدانیەکە ، هەروەها لەوجیگایانەشیان کۆڵیوەتەوە کە دەتوانرێت بە پەرەشوت شتی لێوەدابەزێنریت لەکاتی پێویستیدا، هەردوکیان لەگۆڕەپانەکەوە گەڕاونەتەوە، پاش ئەوەی شوینی نەخۆشخانەکەیان دیاری کردوە لە نزیك "ئاکسەرە" کە ٣ کیلۆمەتر لە ڕێگای سەرەکیەوە دورە.

لەڕێگای گەڕانەوەیاندا کۆمەڵێك سەربازی سوپای عێراقی ڕایانگرتوون کە ئەرکیان دڵنیابون بووە لەوەی کارتی خۆراك وەرگرتنیان لایە یان نا، بەڵام "ڕێگف" و "لفکۆف" پێیان نەبوەو بوونی "ئازاد" لەگەڵیاندا هیچ سودێکی نەبوە ، "ڕێگف" بەئینگلزی بە "لیفکۆف"ی وتبوو: ((دەڵیی چی گەشتێك بکەین بۆ بەغداد؟)) ، نەفسەرە عێراقیەکە وتبوی: ((بەخۆشحاڵیەوە خەڵکی کوێن؟)) ، لفکۆف وتبووی ((سویسرا)).

************

له ٢٦ى ئاب ڕیگلف کارەکانی کۆتایی پێهینا پاش ئەوەی بۆی دەرکەوت کە لەداهاتوی پەرەسەندودا ناتوانیت هیچ هاوکارییەك پێشکەش بەکوردەکان بکات ، ئێوارەکەی بارزانی هات بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لێ بکات ، و پێی گوت ((نارەزایی دەردەبڕین لەسەرئەوەی کە سێ مانگ تێدەپەڕیت دەستەکان دەگۆڕن بەهی تر، هیشتا لەگەڵ شاندەکە یەکترمان نەناسیوە ، ئەوان درکیان بەکێشەکانمان نەکردوە ، دەیانگوازنەوە)).

پاشان بارزانی "لفکۆف"ی خستەلاوە وتی: ((ڕێگف ژنی هیناوە؟)) لفکۆف وتی بەڵێ ، بارزانی ڕوی تێکردوو پاکەتێکی دایە وتی : ئەمە بۆ ژنەکەت .

لەپاکەتەکەدا زنجیرێکی ئاڵتونی گەورە هەبوو، کە ئەستێرە سورەکەی داودی پێوە هەڵواسرابوو.

لەوماوەیەدا مۆساد لەچۆنیەتی چارەسەرکردنی ددانی بارزانی دەکۆڵیەوە کەئازاری زۆربوو ، بەتایبەتی کەئەو ڕەتی دەکردەوە کە چارەسەر لای پزیشکی عێراقی وەربگرێت ، وە نەیدەتوانی لەوماوەیەدا سەردانی ئیسرائیل بکات بۆیە بڕیار درا بە ناردنی دکتۆریك بۆکوردستان تا چارەسەری بکات لە هەمان کاتدا ، ناردنی سیاسیەکی ئیسرائیلی نهێنسپارێز کە پۆستێکی گەورەی هەبێ بۆ کوردستان تا بەرچاوی بارزانی ڕونبکاتەوەو سەبارەت بەومەسەلەی پەرەپێدانەی کە پێشتر باسکرا لە کوردستان .

## بەشی پازدەهەم/

## (ئاهەنگ گێڕان بۆ ڕزگارکردنی (جبل البیت) لە عێراق)

نوسینگەی سەرۆکی حکومەت پەیوەندی کرد بە"ئاری ئەلیاب" کە هەموان بە نازناوی "لۆبا" بانگیان دەکرد ، پێی وترا سەرۆکی حکومەت دەیەوێت بتبینێت، لۆبا ئەو کاتە وەك جێگری وەزیری "بازرگانی و پیشەسازی "کاری دەکرد و لێپرسراوی دروستکردنی ناوچەکانی پەرەپێدان بوو .

"ئاشکۆڵ" بە "لۆبا"ی وت : (( بارزانی دەیەوێت کەسێك وەك نوێنەری حکومەت و کنێست [1]بۆ بنێردرێت ڕازیت چەند ڕۆژێك بڕۆیت بۆ کوردستان و میوان بیت )).

"لۆبا" بەبێ دودڵی قبوڵی کرد چونکە پێشتر بەکاری تایبەتی مۆساد دەرچووە بۆ "باکوری ئەفریقا" و "مالیزیا" و "سەنگافورە"و .... هتد، لە سەرەتایی شەستەکانەوە شارەزایی باشی لەسەرناوچەکە هەبوو ، کاتێك لەبواری کارکردن لە ناوچەی "قەزوین"ی ئێرانی کاری دەکرد ، دوای توشبونی بە زەمین لەرزە.

جگە لە "لۆبا" فڕۆکە گوێزەرەوە سەربازیەکە لە ٥ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦٦ ، دەستەیەکی پزیشکی زۆر باشی سەربازی و سڤیل و نەخۆشخانەیەکی مەیدانی کە بەهەموو پێکهاتەکانیەوە دەپێچرێتەوە لەگەڵ ٨٠٠ تفەنگ و فیشەکی لەخۆگرتبوو.

پاش دوو ڕۆژ "لۆبا" و "ئۆلف هڕۆبن" کەلەگەڵی هاتبوو و "کرۆن" لە تارانەوە ڕویانکردە "حاجی ئۆمەران" و هەروەها هەموو ئامادەکارییەکان خرانەناو "پێنج" لۆرییەوە ، کە لە دوای ئەو "جێب"ەوە دەڕۆشتن کە شاندەکەی هەڵگرتبوو.

---

[1] کنێست پەرلەمانی ئیسرائیل – وەرگێر-

"لۆبا" لەڕۆژانەکەی نوسیویەتی : ((لەتارانەوە بەرەو "قەزوین" و بە "هەمەدان" دا تێپەڕین ، لەشەو لەناوچەی "کرماشان" لاماندا لەبەرەبەیانێکی زوی هەشتی ئەیلول، لەسەر ڕێگای "سنندج" = سنە، دەڕۆیشتین هەتا گەیشتینە "خانێ" کە گوندێکی بچوکە لەسەرسنوری عێراق – ئێران ، لۆریەکان بەجیا لەدوامانەوە دەهاتن ، لەبەرهۆکاری ئەمنی پاش کەوتنی تاریکی سنورمان بڕی .
لەدوری چەند کیلۆمەتریك لە"حاجی ئۆمەران"ەوە "ڕۆئی" و کۆمەڵێك پێشمەرگە چاوەڕێیان بوون کەهاوڕییەتی کاروانەکەیان کرد هەتا "حاجی ئۆمەران" ، "ڕۆئی" جل و بەرگی کوردی لە بەردا بوو ، بۆیە "ئەلیاب" نەیناسیەوە.
جێگری وەزیر گوازرایەوە بۆ میوانخانە و زۆر بەگەرمی بە خێرهاتن کرا ، خزمەتکارێکی سمێڵ پان لەنزیکەوە ڕاوەستابوو قاوەی پێشکەش دەکرد لە ناکاوو "ڕۆئی" ڕوی تێکرد و وتی : (( "لۆبا" چۆنیت؟!)) ، لۆبا بەسەرسورمانەوە پرسی : ((تۆ کێیت؟!!)) ، ووتی: (( "ئەلیشع ڕۆئی"م ، خزمەتکارەکەش کە قاوەت دەداتێ "حیکمە"یە)).
"لۆبا" و "لفکۆف" و "کرۆن" بەسواری ئەسپ ڕویانکردە بارەگای بارزانی ، لۆبا لەڕۆژانەکەیدا نوسیویەتی : ((ڕێگاکە بەلێوارەکانی چیایەکی زۆرسەختدا دەڕۆیی لەتاریکی شەودا نەتدەتوانی هیچ شتێك ببێنیت لە کاتێکدا هەستم لەوەدڵنیابوو کە لەهەر چوار لامانەوە پێشمەرگەی لێیەو لەگەڵمانن ، لەبەردەم و لە دواوەمان لە لای چەپ و لە لای ڕاستمان)).
((پاش نزیکەی ٤٥ دەقیقە گەیشتینە چادرگەی "لفکۆف" کە لەوێ "ئیدریس" و "دکتۆر مەحمود" و "موفتی" کە لە تارانەوە هاتبون چاوەڕێمان بوون ، هەمومان بەیەکەوە دانیشتین لەچاوەڕوانی هاتنی بارزانی دا کە بەپێ لە سەرکردایەتیەوە هات، زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنی میوانەکانی کرد ، "لۆبا" تەنها وەك نوێنەری سەرۆکی حکومەت نەهاتبوو ، بەڵکو وەك نوێنەری سەرۆکی

"کنێست" "کدیش لۆز"یش که له٣١ ی ئابی ١٩٦١ پیرۆزبایی نامەیەکی لەبارزانیەوە پێ گەیشتبوو بەبۆنەی کردنەوەی بینای"کنێست" لەناوچەی "حبعات رام" ، لۆبا پاکەتێکی پێشکەشی بارزانی کرد کە سێ میدالی تیدابوو ، یەکەم "زێڕ" و دووەم "زیو" و سێهەم "برۆنز" و تایبەت بەو بۆنەیەوە دروستکرابون لەسەریان هەلکەنرابوو : "بۆ ژەنەرال مستەفا بارزانی لەگەل ڕێزی برادەران" ، پاشان گفتوگۆ لەنێوانیاندا دەستی پێکرد و بەردەوام بوو هەتا کاتژمێرەکانی سەرەتای یەکەم بەیانی.

لۆبا و گروپەکەی هاوڕێی لە٩ی ئەیلولدا دەستیان کرد بە کارکردن و هاوکارەکانی بارزانی هەستان بەپێشکەشکردن و خستنەڕوی بارودۆخەکە لەهەردوو ڕووی ئاستی عێراق و مەیدانی بەم شێوەیە :

* لەناوچەی ژێردەسەلاتی پێشمەرگە نزیکەی یەك ملیۆن کەس دەژی ، لەنێوانیان "دوسەد هەزار" لەوانەن کە لە شارە گەورەکانەوە ڕایانکردوە، وە ئەم دۆسیەیە لەکاتی دانوستان لەگەل حکومەت دەخرێتەڕوو، و داوای گێرانەوەیان دەکرد بۆ مالەکانیان.

بۆمبارانی ئاسمانی تۆپخانە هەرچەند زۆر وردیش نیە، لە پێکاندا بەلام زەرەری زۆری بەئابوری کورد گەیاندووە ، کێلگەکانی سوتاندووەو ، پردەکانی ڕوخاندووەو لەسەر ئەو بنەمایە لەکاتی دانوستاندا داوای قەرەبوودەکرێت لەسەر ئەو وێرانکارییەی ڕوویداوە .

* لەبەرئەوەی ژمارەی کوردەکان سێیەکی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن دەبێت حکومەت سێیەکی داهاتەکەی لەکوردستان بخاتەگەڕ بۆپەرەپێدانی ناوچەکوردیەکان بەتایبەتیش کە زۆربەی نەوتی عێراق لەخاکی کوردەکانەوە هەلدەقولێت و دەردەهێنرێت.

کوردەکان ئاماژەیان بەوەدا کە دەیەها خوێندکار هەن و هەیانە لەدەرەوە دەخوێنن ، "لۆبا" ئاماژەی بەوەکرد بۆ ئەندامانی شاندەکە کەپێویستە ئەو

خوێندکارانەی بناسرێن ئەوانەیان دیاری بکرێن کە لایەنگری بارزانی و یاخیبون ئامانجەکانیانن ، و ئامادەبکرێن بۆ ئەرکە سەرەکیەکان ، ئیسرائیل ئامادەیە دو بۆ سێ لەو خوێندکارانە وەربگرێت تا ئامادەیان بکات و ئاراستەیان بکات بۆ دانانی کارتێکی کاری سیاسی ئابوری کۆمەڵایەتی تا لە گفتوگۆ لەگەڵ عێراقیەکاندا سودی لێ وەربگرێت.

ئەو ئاهەنگەی کە کوردەکان بۆ "لۆبا" ڕێکیان خستبوو تێکچوو ، کاتێك دەرکەوت کەئێرانیەکان ئەو (٨٠٠) تفەنگەی ئیسرائیلیەکان هێنابویان نەیان گواستۆتەوە، بارزانی زۆر تورە بوو، جنێوی دەداو هاواری دەکرد: کە ئەو درۆزنە "ڕاگۆڕانە" ، ئەوانە سیاسەتی "پەرتکەوزاڵبە" پەیرەو دەکەن، لەنێوان من و "ئەحمەد" و "تاڵەبانی" خیانەتکاردا، یاری بە من و بەوانیش دەکەن، هانیان داون بچن بۆ بەغداد، هەرچەندە دەیانتوانی ڕیی ئەومیان لێ بگرن ، دەیانەوێ وابکەن کە ببم بەمرۆڤێك کە نەدەژی و نەدەمرێ، چەکە تازەکان تایبەت کرابون بە خۆبەخشە نوێیەکان، بە بێ ئەوانە نازانم چیان پێ بڵێم)).

کرۆن ویستی تورەیی بارزانی هێورکاتەوە، وتی: ((لەوانەیە دواکەوتنەکە بە هۆکارێکی ڕۆتینی بوو بێت، دەبێت ئەوەت لە بیربێت کە ئێران بەردی گۆشەیە لەهاریکاری ئیسرائیلی – کوردی دا)).

لە ١٠ای ئەیلول دا، "لۆبا" و "لفکۆف" و "کرۆن" و "ئازاد" ڕویانکردە قوڵایی ناوچە کوردیەکان ، هەتا لە چیای "زۆزگ" نزیك دەبوونەوە ، دیمەنی ئەو کاولکاریەی ڕویداوە زیاتر و زیاتر دەهاتەبەرچاو ، لەگەڵ بەڵگەو نیشانەی جەنگی داهاتوی نێوانیان ، خاڵێکی چاودێری کوردەکان هەبوو کەلەوێوە بەسەر ناوچەکەدا دەیڕوانی ، دەتوانرا لەوێوە تەماشای پێگەیەکی گەورەی عێراقیەکان بکەن، کە پێ دەچو کوردەکان وەك ئامانجی داهاتویان لێی بڕوانن.

"لۆبا" ئامادەكارییە گەورەكانی عێراقیەكانی بۆجەنگی داهاتوو دەبینی ، تیبینی ئەوەی كرد كە عێراقیەكان ئاگربەستەكەیان بە هەل وەرگرتوە، بۆ لێدانی ڕێگایەكی نوێ، كە پێدەچێت بەكاری بهێنیت بۆ ڕاكیشانی تۆپهاوێژی قورس.

لۆبا لەڕۆژانەكەیدا نوسیویەتی: ((گومان لەوەدانیە كە كوردەكان كۆنترۆلیان بەسەر ناوچەی فراواندا هەیە و لەوناوچانەدا مومارەسەی جێەجێكردنی دەسەلات هەستی پێ دەكرێت ، وەك دادگا و پۆلیس و زیندانەكان كەبەسەرەتای دەسەلاتی شارستانی دادەنرێت ، گەلی كورد هەموی چەكدارە بەهەموو تەمەنەكانیەوە، بەلام ئەمە مانای ئەوە نیە كە گەلێكە هەولێ جەنگ دەدات ، بەلكو بەپێچەوانەوە گەلێكی زۆر هێمنەو سەرەتاییە ، و باری ئابورییەكی زۆر خراپی هەیە ، سەرەڕای ئەوە حالەتی كوشتن و دزی و لاقەكردن زۆر كەمە لەناویدا ، ئەمەش مانای ئاستی كۆنترۆلكردنی جەماوەرە لە لایەن دەسەلاتەوە)).

"لۆبا" لەڕێگای تێبینی كردنەكانیەوە بۆی دەركەوت كە ئابوری كوردی لەسەر چیرۆكەكەی "لەدەستەوە بۆ دەم" وەستاوە و سەرچاوەی هەناردەیان "جۆ" و درەختی "سپیدار"ە كە لەدروستكردنی خانوودا بەكاری دەهێنن ، بەس نیە بۆ گەشەكردن ، چ جای ئامادەكردنی سوپایەكی لە ١٠ هەزار بۆ ٢٠ هەزار كەسی.

((لەم كاتەدا هیچ جێگرەوەیەكی بارزانی نیە تەنانەت لە شێوەكەی كەسێكی تردا بێت وەك "ئیدریس" یان "مەسعود" یان "دكتۆرمەحمود" یان "موفتی".

******************

كرۆن لەیاداشتەكانیدا نوسیویەتی: ((كوردەكان دەزگای پزیشكیان نیە، هەموو بریندارەكان لەسەرپشتی ئەسپ و ولاخ دەبرێن بۆ ئێران تا لەوێ چارەسەر بكرێن ، لەوێ بەڕاستی چارەسەر دەكرێن، بەلام ئەوماوەیەی كە پێدەچێت تا نەخۆشەكە دەگەیەننە نەخۆشخانەكانی ئێران وادەكات بارودۆخی نەخۆشەكە زۆرخراپ ببێت ، یان لەڕێگادا دەمرێت، یان پزیشكەكان ناچاردەبن ئەندامە پێكراوەكە ببڕنەوە)).

((بەڵام ئێستا نەخۆشخانەیەکی مەیدانی ڕاستەقینە لە کوردستان کراوەتەوە بەسەرپەرشتی موقەدەم "ئەبراهام تەدمور" سەرکردەی قوتابخانەی پزیشکی سەربازی کەپێشتر سەرکردەی هێزی پەرستاران بووە لەلیوای"جەبعاتی"، دوو پەرستاری سەربازی هاوکارنی ئەوانیش : "موشێ ئاریێل" و "شەمعون ئەفرات"ن.

بەڵام دەستەی پزیشکی سڤیل پێکهاتوە لەدکتۆر "ئۆرلی ئیسرائیل فرند" کەوەك دکتۆری یەکەی پەرەشوتەوانی یەدەك کاری کردوە، لەگەڵ دکتۆر "بیسح سیگل" و دکتۆر "دۆڤ ئیچکۆڤیچ" کە دکتۆری ددانەو تایبەت بۆ چارەسەری ددانەکانی بارزانی هاتووە)).

نەخۆشخانە سەربازیەکە هەزوو لە "حاجی ئۆمەران"و لە ناودارستانێکی چڕی سپیدار و چنار داچێکرا ، لەنزیك ڕوبارێکی بچوك ، بریتی بوو لەچادرێکی فراوان نزیکەی ٤٠ قەرەوێڵەی لەخۆدەگرت لەگەڵ ژوریکی پێشوازی لەنەخۆش وە نۆرینگەیەکی بچوك بۆ دکتۆری ددان ، لەگەڵ چادرێك بۆ نیشتەجێبونی دەستەکە و چادرێك بۆ نانخواردن.

شەش مانگ تێپەڕی کەناوبانگی نەخۆشخانە ئیسرائیلیەکە بە هەمو کوردستاندا بڵاوبویەوە ، نەخۆشەکان لە هەمو شوێن و جێگەیەکەوە ڕویان تێدەکرد ، کارکردن تێیدا هەتاکۆتایی شەو بەردەوام دەبوو یەکێ لەئەندامانی دەستەکە دەڵێت: ((دکتۆر مەحمود کە وەك وەزیری دەرەوەی بارزانی کاریدەکرد یەکەم کەس بوو سەردانی نەخۆشخانەکەی کردوو لەبەشەکانی دەکۆڵیەوە پاشان بەجددی وتی باش نیە ، ئیسرائیلیەکان پرسیان چی باش نیە، وتی ئەو جەنگاوەرەی لەسەر ئەم قەرەوێڵەیە دەخەوێت حەز ناکات بگەڕێتەوە گۆڕەپانی جەنگ)).

لۆبا گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل و لەگەڵ خۆیدا بێزاری و نەهامەتیەکانی بارزانی بردەوە بۆ بەرپرسە ئیسرائیلیەکان و پێی وتن کەبارزانی پێ وتوە : ((توانای

پێدانی موچەی بە سەربازەکانی نەماوە و مانەوەی یاخیبونەکە یەکلایی دەکاتەوە ، ئاشکرابوو بارزانی هیچ گرنگیەکی بەدانوستان لەگەڵ عێراقیەکان نەدەدا، باوەڕی بە هیچ قسەیەکی عێراقیەکان نەبوو ، پێی وابوو عێراقیەکان فێڵیان لێکردوە بۆیە دەیویست لە ڕێگەی چەکەوە ئەوە بپارێزێت کە بەدەستی هێناوە)).

بارزانی وتی: ئاگر بەستەکە باش نەبووە بۆئەو زۆربەی پێشمەرگەکان بۆ ماوەیەکی زۆرە خێزانەکانیان نەدیوە ، جگە لەوە ئەوان لاواز بوون و هەژاری ڕووویتێکردوون بەهۆی ئەوەی چەند مانگێکە مووچە نەدراوە ، گومان لەوەدانیە بەردەوام بونی ئەو بارودۆخە بۆ ماوەیەکی تر بەو شێوەیە دەبێتەهۆی هەڵوەشاندنەوەی پێشمەرگە بەشێوەیەکی کۆتایی)).

((ئێوە هەمیشە بەهەمان ووشەگەل و لۆژیك بەرەوڕووم بونەوە ، ئیسرائیل لاوازە ، بچوکە ، توانای نیە لەوەزیاتر پێشکەش بکات کەکردویەتی ، دەمەوێت بیرت بخەمەوە کە ئیسرائیل تاکە دەوڵەتە لەجیهاندا کە هاوکاریمان پێشکەش بکات ، بەڵام لەهەمان کاتدا بەرامبەریشی دەست دەکەوێت کە ئەوچەکانەی ئێوە دەیدەن بەئێمە ، ڕوی لەسنگی دوژمنەکانی ئێوە دەکەین ، واتە جەنگی ئێمە ئاسایشی ئێوە زیاد دەکات)).

"ئالیاب" لەڕاپۆرتەکانیدا دانی بەڕاستی لۆژیکی بارزانی دا ناوە وە وتویەتی: (( بەبێ پارەی پێویست گومانم لە خۆڕاگرتنی بارزانی هەیە ، قسەکانی لەگەڵ قسەکان ناپلیۆن دا لە یەك دەچن کە گوتی: سوپا لەسەر گەدەی دەڕوات گەدەی پێشمەرگەش نیوەی بەتاڵە بارزانی ناچارە پڕی بکات تەنها بە خواردن نا بەڵکوبە کرێیەکی کەمیش)).

**********************

پاش گەڕانەوەی "لۆبا" ، "لیڤی ئاشکۆڵ" لێی پرسی کوردەکان هەوڵ بۆچی دەدەن؟ لۆبا وتی: ((باوەڕناکەم ئامانجەکانی یاخیبوون لای سەرکردەکانی

ئاشکرابن، باوەڕیش ناکەم تێڕوانین و دیدگایان هاوتەریب و کۆك بێت لەبارمیەوە ، لەکاتی جەنگدا هەمو ئەوەی دەیخوازن ئەومیە نەهێڵن دوژمن سەرکەوێت ، یان ڕێگەدان بەبەعەرەبکردنی ئەو ناوچانەی کە کۆنترۆڵیان هەیە بەسەریدا ، توانیویانە ئەو مەبەستە بە دەست بێنن، بۆچونی من ئەومیە: بارزانی دەیەوێ بارودۆخی ئێستا وەك خۆی بمێنێتەوەو پارێزگاری لەناوچە شاخاوییەکان بکات، نایەوێت کیشەی کورد لە ناوچە دەشتاییەکان چارەسەربکات، تەنانەت کێشەی کوردی لە شارەکاندا وا گومان دەبرێت کە ئەو ئامادەیە بەو ناوچە شاخاوییە ڕازی بێت کە دەسەڵاتی بەسەریدا هەیە و هەڵگرتنی نازناوی شۆڕشگێڕی ئەیەوێت کە دەسەڵاتی بەسەر ئەو ناوچەیەدا هەیە کە لە ژێر دەستیایەتی و پاراستویەتی وەك کارتێکی بەهێز دژی عێراقیەکان و وەك هەڵوێستێکی هاوسەنگی خواز بەرامبەر ئێرانیەکان، ئەمە لەکاتێکدا کە سەرکردە گەنجەکانی سەرکردایەتی کورد وەك "دکتۆر مەحمود" و "موفتی" و "عەفراوی" ئارەزوی گەیشتن بە ڕێکەوتنێکی خێرایان دەکرد لەگەڵ عێراقیەکان و دەستکەوتنی ٣ یان ٤ پۆستی وەزاری ، وە چێژوەرگرتن بەنازناوی شۆڕشگێر و وەزیر لەدەوڵەتێکی گرنگدا، بەڵام ئەم سەرکردانە لەڕاستیدا لەژێر کاریگەری بارزانی دا بوون ، وە ڕێگەی ئەوەی پێ نەدەدان ، ئەو هەڵوێەك بوو باوەڕی بە عێراقیەکان نەبوو)).

((بە هەرحاڵ بارودۆخەکە پەرەدەسەنێت بۆ دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتۆچکەیەك یان هەر کیانێکی کوردی چونکە سوپای عێراقی ناتوانیت بە ئاسانی بیانسڕیتەوە ، تاکە ئازارێك کە لەوانەیە گورزی گورچکبڕیان لێ بدات لە ناوخۆی خۆیانەوە دەبێ بۆ نمونە ئەگەر بارزانی بمرێت یان نەتوانیت پارەی پێشمەرگە بدات ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی لەناوچونی و هەڵوەشانەوەی)).

ئیسرائیل لەچەند بوارێکەوە سودی لەهاوکاریکردنی کوردەکان وەرگرتبو بەم شێوەیە :

*له بواری سەربازی : بەشێکی زۆری سوپای عێراقی کۆکرابوەوە لە کوردستان و لەوێ هێزێکی زۆر و کەلوپەلیکی سەربازی زۆری لە دەست دابوو.

*لەسەر ئاستی سیاسی بەخۆمان سەلماند و مێژووش تۆماری کرد ، دەستی یارمەتیمان بۆ گەلیکی بچوك درێژکرد کە نە لە ڕۆژئاواو نە لەڕۆژهەلات کەس نەبوو پارچە تەختەیەکیان بۆ ڕزگاربوون بۆ هەلٚبدات ، هەرچەندە تەختەیەکی بچوکیش بێت.

* لەسەر ئاستی نێودەولەتی وەختێك دێت دەتوانین بە ئەمریکیەکان یان بەبەریتانیەکان یان بەڕوسەکان بلٚێین ئێوە لەکوێ بون ؟!.

"ئەلیاب" لەراپۆرتەکەیدا پێشنیاری کردوە بۆ سەرۆکی حکومەت و وەزیری بەرگری کەدەستی یارمەتی ماددی بۆ بارزانی درێژبکەن تا بتوانێ دەست بەپێشمەرگەوە بگرێت و سەلامەتی بپارێزێت ، و جەختی لەوەکردۆتەوە کەئەو قازانجەی ئیسرائیل لەمە دەستی دەکەوێت زۆر گەورە دەبێت ، کە تا بارزانی بتوانێت بارەقورسەکە هەلٚبگرێت ، دەبێت یارمەتی بدرێت و داوا بکرێت لە ئێرانیەکان کە ڕێگە بدەن ئیسرائیل هاریکاری کورد بکات.

**********************

لە ٢٦ی ئەیلولی ١٩٦٦ دەستمان کرد بەکردنەوەی خولی پەرستاران ، "ئەبراهام تەدمور" بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە دەلێت: ((بۆچونێکی باشم سەبارەت بەئەوانە بۆ دروستبوو کە ئەوانەی هاتون بۆ ئەوەی خولەکە ببڕن ، ئارەزوی فێربونیان هەیە، سەرەتا گرفتمان بۆپەیدابوو لەدۆزینەوەی کەسانێك کە خوێندنەوە و نوسین بزانن لەناو کوردەکاندا ، پاشان هانامان بۆ ئاشوریەکان برد ، ئەوان وەچەیەکی هۆزێکی مێژویی کۆنن کە تەورات باسی کردوە، و بەرەبەرە لەناوچون زۆربەیان ناوەکانیان عیبریە لەوانە "شەعنە، یۆئنتان، ئەبرۆم، ڕابین")).

"مۆشێ ئیل" دەڵێت   سەرەتا ئاشوریەکان شکیان لێ کردین وتیان کە ئێوە لەئەوروپاوە نەهاتوون وەك ئێمە پێمان وتبون   بەڵکو لەئیسرائیلەوە دەیانویست ئەوە بسەلمێنن بە باسکردنی چەند وشەو زاراوەی ئارامی کۆن، بەڵام ئێمە بە تەواوی پشتگوێمان خستن ، کاتێك دەستمان بەخولەکە کرد، "لفکۆف" پێی وتم ئەمانە سەربازی ئیسرائیلی نین ، بەڵکو کوردن و بە هەمانشێوەی خەڵکی ئەم ناوچەیە مامەڵە دەکەن، بۆیە سەرت سوڕنەمێنێت ئەگەر دواکەوتن لەهاتنە خوێندنگا یان بەشێوەیەکی ناڕێکخراو مامەڵەیان کرد ، بەڵام زوو بۆم دەرکەوت کە ئەوان زۆر ڕێکوپێك و گوێڕایەڵی وتەکانمن.

دەستەی پزیشکی دەستیانکرد بەخولی پەرستاران بەهەمانشێوەی پەیڕەوکراو لە سوپای ئیسرائیلی دا و بە تێکڕای هەشت کاتژمێر لەڕۆژێکدا ، کاتژمێر "پێنج ونیو"ی بەیانی بەڕاکردن دەستی پێدەکرد تا کاتژمێرەکانی ئیوارە بەردەوام دەبو، لەماوەی (٣٠) ڕۆژی خولەکەدا ڕاهێنراوەکان زانیاری بنەڕەتیان وەرگرت لەسەر هەڵدڕین و فسیۆلۆجیا "کارئەندامزانی" و هۆکارەکانی نەخۆشیە درێژخایەن و کورت خایەنەکان و هەناویەکان و پزیشکی خۆپاریزی یان خوێند، وە پزیشکی نۆڕینگەیی "صیدلانی"یان خوێند، لەوانە پێوانی فشاری خوێن و لێدانی دڵ ، دەرزی لێدان وبرینپێچی ، وەستاندنی خوێن و لەگەچنانی شکاوی و ژیاندنەوە....هتد، پاش کۆتایی هاتنی خولەکە بەشداربوان مانۆڕیکیان پێ سازکرا، وایان دانا کەجەنگ بەرپابووە لەنێوان سوپای عێراقی و کوردەکان دا، بەخۆخشان چونە ئەو گردەی کەکوردەکان خۆیان لە پشتیەوە قایم کردبوو ، هەڵسان بەوەستاندنی خوێنی چەند چەکدارێك ، وە هەروەها کاری ژیاندنەوە، و گواستنەوەی بریندارەکان بۆشوینێکی پارێزراو، پاشان بە گوێزەرەوە (نقالە) گوازرانەوە بۆ نەخۆشخانەکە.

((کاتێك ئەندامانی شاندە پزیشکیەکە گەڕانەوە بۆ ئیسرائیل چەکدارە پێشمەرگەکان ورچێکی بچوکیان پێشکەش کردن، کە ڕاویان کردبوو و گرتبویان ،

ئەوەبوو لەئیسرائیل لەباخچەی ئاژەڵان دانرا ، جێی وە بیرهێنانەوەیە کە "مستەفا بارزانی" چیرۆکی شەڕکردنی لەگەڵ ورچدا زۆر دەگێڕایەوە ، دەیگوت بەلێدانێك ٨ ورچی کوشتوە، و جارێکی تریان بە فیشەك لەسەری ورچێکی داوەو کوشتویەتی ، چەندچرکەیەك بەر لەوەی هاوڕێکەی ڕاو بکات و بیخوات)).

********************

"عمیت" لە ئەیلولی ١٩٦٦ بڕیاری دا جارێکی تر بگەڕێتەوە کوردستان ، هەرچەندە "ئاشکۆڵ" زۆر حەزی پی نەبوو، بەڵام عمیت پێی وابوو کە سەردانەکە زۆر باش دەبێت ، بەجۆرێك داوەتی هەریەك لە "ڕەحبعام زەئیفی" و "ئۆلف هرۆبن" ی کرد لەگەڵیدابێن ، پاش ڕازیبوونی سەرۆکی ساواك گەیشتنە تاران ، و لە٢١ی مانگدا گەیشتنە "حاجی ئۆمەران".

کۆبونەوەکەی نێوان شاندەکە و بارزانی ٧ کاتژمێری خایاند ، "عمیت" پێی باش بوو ك بارزانی ڕووبەڕوو لەگەڵ "شا" دا کۆببێتەوەو بە یەکەوەبدوێن ، بەڵام بارزانی بەتوندی ڕەتیکردەوە.

ئەو بیرۆکەیەی بەسەردا زاڵ بوو کەئێرانیەکان ناهێڵن بێتەوە، بۆ کوردستان ، ڕازی نەبوو بەدیدارەکە هەتاوەکو سەرۆکی ساواك بەڵێنی دا کە بەسەلامەتی دەگەڕێتەوە.

لەبەرەبەیانی ٢٢ی ئەیلول دا شاندەکە ڕوویکردە تاران لە ڕێگەی دا بەرەو ئیسرائیل بەدرێژی لەگەڵ "ناسیری"دا دوان کە پێدەچوو زۆری پێ خۆش نەبێت ئەو دیدارە سازبکرێت لە کۆتایدا کە باوەڕیان پێ کرد کە زۆر گرنگە گفتوگۆ لە نیوان بارزانی و "شا" دا ساز بکرێ وتی: ((باشە ، بەڵام لێگەڕی بارزانی خۆی پێم بڵێ، من خۆم پەیوەندی بە "شا"وە دەکەم)) پێم وت: بارزانی هەرگیز داوای ئەو دیدارەی نەکردوە.

ئیسرائیل "شماریە گۆتمان" ئەندامی "کیبۆتس نگن"ی کە زانایەکی شوێنەواری ئیسرائیلی بو نارد ، تا شوێنی "لفکۆفگ بگرێتەوە لە هاریکاری کوردەکان دا ،

هەڵبژاردنی "گۆتمان"لە لایەن "لفکۆف"ەوە بەهەرەمەکی نەبوو، زۆر کەس دەیانزانی کە ئەوپیاوە کورتە باڵایە، لە ساڵی ١٩٤٢ یەکێ لەو سێ نێردراوە بوە کە مۆساد ناردنی بۆ عێراق ، بۆ کۆچپێکردنی جولەکە، کە بە"کۆچی دوەم" ناوبرا ، پاش ئەوە لەهەوالگری تایبەت بەرێکخراوی "هاگانا" کاری کردووە، سەرکردایەتی یەك بەیەکی "بەعەرەبیکراوەکان"ی کردوە، وە لەناو سوپای ئیسرائیلی بچوکدا یەکەی هەوالگری "٢٨"ی دروست کردوە ، کە تەنها بەعەرەبکراوەکانی لەخۆگرتووە ، سێ ڕۆژ وەك حاکمی "اللد" کاری کردوە ، پاش داگیرکردنی ، دۆسیەی ئەم پیاوە دەڵێت : لەساڵی ١٩٠٩ لە"سکوتلەندا" لەدایك بووە ، لە منداڵیدا کۆچیکردوە بۆ فەلەستین ، و زمانی عەرەبی بە باشی دەزانیت.
گۆتمان دەڵێت: ((هاوکاری کردنمان بۆ کوردەکان زۆر سودی پێگەیاندن ، ئێمە هاوکاریمان دەکردن ، لەجەنگیاندا دژی عێراق، تا ڕێگەبگرن لەوەی عێراق شەڕ ل دژمان بکات، یان بەشداری لەوجەنگانەدا بکات)).

**************

لە شوباتی ١٩٦٧ "گۆتمان" پاش ئەوەی تەواو بوو گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل، سەرۆك شاندێکی نوێ نێردرا بۆ ئیسرائیل ئەویش "بینی (بن تسیۆن) میتیڤ" بوو، ئەویش بەهەمان شێوە خزمەتی سەربازی لەسوپای ئیسرائیل وەك ئەفسەر لە هەوالگری سەر بەرێکخراوی ((هاگانا))ەوە دەستی پێ کردوە، وە لە سەرەتایی کارکردنی لە بواری عەرەبی دا کاری کردوە لە "نەقەب"، و لەپاش جەنگی ١٩٥٦وەك حاکمی سەربازی شاری "ڕەفەح" لەکەرتی "غەززە" دەستبەکاربوە، بەرلە هاتنی بۆکوردستان خولێکی بینی لەچەند بوارێکدا کە پێویست بوو بیان زانێت لەوێ.
لەگەڵ گەیشتنی بە کوردستان "میتیڤ" دەستیکرد بە دانانی پلانێك بۆ ڕاکردن لەکورستان لەکاتی پێویست دا، بەپێی فەرمانی مۆساد، بۆ ئەو مەبەستە ٤ ئەسپی چنگ کەوت، هەریەکە بۆ ئەندامێکی شاندەکە تا لەسەر پشتیان ڕاکەن ، بۆ ئێران

کەپێویستی دەکرد لەڕێی شاخەکانەوە ، پاشان لەگەڵ ئەندامانی شاندەکە هەڵسان بەزنجیرەیەکی درێژ گەشت و گەڕان و بەسەرکردنەوە لەناوچەکەدا بۆ دیاریکردنی باشترین ڕێگەی ڕاکردن بەسەر پشتی ئەسپ.

شیاوی وتنە یەکێ لە ئەندامانی شاندەکە لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوەو دەستێکی شکا، بۆیە پلانی ڕاکردن لەسەرپشتی ئەسپەکان هەڵوەشایەوە.

"میتیف" دەڵێ : لەکوردستان زانیویەتی کە بەڕێوەبردنی ئەو لە هیچ ئاراستەیەك سودی نیە، چونکە دەگەڕێتەوە سەر شێوەی یەکەم جاری، وە لە کوردەکان هێزێکی تایبەتی بە دی کرد لە بیرکردنەوە بە شێوازی خۆیان ، لە "ئیدریس" و "مەسعود" دا گرنگیپێدانێکی زۆری بەبزوتنەوەی زایۆنیزم دەبینی ، و ئارەزویان دەکرد بزانن چۆن پەرەی سەندوە، هەروەها هەستیان بەبێزارییەکی زۆر دەکرد کە جیهان گرنگی بە کێشەی کورد نادات، ئەم گوێ پێ نەدانەیان وەکو خیانەت تەماشا دەکرد ، بەباشی دەیانزانی کە ئێرانیەکان خیانەت لە دۆسیەی کورد دەکەن و، پشتگیریەکەشیان کاتی یە.

لە ٧ی نیسان عەقراوی کە لەو خەڵکە زۆر کەمە بوو کە بە حەقیقەتی ئەوی دەزانی بە \پێکەنینەوە پێی وتبوو : ((چەند فڕۆکەیەکی بەریتانی "مەبەستی ئیسرائیل بوو" شەش فڕۆکەی "مێگ"ی میسریان خستۆتە خوارەوە).

لە ناوەڕاستی ئایاری ١٩٦٧ "میتێف" ماوەی کاری خۆی کۆتایی پێ هێناو گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل .

"د.تریستەر" مایەوە وەك جێگرەوەی ئەو کەسەرکردایەتی نەخۆشخانە مەیدانیەکەش دەکرد، "تریستەر" دەیزانی کە دوو کەسایەتی کوردی گەورە لەسەرکردایەتی یاخیبون کە یەکێکیان "ئازاد"ە سەردانی ئیسرائیلی کردوە ، لە کاتێکدا دڵەڕاوکێ لە ئیسرائیل زیادی کردبوو وەك ئامادەکاری سەرەتایی بۆ جەنگی ١٩٦٧ ، ئەو دوانە لەگەڵ کەسایەتی باڵای ئیسرائیلی کۆببونەوە ، لەناویان

دا سکرتێری پارتی "مبای" و وەزیری دەرەوە "گۆڵدا مائیر" کەیەکێ بوو ولەوانەی زۆر لایەنگری هارکاریکردنی کوردەکان بوو.

لە ٢٥ی ئایاردا ، "لفکۆف" گەڕایەوە بۆ کوردستان ، بینی ئیسرائیلیەکان لەدڵەڕاوکێیەکی زۆردان بە هۆی ئەو هەواڵانەی کەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنی عەرەبی بڵاوی دەکەنەوە و دەیانەوێ چی لەئیسرائیل بکەن ، بینی کەپەتای دڵەڕاوکی کوردەکانیشی گرتۆتەوە، پێێ وتن : مەترسن و داوای لێکردن گوێ لە هەواڵی وێستگە میدیاییە عەرەبەکان نەگرن.

*****************

لە ٢ی حوزەیران ١٩٦٧ جێگری سەرۆکی ئەرکانی عێراق و ژمارەیەك لە گەورەئەفسەرانی هاتنەبارەگای بارزانی وداوایان لێ کرد کە هاوکاری عێراق بکات لەدژی ئیسرائیل .

بارزانی دواتر بە پەیامنێری ڕۆژنامەی "لۆمۆند"ی فەڕەنسی "ئەریك ڕۆلۆ" ی وتبو: ((عێراقیەکان داوایان لێ کردوم کە پاڵپشتی خۆم بۆ عەرەب ڕابگەیەنم ، پیم وتن تاکە هۆکار بۆ خۆپاراستن بەبێ جەنگ ئەوەیە داوا لە"عبدالناصر" بکەن ، هێزەکانی بکشێنێتەوە لەسنور ، و کەنداوی "عەقەبە" بە ڕوی دەریاوانی ئیسرائیلی دا بکاتەوە، ئەگینا هەمو سوپا عەرەبیەکان توشی دۆڕان دەبن، گاڵتەیان پێ کردم، داوایان لێ کردم کە چەند یەکەیەکی کورد بنێرم بۆژێردەستیان تا لە دژی ئیسرائیل بجەنگن ، منیش پێم وتن : ئێوە شەش ساڵە شەڕمان لەدژدەکەن، چۆن داوای ئەوەمان لێ دەکەن دەستی یارمەتیتان بۆ دریژ بکەین؟)).

کاتێك نوێنەرانی حکومەتی ناوەندی داوایان کردبوو، هەر هێزێکی ڕەمزی بنێرێت بۆ "بەغداد" تا بەشداری جەنگ بکات ، ، بارزانی وەلامی دابوەوە: ((ئێوە وەك ڕێگر مامەڵەتان لەگەڵ دەکردم ، بۆیە ناجولێم و یارمەتیتان ناکەم ،

خۆتان لەو قوڕاوە دەرچن کە بۆخۆتان سازکردوە، پیشتر ئاگادارم کردن بەڵام گوێتان پێ نەدا)).

"دەیفید کرۆن" ئەوکاتە لە کوردستان بوو ، دەڵێت: ((ڕۆژێکیان بارزانی هات بۆ لام ، وتی لەبەرنەوەی سوپای عێراقی بەشداری دەکات لەجەنگی گشتگیری سوپا عەرەبیەکان دژی ئیسرائیل ، نوێنەرانی حکومەت و سوپا داویان لێ کردوم کە ئاگربەست لەگەڵیان دا مۆر بکەم ، و بەشداری جەنگەکەش بکەم بەناردنی چەند یەکەیەك ، من هەرگیز بیرلەوە ناکەمەوە کەبەشداری جەنگ بکەم دژی ئیسرائیل ، بەڵام بیرۆکەی ئاگربەستم بەدڵە ئەگەر ئاگربەست بکەم ، ئیسرائیل دەستبەردارم نابێت ، دەمەوێت وەڵامێکی بەپەلەم دەست بکەوێت شاندەکەیان چاوەڕێی وەڵامی منن ، لەوماوەیەدا هاوکاریەکانی ئیسرائیل بۆ کورد لە هەموو ڕویەکەوە بوو، کرۆن بیری بۆ زۆر شت دەڕۆیی کە بارزانی لەگەڵیدا دەدوا.

دەیویست پێی بڵێ: ((تەنها هاریکاری نەکردنی عێراقیەکان بەس نیە ، بەڵکو دەبێت هێرش بکەیتە سەریان تانەهێڵیت سوپا بنێرن بۆ" ئوردن" بەڵام زانیم کە ئەگەر واشی پێ بڵیم واناکات ، هێزەکەی ناتوانێت بەرگە بگرێت و نەهێڵێت زۆرینەی سوپای عێراق بنێرێت بۆجەنگ دژی ئێمە لە ئەردەن ، وە سەرکردایەتی یاخیبوون ناتوانێت بەشێوەیەکی سیاسی هاوهەڵوێست بێت لەگەڵ ئیسرائیل دژی کۆششی گشتگیری عەرەب)).

بۆیە کرۆن بە بارزانی وت: ((تۆ لێپرسراوێتی گەلی کوردت خستۆتە ئەستۆی خۆت ، بۆیە ئەوە بۆخۆت جێ دەهێڵم ئەو کارە بکە کەپێت وایە لەبەرژەوەندی گەلی کورددایە ، ئیسرائیل لەگەڵتدا دەبێت هەربڕیارێك بدەیت)).

بارزانی دواتر بە کرۆن دەڵێت : کە ئامۆژگاری عێراقیەکانی کردووە ، خۆیان لەجەنگەوە نەگلێنن و ڕازی نەبووبوو بە داواکاریەکەیان بەناردنی هێزێکی ڕەمزی بۆ شەڕگەکە لە دژی ئیسرائیل ، بەڵام پەیمانەکەی بەجێ هێنا بە پاراستنی هێمنی شەڕگەی عێرقی – کوردی ، بەوەش هاوکاری پێشکەش کردن

جێگەی باسکردنە عێراقیەکان ئەگەر کوردەکان ڕێگریشیان لێ بکردنایە هەر هێزیان دەنارد بۆ جەنگ ، دوو لیوای عێراقی بەس بوو بۆ.سەرقاڵ کردن و بێدەنگ کردنی کوردەکان.

عمیت دواتر دەڵێت: ((هەوڵم دا کە بارزانی ڕازی بکەم بەکردنەوەی شەڕگەیەك لەدژی عێراقیەکان بەجۆرێك ڕێ بگرێت لەناردنی هێزەکانیان ، داواکەی ڕەتنەکردەوە بەڵام زۆر کەمی کرد)).

"لفکۆف" دەڵێت : داواکاریەکەی "عمیت"م گواستەوە بۆ بارزانی ، بەئاشکرا داوای کارکردنی کردبوو دژی سوپای عێراقی بەڵام بارزانی پێی وتم با واز لە جەنگ بهێنین ئێمە هەردولامان هەین ئەوە دەکەین کەدەتوانین بیکەین.

لە ڕۆحیەتی ئەو تێگەیشتم دەمزانی کە قەبارەی هێز و تواناکانی دەزانێت ، پەیوەندیم کرد بەئیسرائیلەوەو وەڵامەکەم دایەوە بە عمیت.

بارزانی لە جەنگەکەدا مژدە و تۆڵە سەندنەوەی دەبینی بە "لفکۆف"ی وتبوو: ((بەردەوام بوون لە کوشتن و کاولکردنمان بۆ ساڵانیکی دورودرێژ ڕەشەوڵاخ و ماڵاتەکانمانیان بەتەواوی لەناوبرد، کێڵگە درێژ و زۆرەکانیان سوتاندین و دەبێت ئێوەش زرێپۆش و پیادەکانیان تێك بشکێنن ، لەماوەی مانگێکدا لێ بگەڕێن بڵێم هەفتەیەك )).

لە ٥ی حوزەیراندا لفکۆف بە بارزانی وت : ((بەهێزترین هێزی ئاسمانی کە ماوە هیێزی ئاسمانی "لوبنان"ە ، ئیسرائیل هەمو هێزە ئاسمانیەکانی عەرەبی لەناوبردوە)).

پاشان "لفکۆف" نەخشەیەکی ئامادەکرد کەچۆنیەتی بەڕێوەچوونی جەنگەکانی لەسەر وێنەکێشابوو بارزانی سەیری دەکرد ، پاشان چوە دەرەوەو پاش کەمێك گەڕایەوە نەخشەیەکی بەدەستەوە بوو ، کەڕێرەوی جەنگەکەی لەسەر دیاری کردبوو بەپێی لێکدانەوەی خۆی.

لەسەر ئەو نەخشەیە کە تائیستا لەناو فایلەکانی مۆساددا پارێزراوە ، ئەستێرەسورەکەی داود لەسەر هەریەك لە "دیمەشق" و "بەغداد" و "قاهیرە" هەیە ، خۆشترین چرکەسات ئەو کاتە بوو کە هەواڵمان پێگەیی لە بارەی داگیرکردنی "قودس" ، ئێمە ئەندامانی شاندە ئیسرائیلیەکە بەسەر لوتکەی چیایەکی کوردستاندا دانیشتبوین ئاهەنگمان دەگێڕا بەهۆی ئەو سەرکەوتنە گەورەیە و بارزانیش بە شیوازی خۆی ئاهەنگی گێڕا ، یەکێ لەخزمەتکارەکانی بەرانێکی گەورەی هێنا شریتێکی شین و سپی لەملیدا بوو نیشانەی ئاڵای ئیسرائیل لەسەری نوسرابوو "پیرۆزبایی لە ئیسرائیل بکەن بە بۆنەی داگیر کردنی (حبل البیت)ەوە ئەمشەو مەڕێك دەکەینە قوربانی لەسەر داگیر کردنی بیت المقدس ".

هەموو کوردستان شادی و خۆشی دایگرتەوە بەهۆی تێکشکاندنی هێزی ئاسمانی عێراقەوە کە بەبەردەوامی گوندەکانی کوردستانی بۆمباران دەکرد ، کاتێك شەڕ لە شەڕگەکان کۆتایی پێهات ، مۆساد داوای "تسوری ساجی" کرد ، کەبگەڕێتەوە بۆ کوردستان ، عێراقیەکان دوو فرۆکەوانی ئیسرائیلیان دەستگر کردبوو، ئەوانیش "ئیسحاق گلینس جۆلان" کە بەپەرەشوت لەسەرخاکی عێراقیی نیشتبوەوە ، دوەمیان بریتی بوو لە "جەدعون درور" کە ئەویش لە فرۆکەیەکی تری ئیسرائیل خۆی هەڵدابوو بەپەرەشوت ، کە دوو فرۆکەکە لە ٧ی حوزەیرانی ١٩٦٧ لەو هێرشەدا کە کردبویانە سەر فرۆکەخانەی سەربازی "H- ٣"ی سەر سنوری "عێراق – ئەردەن"کەوتبوونە خوارەوە.

"تسوری ساجی" ڕاسپێردرابوو کە پلانێك دابنێت بۆڕزگارکردنی دوو فرۆکەوانەکە لەدیلی ، یان فڕاندنی ئەفسەری عێراقی وەك بارمتە ، بەڵام عێراقیەکان هەرزوو فرۆکەوانەکانیان تەسلیمی ئەردەن کرد ، ئەوانیش گەڕاندیانەوە بۆ ئیسرائیل.

## بەشی شازدەهەم/ هەرەسەکە لەو لایەوە ڕویدا

سەربازێك لەڕاجیمەکەیدا هەڵەیکرد لەو مانۆڕە سەربازییەی کە کەتیبەی پەرەشوتەوانی " ٨٩٠" ئەنجامی دابوو ، لە نزیك گوندی "زەعورە" کەدەکەوێتە لێواری بەرزاییەکانی "جۆلان"، لەکانونی یەکەمی ١٩٦٧ بەهۆی ئەو لادانە کەمەی لە گۆشەی تەقاندندا ڕویدا تۆپەکە لەنزیك سەرکردایەتی لیوای "پەرەشوتەوانی ٣٥ "کەوتەوە ، بوە هۆی ئەوەی کە یەکێ لە پارچەکان بەرئەژنۆی فەرماندەی لیواکە عقید "دانی ماط" بکەوێت کەیەکێ لە بەناوبانگترین جەنگاوەرانی لیواکە بوو، هەروەها میوانیکی بیانی لیواکەش بریندار بوو کە لای ئەفسەرەکان بە ژەنەڕاڵ "گۆنزالێس" لەسوپای ئیساپانی ناسێنرابوو.

ئەو دکتۆرەی کە لەلیواکە کاری دەکرد دکتۆر "میخائیل ئالکن" بوو ، هەستا بەدەرهێنانەوەی ئەو پارچەیەی کە دابووی لەسمتی میوانەکە ، وەك دیاریەك لەسەر زەوی پیرۆزەوە پێشکەشی کرد ، میوانەکە بەچەند ووشەیەك لە ژێر لێویەوە بۆڵەبۆڵی کرد ، دکتۆرەکە ویستی شی بکاتەوە بۆی دەرکەوت کەئیسپانی نیە ، بەتایبەتی کاتێك میوانەکە بە زمانی عەرەبی بەدکتۆری وت "شکرا" پاشان ئەلکن بۆ هاوڕێکانی ژەنەرالی ڕونکردەوە کەپێویستە چۆن گرنگی پێبدرێت پاشان چاوی داگرت و وتی: (ئەگەر ژەنەراڵە ئیسپانیەکە پێویستی بەچارەسەر بوو ئەوە ئامادەم گەشت بکەم بۆ وڵاتەکەی و چارەسەری بۆ بکەم".

هاوڕێکەی ژەنەڕاڵ کە "تسوری ساجی" بوو ، وتی : بابزانین، بەم شێوەیە چیرۆکی پەیوەندی نێوان "دکتۆر ئالکن" و کێشەی کورد دەستی پێکرد بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئەو کەسەی چارەسەری کرد کەس نیە جگە لە فەرماندەی گەورەی کورد "مقدم عزیز رشید عەقراوی" ، کە پێشتر ناوی هێنراوە.

"عەقراوی" وتبوی کە ئەکادیمی سەربازی لەبەریتانیا و یەکیتی سۆڤیەت تەواوکردوە، ساڵی ١٩٦٢ لە سوپای عێراقی ڕایکردوەو ، پەیوەندی بەیاخیبوانەوە

کردوه ، ساجی هاوەڵێتی دەکرد و بۆ زۆربەی پێگەو شوێنەکان ، کاتێك بە ئۆتۆمبیل بە نزیك "وادی عارە"دا تێدەپەڕین دوو عەرەبیان بینی ، عەقراوی هاواری کرد و ووتی "ئەوانە عەرەبن ، بە پەلە تەقەیان لێ بکە" بەڵام "ساجی" پێیووت : "ئەوانە عەرەبن بەڵام هاوڵاتی ئیسرائیلین" ، "عەقراوی" بە سەرسوڕمانەوە وتی: "عەرەب دەیانەوێت لەناوتان بەرن ئەوە نازانن؟؟".

"تسوری" بەڵێنەکەی بە "دکتۆر ئالکن"ی دابوو لە بیری نەکرد پێشنیاری کرد بۆ "ئۆڵف هرۆبن" کەبینێرێت بۆ کوردستان بۆ ماوەی چەند مانگێك ، "ئالکن" داوای کرد بە تەواوی لەدۆسیەکە بکۆڵێتەوە دەستی کرد بەهەڵدانەوەی مەلەفی مۆساد لەکوردستان ، بۆی ڕون بوەوە کە مۆساد لە زۆر بواردا کاری کردوە لە کوردستان.

کاتێك سەرۆکی مۆساد ماڵئاوایی کرد و بەڕێیدەکرد بۆ کوردستان "عمیت" پێی وت: ((تا ئێستا لەئەشکەوتەکانی "ئەردەن" خزمەتت کردوە ، کە هەمیشە لە ژێرهەڕەشەی فڕۆکە عێراقیەکاندا بوی ، ئێستا دەگوازیتەوە بۆ ناوچەیەکی نوێ کە لیوایەکی عێراقی لێ سەرقاڵ دەکرێ تا هەڕەشە لە دۆڵی ئەردەن نەکات)).

**************

لە ١١ی ئازاری ١٩٦٨ "ئالکن" گەیشتە تاران و لەوێ کرۆن پێی وت: ((دوژمنی ڕاستەقینە لێرە عێراق نیە ، بەڵکو گۆشەگیریە)).

لەشوێنی گەیشتندا "حسین" چاوەڕێی دەکرد کەبەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە بوو، لەگەل "سلیمان باکۆ"ی سەرۆکی پاسەوانانی نەخۆشخانەکە هەردولا بەپێکەنینەوە چاك و چۆنیان کرد و پاشان سواری ئەو ئۆتۆمبیلە "جێب"ە بون کە ئەمجارەیان "یوسف لۆنتس" لێی دەخوڕی کەڕۆژهەڵاتناس و ئەفسەرێکی ئیسرائیلی بوو بەپلەی نقیب ، پیاویکی نائاسایی بوو، وەك "زەئیفی" باسی دەکات ، بەرز کردنەوەی پلەکەی گەیشتە ڕوتبەی "عمید" ، و پاشان وەکو "حاکمی سڤیل" لە "کەناری ڕۆژئاوا" دامەزرا هەتا کۆتایی ژیانی.

"لۆنتس" تەنها لە ناو کوردەکاندا نەتوابووەوە ، بەڵکو تاکە ئیسرائیلی بو کە زمانی کوردی بەباشی دەزانی ، ئۆتۆمبیلەکە دەستە ئیسرائیلیەکەی بەرەو شارۆچکەی "دیلمان" دەبرد کە شاری زستانەی بارزانی بوو ، گفتوگۆ لەنیوان "ئالکن" و ئەندامانی دەستە ئیسرائیلیەکە هەتا کاتژمێرەکانی بەرەبەیان بەردەوام بوو، کاتێك ئالکن هەستیکرد کە لەوەزیاتر ناتوانیت چاوەکانی بکاتەوە ، بارزانی داوای لێ کرد کەپشکنینی بۆ بکات تا لەتەندروستی دڵنیا بێت.
بارزانی جلەکانی داکەند و فەرمانی کرد کە هەموتان دەبێ برۆنە دەرەوە ، دکتۆرە ئیسرائیلیەکەش هەستایە سەرپێ لەپاش نۆرینەکەی "فحص" دکتۆرەکە بەزمانی عیبری چەند وشەیەکی وت : بارزانی سەری ئەلەقاند وەك ئەوەی کە تێبگات چی دەڵێت جلەکانی لەبەرکردەوەو فەرمانیدا بە هەموان کە بێنەژوورەوە بۆ بەردەوامی گفتوگۆکان.
بارزانی داواشی لە"ئالکن" کرد کە ئەسپی پێشمەرگەکان و ئەسپەکەی خۆشی چارەسەر بکات ، لەبەرئەوەی ئالکن لەو بوارەدا کاری نەکردبوو وردەکاری نەخۆشیەکانی نارد بۆ ئیسرائیل و لەوێوە چارەسەرەکەی بۆهات بەنوسراو، وەك ئەوەی پێ وترابوو کە دەرزییەکی پەنسلین لە ئەسپەکە بدات چاك دەبێت و سەلامەت دەبیت، وە جاریکیان ئەسپیکی خۆشەویستی بارزانی بەسەر دیواریکی تیژدا بازی داو بەمەش ورگی هەڵدراو ڕیخۆڵەی هاتە دەرەوە ، دکتۆرەکە فەرمانی کرد بە شەش لە پاسەوانەکان لەسەر زەوی ڕایبکێشن پاشان برینەکەی دوریەوە، ئالکن دەڵێت: ((بریارمدا فێری زمانی عەرەبی ببم چونکە بۆم دەرکەوت کە بەبێ ئەوە ناتوانم لەگەڵ خەڵکەکە لەیەك بگەین، یان کاری زۆر بکەم، بۆیە داوام لە "عمیران" کرد شەوانە فیرم بکات)).
((ئێوارەیەکیان بارزانی هات بۆ نەخۆشخانەکە و لەگەڵماندا دانیشت دەستی بە قسەکرد و وتی: تەنها عێراقیەکان دوژمن نین ، بەڵکو ئێرانیەکانیش بەڵام دەزانیت کەناتوانیت سەرپەرشتی یاخیبونەکە بکات بەبێ هاوکاری ئەوان یان بە

لاوەیان بنێت ، وە بارزانی بێ ئومیدی خۆی بەجیهانی ڕۆژئاوا دەربڕی کەپشتیان لەخەباتی کورد کردوە، بە تایبەتیش ئەمریکا کە دەبینێت چی ڕودەدات ، کەچی وەك بینەرێك تەماشا دەکات)).

وە بارزانی وتی: ((ئەگەر ئەمریکا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ جەنگی ڤیتنام بوەستێنێت ئەوا بەو پارەیەی لەو سێ ڕۆژەدا بۆی دەگەڕێتەوە دەتوانم ناکۆکی عێراقی – کوردی بە یەکجاری کۆتایی پێ بهێنم، پاشان ڕویکردە ئێمەو وتی: ئێوەی ئیسرائیلی کاریگەری زۆرتان لەسەرسەرۆکی ئەمریکی هەیە، کیشەی ئێمەی بخەنە بەردەم لەوانەیە ئەو خستنەڕووە پارمەتیمان بدات ، ئەگەر وازمان لێ بهێنن ، وئێرانیەکانیش خیانەتمان لێ بکەن ئەوا ٤٠ جەنگاوەر لەگەڵ خۆم دەبەم ڕوو لەچیا دەکەم)).

((کاتێك بارزانی جێی هێشتین پاریدەدەرە هونەریەکە دایە قاقای پێکەنێن و وتی: "دەیەوێ سەرکەوێتە سەر چیا ، بۆ پێی وایە ئیستا لە کوێیە ، ئایا لە دەشتدایە، هەمومان دەستمان کرد بە پێکەنین")).

*****************

(("شەکیب عەقراوی" ئامۆزای ئەو "عەقراوی"یەیە باسمان کرد سەردانی کردین لەنەخۆشخانە بە "ئالکن"ی وت بەیانی لەهموو ناوچەکانی پاخیبوانەوە قوتابیان ڕودەکەنەئێرە بۆ خولی پەرستاران، پاشان لەگەڵ "شەکیب" تا لای ئۆتۆمبیلەکەی ڕۆشتم، لەڕێگا پێی وتم : ((دەترسم عێراقیەکان لەچەند ڕۆژی ئایندەدا هێرشمان بکەنە سەر ، بە بێ گرنگی پێدان و شان ڕاوەشاندن و وتم چی بکەین با بێن، ئایا بەو دەمانچە وشەش تفەنگەی کە لامانەوە وەڵامیان بدەینەوە؟ شەکیب زۆر دودڵ دیاربوو)).

((بە "عومیران"م وت : ئەگەری زۆرە فرۆکە عێراقیەکان هیرشمان بکەنەسەر ئەو مەترسیە زۆرەم بۆ ڕونکردەوە کە لەوانەیە بۆمان پێش بێت وتم لەبەر ئەوەی ئێمە ناتوانین نەخۆشخانە بشارینەوەو لە ناو زوری قایمدا کار بکەین ،

پێویستەڕابکەین لەشوێنەکە ، لەگەڵ نەخۆشەکاندا بچینە پشت بەردەکانی چیای "مام ڕوت" و خۆمان بشارینەوە)) .
((فەرمانم بە"حسین" کرد کە نەوت لەچیشتخانەکە دور بخاتەوەو "جێب"ەکەش لەژێر دارەکەدا بشارێتەوە)).

*******************

لە ١٥ی نیساندا نێردراویك لە "میرخان"ەوە هات وەکوپێشتر باسمان کرد ئەوە ناوی نهێنی بەرپرسیکی گەورەی کورد بوو ، وتی : ((دەبیت پێشبینی ئەوە بکەن کە فڕۆکە عێراقیەکان بۆردومانی ناوچە کوردیەکان بکەن، فڕۆکەکان هێرشیان کردۆتە سەر ناوچە کوردیەکانی باکور و شەڕ لەوێ گەرمە)).
ئالکن دەڵێت: ((سەردانی "ئیدریس"مان کرد لە ماڵەکەی زۆر تووڕە دیاربوو ، وتی : بریاری داوە "بالازمە"[1] ی ژنی لە کوردستان دوربخاتەوە ، شەڕەکان لە باکوردا جدین ژمارەیەکی زۆر کورد کوژراون و بریندار بوون بەهۆی بۆمبارانی تۆپخانەی عێراقی و فڕۆکەکانەوە ، پیم وت نەخۆشخانەکە پارێزراو نیە، پەیمانی دا بەدانانی دۆشکەیەکی قورس لەگۆڕەپانیکی نزیك لە نەخۆشخانەکەوە، بەڵام جێ بەجێی نەکرد)

[1] نازانم بالازمە ناوی خیزانەکەیەتی یان وشەی (بیل ازمە )ی عەرەبی چونکە لەم ولاتەی ئیمەدا ناوی دایك و خێزان و کچی سەرۆك و سەرکردەکان زور گران دەست دەکەوێت -وەرگێر-

## بەشی حەڤدەهەم/

## بارزانی بە نهێنی سەردانی ئیسرائیل دەکات

لایەنە ئیسرائیلیەکان لەناوەڕاستی نیسانی ١٩٦٨ پێیان وابوو کە ئەو مێژووە گونجاوە بۆهێنانی بارزانی بۆ ئیسرائیل ئەو ژوانە هاوکات بوو لەگەڵ جەژنی "الفصح"[١] ی عیبری کە بە "بیسع" ناودەبرێت بۆیە لایەنە ئیسرائیلیەکان لە"باکور" بارزانیان ناونا "بیسع".

لیژنەیەکی تایبەت لەنوێنەرانی مۆساد و سوپای ئیسرائیل دەستیان بەئامادەکاری کرد لەسەرچۆنیەتی سەردانەکە، لفکۆف پێشنیاری کرد کە دیدارێك لەنێوان بارزانی "داود حاجە خنو – دێفد جبای" ساز بکرێت هاوڕێ کۆنە جولەکەکەی لەکوردستان ، چونکە یەکێ لەهۆکارەکانی سەردانەکەی بینینی ئەو هاوڕێیەی دەبێت ، "جبای" ئاگاداربوو لەو پەیوەندییانەی لەگۆڕێدان بۆهێنانی بارزانی بە هەوالگری وتبو: ((کوردەکان هیشتا ئەو حوکمەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیان لەبیرە کە حوکمی لەسێدارەدانی بەسەر باوکی بارزانی دادابوو ، ئەو کۆششەی باوکم کردی بۆ ڕزگارکردنی لەگوریسی سیدارە ، ڕویکردە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بڕێکی زۆر زێڕی لەگەڵ خۆیدا بردبوو داوای لە "سوڵتان" کردبوو لەهاوڕێکەی خۆش بێت ، ئاڵتونەکە کاری خۆی کردبوو، سوڵتان لێبوردنی خۆی دەرکردبوو، بەڵام قەزاو قەدەری خوا وای کردبوو کە لە کاتی گەڕانەوەی باوکمدا باوکی بارزانی کۆچی دوایی کرد)).

کاتێك بارزانی ڕاگوێزرا بۆ یەکیتی سۆڤیەت پاش لەناوبردنی کۆماری مەهاباد "دیڤید جبای" تاوانبارکرا بە یارمەتیدانی بارزانی ، بەڵام جبای وتبوی کە لەژێر هەرەشەدا ئەو کارەی کردوە ، ئەمجارەیان زێرەکە کاری خۆی کردبوو لە مردن ڕزگاری بوو.

---

[١] جەژنێکی جولەکەکانە یادی دەرچونیان دەکەنەوە لە میسر وشەکە لە (فسح)ی عەرەبی وەرگیراوە ، بە مانای پەڕینەوە یان ڕزگاری دێت –وەرگێر-

ئەو فڕۆکەیەی کە بارزانی هەلگرتبو لەڕێگەیەکی لاوەکی لە فڕۆکەخانەی "اللد" نیشتەوە "دکتۆرمەحمود" و "موفتی" و پێنج پاسەوانی تایبەتی لەگەڵدابوو ، کەچەکی کلاشینکۆفیان پێ بوو ، "لفکۆف" و "عمیت" و ژمارەیەك لەناسیاوە ئیسرائیلیەکانی پێشوازیان لێ کرد ، بارزانی بەسەر ئامادەبواندا هاتوو ، یەك بە دوای یەك باوەشی پێداکردن و تەوقەی لەگەڵ کردن ، پاشان ووتی: دیڤید کوا؟ ، "عمیت" ووتی: لە "کیبۆتس"ە ،بارزانی وتی : ئێوە نەتان کرد بە ئەندامی کنێست ، ئیشتان هەر وایە پێم بڵێن کەی دەیبینم؟.

بارزانی سەرەتا لەگەڵ سەرۆکی وڵات "زەلمان شۆڤال" کۆبووەوە "لفکۆف" و "عمیت" و "کرۆن" ئامادەی کۆبونەوەکە بون سەرەڕای هەموو ئەو داواریانەی لێیکرا بارزانی رەتیکردەوە کەدەمانچەپڕەکەی دابنێت ، "لفکۆف" هەوڵی دا کە بەهانەی ئەم هەڵوێستە بەوە بهێنێتەوە کەوتی : "( ........) تان بینیوە (.........)"ی خۆی ببڕێت ؟ ئەو دوانە بە یەکەوە گونجاون.

درێژی بە زمانی ڕووسی بە یەکەوە قسەیان دەکرد، بارزانی وتی: ((پێتان وتم ئەرکی سەرۆکی وڵات وەك هێلکە وایە بۆ مریشك پێش ئەوەی بیکات ، کە کەس نایبینێت ، بەڵام ئێستا پاش ئەوەی دیدارم کرد بۆم دەرکەوت کەبەڕاستی مرۆڤە)).

پێدەچوو بارزانی زۆر کاریگەر بووبێت بەئامۆژگاریەکانی "شۆڤال" کە پێی وت : ((واز لە بیرۆکەی ئۆتۆنۆمی بهێنە کار بکە لە پیناو دروستکردنی دەوڵەتی کوردی ، کرۆن زۆر بە گرنگی گوێی لە قسەکانی نێوانیان گرتبوو ، بۆیە بەنهێنی پێکەنی و بە خۆی گوت: "سەرۆکی وڵات ئاگاداری بارودۆخە سیاسیەکان نیە ، نازانێ چی لە کوردستان دەگوزەرێت ، بۆیە بەکەیفی خۆی قسەدەکات ، نازانێ کەهاریکاری کردنی کوردەکان بەتەنسیق لەگەڵ ئێرانیەکان دەکرێت، ئێرانیەکانیش بەهیچ شێوەیەك ڕێگە بەدامەزراندنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆی نادات )).

لەپاش کۆبونەوەی لەگەڵ سەرۆکی وڵات بارزانی لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەدا کۆبوەوە کە سەردانی کوردستانیان کردبوو ، ئەوانیش هاوڕێیەتیان دەکرد لەو

دیدارانەدا کە لەگەڵ لێپرسراوە ئیسرائیلیە باڵاکاندا ئەنجامی دا ، لەوانە دیدار لەگەڵ "ئەبا ئیبان"ی وەزیری دەرەوە بەئامادەبونی بەڕێوەبەری نوسینگەکەی کە ناوی "ئیتان بن تسور"بوو ، پاشان لەگەڵ "لیڤی ئاشکۆڵ" سەرۆکی حکومەت کۆبوەوە بە ئامادەبونی دکتۆر "یعقوب هرتسۆخ" بەڕێوەبەری گشتی نوسینگەکەی و "عمیت" ی سەرۆکی مۆساد و "حاییم لفکۆف" ، بە درێژایی ماوەکە بە ڕوسی دەدوان ، ژنەکەی ئاشکۆڵ وەرگێرانی دەکرد لە "ڕوسی" یەوە بۆ "عیبری" ، ئاشکۆڵ پەیمانی دا بە زیادکردنی هاوکاری بۆ کوردەکان وە درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆیان لە نەتەوەیەکگرتوەکاندا .

هەروەها "مۆشی دەیان" پێشوازی لێکرد هەرزوو لێکتێگەیشتن لەنێوانیاندا دروست بوون دوو پیاوەکە زۆرخاڵی هاوبەش لە نیوانیاند هەبو، هەردوکیان پێشتر کشتکار (فەلاح) بون.

لەکۆتایدا "دێڤید جبای" هێنرا پاش ئەوەی داوای لێبوردنمان لێ کرد کە بەبێ ئاگادارکردنەوەی خێزانەکەی لەماڵ دورمان خستەوە کاتێك من و ئەو چووینە ئەو ژورەی کەمستەفا بارزانی لێ بوو، "دیڤد جبای" هەوڵی دا پێڵاوەکانی بارزانی ماچ بکات ، بەڵام بارزانی هەڵساندەوەو باوەشیان بەیەکدا کردو، بە کوڵ دەگریان ، بەیەکەوە چەند کاتژمێرێك دانیشتن و دەدوان ، لە کۆتای دیدارەکەدا بارزانی پرسی "جبای" لە کوێ دەخەوێت؟ کاتێك وتمان لە ژورەکەی تەنیشتتە ، سوربوو لەسەرئەوەی بیبینێت ، تا خۆی دڵنیابوو لەوەی کە مامەڵەمان لەگەڵ "جبای" تەواو وەك مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەوا، دەستی لە سیسەم و چەزمەکان دا پاش ئەوەی لە هەمو شتێك دڵنیا بو ، گەڕایەوە بۆ ژورەکەی.

لەهەفتەی داهاتوودا بارزانی وەڵامی هاوڕێکەی دایەوە کە سەردانی ماڵەکەی کرد لە "تەبەریە" لەگەڵ ئەو و منداڵەکانی و خێزانەکەیدا نانی خوارد و دیاریەکی پێشکەش کرد کە بریتی بوو لە پاکەتێکی سیگار خۆی پیچابونیەوە ، کەعادەتی کوردەکان وایە، بڕیاربوو کە سەردانی بارزانی بۆ ئیسرائیل بە نهێنی بهێڵرێتەوە بەڵام "ئاشکۆڵ" لەوەترسا کە هەواڵی سەردانەکەی دزە بکات ، لەبەر زۆرلایەن ،

بۆیە فەرمانی دا بە ئەنجامدانی دیدار لەنێوان بارزانی سەرنوسەرانی ڕۆژنامە ئیسرائیلیەکاندا ، مۆساد ئاهەنگێکی گەورەی بۆ بارزانی سازکرد کە ژمارەیەکی زۆر کەسایەتی ئیسرائیلی ئامادەبون لەوانە : "مەناحیم بێگن" سەرۆکی حیزبی "لیکۆد" ، کەئەوسا لەپۆستی وەزیری بێوەزارت بوو لەحکومەتی یەکێتی نیشتمانی کە لەپاش جەنگی ۱۹٦۷ پێم هات، هەروەها مۆساد بانگهێشتی گۆرانیبێژ "شوشنە دیماری" کرد ، تا ئاهەنگەکە بە گۆرانیەکانی بڕازێنێتەوە و پێی وترا کە ئەومیوانەی کە ئاهەنگەکە لەسەرشەرەفی ئەو ساز دەکرێت خەڵکی ئێرانە.

لە ڕێگای گەڕانەوەدا بارزانی خەریك بوو چاوی لە پێڵوەکانی بێنەدەر کەئەم هەمو ئۆتۆمبێلە سەربازی و تانکە ڕیزکراوانەی بینین کەسوپای ئیسرائیل دەستی کەوتبون و دەستگیری کردبون لەجەنگی ۱۹٦۷ بە سەرۆکی وڵاتی وت : ((ئێوە دەڵێن کە ئەم هەمو ئۆتۆمبیلە هیچ سودێکیان نیە لە کاتێکدا ئێمە هیچمان نیە)).

سەرەڕای ئەو پێشوازیە گەورەیەیی لە بارزانی کراو ئەو هاوکاریانەی ئیسرائیل پێشکەشی کرد ، "کرۆن" و "لفکۆف" بۆ سەرۆکی مۆساد جەختیان لەوە کردەوە کە پەیوەندی ئیسرائیل بە کوردەوە ڕوەو هیچ ئاراستەیەکی مانادار هەنگاو نانێت کەس پێی وانیە سودێکی هەبێت، بەڵام سەرکردایەتی سەربازی بڕوای بە وتەکانی "کرۆن" و "لفکۆف" نەکرد، وە جەختیان لەوەکردەوە کەبەرژەوەندی کوردەکان وادەخوازێت پرۆسەیەکی سەربازی باشتر و فراوانتر لەوەی کوردەکان دەیکەن ئەنجام بدرێت، دەستکرا بە هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی کادیرێکی سیاسی ئیسرائیلی بۆ ئامادەکاری کردن بۆ پرۆسەی "ئەناناس" کە ئامانج لێی ئەومیە گورزێکی کوشندە لەهیزە عێراقیەکانی ڕەواندز بوەشێنرێت ، ئەوە هێزەی کە نزیکەی لیوایەك دەبو بە شێوەیەکی بەردەوام هەڕەشەی لە ڕێگای گەیاندنی هاریکاری بە کوردەکان لە ئێرانەوە دەکرد، کوردەکان دەستیان کرد بە پێك هینانی لیوایەکی شاخاوی تازە بەناوی "هەڵگورد".

## بەشی هەژدەهەم /

## سەرکردەی هێزی پەرەشوتەوانی لە مەیدانی جەنگ دایە

((لە ٢٣ی ئایاردا نامەیەکی جفرەیی مان بەدەست گەیشت ، دەیگوت کەچەند ئەفسەریکی ئیسرائیلی ڕودەکەنە کوردستان ، ئاشکرابووە لامان کەئەرکەکەیان سەربازییە و هیچ زانیاریەکمان دەربارەی ئامانجی سەردانەکە پێ نەگەیی)).

ئێوارە گەیشتنە گوندی "دیلمان" ، "کرۆن" مان دیت کەتازە لەتارانەوە گەیشتبوو دوو ئەفسەری ئیسرائیلی لەگەڵدا بوو، یەکەمیان "تسوری ساجی"کەناوبانگی لەتەواوی کوردستان دەنگی دابوەوە، وەك شەڕکەرێك کەتۆز نایگاتێ، چونکە بارودۆخە مەترسیدارەکەی "هەندرین"ی ڕزگار کرد لە ساڵی ١٩٦٦دا، بەپێی ئەو چیرۆکانەی دەگێردرانەوە لەکاتی شەرەکاندا داوای لە ئیرانیەکان کردوە کە ژمارەیەك ڕاجیمەی قورسی بۆبنێرن ، بەهاوکاری لەگەڵ "عەقراوی" بەشێوەیەکی کاراو سەرکەتوو بەکاریان هێناون، ئەمەش بوە هۆی دۆڕاندنی عێراقیەکان ، لەسەربنەمای ئەوئەنجامانە "عەقراوی" سەردانی ئیسرائیلی کردوە.

بەڵام ئەفسەری دوەم "ئەهاردن دیڤیدی" بوو کە سەرکردەیەکی فێڵباز و تەکتیکی زۆرباش بوو ، ئەو ئەفسەرە هەرچی لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدایە بەدوژمنی ئیسرائیلی دەزانی.

تازە هۆکاری ئەو گەشتەم زانی کە لە٣ی ئایاردا (لۆنچی) بۆ ناوچەی رەواندوز کردی ، ماوەیەکی درێژ چاودێری لیوا عێراقیە جێگیرەکەی ئەوێی کرد.

هەردو ئەفسەرەکەم بەباشی دەناسی بۆیە دەمزانی کە ئەو دوانە بۆ گەشت نەهاتون یان بۆ بەسەربردنی پشوی کۆتایی هەفتە ، زوو بۆم دەرکەوت کەئەفسەرە ئیسرائیلیەکان پلان دادەنین بۆ پرۆسەیەکی گەورە ئەویش پرۆسەی "ئەناناس"ە کە ئامانج لێی وەشاندنی گورزێکی گورچکبڕە لە سوپای عێراقدا لە کوردستان.

وەزیری بەرگری (مۆشی دەیان) لە ١٠ی ئایاری ١٩٦٨ لەو دانیشتنەی کە بۆلێپرسراوانی نوسینگەکەی سازی کردبوو بڕیاری دابوو هەردوو ئەفسەری ناوبراو بنێریت بۆ کوردستان ، ناردنیشیان لەچوارچێوەی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا دێت کە لەسەردانەکەی بارزانی بۆ ئیسرائیل مۆرکراون لەمانگی ڕابردودا .

تسوری بۆ کاتێکی کەم هاتبو هەتا "دیڤیدی" بەبارزانی و سەرکردەکانی تری یاخیبونەکە بناسێنێت و بۆئەوەی گەشتێکی لەگەڵدا بکات بەوناوچانەدا کەتێیدا سەرپەرشتی چەند جەنگێکی کردوە.ساجی بەکوردەکانی وت: ((دیڤیدی ئەفسەریکی زۆر نایابە یەکەم ئەفسەرە کەپۆستی سەرکردەی هێزی پەرەشوتەوانی وەرگرتوە لەسوپای ئیسرائیل ، ئێوە ناوی "ئارێل شارۆن" و "ڕافائێل ئیتان"تان وەك دوو ئەفسەری بەهێز بیستوە ، "دیڤیدی" هیچی لەوان کەمتر نیە بەڵکو ئەم ، میدالی پاڵەوانبازی بەدەست هێناوە .

"ئالکن" لەڕۆژانەکەیدا لە٢٣ی ئایاردا نوسیویەتی ئەمشەو ئەفسەرەکە پلانەکانی پێشکەش بەمەلا مستەفا بارزانی دەکات.

((بارزانی لەگەڵ "مەسعود"و "ئیدریس"ی کوڕی و "عەقراوی"و "دکتۆرمەحمود" و "شەکیب"دا هات، پاش سڵاوکردن لەیەکتری نەخشەکان والاکران ، هەمودەستیان کرد بەلێکۆڵنەوە زانیمان کە قسەکان دەربارەی ناوچەی ڕەواندزە.

"تسوری" و "دێڤیدی" دەستیان بەقسەکرد ، "لفکۆف" وەرگێڕانی دەکرد بۆ بارزانی ، قسەکان سەبارەت بەدروستکردنی یەکەیەکی سەربازی گەورە بوو ، بۆ داگیرکردنی ناوچەی ڕەواندز)) .

((ڕوون بوو کەقسەکانی شێوازی نوێی کوشتاربوون، وە سەبارەت بەڕاهینان و هێرش و چەك وتەقەمەنی نوێ لە پێش هەمویانەوە چەند گەشتێك بەناوچەکەدا بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و شارەزابوون لەناوچەکە لەپێناو پلان دانان بۆ هێرشەکە ، "دیڤیدی" و "تسوری" سەرکەوتووبوون لەوەی کەجەوێکی

گەشبینانە بدەن بەکۆبونەوەکە ، و وایان لە بارزانی کرد کە وا هەست بکات پرۆسەکە ئاسانە و شیاوی جێبەجێکردنە، پاش تەواو بونی کۆبونەوەکە گومانی قوڵی خۆم لەوەی بیستومە و بینیوم تا ئیستا بە"عومیران"م وت: کوردەکان ئامادە نەکراون وە توانای هێرشێکی شەڕگەیی و داخراویان نیە لەدژی لیوا عێراقیەکە ، ئەو پلانەی دانراوە ، باشە بەڵام تەنها کەتیبەیەکی ڕاهێنراوی هێزی پەڕەشوتەوانی دەتوانێ جێ بەجێی بکات ، بەڵام قسەکانم عومیرانی توڕە کرد)).

((بەڵام لەئیسرائیل بڕیاردرابوو کە هیچ پلانێك ڕەتنەکردێتەوە ئەگەر ببێتەهۆی کوژرانی سەربازانی عێراقی و دەست بەسەراگرتنی شاری ڕەواندز)).

((لە٢٤ی ئایار "تسوری" و "دیڤیدی" لەو گەشتە گەڕانەوە کە بۆناوچەکە ئەنجامیان دابوو بەهاوڕێیەتی "عەقراوی" ،لەکاتی نانخواردنی ئێوارە گوێم بۆ قسەکانی دیڤیدی گرت زۆر بە کەمی باسی لەتوانا و کەفائەتی هێزە کوردیەکان دەکرد بە خۆمم وت : دیڤیدی ساڵانیکی درێژە لەدۆسیەی خۆرهەڵاتی ناوەراست کاردەکات دەتوانێ بەزۆر زمان بدوێ ، جگە لە زمانی عەرەبی ، ئەوەتا پلانێکی سەربازی تۆکمە دادەرێژێت بۆ داگیرکردنی ناوچەی ڕەواندوز بەڵام هیچ پەیوەندیەکی هاوبەشی لەنێوان ئەونەخشەیە و یاخیبونی کوردەکاندا نیە.

جامی توڕەیی خۆمم لەو نامەیەدا ڕشت کە ناردم بۆ ئیسرائیل و ویستم بێلایەنیەکی زۆری پێوەدیاربێت ، ئەوجیاوازیە زۆرەم ڕوونکردەوە کە لەنێوان ئەو پلانەی ئیسرائیلیەکان دایان ڕشتووە و توانای جێبەجێکردنی کوردەکاندا هەیە، ڕای خۆمم نەشاردەوە کە دەبێت کوردەکان خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرن ، و هەر خۆتێهەڵقورتانێکی ئێمە کارەسات دەخولقێنێت ، گومان لەوەدانیە کە دەتوانین لەڕێگەی پێشکەشکردنی ئامۆژگاری و ڕاوێژو تا ڕادەیەك هاوکاریش خزمەت بکەین ، بەڵام نابێت بچینەژێر ئەو قورساییەوە تەنها لەپێناو ئەوەی کەکارەکان بەئاراستەی دڵخوازی خۆماندا ببەین)).

((له ۳۰ی ئایاردا کۆمەڵێکی تر پەرستاری سەربازیان دەرچواند و پێگەیاند هەریەك لە "ئیدریس" و "دکتۆرمەحمود" و "شەکیب" ئامادەبوون ، ئیدریس وتارەکەی خۆی تەرخانکرد بۆ ستایشکردنی پەرستارەکان و دڵسۆزیان بۆ کوردستانی ئازاد، "دکتۆرمەحمود"یش ستایشی ڕاهێنەرە ئیسرائیلیەکانی کرد کە بەباشترین شێوە کاری خۆیان جێبەجێ دەکەن، منیش وتەی خۆمم تەرخان کرد ، بۆ ئەو نرخەی کە جەنگاوەری ئازادی دەبێت بیدات، پاشان دکتۆر مەحمود هەر خوێندکارێکی بەناوی خۆیەوە بانگ کرد و بڕوانامەی کۆتایی خولەکەی پێ بەخشین ، جگە لە کتێبیك کەئامادەمان کردبوو سەبارەت بەکارەکانی پەرستاری سەربازی)).

((لەای حوزەیرانی ۱۹٦۸ ، چووین بۆ "دیلمان" بۆ چاوپێکەتنی "لفکۆف" و تا ڕای خۆمی پێ بڵێم سەبارەت بە نەخشەکەی "تسوری" و "دیفیدی" ، بەڵام "لفکۆف" پێی وتم: "نامەوێ چارەسەری نەخۆشەکانت بکەم بۆیە تکایە دەست لەکاروباری من وەرمەدە ،هەوڵ مەدە کێشەکانی من چارەسەر بکەیت" ، ئەمە وایکرد بگەمە ئەو دەرەنجامەی کە "لفکۆف" ناتوانیت مەسەلەکان یەکلایی بکاتەوەو زۆر هەستیارە سەبارەت بەمەسەلە سەربازیەکان لەوانەیە لەگەڵ ڕایەکەی مندا بێت بەڵام بەئاشکرا وای نەوت )).

*****************************

"دیفیدی" و "تسوری" بەڕاستی هەوڵیان دەدا بۆ پلاندانان بۆ پرۆسەیەك کە عیراقیەکان شێت بکات ، کاریان دەکرد تا پرۆسەکە ۲۰ کیلۆمەتر لەخۆبگرێت ، سەرۆکی مۆساد ئەم چەند ووشەیەی بە"دیفیدی" وتبوو کەسەرپەرشتی کاروبارەکانی دەکرد، ((دەبێت پرۆسەکە گەورە و بەرفراوان بێت ، تا عێراقیەکان لەباکوری هەولێر و زۆزگ دەرپەڕێنێت، تا پشت ڕەواندز و گەلی عەلی بەگ)).

عێراقیەکان دەیانویست نەهێڵن کوردەکان بەشێوەیەکی جوگرافی پێکەوەبەسراو کۆنترۆڵی ئەوناوچانەبکەن کە تیایدان ، عێراقیەکان لە بەردەگەورەکانی چیای

"کۆرەك" و لە "ڕەواندوز" جێگیر بووبوون، بەجۆرێك توانای ئەوەی پێ بەخشیبون کە کۆنترۆڵێ کەوانەیەکی فراوانی نیشانەگرتن و قەناسە بکەن ، لەسەر ڕێگای بچوك و گەورەکان، وەك ڕێگەی نیوان "کەرکوك" و "هەولێر".

بۆیە پاككردنەوەی ناوچەکە لەکۆنترۆڵی سەربازی عێراق، وای دەکرد کوردەکان بتوانن کۆنترۆڵی جوگرافیایی پێکەوەبەسراوی هەمو ناوچە کوردیەکانی ئەوێ بکەن.

عمیت پێی وابوو کە کوردەکان دەتوانن ئەم ئەرکە جێبەجێبکەن پاش ڕاهێنانی گونجاو، "تسوری ساجی"ش بەهەمان شێوە، بەتایبەت کە ئەو تاکە ئیسرائیلی بوو کەپێشتر سەرکردایەتی کوردەکانی کردبوو لەجەنگدا دژی عێراقیەکان و سەرکەوتوو بوو تیایدا بۆیە پێی وابوو هەلی ئەنجامدانی پلانەکە زۆرە ، بەلاّم دیڤیدی دەیگوت: "کوردەکان ئەو ئیسرائیلیانەن کە لەناو عەرەبدا دەژین وئازان و توانای جیّ بەجیّ کردنیان هەیە".

لەمیانەی گەشتەکەیدا "دیڤیدی" چەند دیاردەیەکی بینیبوو کە ئەگەر لە ئیسرائیل بوایە دنیا هەڵدەستان دەڵێت: "لە ڕێگای باکوری ڕۆژئاوای ڕەواندوز دەڕۆیشتین ، لەوێ "فصیل"ێکی سەربازی کوردە شیوعیەکانی لیّ بو ، کە پێشتر لە سوپای عێراق ڕایان کردبوو، پاسەوانی ناوچەکەی دەکرد و لەوێ جێگیر بوو ، لەوێ دووکەسی "فصیل"ەکەم بینی لەسەر ڕێگا بوون ، سێ کەسی ترم دیتن کە لەکەلاوەیەکدا دانیشتبون ، بەشێکی تریان بۆ کڕینی هەندی پێویستی ڕۆشتبون ، بیرم کردەوە باشە چی ڕودەدات ئەگەر بێت و عێراقیەکان بڕیاریان دا کە ئێستا هێرش بکەن ؟ گومان لەوەدا نیە کە زۆر بە ئاسانی ٢٠ کیلۆمەتر بەئاراستەی باکور دێنە پێشەوە ، بەلاّم هەڵسوکەوتی کوردەکان لەزەمینەی شارەزابونیانەوەیە بە تەواوەتی لەعێراقیەکان ، دەیانزانی کەلەم کاتەدا هیچ هێرشێك ناکەن".

ئەوە تاکەشتێك نەبوو کە "دیڤیدی" نیگەران دەکرد، دەیگوت: ((کوردەکان نازانن نەخشە بخوێننەوە، ناشزانن لەوەتێبگەن جەنگ چیە؟ بەلاّم بەختیان

باشه كەڕوبەڕوی سوپایەكی وەك سوپای عێراقی بونەتەوە كە چەكدارکردنێکی تا ڕادەیەك لاوازی هەیە، هەروەها ئەفسەرەكان تەنها گەمژەو گەندەڵ بوون ، کوردەكان بەتفەنگە لولەدرێژەكانیان لە دوری (٨٠٠) مەتر تەقەیان لێ دەكردن، زۆریان لێ دەپیکان پاشان هێرشیان دەکردە سەریان)).

"تسوری" توشی ڤایرۆسێکی نێوچەیی بوو، کەئازارێکی توندی توشی ڕیخۆڵەکانی کردبوو ، ئەمەش ناچاریکرد بەپەلە ناوچەکە بەجێ بهێڵێت ، بەڵام دیڤیدی ئەفسەریکی پەرەشوتەوانی تری هێنا کە باشترین ئەفسەرانی پەرەشوتەوان بوو ، وتی: "سەرکەوتنی پرۆسەی ئەناناس پەیوەستە بە ئەفسەریکی وەك "کیبۆست"ەوە کەناوی کۆنی بنەماڵەی "میخائیل بن ئاری"ە کەیەکێ لەسەرەتایی ترین جەنگاوەرانی هێزی پەرەشوتەوانی یە لە "ئەردەن" لەدایکبووە ، باوکی وەك کارمەندی کارەبایی لەو وێستگەیەی وزەی کارەبا کاری کردوە کە "بنحاس ڕۆتبێرگ" لەناوچەی "نەهرایم"دروستی کردبوو، پاشان بوەتە بەڕیوەبەی ویستگەیەکی وزەی کارەبا لە سەربازگەکانی سوپای بەریتانی لە "زەرقا " و "معان" ی ئەردەن، خیزانەکەیشی لەگەڵ دابوە، بۆیە "میخائیل" یەکێکە لەو ئیسرائیلیە کەمانەی کەلەئەردەن لەدایکبووە، لە پەنجاکانەوە "میخائیل کیبۆستە" پەیوەندی کردوە بەهێزی پەرەشوتەوانیەوە ، ئەزمونیکی زۆر دەوڵەمەندی بەدەست هێناوە ، کە وەك ئەزمونی "ئاریل شارۆن" و "دیڤیدی" و "مائیر هارتیسۆن" دەبێت ، وەیەکێ لە دامەزرێنەرانی یەکە سەرەتاییە خولیەکان بووە، وە بەشداری هەموپرۆسەکانی تۆڵەسەندنەوەی کردوەو دووجار بریندار بووە.

پێش دەرچونی لە سوپا بەشداری جەنگی ١٩٦٥ ی کردوە لە ڕێرەوی "المتلا" زۆر بەسەختی بریندار بووە ، دوای ئەوە بەشداری کردوە لەپێکهینانی هەیئەی ئەرکان ، پاش ئەوە سریەی "هاتوچۆی لیوای ٨٠"ی دروست کردوە سەرکردایەتی

کردوه لەداگیرکردنی قودس دا ، وە لە دیاریی کردنی سنوردا لە بەرزاییەکانی جۆلان لە جەنگی ١٩٦٧ .

"دیڤیدی" و "کیبۆستە" و "عەقراوی" دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی ناوچەکە، و سێ ڕۆژ لەناوچەی پێکدادانی داهاتوو مانەوە، ئەو دوانە دەڵێن: ((سواری وڵاخ بوین بەڵام وڵاخی سێیەم دووربینێکی گەورەی هەڵگرتبو لە "حاجی ئۆمەران"ەوە ڕوەو ڕۆژئاوا ڕۆشتین ، واتە بەئاراستەی "ڕەواندوز" ، واتە لەناوچەیەکدا سوڕاینەوە کە ٣٠ کیلۆمەتر پانی و ٣٠ کیلۆمەتر درێژی بوو ، چاودێری هەموو ئەوناوچانەمان کرد کەسوپای عێراقی لێ جێگیر بوو ، پاشان بە هەمان ڕێگادا گەڕاینەوە بۆ حاجی ئۆمەران)).

وە لە هەر پێگەیەکی هیزە عێراقیەکان ئەودوانە لەهەمو ئەو ڕێگایانەیان کۆڵیوەتەوە کە بۆی دەچێت، لەگەڵ باشترین شوێن بۆ پچڕاندنی تەلە دڕکاویەکان و تێك شکاندنیان ، تەنانەت دیڤیدی کاریکرد تا پلان دابنێ بۆ سەرلێتێکدان لە ناوچەی پێنجوێن ، تا وابکات زۆرینەی هیزەکانی عێراق کێش بکرێن بۆ ئەوێ ، کە ٢٠٠ کیلۆمەتر لەناوچەی ڕاستەقینەی جەنگەکەوە دورە ، وەئەو یەکە کوردیەش دیاری کرا کە ئەوکارە دەکات.

"کیبۆستە" لەیادەوەریەکانیدا نوسیویەتی: ((شوانی گاگەلی چەند هۆزێك کە لەو ناوچەیەدا نشتەجێین بە عێراقیەکانیان ڕاگەیاندبووکە ئەو گەشتە لێرە ئەنجام دراوە، دواتر زانیم کەهێزە عێراقیەکان هەوڵیان داوە دوامان بکەون، لە دوای گەشتەکە بۆمان دەرکەوت ئێمە پێویستمان بەنزیکەی هەزار چەکدارە تا ناوچەکە داگیربکەن)).

"کیبۆستە" بەدرێژایی گەشتەکە ئەوەی لەبیر بوو کە پێش ئەوەی لە ئیسرائیلەوە بێت پێی ووترابوو : ((تا شەڕگەکە گەرمتر بێت لەنیوان کوردەکان و عێراقیەکاندا بۆ ئیسرائیل باشترە ، چونکە ڕێگەیان لێ دەگرێ لەوەی کەهێزەکانیان بنێرن بەئاراستەی ئیسرائیل و هاوکاری کردن لەگەڵ "ئەردەنی"

و "سورياییی"ەکان لەو بوارەدا ، چونکە ئاشکرایە کە عێراقیەکان بەهیچ کلۆجێك واز لە کێڵگەکانی نەوت ناهێنن بۆ کوردەکان لەناوچە کوردیەکان هێزی گەورە دەنێرن بۆ پاراستنی)).

لەرێگادا کیبۆستە قسەی زۆری لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەدا کردوە کە پاراستنی گەشتەکەیان لەئەستۆ بووە چاودێری کردوون کە چۆن بۆ شوینی دور و زۆر بەگرنگیەوە تەقە دەکەن، و لە یەکێکیانی پرسیی بوو ئەگەر فیشەکت پێ نەما چی دەکەی، وتبوی من تفەنگەکەم لە شوێنیکدا دەشارمەوە پاشان رودەکەمە ئەو ناوچەیەی کە شەڕم تێدا دەکرد وەك کشتکارێکی"جوتیارێکی" ئاسایی ، پاشان چاوەڕێ دەکەم تا ئۆتۆمبێلێکی "جێب"ی عێراقی دێت کە ئەفسەریکی تێدا بیت ، ١٠ دیناری دەدەمێ فیشەکەکانی لێ دەکڕم و دەگەڕێمەوە دەست دەکەمەوە بە تەقە.

کیبۆستە لێی پرسی بوو ، بۆچی ئەفسەر؟ ، بۆ سەربازێك نەبێت؟ ، وتبوی : سەربازەکان هەرگیز چەك و فیشەکەکانیان نافرۆشن بەڵام ئەفسەرەکان دەتوانی هەمو شتێکیان لێ بکڕیت.

وە لەیەکی لەکاتەکانی پشودا یەکێ لە پێشمەرگەکان بە "کیبۆستە"ی وتبوو سەیری ئەو بەردە دوورە بکە، بەڵام کیبۆستە هیچی نەدیبوو ، بەڵام پێشمەرگەکە تفەنگە بڕنەوەکەی خۆی ڕوو لە بەردەکە کردبوو، تەقەی کردبو پاشان لە "کیبۆستە"ی پرسی بوو : دیت؟ ، "کیبۆستە" ش وتبوی : هیچم نەبینی ، بەڵام پێشمەرگەکە چوبوو بۆلای بەردەکە و پاش چەند چرکەیەك گەڕابووەوە لەگەڵ خۆیدا باڵندەیەکی "سۆیسکە"ی بەدەستەوە بوو ، بە توڕەییەوە وتبوی "ویستم لە سەری بدەم کەچی نەمتوانی لەجەستەیم داوە" ، "کیبۆستە"ش پێکەنیبوو سەری سوڕمابوو لەو کێشیە ، بەڵام هەرزوو بۆی رون بوەوە کە سەرەڕای ئەو کارامەیەیی پێشمەرگەکان هەیانە لە (پێکاندا) بەڵام توانای سەربازیان لاوازەو ڕاهێنانێکی زۆر لەوە زیاتریان گەرەکە.

دکتۆر "ئالکن" دەڵێت: ((لەپاش ئەو گەشتە بیرکردنەوەی ئەفسەرەکان زیاتر مامناوەند بوو ، جگەلەوە من وام هەست دەکرد کە کوردەکان نایانەوێت "ڕەواندز" بەشێوەیەکی گشتی داگیر بکەن، ئاشکرا بوو لەلام کەئەوان پێچەوانەی توانا و ئارەزوی خۆیان کار ناکەن)).

((بارزانی سەر لەئێوارە هات باسی شەڕەکانی ١٩٦٥ی لە "زۆزگ" کرد لەگەڵ گەشتە دراماتیکیەکەی لەئێرانەوە بۆ یەکێتی سۆڤیەت کردی لەساڵی ١٩٤٥ دەیویست وا پیشان بدات کە ئەم دو ڕوداوە وەك یەك وان)).

((بەڵام دیڤیدی باسی لەداهاتو کرد، وە وتی : چیای کۆڕەك ئەو ئامانج و داگیرکردن و کۆنترۆڵەیە کە ئێمە دەمانەوێ و هەوڵی بۆ دەدەین ئەمەش لەبەر دوو هۆکار : یەکەم تا بتوانین بۆمبی ڕاجیمەی لێوە بهاوین، دوهەم تا نەهێڵین عێراقیەکان خاڵی چاودێری لێ دابنین، بەڵام ئامانجی دوەممان سەربازگەکەی سوپای عێراقیە کە "خەلیفان"ە لەنزیك "گەلی عەلی بەگ" و گردێکی زۆر بەرزی تر کە لەنزیکیەتی)).

"دیڤیدی" دەڵێت: کە پێشبینیەکان ئاماژەیان بەوەدەدا کە شاری رەواندز ، پاش جەنگێکی توندو تیژ داگیردەکرێ، شەڕی ماڵ بەماڵ یان ئەگەر کوردەکانی نەوێ پشتگیری بارزانی بکەن، دوای ئەوەی دڵنیا دەبنەوە لە سەرکەوتنی.

لە ١٧ی تەموزی ١٩٦٨ کودەتایەکی نوێ لە عێراق ڕویدا بە سەرکردایەتی "ئەحمەد حسن بەکر" کە ژەنەراڵ و سیاسەتمەدار بوو ، هاوبەش بوو لەو کودەتایەی کە لەساڵی ١٩٥٨ ڕویدا ، بەڵام نەیتوانی زمانێکی هاوبەش لەگەڵ سەرکردەی کودەتاکە "عبدالکریم قاسم" بدۆزێتەوە، وە لە شوباتی ١٩٦٣ دەستی یارمەتی بۆ ئەو کودەتایە درێژکرد کە بەسەرکردایەتی "عارف" ، "قاسم"یان لەناوبرد ، بەڵام لە تشرینی دوەمی ١٩٦٣ عارف لە هەمو ناوەندەکانی هێز دوری خستەوە ، بەڵام لەکۆتایدا بەمەبەستی خۆی گەیی.

"بەکرد" خۆی کرد بەسەرۆك و سەرۆکی حکومەت و سەرکردەی سوپا و سەرۆکی ئەنجومەنی شۆرش و بەچنگیکی ئاسنینەوە کاریکرد دژی هەموو دوژمنەکانی ، هەروەها دژ هاوڕێکانیشی لە کودەتاکەدا ، و پتەوی و ڕاوەستاویەکی توندو تۆڵی بەرامبەر بە دەرەوە پیشان دا ، وە بوە بەردێکی بنەڕەتی لە جەبهەی "ڕەتکردنەوە"دا کە جەبهەیەك بوو وهەڵویستی توندڕەوانە و نەگۆڕێ هەبو دژ بەئیسرائیل.

کودەتا ماوەیەکی ئاگربەستی دا بەکوردەکان و ماوەیەکی باش بۆ ئامادەکردنەوەو و زیادکردنی هێزەکانی ، هەروەها ئومیدی ئەوەی پێدان کە سەرکردەی کودەتای نوێ مامەڵەی وەکو ئەوانەی پێش خۆی نەبێت بەرامبەریان.

بەڵام ئومیدەکانی بارزانی هەرزو بەباچوون، کاتێ بینی کە بەکر یەکێ لەنزیکەکانی "تاڵەبانی" کردۆتە وەزیر لە حکومەتەکەیدا وە یارمەتی دارایی و چەکی داوەتە تاڵەبانی خۆی ، تا ڕێگری بۆ پێشمەرگە دروست بکات.

شیاوی وتنە کە زۆر تێنەپەڕی تا "بەکر" هەستیکرد کە تاڵەبانی و هیزەکەی پاڵپشتی لاوازن و بارزانیش هیچ هۆکارێکی دەست نەکەوت تا داوا لەئیسرائیلیەکان بکات واز بێنن لە پلانداناں بۆ پرۆسەی "ئەناناس".

پرۆسەی کۆکردنەوەی هەزار جەنگاوەرەکە لەهەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراقیەوە دەستی پێکرد کە بەرەبەرە بەپێ و بەوڵاخ لەناوچەی کۆبونەوەکە کۆدەبونەوە، هەروەها لەهەمان کاتدا .دەستکرا بەدیاریکردنی ١٢٠ کورد کە سەرکردایەتی پرۆسەکە بکەن ، وە نێردران بۆ ئەوەی خولێکی "ئێرانی – ئیسرائیلی" ببینن لەناوچەی "محمد"ی نێو خاکی ئێران دەستە ئیسرائیلیەکەی خولەکە مقدمی یەدەگ "ئەلیشع شلیم" سەرپەرشتی دەکرد کە یەکێ لە گەورەئەفسەرانی هێزی پەڕەشوتەوانی ئیسرائیلی بوو، کە جەنگی زۆری ئەنجام دابوو لەپرۆسەکانی تۆڵەسەندنەوەدا، وە بەشداربوو لەجەنگی ١٩٥٦ و جەنگی ١٩٦٧ یش.

کێشەی کورد نامۆ نەبوو لای "ئەلیشع" چونکە "تسوری" هاوڕێی نهێنیەکەی پێ وتبوو ، هەروەها زانیاری وردو درشتی لە"ڕافائیل نیتان" وەرگرتبو ، کەدەبوایە لەو ماوەیەدا جێگەی "دیڤیدی" بگرێتەوە وەك سەرکردەی هێزی پەڕەشوتەوانی دیڤیدی پێی وت : کە خولەکە تایبەت کراوە تا پلەیەك بەرزتر ببنەوە و فێربکرێن چۆن لە بەرگریەوە هێرش بەرن.

"ئەلیشع شلیم" و هەشت ئەفسەرەکە لەباشترین ئەفسەرانی هێزی پیادەو پەرەشوتەوانی بەفرۆکەیەکی گواستنەوە سەردانی ئێرانیان کرد ، هەروەها فڕۆکەکە ڕێژەیەکی زۆر چەکی تێدابوو ، کە ئیسرائیل لەجەنگی ١٩٦٧ دەستی کەوتبون، لەتارانەوە کۆمەڵەکە ڕویانکردە کێڵگەیەکی گەورە لە ناوچەی هەمەدان کە دەکەوێتە نزیکەی ١٦٠ کیلۆمەتر لە ڕۆژئاوای پایتەختی ئیران ، ساواك دەستی بەسەر ئەو کێڵگەیەدا گرتبوو لەبەرئەوەی دەکەوێتە نیوان چیاکانەوە ، وە ئامادەی کردبوو بۆ خولەکە ، دەستەی ڕاهێنانی ئێرانی پێکهاتبوو لە ٥ ئەفسەر بە سەرۆکایەتی عقید "فلافن" وە لەو ڕێنماییانەدا کە ئاراستەی "ئەلیشع" کرابون ، پێ وترابوو عقیدی ناوبراو کەرامەتی خۆی لەسەروی هەمو شتێکەوە دادەنێت ، وە زۆر هەستیارە بۆیە پیویستە زۆر ڕیزی لێ بگرێت، وە پێ وترابوو هەرکاتێك هەستت کرد کە خەریکە تووڕە دەبێت و لەپێستی خۆی دەردەچێت ، پێ بڵی تۆ شکایەت لەلای "یعقوب نەمرودی" پاشکۆی سەربازی ئیسرائیل لەئێران دەکەیت ، کە لە کاریگەریدا کاریگەری جێگری "شا"ی هەیە.

بەڵام چوار ئەندامەکەی تری دەستە ئێرانیەکە ئەفسەر بون بەپلەی نقیب، جلوبەرگەکانیان دەری دەخست کە ئەمانە لە کۆماندۆی ئیرانین ، دوان لەوان ڕاهێنانیان لە ئەمریکا و بەریتانیا پی کرابوو، کە "ئارش" و "کۆرش" بون ، سێهەم ئەفسەریکی تورکمانی و چوارەمیش ئەفسەریکی بەڕێوەبردن بوو، خولی سەرکردەکان لەیەکی ئابی ١٩٦٨ دەستی پێکرد ، و ٢٥ ڕۆژی خایاند، ڕاهینانەکان هەتا ئاستی سەرکردەی "فصیل"ی لەخۆگرتبو لەوانە ڕێکوپێکی شەوانە ،

هێرشی کەمین و بەڕێوەبردنی تەقە، ڕێ و شوێنی فەرمان پێدان ، وە پەیوەندی تۆبۆگرافیان و کۆکردنەوەی زانیاری هەوالگری تایبەت بەپرۆسەکان و ڕێکخستن و ئامادەکاری و پاراستنی چەك و گرنگی پێدانی.

ڕاهێنراوان "بەشداربوان" جلوبەرگی ڕەنگی ئێرانیەکانیان لە بەردا بوو کە لەکارگەی "ئاتا"ی ئیسرائیلی دروست کرابوون، دابەشکران بۆ سێ گروپ ، کە وەك لە پلانەکەدا بڕیاری لێ درابوو، گروپی باکور و ناوەڕاست و باشور ، ڕاهێنەرەکان هەوڵێکی چڕوپڕیان دا تا ڕۆڵ وگرنگی ئەو چەکە ئۆتۆماتیکیە بزانن کە پێیان دراوە ، کاریگەریان وەك ئەو تفەنگە بەریتانیە کۆنانە وایە کەئەوان بەکاری دەهێنن.

لە چوارچێوەی ئەو خولەدا ، "ئەلیشع" خولیکی تری کردەوە بۆ ئامر کەرتەکان چونکە پێویست بوو کە توانایان پێ بەریت لە هەڵسەنگاندنی بارودۆخ ، وە خوێندنەوەی ئاراستەکان و دانانی پلانی جێ بەجێ کردن، "دیڤیدی" و "کیبۆستە" سەردانی خولەکەیان کرد ، تا ئەو دەرەنجامانە بە ڕاهینەرەکان ڕابگەیەنن کە پێی گەیشتون ، لەو گەشتەدا کە بەناوچەکانی کوردستاندا ئەنجامیان داوە، جەختیان کردوە کەسەرکەوتنی پرۆسەکە بەندە بەداگیرکردنی، ئەو پێگە عێراقیانەی کە پێیان دەگوترێت "ڕەبایە" کە لەڕاستیدا هەر پێگەیەك لەوانە وەك "لتلحی"[1] ساڵی ١٩٢٠ وابون کەپێکهاتوە لە گۆڕەپانێکی ئەملاولای فراوان لەشێوەیەکی دیاری نەکراو کە بەپەرژینێکی لم و بەرد چواردەوری گیراوە ، بە چەند خاڵێکی چەکدار پارێزراوە و چەند ڕێگەیەکی پەیوەندی لەدەرەوەو ناوەوەیدا هەیە، ئەم پیگانە چەند یەکەیەکی سەربازی و چەکە قورسەکانی لەخۆدەگرێت ، لەگەڵ هۆکارەکانی پەیوەندیان، وە وەکو پێگەی پێشکەوتوو ،

---

[1] ئەگەر" تل الحی" بێت واتە گردی زیندو بەلام ئەگەر زاراوەیەکی سەربازی سەردەمی بیستەکان بیت ئەوە دیسان هەڵەیەکی تری وەرگێری عەرەبییە. —وەرگێر-

بۆناوەندەکانی کۆنترۆڵ بەکاردەهێنرێت، داگیرکردنی ئەو پێگانە ڕێگامان بۆ خۆش دەکات بۆ هێرشی گشتگیر.

"دیڤیدی" لەگەڵ خۆیدا وێنەیەکی نمونەیی یەکێ لەو ڕەبایانەی هێنابوو، داوای کرد کەنمونەی هاوشێوەی ئەوە دروست بکرێ و ڕاهێنان بکەن لەسەرداگیرکردنی ، ڕاهێنەرەکانیش ڕازی بون ، بەڵام یەکی لەجەنگاوەرەکان لە کاتی هێرشەکەدا کوژرا بەهۆی فیشەکێکەوە کە لە تفەنگەکەی خۆی دەرچوو، ئەمەش بووەهۆی دابەزاندنی ورەی خوێندکارەکان، وایکرد هەندێکیان ناوچەکە بەجێبهێڵن و نەگەڕێنەوە پۆل.

ئەفسەری پەڕەشوتەوان "ئەمیر کێرن" کەیەکێ لە ئەفسەرانی خولەکە بوو، قوتابیەکانی فێری چەکی نەجولاو دەکرد، دەڵێت: ((ئاستی زیرەکیەکی ماقولانەم تێدانەبینین، لەچەند هۆزیکی جۆراو جۆرەوە هاتبون، وە بەزاراوەی جۆراوجۆر دەدوان، لەدوری باوەڕپێنەکراوەوە نیشانەیان دەپێکا، بەڵام گۆڕینیان بۆ سەربازی ڕاستەقینە، پرۆسەیەکی شەونخونیی فراوان و ڕاستەقینەی گەرەك بوو)).

خولەکە بەئەنجامدانی مانۆڕێك بەفیشەکی زیندو کۆتایی هات، کە هەشت کاتژمێری خایاندو لایەنەکانی خولەکەی لە خۆگرتبوو ، "عزيز العقراوی" وەك میوانی شەرەف ئامادەبوو.

**********

"دیڤیدی" دەڵێت: ((لەخولەکەی "هەمەدان"ی ئێراندا لەوە تێگەیشتم کە توانایان زۆر نزمە ، ڕەبایەیەکمان دروست کرد و ڕامان هێنان کە تێکی بشکێنن، خستماننە بەر بۆمبارانی چەکی قورس ، کە حەفتا بۆ هەشتا مەتر لێیانەوە دور بوو، هەستم کرد کە زۆر دەترسن بەتایبەت کاتێك یەکێکیان کوژراو ، ئەویتریان پارچەیەکی بەرکەوت، ئەمە یەکەم جاریان بوو لەژیانیاندا مانۆڕی لەو شێوەیە بکەن، شەڕکەری باش بە پێی پێوەرەکانی من ئەو سەربازەیە کە عەقڵی ناوەستێت لە چرکەساتە سەخت و یەکلایکەرەوەکاندا ، ئەمە لە سەربازی

ئیسرائیلی دا دەبینین، بەڵام لەناو کوردەکاندا لەژمارەیەکی ئێجگار کەمدا نەبێت ئەو سیفەتەم نەدەدی)).

دیڤیدی دەڵێت: ((ڕاهێنان ئامادەکاری بوو بۆجەنگ ، چەك وتەقەمەنی لەئێرانەوە زۆر بەخاوی دەهات کە گومانی لا دروست کردم سەبارەت بەنیازی ئێرانیەکان ، وای لێکردم کە پێم وابێت ئێرانیەکان حەزناکەن پرۆسەکە جێبەجێ بکرێت، ئارەزوم دەکرد لەو خشتە زەمەنیەدا کەدامان نابوو کارەکە یەکلا بکەینەوە، بۆیە لەماوەی ئامادەکاریدا ، چوار جار سەفەری ئیسرائیلم کرد، ڕاهێنانەکان بەردەوام بون، جەنگاوەرەکان لەنزیك "دیلمان" کۆبوبونەوە)).

خاوخلیچکی ئیرانیەکان گومانی لای دیڤیدی دروست کرد ، بۆیە سەردانی تارانی کرد ، تا هۆکارەکان بزانێت ، ڕێکەوت وابو لەوکاتەدا "ئەبا ئیبان"ی وەزیری دەرەوە سەردانی تارانی کردبوو، لەگەڵ (شا) کۆبوبوەوە و دۆسیەی پرۆسەی نابراوی باس کردبوو، شا وتبوی : ((با جێبەجێی بکەین من پشتگیری لەو پرۆسەیە دەکەم)).

دیڤیدی لەگەڵ "ناسیری" سەرۆکی ساواکدا کۆبوەوە، پاشان چەك و تەقەمەنی لەئێرانەوە هەڵدەڕژا بۆ کوردستان، ڕێژەیەکی دیاریکراو لە چەك تەقەمەنی داواکرابوو کەئەوان ناردیان، بەڵام ئامێری تەقینەوەیان نەناردبوو، چونکە دیڤیدی بیری چووبوو داوای بکات ، پێی وابو ئاساییە ، دیڤیدی لەگەشتەکانیدا بۆ ئیسرائیل بە "عمیت" و "مۆشێ"ی وتبو کە لە توانایدا هەیە پرۆسەکە جێ بەجێ بکرێت، بەڵام "دەیان" دودڵ و سارد بوو، وتبوی: ((باشە مادەم ئێوە بڕیارتان داوە منیش ڕازیم لێی ، بڕیار وابوو کە ئەرکی سەرکردایەتی کردنی یاخیبووە کوردەکان بسپێردرێت بە

"عزیز العقراوی" کە زۆربەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن پێیان وابوو زۆر لەوەدورە کە سەرکردەی یاخیبوەکان بکات ، بەڵکو ئەو ژەنەڕاڵیکی نمونەیی سوپایەکی مۆدێرنە.

"دیڤیدی" هەستی ئەوەی لادروست بووبوو ، کە "عەقراوی" سەرەڕای توانا سەربازیەکانی جێگەی متمانەی کوردەکان نیە، چونکە بیریان بوو کە پێشتر خزمەتی عێراقیەکانی دەکرد، پاشان خیانەتی لێ کردن و هاتە نێو یاخیبوانەوە، کێ گرەنتی ئەوەیان بۆ دەکات کە ئەمجارە خیانەت لە ڕۆڵەکانی گەلەکەی ناکات، جگە لەوە کوردەکان ناڕازی بون لەوەی کە بۆچی خێزانی "عەقراوی" لەو ناوچانە دانانیشێت کە ئەوان کۆنترۆڵیان بە سەریدا دەشکێت ، هەرچەندە دەیانزانی کە ئەو خێزانە ڕوبەروی مردن دەبێتەوە لە"عەقرە".

"دیڤیدی" دەڵێت : ((خۆشەویستی یان ڕق هەرکامیان بێت "عەقراوی" تاکە کەس بوو ، کەپلانی هێرش و پیکدادان حاڵی دەبو)).

کرۆن دوای ٢٨ ساڵ دەڵێت: ((دیڤیدی و عقراوی هەوڵی زۆریان دا بۆ ئامادەکردنی پرۆسەکە ، لە نەخشەکان ڕامان و ڕێگاکانیان ئامادەکرد لەگەڵ خشتەی هاوکاریەکان و ژمارەی بۆمبەکان گەیشتن بەئامادەکردنی خشتەی پڕ لەچەك و تەقەمەنی زۆر ، گران بوو مشتومڕ لەگەڵ دیڤیدی بکەن لەبەرئەوەی کابرایەکی سەربازی لێزان بوو، توێژینەوەی تەواوی لەپلانەکان دەکرد، کاریدەکرد تا چەك وتەقەمەنیەکان گرنتی سەرکەوتنی ئەرکەکەی بکەن)).

"لفکۆف"یش دەڵێت: ((ئامانجی پرۆسەکە ئەوەبوو حکومەتی ناوەندی ناچار بکات دان بنێت بە کوردەکاندا وەك هێزێك کە هیچ بوارێك نیە جگە لەوەلامدانەوەی داخوازیەکانی و پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی ، نیازی من هەر لە چرکەساتی یەکەمەوە ئەوە بووە، کە ئەوکارە بکەم کە لە بەرژەوەندی ئەواندایە)).

********************

عێراقیەکان هاتنەوە ئارەزوی خۆیان پیشاندا بۆ گەیشتنە ڕێکەوتن لەگەڵ کوردەکان ئەمەش ئومێدی ئەوەی لەلای کوردەکان دروست کرد کە لەوانەیە سەرکردایەتی نوێی عێراق لەئەوانەی پێش خۆی جیاواز بێت ، لەوانەیە ئەو

بیرکردنەوەیە بووبێتە هۆی ئەوەی کەپرۆسەکە ئەنجام نەدرێت ، لەوانەشە هۆکارەکەی هەڕەشەی ئێرانیەکان بوبێت کە نابێت کوردەکان هیچ پرۆسەیەکی نائاسایی ئەنجام بدەن.

شیاوی ئاماژە پێکردنە هەر ڕاوێژکاریکی ئیسرائیلی هاتبێتە کوردستان بیری لە بەرژەوەندی ئیسرائیل کردۆتەوە ، هەورەها بەرژەوەندی کوردەکان وە تێکەڵ کردن لەنیوان ئەو دوو بەرژەوەندیەدا وە ئەو ڕاوێژانەی پێکەشی کوردەکانیان دەکرد، وە تیۆرە سەربازیەکان وەك تیۆری گرنگ بون ، بەڵام لەسەر ئاستی واقیعی کوردەکان کارکردنی دیاروکارای نەبوو، بۆیە ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان هانی کوردەکانیان دەدا کاربکەن ، کاتێك نەیاندەتوانی هانیان بدەن، لەنیوان ئەوان و خۆیاندا چەند بیرۆکەیەکیان دەخستەڕوو لەنێوانیاند کارکردن بۆ تورەکردن و ئەنگاوتنی عێراقیەکان بەجۆریك وایان لێ کرا کە گورز لە کوردەکان بوەشێنن، پاشان کوردەکان ناچار بن ، بەو مەرجانەی کە ئەمان دەیانەوێ وەڵامی هێرشەکانیان بدەنەوە.

"دیڤیدی" دەڵێت: ((پیلانی هێرشەکە گەشتبوە ئاستی ئەوەی کە ئامر کەرتەکان و گروپەکان بانگرابوو تا ڕینمایی کۆتاییان پێ بدرێت وەك ئەوەی کە ڕێنماییە سەربازیەکان و ئەو واقیعەی تێیدا دەبن دیاری کردوە ، و ئەو تریشقانەی کە چاوەڕیمان دەکرد لەکۆتایدا لەئێرانەوە بۆمان هاتن ، کە ئەوانە لەبۆمبی ڕاجیمەکان دەبەستران و گرەنتی سەرکەوتنیان بۆ دەکردین، پێشبینیم وابوو، کە عێراقیەکان لەبەردەم بۆمبارانی چڕوپڕدا خۆیان بۆ ناگیرێت ، ئەمەش هەلی ئەوەمان دەداتێ کە بچینە ناو ڕەبایەکان و ئەو عێراقیانە بکوژین یان ڕادەکەن، بەلام لەسایەی ئەم بارودۆخەدا خەریك بو لەوە تێدەگەشتم کە پرۆسەکە جێ بەجێ ناکرێت.

***************************

ڕێنماییەکان لەسەرکردایەتی ئیسرائیلەوە داوایان دەکرد ، جێگیرکردنی عێراقیەکان بەرامبەر کوردەکان بەردەوام بێت ، بەمەش تێروانینی ئیسرائیل ڕێگەدەگریّ لە دروستکردنی جەبهەیەکی عەرەبی لەڕۆژهەڵاتەوە ، بارزانی زۆر حەزی دەکرد کەگورزی گورچکبڕ لەعێراقیەکان بوەشێنێت، "لۆنشی" کەپیاوێکی زیرەك بوو، ئەوەی بۆ "دیڤیدی" ڕونکردەوە کە ناوی نابو "بیردۆزی مانەوە" کە بارزانی پەیرەوی دەکات، ((بارزانی کاریك ناکات کەخەونی گەیشتنی بەئۆتۆنۆمی لە لایەن عێراقیەکانەوە بە هەرشێوەیەك بێت لەدەست بدات، ناخوازیت بارودۆخەکە بگاتەئاستێك کەحکومەتی عێراقی هێندە پەست بکات ، کە هەمو سوپاکەی بجوڵێنێت بۆ پاکتاوکردنی کوردەکان ، بەتایبەت کە ئەو لەوە دڵنیا نەبوو کە ئایا هاریکاری دەرەکی بەردەوام ئەبێت یان نا)).

تاکەسنوری کراوە لەبەردەم کوردەکاندا ئێران بوو، بارزانی لەوەدەترسا کە لە چرکەساتێکدا ئێرانیەکان دەستی لیّ بەربدەن ، وە خۆی بەتەنیا لە بەرامبەر دوژمنە عێراقیەکاندا ببینێتەوە ، کاتێك چرکەساتە یەکلاکەرەوەکە هات ، "دیڤیدی" سەپاندی بەسەر بارزانیدا کە بەهیمنی وتی: ((ئیستا کاتی ئەوەیە کە ڕازی بون لە"شا" وەربگریت)).

"لفکۆف" کە لەکۆبونەوەکە ئامادەبوە دەڵێت: ((وەڵامی بارزانی وەڵامیکی ڕۆژهەڵاتی فێڵبازانە بوو ، ئەو دەیزانی کە ئێرانیەکان خوازیاری لە قاڵبدانی عێراقیەکانن ، بەڵام نایانەویّ کە بەڕادەیەکی هێندە گەورە تورەیان بکەن)).

"تسوری ساجی" دەڵێت: ((کوردەکان شتەکانیان بە نیوەئارەزو "نابەدڵی" دەکرد، بیرکردنەوەی تایبەت بەخۆیان هەبوو، ئێمەش هیچ شتیکمان بەسەردا نەدەسەپاندن ، بەڵکو ڕاویژمان پیّ دەدان لەسەر ئەو کارەی دەیان خواست بیکەن بەباشترین شێوە ، سەرەڕای ئەوەهەرگیز بیرم لەڕزگارکردنی کوردستان لەژێرنیری عێراقیەکان نەکردۆتەوە، جگەلەوە من ئەوەم بەمەحاڵ دەزانی)).

لەئەیلوی ١٩٦٨ دا پلانی "ئەناناس" بۆ هەمیشە مرد، کاتێك پرسیار لە "دیڤیدی" کرا سەبارەت بەهۆکاری ئەوە وتی: ((وەلآمیکی ڕوونم پێ نیە ، لەوانەیە هۆکارەکە بۆ خودی بارزانی بگەڕێتەوە، گەلەکەی بەیەکەوە کۆك نەبون ، لەچەند هۆزێك پێکهاتبون بەیەکەوە شەڕیان بوو، بارزانی دیارترین سەرکردەی گەلەکەی بوو، بەلآم نەیتوانی کۆیان بکاتەوە ، بە تەنها وەك سەرۆك هۆزێك مایەوە ، بۆیە گران بوو بۆ ئەو کە نەخشەیەکی وەك ئەناناس قبولّ بکات، بەڕاستی من پێم وا نیە هەستی بەپەشیمانی کردبیت کەنەخشەکەی قبولّ نەکرد)).

هەر زوو بارزانی ئومێدەکانی بەحکومەتی نوێی عێراق بەباچوو، ئەو یاسای کاتیەی کەحکومەتی عێراقی لە٢٣ی ئەیلولی ١٩٦٨ ڕایگەیاند نە دوور نەنزیك مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردەکانی تیا نەبوو، بەلآم "عبدالرحمن البزاز" کە نوینەری ڕیکەوتن بوو سالّی ١٩٧٠! دەستگیر کراو بۆ هەمیشە ونبوو.

**************************

"مائیر عمیت" کەیەکێ لەتوندترین لایەنگرانی هاریکاری کوردەکان دادەنرێت لە ئەیلولی ١٩٦٨ دا کارەکەی وەك سەرۆکی مۆساد کۆتایی هات، لیوای یەدەك "زمڤی زامیر" جێگەی ئەوی گرتەوە.

لە ٩ی کانونی یەکەمی ١٩٦٨ "حردان عبدالفاخر التکریتی" جێگری سەرۆکی حکومەت و وەزیری بەرگری بارزانی بەوە تۆمەتبار کرد کەهاوکاری ئیران دەکات و چەکی لەئیسرائیل وەرگرتوە ، گومانی تێدا نیە تکریتی کاتێك ئەو تۆمەتانەی دایە پالّ بارزانی خۆی نەیدەزانی کە لەکارەکەی لادەبرێ لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٠ پاشان بە فەرمانێك لە بەغدادەوە لە ئازاری ١٩٧١ لە کوێت دەکوژرێت.

بارزانی زۆر بەتوندی وەڵامی ئەوتۆمەتانەی دایەوە ، عێراقی بە هەوڵدان بۆ لەناوبردنی گەلی کورد تۆمەتبار کرد، ڕوی کردە نەتەوە یەکگرتوەکان داوای لەسکرتێرەکەی کرد بەپەلە تەداخول بکات لەبەرژەوەندی گەلی کورد.

لە ٢٦ی شوباتی ١٩٦٩ "لیڤی ئاشکۆل" کۆچی دوایی کرد، بارزانی کوڕەکانی سەرەخۆشیان لە "لفکۆف" کرد و داوایان لێ کرد پرسەنامەی ئەوان بگەیەنێتە ئیسرائیل ، چونکە دەیانزانی بە بێ "ئاشکۆل" بڕیار لە ئیسرائل دا نەدەدرا ، بەدرێژکردنی دەستی هاوکاری بۆ کورد.

لەدوای ئاشکۆل "گۆلدا مائیر" دەسەلاتی گرتەدەست کە ئەویش بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتەکانی ئاشکۆل لەهاریکاری کوردەکان.

"کرۆن" دەڵێت : ((بارزانی بڕوای بەوە کردبوو، کە داهاتو بەردەوامی یاخیبونەکەی کورد بەندە بەدانپیانانی ئەمریکاوە پێی ، تەنها ئیسرائیل دەتوانێت وابکات ئەمریکا بەو ئاراستەیەدا بەرێت ، و وابکات باوەڕ بەگرنگی کورد بۆ ڕۆژئاوا بهێنێت ، گومان لەوەدا نیە کە ئەودانپیانانە وادەکەن کەئێرانیەکان سروشتی مامەڵە کردنیان لەگەڵیدا ب شێوەیەکی بنەڕەتی بگۆڕن)).

## بەشی نۆزدەهەم/ کوردەکان گورز لە دامەزراوە نەوتیەکان دەوەشێنن

لەای ئازاری ۱۹٦۹ ئاگر لەپاڵاوگەی نەوتی کەرکوك بەرزبووەوە کە بە یەکێ لە گەورەترین دامەزراوە نەوتیەکانی عێراق دادەنرێت ، پاش دو ڕۆژ کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی بڵاویان کردەوە کە کوردەکان پرۆسەیەکی تێکدەرانەیان لەکارگەیەکی نەوت لە باکوری عێراق ئەنجام دا، گومان لەوەدا نی یە کە وردی پرۆسەکە دەلالەت لە شارەزایی و پیلانداناني باش دەکات.

ڕۆژنامەی "دەیلی تەلەگراف"ی بەریتانی لەژمارەی ۱۱ی ئازاری ۱۹٦۹ بڵاویکردەوە کە عێراقیەکان لەوبڕوایەدان کە ئیسرائیلیەکان ئەو کارەیان ئەنجامداوە ، شیاوی باسکردنە تاقە ئیسرائیلیەك تیوەگلابوو لەم پرۆسە تێکدەرانەیەدا کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەچرکەساتی جێبەجێکردنی پرۆسەکەدا لە کوردستان نەبوو بەڵکو لە "کیبۆتسە" "دجانیا – ئە" بوو لە ئیسرائیل و لەڕیگەی ئەو ڕاپۆرتانەوە کەبەدەستیان گەیشتبو بۆیان دەرکەوتبو کە پرۆسەی "ئەلیکسەندەر" ناوێکی خوازراوە بۆ پرۆسەکە وەك خۆی جێبەجێ کراوە.

ئەو ئیسرائیلیە ناوی "ئیسحاق عبادی" بوو ئەفسەر بوو بە پلەی ڕائید لەیەکەی یەدەگی سەر بەهێزی پەڕەشوتەوانی وەك خواستن لەلایەن مۆسادەوە ڕەوانەی کوردستان کرا، "عبادی" کە هەموان بە نازناوی "ئەینی" بانگیان دەکرد لە سوریا لەدایکبوە زۆر بەباشی بەزمانی عەرەبی دەدوا ، لە ڕیگەی ئەو فەرمانەوە کە لە "تەل ئەبیب" پێیکرابوو پێیوترابوو کە دەچێت بۆ باشترکردنی ژێرخان لەکوردستان ، کەچاکسازیەکان بریتی دەبن لەڕاهینانی چەند "فصیل"ێکی کوردەکان لەسەر داگیرکردنی پێگە توندو تۆڵەکان و باشترکردنی ڕاهێنان لەسەرکۆمەڵێك جۆری چەك و دروستکردنی چوارچێوەی شەڕکردنی نوێ لەجێگەی چوارچێوە کلاسیکیەکان ، وە چارەسەر کردنی کۆگاکانی چەك و تەقەمەنی و توێژینەوە لە هۆکارەکانی بەرگری دژی فڕۆکەکان و ڕاوێژکاری لەبواری ئابوری و کشتوکاڵی.

پاش گەیشتنی بەکوردستان لەای کانونی یەکەمی ١٩٦٨ بۆی دەرکەوت کەواقعی حاڵی کوردستان ڕێگرە لەجێبەجێکردنی ئەرکەکەی ، وە ئەو"کەتیبەیە"ی کە پێویست بوو ڕاهینانی پێ بکات لە "مۆڵەت"دا بون، ماوەیەکی زۆریشی پێدەچێت تا کەتیبەی جێگرەوەیان دێن ، جگە لەوە زستانەکەی سەخت بوو ، بەفر بەرزاییەکی زۆری بەسەریەکدا کەوتبوو ، پێشمەرگەکان جل و بەرگی پێویستیان بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی ئەو بارودۆخە نەبوو و سەبارەت بەڕاوێژکاری کشتوکاڵیش عبادی هەستی کرد کە کوردەکان شتێکی ئەوتۆ لەبارەیەوە نازانن ، وە ئەگەر بیشیکات وەك خۆی نرخ و بەهای پێنادەن.

وە لەمیانەی بەسەرکردنەوەیدا بۆ چەك وتەقەمەنی هەستی کرد بڕیکی زۆر چەك وتەقەمەنی و تۆپخانە و دژەتانکی لێیە ، وە بڕی تەواو لەچەکی سوك بۆ ئەنجامدانی یەکەم پێکهینان، بەڵام کەم هێنانیکی زۆر ترسناك هەیە لەتەقەمەنی دژەفڕۆکەدا ، بەڵام بارودۆخی کۆگاکان زۆرخراپ بوو، هیچ گرنگیەکی ئەوتۆی پی نەدەدرا، هەوڵیدا کوردەکان ڕازی بکات کەکۆکردنەوەیەکی باش لە کۆگاکاندا زۆرگرنگە و ئەو هێرشەی کەفڕۆکە عێراقیەکان کردیانە سەریان بەهەلی وەرگرت تا پێیان بڵێت کەکەمترین هەلگرتن و خەزنکردن ئەوەیە کە دەبێت حەشارگە سروشتیە پارێزراوەکان بە کار بهێنرین.

لەکانونی یەکەمی ١٩٦٨ دکتۆری سەربازی ئیسرائیلی "ئەلکسەندەر برێشمان) گەیشتە کوردستان کەپێشتر وەك ئەفسەر لەلیوای جۆلان و پەرەشوتەوانی کاری کردبوو.

"بریشمان" لەیەکێ لەنامەکانیدا بۆ خێزانەکەی باسی لە "سامی" کردوە، کە "محمد محمود عبدالرحمن" ەو بە یەکێ لەنزیکەکانی بارزانی دادەنرێت بەجۆریك وەك کوڕی بێت ، سامی زمانی فەرەنسی لە"برێشمان"ەوە فێر بووە ، سامی پەردەی لەسەر ئەو هەڵدایەوە بۆ عبادی کە سەرکردایەتی یاخیبوان بڕیاری داوە گورز لەدامەزراوە نەوتیەکان بوەشێنێت، ئەمەش بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە:-

★دروست کردنی هەڕەشە بۆ سەر خاوەن پشکەکان لە کۆمپانیای نەوت ، تا ناچاریان بکات پارە بۆکوردەکان بنێرن، بۆ بەردەوامی دان بە شەڕەکەیان لەداهاتودا تا ڕێگە لەتێکدانی کارگەکان بگرن.

★لاوازکردنی ئابوری عێراق ئەمەش دەبێتەهۆی لاوازکردنی فشاری سەربازی عێراقی لەسەر کورد.

★دروستکردنی دەنگدانەوەی فراوان لەسەرکێشەی کورد لە ڕای گشتی جیهاندا.

عبادی سەبارەت بە نەخشەکە زانیاری بەبەرپرسانی ئیسرائیلی ڕاگەیاند ، پێشنیاریکرد کە پشتگیری لێ بکرێت، پێشتر ئەو بیرۆکەیە چەندجارێك خرابووەڕوو لە گفتوگۆی کوردەکان و ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکاندا ، بەلام ئیستا ئەو نەخشەیە بوە کاریك کە گێرانەوەی نیە.

لە ٦ی کانونی یەکەمی ١٩٦٨ لە دانیشتنی هەفتانەی وەزیری بەرگری دا خرایەڕوو ڕێکەوتن لەسەرڕایەکەی "موشێ دەیان" : ((تویژینەوە لە ئیمکانیەتی گەیشتن بەهاوکاری جێبەجێکردنی لەگەڵ کوردەکان ئاشکرایە کەمەحاڵ بوو ئەم بیرۆکەیە ، بەبێ ڕازیبوونی ئیرانیەکان جێبەجێبکرایە ، بۆ ئەم مەبەستە "زامیر"ی سەرۆکی مۆساد و "هرۆبن" لە کانونی یەکەمی ١٩٦٨ ڕویانکردە تاران دەستیانکرد بە گفتوگۆکردن لەسەر دۆسیەکە بە ئامادەبونی کرۆن ، و هاوڕێکانیان لە ساواك.

ئێرانیەکان هەتا ئەوکاتە ڕێگریان دەکرد لەوەی دۆسیەی نەوت و دامەزراوە نەوتیەکان بخەنە نێو ناکۆکیەکانەوە ، چونکە دەترسان لەبەرامبەردا عێراق گورزی هاوشێوە لەدامەزراوە نەوتیەکانی ئێران بدات لە "خوزستان" ، بەلام ئێستا ڕازی بون بەپلانەکە ، "زامیر" و "هرۆبن" ، گڵۆپی سەوزی ئێرانیەکانیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرت بۆ کوردستان، لە٢٠ی کانونی یەکەمی ١٩٦٨ دۆسیەکە جارێکی تر لەنوسینگەی وەزیری بەرگری خرایەڕوو ، پاشان لەگەڵ سەرۆکی مۆساد تاوتوێ کرا ، و ئامانجی پرۆسەکە دیاریکرا بەوەی کەزۆرترین زیان بگەیەنرێ بەدامەزراوە نەوتیە عێراقیەکان.

"عبادی" دەیویست لەگەڵ "سامی" دا گەشتێك بكات بۆ تەواوكردنی وردەكاریە داواكراوەكانی پرۆسەكە بەلاّم ئەو دەبوو لە دواوە بێت ، چونكە "سامی" لەگەڵ "دوو"كەسدا دەهات كە نەدەبوو بەبونی "عبادی" بزانن، ئەو سیانە چونە ناوچەی ئامانجەكە بەلاّم تەنها لە دوورەوە چاودێریان دەكرد، ئەوزانیاریانەی كەهێنابویان بەس نەبوو ، و لەپاش گەشتی دوەمی لێكۆڵینەوە كە"سامی" كردی ، عبادی لەخەیاڵی خۆیدا وینەی ئامانجی دەكێشا كە دەبێ بەوردی گورزیان لێ بوەشێنرێ، ناوچەی دەرگردن و پالاّوتنی سەرەتایی نەوتەخاوەكە و ناوچەی نەوتی پاڵێوراو ، بۆشی ڕون بوەوە كە ناتوانێت ڕەشاشەكانی چەكەكانی لە دوری ٥٢٥٠مەتر نزیكتر دابنێت ، سێ ڕاجیمەی كاتیۆشا كە تەنها یەكجار بەكاردەهات وە بە كارەبا دەتوانرا كاریان پێ بكرێت، هێزی ئەندازیاری چەكەمەنی ئیسرائیل ئەو جۆرە موشەكانەی پەرە پێدابو لەسەرداوای تایبەتی مۆساد، وە ئەو جۆرە كاتیۆشایە لە كوردستان تاقی كرایەوە، عبادی دەڵێ : ((ڕاجیمەكان لەپاش هاویشتنی موشەكەكانەوە بون بەلاّم هەڵدانی دووەم سەركەوتو بوو ئامانجی پێكا، بەلاّم عبادی پێی باش بوو چەكێكی تر بەكاربهێنیت كە زیاتر متمانەو وردترە لەبەكارهێنانی دا ، ئەویش تۆپهاویژی جێگیر لەعەیاری ١٠٦ ملم كە بەرهەمی یەكێتی سۆڤیەتە، كە وەك دژەتانك بۆ هەڵدانی ڕاستەوخۆ بەكاردێت تا دوری ١٢٥٠ وە ڕاجیمەی جۆری ١٢٠ ملم كە دوریەكەی دەگاتە ٤٥٠٠ تا ٦٥٠٠ مەتر ، عبادی داوای كرد ئیسرائیل بۆمبی تایبەت بۆ ئەو ڕاجیمە و تۆپهاویژانەی بۆبنێرێت و دەستبەجێ بۆی نێردرا.

عبادی بڕیاریدا كە تۆپهاویژە جێگرەكان بەئاراستەی ناڕاستەوخۆی بەكاربهێنیت ، بەئاراستەیەكی پلەبەند تادوریەكەی زیاد بكات بە دوری خوازراو ، هەڵسابوو بەبەكارهینانی لە گۆڕەپانی ڕاهینانی كوردەكاندا هەتا گۆشەی گونجاوی هەڵدانەكەی دۆزیەوە بۆ بەكارهێنانی تۆپهاویژەكە ، ئەوكات پەیوەندی بە بەرپرسەكانیەو كردو وتی: كە ئامادەیە بۆ جێ بەجێ كردنی پرۆسەكە ، بەلاّم

ئەوانەی کە دودڵ بون لەوە ئەفسەریکی تریان نارد بۆلای عبادی تا دڵنیا ببنەوە لە ئامادەکاری پرۆسەکە بۆ ئەم مەبەستە "ئەمیر کێرن" هەڵبژێردرا کەڕویکردە کوردستان و لەگەڵ عبادی ئەزمونی تەقاندنی تۆپهاوێژەکەی تاقی کردەوە لەسەر ئەوبەرمیلە بەنزینانەی کەبرابوونە دووری دیاریکراو ودانرابون ، بینی کە دەتەقنەوە ، کێرن پەیوەندی کرد بەبەرپرسانیەوە لە مۆساد و لە سەرکەوتنی ئەزمونەکە ئاگاداری کردنەوە.

"عبادی" و "کێرن" زانیان کە ناتوانن هاوڕێیەتی هێزی جێبەجێکار بکەن بۆ ناوچەی ئامانج بۆیە سوربون لەسەرئەوەی کە باشترین جێگا دیاری بکەن بۆ تۆپهاوێژەکان بۆئەمەش پشتیان بە نەخشەیەکی سۆفیەتی نوێ دەبەست.

پرۆسەی "ئەلکسەندەر" پێویستی بە ١٥٠ جەنگاوەر هەبوو تا لە بواری پاسەوانیدا کاری تێدابکەن هەروەها بۆدانانی بەربەست لەسەر ڕێگاکان و گواستنەوەو بەکارخستن، بەڵام پرۆسەی پێکان و نیشانەگرتن ، گروپێکی زۆر باش و کارامەی پێویست بوو ، دەرکەوت کە ٢٥ جەنگاوەر لەوانە کەخولەکەی "هەمەدان"یان بینیبوو لە هاوینی ١٩٦٨ دەستیان کرد بەکردنەوەی خولێك بۆ ئەو جەنگاوەرانە بۆ ڕاهینان و ژیاندنەوەی زانیاریەکانیان ، لە کۆتایی خولەکە عبادی ئەو دەرەنجامەی دەستکەوت کە ئەو گروپە ناتوانن سەرکەوتوو بن لەکارەکەیان تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە کارەکە پێویستی بە تەگبیر و بیرکردنەوە نەبێت ، لەحاڵەتێکدا کە گرفتێك ڕویدا ، بۆیە ئیسرائیل ئامێری پێوانەکاری هێناو بە لولەی تۆپهاوێژەکانەوە جێگیری کردن، و لەپێشەوە گۆشەکانی دیاریکردن، بەبێ ئەوەی هیچ توانای گۆڕانکاری تێدا هەبێت، پاشان ڕویکردە ناوچەکەو دوو مێخی چەقاند، تا هەر تۆپهاوێژ لەوێ نیشتەجێ بن ، یەکەم بۆ ئاماژە کردنی بۆ ئامانجەکە ، مێخی دوەم بۆ دیاری کردنی ئەو شوێنەی کەدەبێ پێیەکانی تۆپهاوێژەکەی لێ دابنرێ.

هیچ لەجەنگاوەرە کوردەکان ، هۆکاری ئەو ڕاهێنانە چڕوپڕەی نەدەزانی جگە لە "سامی" وە پرۆسەی دیاریکردنی شوێنی تۆپهاویژ و ڕاجیمەکان پرۆسەی گواستنەوەیان لەسەرپشتی ولاخەکان نامۆ بوو بەلایانەوە بەڵام پشتیان بە سامی بەستبوو، "کێرن" لێنۆرینەکانی خۆی تەواوکردو گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل هیچ گومانی نەبوو لەپێویستی پرۆسەکە.

دەڵێت: ((بۆیەکەم جار لەژیانمدا ئەوەم دیت کە پێی دەڵێن "لە ناو بردنی گەلێك" فڕۆکە عێراقیەکان بەبێ وەستان بۆمبارانی کوردەکانیان دەکرد ، ناتوانرێت ژمارەی پێکراوەکانیان دیاری بکرێت، ئەوان کێلگەو ماڵەکانی کوردەکانیان ڕوخاندبوو، وە سوتاندبوو، وەك ئەوەی هاولاتی ولاتێکی دوژمن بن)).

***************************

ڕیگای ئامانجەکە دورو درێژ و پێاوپێچ بون ، گەیشتن بە شوێنەکە سێ هەفتەی خایاند، جەنگاوەران و ولاخەکانیان تەنها لە کاتژمێرەکانی شەودا هاتوچۆیان دەکرد ، تا ڕێگربن لە دۆزینەوەیان و ڕوبەڕوبونەوەی فڕۆکەکان ، هەرولاخێك سندوقێکی تەقەمەنی بەکێشی ٥٠ کیلۆ هەلگرتبوو ، و لەهەندێ ڕێچکۆڵەی سەختدا ، جەنگاوەرەکان ناچاردەبون سندوقەکان بە پشتی خۆیان هەڵبگرن، ئەمە جگە لەوەی کە دەبوو یەکێ لەو ڕوبارانە ببڕن کە تێکەڵێ "دیجلە" دەبێت و ناوی "زێی بچوك"ە، هەمو سەختی و گرفتەکان لەپێشەوە حسابی بۆ کرابوو بۆیە ، بڕیاردرا جەنگاوەرەکان بەپارە قەرەبوو بکرێنەوە، لەهەندێ لەو ڕێچکۆڵە سەختانە.

جەنگاوەران بەکۆڵەکانیانەوە گەیشتنە ئامانجەکە، وە تۆپهاویژەکانیان بەو پێوەرەی کە "عبادی" وتبوی دانا، لە ١٥ی شوباتی ١٩٦٩ دا کاتێك هەموشتێك ئامادە بوو بۆ کار ، "عبادی" بڕیاری دا بگەڕێتەوە ئیسرائیل بەر لەگەڕانەوەشی

ئەو ڕیشەی تاشی کە لەکوردستان هێشتبویەوە ، کە وای کردبو کوردەکان ناوی بنێن "ئەبو ڕیشە".

لە ١٥ی ئازاری ١٩٦٩ کەناڵەکانی ڕاگەیاندن هەواڵی بۆمبارانی دامەزراوە نەوتیەکانی کەرکوکی بلاو کردەوە ، پاشان ئەو هەواڵە بیسترا کە کۆمپانیای نەوتی عێراق بڵاوی کردەوە کە تێیدا هاتبوو ١٠ یەکە لەکۆی ١٢ یەکەی تایبەت بەجیاکردنەوەی گۆگرد لە یەك تێکشکێنراون کەهەموو نەوتی گوستراوە بۆ بەندەری "بانیاس"ی سوریا و بەندەری "تەرابلوس" لەلوبنان دەگرێتەوە، و پێیدا تێپەڕ دەبن ، کەئەمەش بوە هۆی دابەزاندنی بەرهەم هێنانی نەوت بەڕێژەی ٥٠٪.

هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بڵاویان کردەوە کەدامەزراوەکان بە تۆپهاوێژ بۆمباران کراوان لەکوردەکانیش بترازی کەسی تر لە ناوچەکەدا تۆپهاوێژی نیە.

**********************

لە ئایاری ١٩٦٩ دا واتە پاش نزیکەی دە هەفتە لە پرۆژەکە ڕۆژنامەی "سەندەی تایمز" ڕاپۆرتیکی وردی بەئیمزای "جۆن کیل براکن" کەڕۆژنامەنوسیکی بەریتانی ناودار بوو بڵاوکردەوە کە چاوپێکەوتنیك بوو لەگەڵ "سامی" سەبارەت بەپرۆسەکە ئەنجامی دابوو، بەڵام سامی ئەو ڕۆڵەی کە "عبادی" لە پرۆسەکەدا پێی هەستابوو شاردبویەوە ، لە٢٦ی کانونی یەکەمدا.

"کیلبراکن" نوسیبوی : ((سامی لەگەڵ دوو لەپیاوەکانی گەشتێکیان لەناوچەکەدا کرد بە جلوبەرگی شوانەوە ، چوار ڕۆژ بەسەرپشتی وڵاخەکانیانەوە ڕێگایان بڕی تا گەشتنە ناوچەی کەرکوك، کاتێك گەڕایەوە بۆ کوردستان یەکەیەکی هێرش بردنیان لە ٢٠٠ سەرباز دروستکرد ، هەمویان لەو خۆبەخشانە بون، کە ڕاهێنانی تایبەتیان ئەنجام دابو، لەوماوەیەدا سامی سەرقاڵ بوو بەچارەسەرکردنی کێشەیەکی گران کەتایبەت بوو بەگواستنەوەی ئامادەکاریەکان بە پشتی وڵاخ ، یەك وڵاخ تەنها دەیتوانی سێ هەزار فیشەك یان ٦ بۆمب هەڵبگرێت، پێویستە

هەر ڕاجیمەیەکیش هەڵبوەشێنرێت بۆ ٣ بەش هەر بەشێکیش بۆ سەرپشتی وڵاخێك ، شەش ڕاجیمەو دوسەد بۆمب گوازرانەوە بۆ تەواوکردنی پرۆسەکە)).

((یەکەی هێرش بردن ، ڕووی لەئامانجەکە کرد و لە٢٣ی شوباتی ١٩٦٩ لەشێوەی کاروانێك کە لە ١٠٩ وڵاخ پێکهاتبوو ، لە ٢٨ی شوبات گەیشتنە گوندێکی نزیك کە وەك بنکەیەك دادەنرا ، یەکێ لە یەکەکان نێردرا بۆ دەستکەوتنی هۆکاری گواستنەوە گەڕایەوەو لەگەڵ خۆیدا ١٣ بارهەڵگر و ئۆتۆمبێلیی هێنابوو، تۆپهاویژەکان لەبارهەڵگر و ئۆتۆمبیلەکان بارکران و لەژێر باڵی شەوەزەنگدا کەوتنە ڕێ ، سەعات ٨ ئیوارە گەشتنە شوێنی هەڵدانی بۆمبەکان)).

سامی دەڵێت: "سەرکەوتو بوین لەگەیشتن بەئامانجەکە بەتەواوەتی دەمتوانی بەرکەوتنی هەر قازیفەیەك ببینم وە ڕێنمایی دەربکەم بۆ هەڵدانێکی باش ، دوو کاتژمێر چارەکێك کەم بۆمبارانمان کرد هەرچەندە هیچ بەرگریەکمان ڕوبەڕوونەبوەوە هەرچەندە نزیکەی ١٠٠ قازیفە (بۆمب) مابو بەڵام بڕیارم دا کە ئەوە بەسە ، شوێنەکەمان جێ هێشت بەبێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێك بەجێ بهێڵین تەنانەت سندوقی بەتاڵیش".

((کاتێك پرۆسەی بۆمبارانەکە دەستی پێکرد پاسەوانە شەوانەکان توشی شۆك بون، پێنج خولەك تێ پەڕی هەتا هەلیکۆپتەرێکی بێ چەك ، شوێنی هەڵدانی قازیفەکانی دۆزیەوە کەگردێکی بەرز بو لەنزیکەی پێنج کیلۆمەتری باکوری ڕۆژئاوای ئامانجەکە، قازیفەکان زۆر بە خێراییەوە بەرەو ئامانجەکە دەچون)).

((دوا قازیفە کە ژمارەی ١١٧ بوو دای لە ناوچەی باڵاوتنی نەوت و دەوروبەری کاتژمێر ١٠:٣٠ خولەکی ئیوارە دوای بیست خولەك لەبۆمبارانە هێزێکی عێراقی بینرا کە لەنزیکەی هەزار سەرباز پێکهاتبون لەڕێگەی سەرەکی کەرکوك نزیك دەبونەوە ، هێزیکی بەرنگاربونەوەی کوردی بەچەکە سوکەکانیانەوە دەستڕێژیان لێ کردن ، ئەو پیکدادانە تاکەپیکدادان بوو، لەگەڵ هیزەکانی عێراقی پاشان خێرا هێزی هیرشبردنی کوردەکان گەرانەوە بنکەکانی خۆیان)).

بڕی زەرەرو زیانی ئامێر و دەستگا و بەرهەمهێنان گەیشتە ١٠ ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی و زیاتریش ، وە کارگەکە بە یەکجاری لەکارکەوت بۆماوەی هەفتەیەك.

لەلێکۆڵنەوەیدا لەسەرپرۆسەکە گۆڤاری "پیترۆڵ ینفەر ماسیۆن"ی فەرەنسی تایبەت بە کاروباری نەوت لەژمارەی ڕۆژی ٤ی نیسانی ١٩٦٩ وتویەتی : (( هێرشەکە زیانی زۆر گەورەی داوە کە دەگاتە بڕی یەك ملیۆن جونەیهی ئیستەلینی، بۆ هەریەکەیەکی نەوتی خاو، ئەو یەکانە ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئاستی بەرهەمهێنانی پێشویان بەلایەنی کەمەوە تا دوو مانگی تر)).

لەنامەیەکدا کە "سامی" بۆ "عبادی" ناردوە لە ١٦ای ئازاری ١٩٦٩ نوسیویەتی : ((هاوڕێ ئازیزەکەم هیوادارام هەمولایەك باش بن، پرۆسەکە زیندوو بوو ئێمە دڵنیاین کە جێ دەستی تۆ زۆر دیاربوو ، ئەگەر بەشداری تۆ نەبوایە پرۆسەکە سەرنەدەکەوت)).

پاش ماوەیەکی کەم سامی سەردانی ئیسرائیلی کرد، سەردانێکی کورت بەمیوانداری "عبادی" ئەو هەلە ڤۆسترایەوە بۆ پرسیار لێ کردنی سەبارەت بە پرۆسەکەو بارودۆخەکەی ، ڕون بوەوە کە ڕێ ڕۆشتنەکە هەفتەیەکی خایاندوە، لەڕێگەکەدا جەنگاوەران ١٤٠ کیلۆمەتریان بڕیوە وە ڕوباری زێێ بچوکیان بەوبەلەمانە بڕیوە کە گەنم لەنیوان هەردو کەنارەکەدا دەگوازێتەوە ، ١٥٠ ولاخ و نزیکەی ١٠ تەن چەك تۆپهاویژە جێگیرەکانیان هەلگرتوە لەگەڵ ڕاجیمە و تەقەمەنیەکانی، وە ڕاجیمەکان ڕویان لەو شوینە کراوە کە ١١ بیرە نەوتی لێ بوە ، وە ڕاجیمە بەئارستەی "کێلگە" لە خۆگرە نەوتیەکان و تانکەرەکان دانراوە ، ڤازیفەکان ١٠ بیریان ڕاستەوخۆ پیکاوە، "عبادی" وای پیشان دەدا کەگرنگی دەدات بەوەی کە ئایا ڤوربانی هەبوە یان نا، زامیر لە سەرەتاوە داوای کرد نەخشەکە وا دابڕێژێت کە هیچ کرێکار و هونەریەك بەرنەکەوێت بەتایبەتی بیانیەکان، بێگومان بواری بۆمبارانەکە زۆر دووربوو لە ناوچەی نیشتەجێ بون، جگە لەوەی

که بۆمبارانەکە بە شێوەیەکی پلەپەند ئەنجامدرا تا ڕێگە بۆ ئەوکەسانە ئاسان بکات کە دەیانەوێ لەناوچەکە ڕابکەن.
لەنزیك کێڵگە نەوتیەکانەوە کەتیبەیەکی کۆماندۆی خاوەن چەکی ئاسمانی لێیە ، بەڵام وەك پێدەچێت هیچ سەربازێکی عێراقی نەیتوانیوە بگاتەشوێنی هەڵدانی قازیفەکان وە بەهیچ جۆرێك نەیانتوانیوە ڕاوەدووی هێزە کوردیەکە بنێن لەکاتی پاشەکشەدا.
"عبادی" هاوڕێیەتی سامی کرد لە هەموو گەشتەکەیدا لە ئیسرائیل بە کۆبونەوەی لەگەڵ "گۆڵدا مائیر"یشەوە.

**************************

ئەو هێرشەی کەکوردەکان کردیانەسەر کەرکوك ڕژێمی بەعسی ناچار کرد کە درێژە بەدانوستانەکان بدات لەگەڵ کوردەکاندا و بەڵێنی دا بەبارزانی کە پێشنیارەکەی سەرۆکی حکومەت "بەزاز" جێبەجێ بکات، کە لە حوزەیرانی ١٩٦٦ بەکوردەکانی دابوو، کە تایبەت بوو بەپێدانی مافەکان بەگەلی کورد.
بارزانی هۆشداری دابونێ کە ترسیان نیە لە دوبارەهێرشکردنەوە سەر کێڵگەکانی نەوت و کۆنترۆڵ کردنی ئەگەر بەشێك لە قازانجی ئەو کێڵگانە تەرخان نەکرێت بۆ پەرەپیدانی کوردستان.
لە ڕاستیدا عێراقیەکان خۆیان ئامادەدەکرد و ڕۆژیان دەژمارد بۆ ئەنجامدانی جەنگ، بەڵگەش ئەو تۆمەتانە بون کە ڕوبەڕوی ئێرانیان دەکردەوە بەبیانووی ئەوەی دەستی هاوکاریان بۆ کوردەکان درێژ کردوە، لەوانەیە عێراقیەکان نەیانزانی بێت کە ئەفسەری پێوەندی.ئیسرائیلیشی لێ بن، و کوردەکان ئەوانیان لە ئێرانیەکان پێ باشترن ، هۆکاری ئەو بەباشتر زانینەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی مامەڵەی ئیسرائیلیەکان ، ئەوانە لە هیچ شوێنێکدا خۆیان جیا نەدەکردەوە ، لەهەمان خواردن و خواردنەوەی کوردەکان دەیانخوارد و دەیانخواردەوە ، ئەمەش وایکرد هەندێ جار توشی نەخۆشی ببن ، وەهەندێك

بەپەلە بگێڕدرێنەوە بۆ ئیسرائیل ، بەڵام ئێرانیەکان ڕۆژانە خواردن و خواردنەوەیان لە ئێرانەوە بۆدەهات ، و هەمیشە جەختیان لەوەدەکردەوە کە کارکردنیان لەکوردستان بەدڵ نیە.

"تسادۆق ئۆفێر" کە لە ئازاری ١٩٦٩ شوێنی "لفکۆف" ی گرتەوە دەڵێت: ((هێشتا بێزاری و تورەیی هاوتا ئێرانیەکەمم لەبیرە کە پیاوێکی ساواك بوو و دەیگوت لە تاران لە باشترین شوێندا دەخەوم بەڵام لێرە هیچ نیە ، نەئافرەت هەیە نەخواردن تەنها چیاو ئاسمان هەیە)).

"ئۆفێر" لە مانگەکانی نیسان بۆ حوزەیرانی ١٩٦٦ ڕاهێنانی بە کوردەکان دەکرد لە ئیسرائیل ، لەکوردەکان لەگەڵ یەکیکیاندا یەکێ بینبوەوە و ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو لێنۆڕینی بارودۆخی کۆگاکانی چەك و تەقەمەنی بوو، بۆ ئەم مەبەستەش پشتی بە دوو ئەفسەری هێزی ئەندازەیی سوپای ئیسرائیل بەستبو، لەو ماوەیەشدا ئەفسەریکی تری پەرەشوتەوانی ئیسرائیل گەیشتە کوردستان، ئەویش "یۆرام زەموش" بووکەهاتبوو ڕاوێژ لەگەڵ گەعقراوی" بکات بۆ پێکهینانی کەتیبەیەکی نوێ.

*********************

لەماوەی ڕاهێنانەکاندا چەند پلانێکی تر باسکران لەوانە هێرشکردنە سەر فڕۆکەخانەیەکی عێراقی لەشاری "کەرکوك" و هێرش بۆسەر ئەو بۆریەنەوتانەی کەنەوتیان بۆ چەند بەندەرێکی گەورە دەگواستەوە بەڵام هیچ کام لەم پلانانە لەسەردەمی "زامۆش"دا جێ بەجێ نەکران ئەوەش بەهۆی قوڕاو بارانی بەخوڕەوە.

"دیڤید کرۆن" دەڵێت: ((هەمو کوردەکان دڵخۆش و ڕازی نەبون بە هاوکاری ئیسرائیلیەکان بۆیان ، لە یەکێ لە سەردانەکانمدا دیتم بارزانی لەوێ نەبوو ، لەگەڵ "میرخان" کۆبووینەوە کە لەنەبوونی بارزانیدا لێپرسراو بوو لە مەسەلەی ئیسرائیلیەکاندا، لەسەر هەمو دۆسیەکانی خشتەی کار قسەمان کردو دواین،

کاتێك چوینە سەر ئەو چالاکیانەی کە نەخۆشخانە مەیدانیەکە پێی هەڵدەستێ لە ناکا و وتی : ئەو زیانەی کە نەخۆشخانەکە هەیەتی لە سودەکەی زیاتر، هەواڵی گەیوەتە عێراقیەکان و بووەتە سەرچاوەی کێشە.

هەستم کرد لەتوڕەییدا خوێن لەدەمارەکانم دەکوڵێ وتم ئەوەی دەیکەین بۆبەرژەوەندی کوردەکانە، ئەگەر نەخۆشخانەکە کێشەتان بۆ دەنێتەوە کارەکە زۆر ئاسانە، چادرەکان دەپێچمەوە و دکتۆرەکان لەگەڵ خۆم دەبەمەوە بۆ ئیسرائیل میرخان ویستی هیورم بکاتەوەو وتی: مەبەستم ئەوە نەبوو ، بەڵام من سوربوم لەسەر ڕایەکەك تائاشکرا دەبێت سنوریکی بۆ دابنێن ، خێمەکانمان پێچانەوە لەگەڵ ئامێرەکان دکتۆرەکانم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ تاران و لەوێشەوە بۆ ئیسرائیل ، پێویست بو لەسەر کوردەکان زۆر بە شێوەیەکی جوانتر لەدوای ئەوە داوا بکەن، بۆکردنەوەی نەخۆشخانەیەکی تر، لەوکاتەوە هیچ یەکێ لەوانە باسی لەوزیانانە نەکرد کە ئێمە بە کوردەکان دەگەیەنین)).

ناکۆکیەکان لەنیوان عێراق و ئێراندا لەسەر "شط العرب" لە نیسانی ١٩٦٩ دا نوێبونەوە ، ئیرانیەکان تاکلایەنە ڕێککەوتننامەی ساڵی ١٩٣٧ ی نێوان هەردولایان هەڵوەشاندەوە پاش ئەوەی کە عێراقیەکانیان بەرێگرتن لەکەشتیە ئێرانیەکان تۆمەتبار کرد، بەڵام ئەم بەلگەیە تەنها بوختانێك بوو، شا پێی وابوو کە ڕژیمی عێراق زۆر لەوەلاوازترە کە ناڕازی بێت بە هەنگاوەکانی ئەوەش بە ڕاستی ڕویدا، عێراقیەکان بەهات و هاوار وەڵامیان دایەوە، هەستان بە دەرکردنی شیعە و ئێرانیەکان وە فشاریان خستە سەر جەماوەری شیعەی عێراقی ، هەروەها هەوڵیان دا کە چالاکیە نهێنیەکانیان لەناوچەی "خوزستان" زیاتر بکەن، و داوای وەرگرتنەوەی ئەو پارچەیە لە خاکی وڵاتەکەیان بکەنەوە کە لەساڵێ ١٩٣٧ لەسەردەمی ئینتیدابی بەریتانی لێی دابڕێنراوە وە دەوڵەمەندە بە نەوت.

لەدەرەنجامی ئەو بارودۆخە ئاسایی بوو کەئێرانیەکان دەستتێوەردانی خۆیان لەکوردستان قوڵتر بکەنەوە، لە٢٠ی نیسان کارمەندێکی ئێرانی بەباڵوێزی ئەمریکا لەتارانی وتبو: ((بارودۆخی ناوخۆی عێراق خەریکی داڕوخانە سوپای عێراقیش توشی هێرشی تورك دەبێتەوە)).
پێدەچێت هەڕەشەی ئێرانیەکان کاریگەری خۆی هەبوبێت وای کرد کە بەغداد چاو بخشێنێتەوە بەپێدانی ئۆتۆنۆمی بە کوردەکان، و هەڵویشتی خۆی لەوبارەیەوە زیاتر مامناوەند ڕابگرێت، ئەو مامناوەندیەش لەو لێدوانە ڕەنگی دایەوە کە "میشیل عەفلەق" تیۆرسێن و دامەزرێنەری حیزبی بەعس لە حوزەیرانی ١٩٦٩ دا کە وتی : ((حکومەتی عێراق دژایەتی مافی کوردەکان ناکات لەبەدەستهینانی جۆریکی تایبەتی ئۆتۆنۆمی بەڵام ئەو سور بوو لەسەر ئەوەی کە بڵێ: "بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەشێکی ڕێگەپیدراوە لە شۆرشی عەرەبی" لە دوای ئەوە ڕۆژنامەی "الثورة العربية" زنجیرەووتارێکی بەهەمان ئاراستە لەماوەی نیوان نیسان بۆ تشرینی یەکەمی ١٩٦٩ دابەزاند.
بارزانی ڕاهاتبوو بەگۆڕانگاری هەمیشەیی لەقسەکانی دا ، کاری کرد بۆ جەنگ کردن ، لەڕاستیشدا جەنگ لەزۆربەی ناوچەکاندا لە ئەوپەڕی توندی دا بوو، بۆنمونە لە "قەڵادزێ" ، کە "قەڵادزێ" قەڵایەکی عێراقیەکانی لێ بو لەسەر گردێکی بەرز چواردەوری پڕ بو لەبەرد لە ناوجەرگەی ناوچە کوردیەکەدابوو، عێراقیەکان پارەو کەل و پەل و تەقەمەنیان بۆدەگواستەوە بەچەندەها کاروان، وە کوردەکانی ناوچەکەیان ناچار دەکرد لە پێشەوەی کاروانەکەدا ڕێ بکەن، تا کوردەکان نەتوانن هێرش بکەن سەر کاروانەکانیان.
هێزێکی کوردی ڕویان لەقەڵاکە کرد بەڕێیەکی گڵدا کەچەکدار کرابون بەدوو ڕاجیمەی ١٢٠ملم پاش هەفتەیەك دەگەیشتنە ئەوێ ، خۆئامادەکردنەکان بە

هێواشی بەڕێوەدەچوو، ڕاجیمەکان ڕۆژانە جارێك یان دوجار بەکاردەهێنران، لەکاتژمیری دیاری نەکراودا بەلاّم وەك "ئۆفێر" دەڵێت : عێراقیەکانی تۆقاندبوو. ڕۆژێکیان هێزە کوردیەکە بە "ئۆفیر"یان وت: کە قەلاّکەیان داگیر کردوە، پرسی بوی شەڕەکە چۆن بوە ، هێزەکەش گوتبویان هیچ شەڕیك ڕوی نەدا ، عێراقیەکان بەیانیەك لەقەلاّکە چونەدەرێ وە ئیمەش چوینە ناوی هیچ هۆکارێك نازانین کە بۆ پاشەکشەیان کردوە.

****************

جگە لەوخولەی کە ئەلیشع بەڕێوەی دەبرد "نەتان ڕاهیب"یش خولێکی چڕوپڕی لەناوچەی "حبلە" بەڕێوەدەبرد بەبەشداری چوار شاگرد هەروەها "ڕاهیب" لەچاکترکردنی چەکەکان و توێژینەوە لەتوانای دامەزراندنی پیشەسازی سەربازی بچوك لە ناوچەکەدا کاری دەکرد کە هەلی ئەوەی بۆ بۆ کوردەکان دەخوڵقاند کە دەستبەجێ کێشەکانیان چارەسەر بکەن، لە ناو کوردەکاندا ئەندازیارێکی "ڕایەڵەکاری-منسوجات" دەستکەوت پێشنیاری کرد بێنردرێت بۆ ئیسرائیل تا ڕاهێنان بکات، هەروەها سەرکەوتوو بوو لەبەکارخستنی وەرشەیەکی میکانیکی لە حەشارگەیەکدا و ئێران و ئیسرائیل پارەیان دا بۆکڕینی "میخرەتە"یەك و "مۆلیدە"یەکی کارەبایی گەورە ، ئەو وەرشەیە کاری دروستکردنی ئەو تەقەمەنیانە بوو کە دواتر لەزۆر کاری تیکدەرانەدا بەکارهاتن.

لەو کۆبونەوەیەدا کە لەای ئایاری ١٩٦٩ لەسەرکردایەتی بارزانی لە"دیلمان" سازکرا، سەرۆکی مۆساد "زامیر" و "هرۆبن" و نوێنەری ساواك دۆسیەی یارمەتیدانی کوردەکانیان بەچەك و تەقەمەنی و لایەنی ئاسایشی گشتگیر و هەڵسان بەپرۆسەی بەرفراوانتر دژی دامەزراوەنەوتیەکانی کەرکوك و تەقاندنەوەی بەنداوی "دوکان"یان تاوتوێ کرد ، زامیر پێشنیارێکی وەزیری

بەرگری "موشێ دەیان"ی هێنابوو ، کە هەتا ئەمڕۆش ئەو پێشنیارە بەنهێنی ماوەتەوەو ئاشکرا نەکراوە، ئەو پێشنیارە لەسەر زەمینەی ئەو جەنگە دەرونیە بووکە "میسر" سەرکردایەتی دەکرد دژی ئیسرائیل ، کە لەکۆتایدا دەستپێشخەری میسری بۆ دروستکردنی جەبهەیەکی ڕۆژهەلاتی دژی ئیسرائیل بەبەشداری کارای عێراقی لێکەوتەوە ، "دەیان" پلانەکەی خۆی لەسەربنەمای فەشەلپێهێنانی دەستپێشخەریەکەی میسر دارشتبوو لەرێی سەرقاڵ کردنی سوپای عێراقیی و ناچارکردنی بەمانەوە لەولاتەکەی خۆیدا.

"هرۆبن" دەلێت: کە ئەو پێشنیارەکەی "هرۆبن"ی ڕەت کردۆتەوە ، جگە لەوەش بارزانی بەڕێزە ڕەتی کردۆتەوە.

جگەلەوە ئیسرائیل دەیویست ڕاوێژکارەکانی بە شێوەیەکی فراوانتر سەرپەرشتی جەنگەکان بکەن، زیاتر لەوەی کەکوردەکان قبولیانە، سەبارەت بەوە بارزانی بە"تسادوق ئۆفیر" وتبوو : ((بیربکەرەوە ئەگەر یەکێ لەراویژکارەکان بەبریندار یان بەساغی بکەوێتە دەستی عێراقیەکان لەوحالەتەدا تۆ جەنگاوەریك لە دەست دەدەی ، بەلام من وەك کوردیکی عێراقی بەخیانەت تۆمەتبار دەکرێم)).

## بەشی بیستەم / "تۆرپاین"ە گەورەکان نەتەقینەوە

"میخا بن ئاری" "کیبۆستە" گەڕایەوە بۆ نێودەستەی ئیسرائیلی لەکوردستان لە ٣٠ ی ئایاری ١٩٦٩ ، هاتنی بۆ ئامادەکاری بوو بۆ چەند پرۆسەیەکی سەربازی بەپێی ئەو ڕیکەوتننامەیەی لەنیوان "زامیر" و بارزانی دا هەبوو.

بەرلەهاتنی "ئۆفیر" لەگەڵ "ئازاد" قسەی کردبوو کەپێی وتبوو : ((هاتنی "کیبۆستە" زۆرزووە ، بۆیە پێویستە زۆر چاوەڕێ بکات)).

کاتێك "ئۆفیر" بە"کیبۆستە"ی وتبوو کە زۆرزوو هاتووە، کیبۆستە وتبوی کە"زامیر" و "هرۆبن" پێیان وتووە : پێویستە چەند پرۆسەیەك دەستبەجێ ئەنجام بدرێن، کیبۆستە چاوەڕێی "فارس"ی دەکرد تاپێشنیاری ئامادەکاری پرۆسەی "ئەلیکسەندەری فراوان"ی بۆبکات کە بۆ دوبەش دابەش دەبێت "ئەلیکسەندەر B" و "دیڤید" کەئامانج لێیان تەقاندنەوەی "تۆرباین"ە کە عێراقیەکان بەکاری دەهێنن بۆ بەکارهینانی فشاری ئاوی ڕوباری "زێی بچوك" بۆ بیرەنەوتەکان هەتاپاڵ بەنەوتەکەوە بنێت بڕۆن بەرەو سەرەوە، گومان لەوەدانیە کەتەقاندنەوەی"تۆڕباین"ەکان و لەهەمان کاتدا تۆپ بارانکردنی دامەزراوەنەوتیەکان بەتوندی بەسە بۆئەوەی کەدەرهینانی نەوت بۆ ماوەیەکی زۆر ڕابوەستیت، جگە لەو ئاگرە گەورەیەی کە لەگەورەترین کێلگەی نەوتی عێراق بەردەبێت.

"کیبۆتسە" دەڵێت : لەگەڵ "لۆنتس" کۆبومەوە کە تازە لە گەشتێکی فراوانی ناوچەی پرۆسەکە گەڕابوەوە، بیروڕامان ئاڵوگۆڕ کرد، و کارەکانمان دابەش کرد ، بەلام لەو چرکەساتەوە دەستی دەستی پێکرن و ئەملاولا کردنی بەردەوام دەستی پێکرد کە بەئاشکرا دەری دەخست کەکوردەکان نایانەوێت من لەناو ئەو کۆماندۆ[1]یە دابم ، کەدەنێردرێت بۆ ناوچەی پرۆسەکان.

---

[1] کۆماندۆ زاراوەیەکی سەربازییە ، بە هێزە دەوترێت کە تایبەت ڕاهینراوە بۆ ئەرکێك. -وەرگێر-

له ١٥ی حوزەیران "کیبۆسته" بۆ "ئەفیفە"ی‌ژنی نوسیویەتی : ((ئەم ئیوارەیە میرخان پێی وتم کۆماندۆ کوردیەکە هەفتەیەك مۆڵەتی وەرگرتوە دەتوانم پاش دوو هەفتە بڕۆم بۆ ئامادەکردنی کۆماندۆکە، پاشان دەست دەکەم بە ئامادەکاری بۆ پرۆسەی"دێڤید" ، ئاووهەوا خراپە باران بەبەردەوامی دەبارێ و سەرماکەی زۆر سەختە)).

له ٢٢ی حوزەیران نوسیویەتی : ((پرۆسەی "ئەلیکسەندەر" پشتگوێ خراو پێشەنگی درا بەپرۆسەی "دێڤید" کەمن بەرپرسمی ، بۆیە من دڵم خۆشە داوام کرد کەکاتێکی دیاریکراوم پێ بڵێن بۆ چوونەپاڵ کۆماندۆکە لەشوێنی پرۆسەکە چونکە ئیشێکی ترم نەماوە کەبیکەم لێرە، زانیاری ئەوەمان پێگەیشت کە "فارس باوە" ناوەندیکی پۆلیسی تێك شکاندوە)).

٢٣ی حوزەیران : ((خۆم سەقاڵکرد بەئامادەکردنی بۆمبی چێنراو کە لە پرۆسەی دێڤیددا بەکاردێت))

(( ٢٥ی حوزەیران : ئەمە ئەو ڕۆژەبوو کەچاوەڕێم دەکرد ڕازی بون وەربگرم بۆ ڕووکردنە شوینی جێبەجێکردنەکە بەڵام لە جیات ئەوە کە "فارس" خەریکە بڕیاربدات ، هەوڵدەدەم ڕازی بکەم کە ڕێگەم بدات لەبنکەکەی ئەو ئامادەکاریەکان بکەم، هەست دەکەم "فارس" فەرمانی کردوە تێم بگەیەنرێت کە لەگەڵ نەڕۆم بۆلای واتە بۆشوێنی جێبەجێکردنی پرۆسەکە)).

((٢٦ی حوزەیران : بێزاربووم لە چاوەڕێکردن ، مرۆڤ چەند دەتوانێ بە دەستبەسراوی دانیشێت؟؟ من مانگێکە لێرەم و هیچم نەکردوە، ئومیدم بەوەنیە بەم نزیکانەش هیچ ڕوبدات ، چونکە جەختیان نەکردۆتەوە لەوەی کە ئارەزووبکەن زوو پرۆسەکە ئەنجام بدرێت، دەگەڕێمەوە بۆ ئیسرائیل)).

((٢٨ی حوزەیران : ئێوارە "ئازاد" و "فارس"هاتن باسی هەموو وردەکاریەکانی پرۆسەی "دێڤید"مان کرد کەمن هەموو تەقەمەنیەکانم بۆ ئامادەکردوە بەڵام من شوێنی ئامانجەکەم نەدەزانی ، نەمتوانی ڕازییان بکەم بەوەی بچم بۆشوینی

جێبەجێکردنەکە ، چونکە گەر لەنزیکەوە بیبینم ، باشتر توانای پلان دانانم دەبێت)).

((٢٩ی حوزەیران : ئازاد هات تا لەگەڵمدا بدوێت بۆم دەرکەوت کەئەوان نایانەوێت گەشتێك بەناوچەکەدا بکرێت، دەخوازن تەنها "فارس" خۆی کارەکە جێبەجێبکات ، پێشنیاری بۆکردم بگەڕێمەوە بۆ ئیسرائیل ، ئەگەر کاریان پێم بوو داوام دەکەنەوە، وتم باشە من دەمەوێت کەل و پەلەکانم بدەمە دەست "فارس" ، پەیمانی دا ئێوارە بێت بۆسەردانم)) .

١ی تەمموزی ١٩٦٩ نامەیەك لەکەسایەتیەکی گەورەی ئیسرائیلیەوە گەیشت بەبارزانی و داوای لێ کردبو کە ئەو پەیمانانە جێ بەجێ بکات کەدابوی بەوەی من بخاتە ناو کۆماندۆ کوردیەکەوە، لەشوینی پرۆسەکە بارزانی بەرازیبون وەڵامی نامەکەی دایەوە بەڵام هیچ کاتێکی بۆ دیاری نەکرد ،وە ئێوارەکەی راپۆرتێکم بە دەست گەیشت سەبارەت بەو گفتوگۆیەی کە"ڕاهیب" و "نۆفیر" لەگەڵ "ئازاد" ئەنجامیانداوە ، ئەو دوانە فشارێکی زۆریان لێ کردوە ، کە وای لێکردوە ڕازی بێت بەچوونم بۆ شوینی دیاریکراو ، بەڵام دیسان کاتێکی دیاری نەکردوە ، واتە هیچ چارێکم نیە تەنها چاوەڕێ کردن نەبێت.

٢ی تەموز : بە "نۆفیر"م وت کە بە "ئازاد" بڵێت ئەگەر تا ٨ی تەموز[1] کاتێکی دیاری کراو و ورد دیاری نەکات بۆ چونم بۆ شوینی کارەکە ئەوا کوردستان جێدەهێڵم دەگەڕێمەوە بۆ ئیسرائیل بەڵام نۆفیر ڕەتی کردەوە کە قسەکانم بۆ ئازاد وەربگێڕیت بەهۆی توندیەکەیەوە.

خەریك بوو ئارامم نەدەما ، ئاشکرا بوو کەئەوان نەیاندەویست بچم بۆ شوێنەکە ، ئەگەر سەرەرای ناڕازیبونی ئەوان بچومایە بۆ شوینەکە ئەرکەکەم جێبەجی نەدەکرا وەدەرئەنجامی باشم بە دەست نەدەهینا، بۆیە لایەنە بەرپرسەکانم ئاگادار

[1] لە کتێبەکەدا نوسراوە ٨ی حوزەیران ، بەڵام پێدەچێت هەڵەبێت چونکە ئەگەر وابێت مانگ و نیونك دەکات. -وەرگێر-

کردنەوە کە ئەگەر هەتا دەست بەکار بونی "ناحیك""مەناحیم بینۆت" کە دوای ماوەیەکی کەم پۆستی سەرۆکی شاندی مۆسادی لە تاران پێ سپێردرا، نەنێردریم بۆ ئەوێ ئێرە جێدەهێلم دەگەڕیمەوە بۆ ئیسرائیل، پیم وترا کە ئیرانیەکان هۆکاری دواکەوتنی چونی منن بۆ پێگەکە ، بۆیەدەبێت هەندێك چاوەڕێ بکەم، ئەمەش تەواو بێزاری کردم، ئارەزوی ڕۆشتنم بۆ "سەفین" نەما، کە ئەو شوینە بوو کە کۆماندۆ کوردەکانی لێ بوو.

١٢ی تەموز دەبێت بەیانی برۆمە شوێنەکە پاش ئەوەی ئێرانیەکان ڕازی بون دابەزم لەوێ ، خەریکە ئاماژە دەکەن بە پەلەکردن لەجێبەجێکردنی پرۆسەی "دێڤید" ، دەبێت بەحساب کاتژمێر ١١:١٥ خولەکی شەو ئازادبێت بۆ لام تا کاتی ڕۆشتنەکەم پێ بڵێت، بەلأم نوێنەرێکی ناردوەو دەڵێت: داوای لێبوردن دەکات کە نەیتوانیوە بێت.

١٣ی تەمموز : ئازاد هات بۆلام پێی وتم کەدەبێت بەیانی ڕوبکەمە شوێنەکە

١٤ و ١٧ی تەموز "چوار" ڕۆژ بەپیادەڕۆیی و بەسواری وڵاخیش لەڕێگادا بوم بەرەوشوینی پێگەکە وەرگێڕێك و شەش پاسەوانم لەگەڵدا بوو، لە ڕیگادا لێرەو لەوێ دەوەستاین بۆ خواردن و پشوو.

لە"سەفین" شوێنەواری ئەوچالاکیانەمان دیت کە فڕۆکە عێراقیەکان بەسەر شوێنەکەدا بەجێیان هێشتوە و خەڵکەکەیان جیاکردۆتەوە لەسەریەکێ لەبەردە بەرزەکانەوە ئاوی دەریاچەی "دوکان"مان بینی ، هەروەها ڕۆشنایی بیرەنەوتەکان لە کەرکوك.

لە ١٩ی تەموزدا لای بەیانیەکەی "فارس" هات دیدارەکە کاریگەر بوو ، باسمان لەپرۆسەی "دێڤید" کرد ، پلانەکەمی بەدڵ نەبوو ، چونکە پێشنیارم کردبووکە بچینە ناو پەمپەکانەوە، من پێنج پلانی جیاوازم بۆ کارەکە دانابوو ، سیانیانی قبوڵ کرد و دوانی ڕەتکردەوە، وە پلانیکی ئاسان و باشی خستەڕوو بۆئەوەی چەند گەشتێك بەناوچەکەدا بکەین، کەسێکیش هاتبوومن ببینێت بە ناوی

"محسین دزەیی" کەپێشتر پارێزەر بووە لەبەغداد کاری کردوە، بەڵام ئێستا ئەندامی "لیژنەی تەنفیزی پارتی دیموکرات"ە لەگەڵ "فارس".

قسەم لەگەڵ "فارس"دا کردو توانیم ڕازی بکەم بەدروستکردنی چوار خانە هەرخانەیەك لە ١٥ کەس پێکدێت ، جێ بەجێ کردنی چەند ئەرکێك وەك هێرش بۆسەر ناوەندەکانی پۆلیس و بڕینەوەی عەمودەکانی کارەبای فشاربەرز"ظغط العالي"وە دانانەوەی کەمین بۆ ئۆتۆمبیلەکان و تەقاندنەوەی پردێکی گەورە کە دەکەوێتەنیوان "هەولێر" و "موصڵ" ، ڕازی بوو چونکە پیاوەکان ، پێشتر لەو جۆرە کارەیان کردبوو ، وە لە دوای ١٥ ڕۆژ ڕاپۆرتیکم بە دەست گەیشت دەیوت کە بەشی زۆری ئەو ئەرکانەی کە پێشتر ڕونم کردەوە جێ بەجێ کراون.

کاتژمێر ٦ی ئیوارە لەگەڵ "فارس" بەڕیکەوتین لەڕێگادا دەمانزانی کە دوژمن چاودێریمان دەکات هەندێ جار بەپێ و هەندێ جاری تر بەوڵاخ هاتوچۆمان دەکرد بەئاراستەی پردی "تەق تەق" کە لەسەر "زێی بچوك"ە لەسەرهێڵی "کۆیسنجق -کەرکوك" ، کاتژمێرەکانی سەرلەئێوارە گەیشتینە ئەوێ، جوان تەماشام کرد و دیقەتم لێ گرت، پلانێکی هێرشکردنە سەریم داڕشت، سەرکردەی ناوچەکەشمان لەگەڵدابوو، کە دەبوایە ئەو سەرپەرشتی جێبەجێکردنی پلانەکە بکات.

*****************************

کوردەکان ئامادەنەکرابون تا لەگەڵ عێراقیەکاندا ، بەشێوازی ددان بەرامبەر ددان مامەڵە بکەن ، بەتایبەتی کوشتنی هەر شتێك کە بجوڵێتەوە تەنانەت لەوحاڵەتانەش کە تۆڵەیان دەسەندەوە لە بەرامبەر کارەدڕندانەکانی عێراقیەکان ، تۆڵەسەندنەوەکانیان هێندەی ئەو دڵڕەقیە نەبوو کە عێراقیەکان لە ئابی ١٩٦٩

مامەڵەیان پێ لەگەڵ دانیشتوانی گوندی "دوکان" کرد، کە دەکەوێتە لیوای "موصل"ەوە بەوجۆرەی کەئیستگەکەیان و ڕۆژنامەی "کوردیش ئەفیەرس بیولتین" وەسفی دەکەن.

دوکان گوندێکە دەکەویتە سەر کەناری ڕوباری "خابوور" لەلیوای موسڵ هێزە کوردیەکان دەستیان بەسەرداگرتبوو، دانیشتوانەکانی سوربون لەسەر ئەوەی گوندەکەیان نەبێتە ناوچەی ناکۆکی و شەڕ ، بێژەرەکەی ڕادیۆی کوردی دەڵێت: ((پاش ئەو دۆڕاندنەی کە هێزەکانی حکومەتی عێراق توشی هاتن یەکەیەکی سوپا چونە ناو "دوکان" تا پیاوەکانی دەستگیربکەن، بەڵام پیاوەکان بەرلەوە ڕایان کردبو، لە کاتێکدا ئافرەت و منداڵەکان لەحەشارگەیەکی بچوکی نزیك چیاکە خۆیان حەشاردابوون بەڵام عێراقیەکان لە ڕاکردوەکان دەگەڕان ، تا گەیشتنە حەشارگەکەو دۆزیانەوە، چەند سەربازێك پاسەوانییان دەکرد تا کەس ڕانەکات لەکاتێکدا هەندێکی تر هەستان بەکۆکردنەوەی دارودڕ و تەختەو لەدەرگای حەشارگەکە ڕیزیان کرد ، پاشان نەوتیان بەتەختەکاندا کردو تەماشای ئەو ئاگرەیان دەکرد کە ٦٧ منداڵ و ئافرەتی لەپشتەوە بو دەسووتان.

## بەشی بیست و یەکەم/ پرۆسەی دوکان "سەرکەوتن و شکست"

رائیدی یەدەگ "دان زیف" هەڵگری خەڵاتی پاڵەوانیتی لە جەنگی ١٩٥٦ و جێگری سەرکردەی کەتیبە لەلیوای ٥٥ "یەدەگی پەرەشوتەوانی" لەنیسانی ساڵی ١٩٦٦ دا نێردرا بۆکوردستان بە ئەرکێکی تایبەت کەبریتی بوو لە تەقاندنەوەی ئەو فرۆکە "مێگ-٢١" عێراقیانەی لە فرۆکەخانەی شاری کەرکوک ڕاگیرابون، بەڵام لێکۆڵینەوەی ئەو پرۆسەیە لەزەمینەی واقعدا دەری خست کە ڕێژەی سەرکەوتنی کەمە ، بۆیە داوای لێکرا ئەرکێکی تر جێ بەجێ بکات کە خۆی لە تەقاندنەوەی بەنداوی"دوکان"دا دەبینیەوە .

بەنداوی دوکان لەساڵی ١٩٥٩ لەسەر ڕوباری "زێی بچوك" دروستکراوە ، لەرۆژهەڵاتی کەرکوك ئامانجی بەنداوەکە ڕێگری لە لافاوە ئەمە جگە لەدروستکردنی کارەبا بەبڕی ٦٠ میگاوات ، وە خەزنکردنی "شەش ملیار" مەتر سێجا ئاو بۆ ئاودیریکردنی "دوومليۆن" دۆنم زەوی ، کەتیبەیەکی عێراقی ڕاسپێردرابوو بە پاسەوانی کردنی، گومان لەوەدا نیە کەکۆنترۆڵکردنی ئەو بەنداوە کارتێکی یەکسانی جددی دەدا بە کوردەکان کە وایدەکرد ، سازشی زۆر لەحکومەتی عێراقی وەربگرن.

تویژینەوەی پلانی تەقاندنەوەی لەکۆبونەوەدا لەنێوان ئەفسەری ئێرانی "پهلوان" و "ئۆفیر" تاوتوێکرا لەکۆتایی ئایاری ١٩٦٩ دا ، "دان زیف" و "عزیز العقراوی" کەئەرکی سەرپەرشتیکردنی پرۆسەکەی پێسپێردرابوو ، لەگەڵ (بەهلەوان) گەشتێکیان کرد بۆ ناوچەی بەنداوەکە تا "دراوەکان" لەزەمینەی واقیعدا تاوتوێبکەن ، گەشتەکە نزیکەی هەفتەیەکی خایاند وە زۆر سەخت بوو لە ڕۆژی کۆتایدا "پهلوان" لەترسی ژیانی خۆی پاشەکشەی کرد.

"زیف" و "عقراوی" سەرکردەی ئەو سێ کەتیبەیەی لە ژێر دەستی "عقراوی"دا بوون لەدوری چەند سەد مەترێکەوە چاودێری بەنداوەکەو هێزە پاسەوانەکەیان

دەکرد، "زیف" جانتایەکی پڕ وردەکاری لەسەربەنداوەکە دەست کەوتبو ، کە لە چەند نەخشەیەك و وەسفی ورد لەبارەیەوە جگە لەوێنە پێکهاتبوو .

*************************

پلانەکەی "زیف" و "العقراوی" کە لەسەربنەمای نەخشە و وێنەکان و ئەو پێدراوو زانیاریانە بەهۆی گەشتەکەوە دەست کەوتبوو ئامادەکرابوو ، تەرکیزی کردبوو لەسەر داگیرکردنی ناوچەی بەنداوەکە لەویستگەی وزەکەوە ، و شوێنی ئەو خەڵکە سڤیلەی کەکار لەسەربەکارهێنانی بەنداوەکە دەکەن، لەگەڵ نوسینگەکان لە هێرشێکی شەوانەی کتوپڕدا تا ئەوەش لە تواناداا بێت دەبوا کەتیبە پاسەوانەکە کۆنترۆڵ بکرێت کە لە سەربازگەیەکی فراوان و گەورەدا بڵاوبوبوەوە ، لەگەڵ دوو پێگەی تردا.

ئەم ئەرکە خرایە ئەستۆی سێ هێزی کورد کە دەبوو هەرسێکیان لەهەمان کاتدا هێرش بەرن ، هەروەها دووهێزی تری کوردی دانرابون بەتۆپهاوێژی ناجێگیر و دۆشکەی مامناوەندەوە بۆ داخستنی ئەو ڕێگایەی کە بۆئامانجەکە دەچێت بۆ ڕوبەڕووبونەوەی هەر پاڵپشتێکی زرێپۆشی عێراقی کەبڕوات بۆ ئەوێ، ئەو هێزە بڵاو بووەوە لەچەند حەشارگەیەك لە دوری ٥٠٠ تا ٧٠٠ مەتر لە ڕێگاوە ، ئاوە قوڵەکەی ڕوباری زێی بچوك لە ڕێگای جیادەکردنەوە ئەمەش دەیپاراستن لەئەگەری دژەهێرش بۆ ئەو هێزە عێراقیانەی کە لەوانەیە بهێنرێن بۆ ناوچەکە.

پلانەکە وابوو، کە پاڵپشتی تۆپخانە دوو گرد بە ڕاجیمەی ١٢٠ ملم تۆپباران بکات ، وە تا پرۆسەی خۆ ئامادەکردن بۆ گردەکەو مۆڵگەی عێراقیەکان دەست پێ دەکات لەماوەی نیوکاتژمێر لە کاتژمێر ٨ی ئیوارە تا تاریك دابێت، پاش ئەوە لەسەر هێزی هێرشبەر پێویست بوو کەهێرشبەرێ بۆ سەرئامانجەکە بەبێ ترس ، لە هێرشی فرۆکە عێراقیەکان، چونکە شەوانە هێرش ناکرێت ، ڕێرەوی ئامانجەکە سێ کاتژمێری خایاند ، تا کاتژمێر ٩:٣٠ زیف پێی وابو کە لەماوەی ئەو

۳ "کاتژمێرەدا عێراقیەکان پێیان وادەبێت ، کە تۆپبارانەکە تەنها مەسەلەی ترساندنەو هیچی تر و دەگەڕێنەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆیان.
پلانەکە دەیگوت کە پاڵپشتی تۆپخانە لەکاتژمێر ۹:۳۰ خولەك درێژە بەبۆمبارانەکە بداتەوە ، وە تا کاتژمێر ۱۰ کەکاتژمێری سفری هێرشەکەیە بۆسەر سێ مۆلگەکەی کەتیبەی عێراقیەکەو کۆنترۆڵ کردنی وە کۆنترۆڵکردنی بەنداوەکە.
"زیف" و "عقراوی" سەرکردەی کەتیبەکان گەڕایەو و دیتیان کە (پهلوان) لەشوێنی دیدارەکە چاوەڕێیانە، هەرسێکیان چوون بۆ لای بارزانی تا ڕەزامەندی وەربگرن ، بارزانی بەگرنگیەوە گوێی بۆ گرتن دوایی ڕازی بوو لەسەری.
"زیف" هەمو وردەکاریەکانی گواستەوە بۆ ئیسرائیل لەگەڵ لیستێکی چەك و ئامادەکارییە خوازراوەکان ، و ئامۆژکاری کرا کە لەکۆتایی وەرزی "دروێنە"دا دەست بەپرۆسکە بکرێت، تا هەلی ئەوە نەدرێت بەهێزی ئاسمانی عێراقی کەوەك پیشەی خۆی بەسوتاندنی کێلگەکان وەلام بداتەوە.
پێویست بوو ئامادەکاری گشتگیر بکرێت بەدەستخستنی نزیکەی ٤٠٠ وڵاخیشەوە بۆ گواستنەوەی کەلوپەل و ئامرازەکان بۆ ناوچەی ئامانج، "زیف" چاودێری پرۆسەی ئامادەکاریەکانی دەکردن تا دواهەمین وردەکاریەکان ، پاشان گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل لە یەکێ لەڕۆژەکانی ئەیلول دا کاتێك لە(کیبۆتسە) نانی بەیانی دەخوارد بەپەلە داوا کرا بۆ تەلەفون نوینەری مۆساد پێی وت کە پرۆسەکە سەرکەوتووبوە بەپێی پلانەکە دانراوەبەڵام کامەرانیەکەی "زیف" زۆری نەخایاند ، پاش ٤٨ سەعات بۆی دەرکەوت کە هێزی پاڵپشت کە بڕیاروابوو ڕێگە لەوهێزە عێراقیەبگرێت کە دەهێنریت بۆ ناوچەکە بەر لەکاتژمێری دیاریکراو کشاونەتەوەو هێزی پاڵپشتی عێراقیی هێرشی کردۆتە سەر هێزە کوردیەکە و هەرکەسێك فریا نەکەوتبێت ڕابکات کوژراوە، ئەگەر ئەو عەیبە نەبوایە لەپلانەکە ، کوردەکان دەیانتوانی سەرچاوەی ئەو ئاوە کۆنترۆڵ بکەن کە بەشێکی

زۆری زەویەکانی عێراق ئاو دەدات، بەمەش دەیانتوانی سازشی زۆر گەورە لەعیراقیەکان وەرگرن یان زەرەری گەورەو ماوەدرێژی لێ بدەن.

کاتێك وەزیری بەرگری "موشێ دەیان" و "بارلیف"ی سەرۆکی ئەرکان بۆیان دەرکەوت کە بارودۆخ لەکوردستان پێویستی بە زەمین لەرزەیەکی توندوتیژ هەیە ، بڕیار درا کە سەرکردەی هێزی پەڕەشوتەوانی و پیادە ، "ڕافائێل ئیتان" بنێردرێت بۆ ئەوێ ، ئیتان لە کتێبەکەی یدا بە ناوی "گێرانەوەی سەربازێك" دەڵێت: ((بارزانی ئارەزوی خۆی پیشاندا بۆ فراوانکردنی پێوەرەکانی جەنگ لەکوردستان، و شێوازی خۆی گۆڕی ، چیتر حەزی لە جەنگی پارتیزانی نەبوو ، بەڵکو هێرشی ئاشکرا دژی سوپای عێراقی ، وە من نێردرام بۆ ئەوێ تا لێکۆڵینەوە لەمەرجەکانی جەنگ لەو گۆڕەپانەدا بکەم)).

کەسێك لە نزیك نوسینگەی بارزانی بەخێرهاتنی لە "ئیتان" کردوە بە زمانی عیبری و پیی وتوە کە ناوم "ئیتانە" ، ڕافیلیش وتویەتی منیش هەر ناوم "ئیتان"ە ، ئیتانی یەکەم "د. ئیتان رۆبنشتاین" بوە ، ئەو دکتۆرە ئیسرائیلیەی کە لەماوەی نێوان ئەیلول و تشرینی دوەمی ١٩٦٩ دا نەخۆشخانەکەی بەڕێوەدەبرد.

"ڕافائیل ئیتان" لەکتێبەکەیدا دەڵێت : ((سنوری ئێرانمان بڕی دو ڕۆژی تەواو بەڕێوەبوین بەرەوە باشور ، تا گەیشتینە ناوچەیەك کەناوی "سەردەشت" بو، لەوێوە جارێکی تر سنوری عێراقم بڕیەوە تا گەیشتینە قەڵادزێ لەوێوە بۆ قەڵایەك کەکوردەکان بە دەستیانەوەبوو ، و بەسەر ڕوباری "دوکان"دا دەمیڕوانی لەوێ شوینەواری جەنگ بە ئاشکرا دیار بوو، لەسەر بەردە سوتاوەکان و ئەو وڵاخانەی بە بۆمبارانی فرۆکە عێراقیەکان پارچە پارچە بوبون)).

لە بەرەبەیاندا "ئیتان" و هاوڕێکانی بەپێ کەوتنەڕێ و ڕوبارەکەیان بڕی بەئاراستەی بەردەکانی دوکان ، و پێگەی عێراقیەکان فڕۆکە عێراقیەکان بە ئاسماندا دەسوڕانەوە : ((چەند ئامانجێکیان بۆردومان کرد لە نزیك ڕێڕۆشتنی

ئێمەوە کاتێك نزیك بوینەوە لەپێگە عێراقیەکان لەسەرچیاکان ، بەر تۆپباران دراین، توانیبویان بمانبینن ، خۆم لەپاڵ بەردێك گرت ، کامێراکەم فڕێ نەدا وێنەی شوینی تەقینەوەکانم دەگرت ، کابرا ئێرانیەکە هەرتۆقیبوو ، بەلاّم کوردەکان ڕاهاتبون لەگەڵ بۆردومانەکە بۆیە خۆیان لەپاڵ بەردەکاندا شاردەوە هەتا تۆپبارانەکە تەواوبوو، دوایی گەڕاینەوە گوندەکە)).

"ڕافائیل ئیتان" دەڵێت کە هەستیکی نامۆی هەبوە، چونکە هیچ لایەنێك ئامانجی گەشتەکەی پێ نەگوتوە ، بەکوردەکانی گوتوە کە بەرەو کوێ دەچین : (( پیان گوتم بۆ شاخەکان دەچین، ڕێگای چیاکان دەگرین، دارستان و ڕوباران دەبڕین لەڕیگاکەمان ماوەیەك بە پێ دەڕۆشتین ، ماوەودوا بەسواری ئەسپەکان تا وای لێهات وام هەست دەکرد ئێسکەکانم خەریکە تێکدەشکێن ،لەکۆتاییدا گەشتینە ناوچەی چادرەکان ، پێم وترا کە بارزانی دێت بۆ بینینم ، پاش کەمیك هات و یەکترمان بینی باوەشی پێداکردم و شمشێرێکی خواری بەدیاری پیدام ، وەرگێرەکە پێ وتم بارزانی بۆیە ئەو دیاریەم پێشکەش دەکات ، چونکە دەزانێت دەستی یارمەتی بۆ کوردەکان درێژ دەکەم، هاوڕیکانم پێیان وتوم کە لە کاتی بۆردومانەکە چۆن هەڵس و کەوتت کردوە)).

((پاش دیدارەکە ڕومان کردە ئەو شوێنە ڕاستەقینەیەی کە بۆی هێنرابوم ، فیرقەیەکی عێراقی لێ جێگیربووبوو لەنزیك شاری ڕەواندوز کوردەکان دەیانخواست هێرش بکەنەسەر ئەو فیرقەیە بۆیە ڕای منیان گەرەك بوو)).

((بەوشیاریەوە بەدرێژایی دواهەمین بەربەستی هێزە کوردیەکان بەرامبەر هیزەکانی عێراق ڕۆیشتین ، درەختێکی "مازوو"ی گەورە بڕدرابوو لەسەر ڕێگاکە دانرابوو، لەپشت یەکێ لە بەردەکانەوە جەنگاوەرێکی کورد خۆی مەڵاس دابوو، بەخۆی و تفەنگەکەیەوە ، چاودێری جموجوڵەکانی لایەنی بەرامبەری دەکرد ، کەهێزە عێراقیەکان تێیدا جێگیر بوون ، لەسەر گردێکی بڵندەوە چاودێری هێزە عێراقیەکەمان کرد، پاشان لەسەر پشتی ئەسپەکان بەرەو باکور ڕۆشتین، بۆ

ناوچەیەك كە پێگەیەكی كوردەكانی لێ بوو ، لە باوەشی سروشتدا، كە چەند تۆپهاویژێكی لێ بو)).

((شەو لەلێواری چیاكە خەوتین ، بەجۆرێك هەریەك لەئێمە لە پشت درەختێكەوە دانیشتبوو قاچی پێوەنابوو، تا لەبەربوونەوە بیپارێزرێت ، بچوكترین جوڵە بۆی هەبوو خلۆری بكاتەوە بە تەقلە هەتا بنی چیاكە)).

ڕافائیل دەڵێت: ((كوردەكان قسەكانی منیان سەبارەت بە بەكارهینانی چەكی نوێ و هێرشی ئاشكرا بۆ سەرهێزەكانی عێراقی پێ قبوڵ نەدەكرا، "لفكۆف" پێی وتم : ئەمە سوپا نیەو كوردەكانیش سەرباز نین)).

ئیسرائیلیەكم پیشان بدە كە تەنها بە شەكر و چا و بڕێكی كەم خواردن بژێت؟

كاتێك "ئیتان" گەڕایەوە بۆئیسرائیل سەبارەت بەپرۆسەی "دوكان" بە"دان زیف"ی وت: "ئایا تۆ شێت بوبوی؟ چۆن كاری وایان پێدەسپێریت؟"

زیف : بەڵام جێ بەجیان كرد.

ڕەفائیل : بەڵام سوپای عێراقی هەموی هێزی پاڵپشتی كوشت.

زیف: بەرپرس نیم لەهەڵەكان، ئەگەر بیان هێشتایە لەگەڵیان بمامایەوەو سەرپەرشتی پرۆسەكەم بكردایە ، ئەوە ڕوینەدەدا كە ڕویدا.

ڕافائیل : سەرەڕای ئەوە نەدەبو ئەركی وایان پێ بسپێردرێت ئەوان توانای ئەو جۆرە كارانەیان نیە.

زیف : لەگەڵ ڕیزی زۆرم بۆت ڕایەكەتم قبوڵ نیە ئەگەر ڕێنمایی دروست وەرگرن ، كارەكان بە ڕێكوپێكی دەڕۆن بە ڕێوە.

**********************

ئیتان داوای كرد كە تانكێك یان دو تانك لە جۆری "T-٣٤" لە دەستكەوتی جەنگی ١٩٦٧ بنێردرێت بۆ كوردەكان، كرۆن لەلای هاوتاكەی لە "ساواك" ئەم پێشنیارەی خستەڕو بەڵام ئەو وتی: ڕازین بەمەرجێك سەرەتا كوردەكان بتوانن ، دەست

بەسەر تانكێكی سوپای عێراقیدا بگرن، ئەوكات ئیسرائیل دەتوانیت تانكێك یان دوان بنێرێت.

لەوانەیە ئەمە شێوازی ئێرانیەكان بوو بێت بۆ دەربڕینی "نا" چونكە دەیانزانی كە كوردەكان ناتوانن دەست بەسەرتانكی سوپای عێراقیدا بگرن، ناڕازیبوان تەنها لەئێرانیەكان نەبون، بەڵكو چەند كەسایەتیەكی ئیسرائیلیش دژایەتی بیرۆكەكەیان دەكرد، سەركردەی ناڕازیەكان سەرۆكی پۆلی پیلاندانان لیوا "ئیسحاق حۆفی" بوو، كە خەریكی چارەسەركردنی مەسەلەی یارمەتی دانی چەكدارانەی كوردەكان بوو، كە دەیگوت: ((كوردەكان ڕاهاتون كە جەنگی كلاسیكی لەگەڵ هێزە عێراقیەكان بكەن، بەكارهێنانی شێوی تر وادەكات زیاتر بدۆزرێنەوە و بەرچاوی هێزی ئاسمانی عێراقی بكەون)).

**************************************

"كریس كۆچێرا" لەو توێژینەوەیەدا كە ئامادەیكردوە بە ناوی "بزافی نەتەوایەتی كوردی" و لەساڵی ١٩٧٩ بلاوكرایەوە دەڵێت: ((حكومەتی عێراقی لەبەردەم دوو ئەگەردا بو، یان بگاتە ڕێكەوتن لەگەڵ كوردەكان یان لەگەڵ ئێران، لەڕاستیدا ئەمە یەكەم جار نیە كەعێراقیەكان ڕوبەڕوی ئەم تاقیكردنەوە دەبنەوە، ئەوان هەمیشە ئارەزویان لەڕێكەوتن لەگەڵ عێراقیەكان زیاتربوە ، چونكە ڕێكەوتن لەگەڵ ئێران دەبێتە هۆی كۆتایی پێهینانی ناكۆكی نەبڕاوەی نێوان هەردووڵات ئەمە جگە لەوەی كە دەبێتە هۆ داخستنی تاكە ڕێرەوی گەیشتنی هاریكاری بەكوردەكان بە كردار ئەوە ڕویدا كاتێك شاندێكی عێراقیەكان ڕووی لە تاران كرد ، بۆ ڕازیكردنی شا بەڕاگرتنی هاریكاریەكانی بۆ كوردەكان، لە بەرامبەر سازشی گەورەی عێراق بۆ ئێران ، بەڵام "شا" بۆندەكەی ڕەتكردەوە ئەمەش وایكرد كە هیچ شتێك بۆ عێراقیەكان نەمێنێ جگە لەڕوكردنە ئەگەرەكەی تر، بەڵام كوردەكان نەچون بۆ دانوستان)).

((ئامارەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە ژمارەی ئەوە کوردانەی کە لە دەستپێکی جەنگەوە لە ساڵی ١٩٦١ەوە پێکراون گەشتۆتە نزیکەی ٢٠ هەزار کەس ئەمە جگە لە دەیەها ژن و منداڵ ، هێزی ئاسمانی ٢٠٠ گوندی خاپور کردوە، سەرەڕای ئەوەش کوردەکان زۆر خۆڕاگرن وە زەرەری گەورەیان لەعێراقیەکان داوە)).
بارزانی درکی بەوەکردبوو کە توانای خۆڕاگری گەلەکەی ئەبەدی نیە، بۆیە دەیویست لەگەڵ عێراقیەکان بگاتە ڕێککەوتن بە جۆرێك مافی ئۆتۆنۆمیان پێ بدرێت)).

************************

"مەناحیم سیلع" ناسراو بە "مەڕاك" لە تشرینی دوەمی ١٩٦٩ هاتە کوردستان ئەرکەکەی ئامادەکردنی کوردەکان بوو بۆ هێرشی بەهارەی عێراقیەکان ، لەپاش توانەوەی بەفرەکان کە ساڵانە پێشبینی دەکرا، ئەو هەستەی لادروست بووبوو کەکوردەکان ئامادەگی تەواویان تیدا نیە بۆ ڕوبەڕووبونەوی هێرشی دوژمن ، ئامادەکاریەکان بریتی بوون لە نیشتەجێ بون لە خانوی گڵیندا کە لە هەر نشینگەیەك ١٠ تا ١٥ کوردی لێ دەژیا ، کاتێك (مەڕاك) لێی پرسین ئایا خاڵی چاودێری دانانێن ، وتبویان ئێمە پشت بە هەواڵگری مەیدانی دەبەستین ، دڵنیابە عێراقیەکان ناتوانن بجوڵێنەوە بە بێ ئەوەی ئێمە دەست بە جێ لەوە ئاگادار نەبین.
ترسی زۆری کوردەکان لەکوردەکانی هۆزەکانی تر بوو ، کە لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر هاتوچۆیان بوو ، بەتایبەت ئەو هۆزانەی کەدوژمنی بارزانی و سەرکردایەتیەکەی بوون ، بۆیە وشەبەوشە ڕینمایەکانی بارزانیان جێبەجێدەکرد، کە دەبوو چاودێری و پاسەوانیەکی توندی هەر بیانیەك کە لەوێ بوون بکرێ ، بەم شێوەیە مەڕاك و هەر ئیسرائیلیەکی تر ، بۆ سەرئاوکردنیش دەبێت بەبەرچاوی پێشمەرگە زۆرزانەکانەوە بێت.

"مەڕاك" كوردەكانی ڕاهێنا لەسەر "ڕاجیمە" و بەكارهێنانی تەقینەوە ، گرتن و داخستنی ڕێگا و خولگە سەرەكیەكان لە تانكەكان و هۆكارەكانی گواستنەوە ، لەكاتێكدا كەچەند هونەرییەكی ئیسرائیلی ، وێستگەیەكی پەخشی تازەیان دروست كرد و ناویان نا "دەنگی شۆڕش".

"مەڕاك" دەڵێت: ((وەك خۆئامادەكردن بۆ هێرشی بەهارە داوام لە كوردەكان كرد ، كە پێگەكانی خۆیان بە هێزبكەن لەچیای "زۆزگ" بە بڕینەوەی دارچنار و سپیدارەكان و بەستنەوەیان بە بەردەكانەوە، بەڵام كارەكان زۆر بەهێواشی دەچون بەڕێوە ، كە تەواو بێزار و تورەی دەكردیت ، لەبەیانی ڕۆژی دووەمدا پێم وترا ، ناتوانین ئەمڕۆ كاربكەین ، چونكە شەو وڵاخەكان ڕایان كردوە ، كاتێك چومە پشت گردەكە تا دەست بەئاو بگەیەنم دیتم هەمو ولاخەكان لەوێ بەسترابونەوە)).

بارزانی لەو چاوپێكەوتنەدا كە "جەواد ئەلئەمیر"ی پەیامنێری "لۆمۆند"ی فەرەنسی لەگەڵیدا سازیكردوە دەڵێت : ((ئەوەی كە ئێمە بۆی تێدەكوشین یەكخستنی گەلەكەمان و پێدرانی مافی ئۆتۆنۆمی پێمانە ، لە ناو عێراقێكی دیموكراتدا ، ئاماژەی بەو سەركەوتنانەی هێزەكان دابو لە ناوچەی هەولێر ، وە وتبوی كە ئامانجی داهاتویان دەست بەسەراگرتنی ناوچە كوردیەكانی ڕۆژهەڵاتی "موصڵ" و "هەولێر" و دەستبەسەراگرتنی كێڵگەكانی نەوتی كەركوكە، دەڵێت ئێمە كۆنترۆڵی ناوچەیەكی ئازاد كراومان كردوە كەنیوەی خاكەكەمان دەگرێتەوەو نزیكەی ملیۆنێك و دوسەد هەزار كوردی لێ دەژی ، ئێمەش هەوڵدەدەین بەشێوەیەكی مرۆیی ئاستی بژێویان باش بكەین، ئێمە داواخوازین كە كۆماری عێراق دەوڵەتێكی یەكگرتوو بێت لە "عەرەب" و "كورد" پێكبێت تا بە یەكسانی بەپێی یاساكانی گەلان بژین، دەبێت هەیئەی یاسا دانانی عێراقی هەڵبسێت بەدامەزراندنی دامەزراوەیەكی عێراقی باڵا، دیاریكردنی سەرۆك و توانا یاساییەكانی حكومەت ، وە ڕێگە بەكوردەكان بدرێت مافەكانی خۆیان بەكاربهێنن

لەبواری یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری لەناو کوردستان، وە جێگری سەرۆك کورد بێت وە دابەشکردنی پۆستە وەزاریەکان بەشێوەیەکی ڕێژەیی بێت )).

بارزانی ئەو سنورەی کوردستانی دیاریکردبو کە دەیەوێت: ((دەبێت سلیمانی و هەولێر و کەرکوك لە خۆبگرێت کە ئیستا وەك "قەزا" بەڕێوەدەبرێن لەگەڵ هەموو ئەو ناوچانەی کە زۆرینەی کوردن لە قەزای موسڵ و دیالە)).

وە لەوەڵامی پرسیاریکدا کە : "ئایا ئەگەری دانوستان لەگەڵ حکومەتەکەی "بەکر" لەگۆڕێ یە؟" وتبوی : "مەحاڵە دانوستان لەگەڵ دەسەڵاتە سەرکوتکەرەکانی بەعس ، ئەو کەسانە وەکو گورگ وان، ئێمەش ڕێگە بەخۆمان نادەیەن لەسەر یەك مێز لەگەڵ گورگ بەیەکەوە دابنیشین ، ئەوان بەبۆمبی ناپاڵم سەرمان دەبڕن پەیڕەوی سادەترین بنەمای مرۆیی ناکەن ، مەحاڵە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، بە یەك زمان نەبێت ئەویش زمانی هێزە، ئێمە بڕیارمان داوە بە بەکارهێنانی ئەو زمانە هەتا کۆتایی".

****************************

حکومەتی عێراق بۆی دەرکەوت کەلەم قۆناغەدا ناتوانیت سنورێك بەو شێوەیەی کەدەیخوازێت بۆ کوردەکان دابنێت، بۆیە پاش مشتومڕیکی زۆر بڕیایدا کە بەرەوڕوویان بڕوات و وەڵامی داواکاریەکانیان بداتەوەن بڕیاری حکومەتی عێراق هات وەك ئەوەی بڵی چارەسەری سەربازی لەگۆڕیدانیە بۆ چارەسەری کێشەی کورد، ئەمەش زللەیەکی توند بوو بە ڕوی سەرکردایەتی باڵای سەربازی دا.

توێژەر "عەفرە بن جور" کە توێژینەوەی زۆری لەسەر کوردەکان ئەنجامداوە دەڵێت : ((بڕیارەکەی حکومەتی عێراق وەك تەحەدا وابو بۆ "سوریا" و "ئێران" ، هەمیشە لەیاخیبون و سەرهەڵدانی کوردەکان نێو وڵاتەکانیان دەترسان)).

بارزانی زۆر بەگومان بوو لەبەڵین و پەیمانەکانی حکومەتی عێراقی و جارلەدوای جار دەیگوت : حکومەتی عێراقی پەیمانەکانی جێ بەجێ ناکات ، ئیدریسی کوڕی هەمان ڕای هەبوو ، بەڵام کوڕەکەی تری "مەسعود" پشتگیری لەئەنجامدانی

ڕێکەوتنەکە دەکرد، لەبەر ئەوەی زۆرینەی کوردەکان ئارەزیان لەوە بوو، لە سەرووی هەموویانەوە سەرکردایەتییە گەنجەکەکان وەك "دکتۆرمەحمود" و "سامی" کە لەجەنگ بێزاربوبون ، باوەڕیان وابوو کە باشترە ڕێگاکەی تر تاقیبکرێتەوە ، ئەمانە سەرکردایەتی یاخیبوانیان ناچار کرد کە ڕازی ببێت بەڵام ئەو جەختی لەوە دەکردەوە کە ڕێکەوتنەکە کە درەنگ یان زوو هەڵدەوەشێتەوە، (......)[1] نوێنەری ڕێکەوتن بوو لەگەڵ کوردەکان لەمنداڵیەوە پەیوەندی کردبوو بەباڵی نهێنی حیزبی بەعسەوە، یەکەی لێدانی دژی دوژمنانی حیزب دروست کردبوو ، وە ساڵی ١٩٥٩ بەشداری پلانێکی کرد بۆ کوشتنی عبدالکریم قاسم ، پاشان ڕایکرد بۆ سوریا و لەوێوە بۆ میسر.

لەدوای کەوتنی قاسم لەساڵی ١٩٦٣ هاتەوە بۆ عێراق و پەیوەندی کرد بە سەرکردایەتی حزبی بەعسەوە پاش نزیکەی سێ ساڵ دامەزرێنرا بەجێگری سکرتێری گشتی حیزب ، کاتێکیش حیزبی بەعس لەدەسەڵات دورخرایەوە لەساڵی ١٩٦٤ بەندکرا ، بەڵام توانی لەبەندینخانە ڕابکات، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٨ کاتێك حیزبەکەی سەرکەوتو بوو لە کودەتاکەیدا ، گەڕایەوە تا ببێتە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی شۆڕش ، لەبەرئەوەی "بەکر"ی سەرۆکی ئەنجومەن کەسێکی توند و یەکلانەبوو ، "صدام حسین" بووە پیاوی بەهێزی حیزبەکە ، میلیشیایەکی حیزبی چەکداری دروست کرد لەگەڵ دەزگایەکی ئەمنی نهێنی ، کە لەژێر دەسەڵاتی تایبەتی خۆیدابوو، تایبەتی کردبوو بۆ بواری پاکسازی کەلەسەر کارلابردن و پاکسازی جەستەیی دەگرتەوە لە دامودەزگای دەوڵەتی و حیزبیدا ، سەر لێرەو لەوێ دەپەڕینران بەوانەشەوە کە ڕکەبەری سیاسەتی نوێی کودەتایان دەکرد لەبەرامبەر کوردەکاندا، صدام نازناویکی تری خستە پاڵ خۆی ئەویش "ئەندازیاری ئۆتۆنۆمی"بوو.

---

[1] ئەم کەسە (صدام حسین)ە نازانم بۆچی لە کتێبەکەدا وانوسراوە. –وەرگێر–

سێ هۆكار پاڵیان به "صدام حسین"ەوه نا بەو ئاراستەیەدا بڕوات:-

- بەبێ چارەسەركردنی هیچ ئومێدێك نەبو بۆ ڕژێمی بەعس تا پتەوبێت ڕەگ دابكوتێت.
- هەوڵی دەدا سوپا لە سیاسەت جیابكاتەوە كە بەمەش بازنەی كودەتای سەربازی لەعێراقدا تێكشاند.
- ئارەزوی كردنەدەرەوەی ئێران لەكاروباری ناوخۆیی كوردەكان، و لاوازكردنی تواناكان لەبەرامبەركێكردن لەسەر ناكۆكیەكانی تری نێوانیان، وەك مەسەلەی "شط العرب".

دانوستانەكان لەئەیلولی ١٩٦٩ دەستی پێكرد ، سێ قۆناغی بە خۆوە بینی هەتا ساڵی ١٩٧٠ "صدام حسین" دەبوو ڕوبەروی چەند لایەنیكی سیاسی و سەربازی ببێتەوە، كە هەڕەشەیان لە سەركردایەتیەكەی و پلانەكانی دەكرد، بە شێوازی تایبەتی خۆی ، هەمویان پاكسازی كران، بەردەوام بوو لەڕكەبەری سوپا ، كە بەربەرەكانی هەر چارەسەرێكی لەگەڵ كوردەكاندا دەكرد، جگە لە چارەسەری سەربازی.

بارزانی خۆی بەشداری لەدانوستانەكاندا كرد، لە هەندی حاڵەتی تردا تەنها نوێنەرەكانی ئاڕاستە دەكردن، كە "دكتۆر مەحمود" سەركردایەتی دەكردن، وە هەریەك لە "ئیدریس" و "مەسعود" و "دزەیی" ، لەگەڵیدا بون، دانوستانەكان درێژەیان كێشا، وە جێی گومانی هەردولابوو ، هیچ لایەك باوەڕی بە لاكەی تر نەبو، بۆیە بەزۆر هەڵكشان و داكشاندا تێدەپەڕی .

لە ٢١ی كانونی دوەمی ١٩٧٠ پلانێك ئاشكرا كرا دژی ڕژێمی عێراقی بەهاوكاری "ئێران" و "ئەمریكا" و "ئیسرائیل" ، زنجیرەیەك تۆمەت ڕوبەروی پیلانگێران كرایەوە، لە ناویان هەوڵدان بۆ سەرنەگرتنی لێكتێگەیشتن لەگەڵ كوردەكان

هەمان ڕۆژ فەرمان دەرکرا، بە لەسێدارەدانی ٣٣ ئەفسەر و لەپاش ماوەیەکی کەم هەردوو وەزیری بەرگری و ناوخۆ لەکارخران وە گۆڕانکاری نێوخۆیی گەورە لە ناو سوپادا ئەنجام درا ، پێدەچێت ئەم گۆڕانکاریانە بەرازیبونی ژمارەیەك ئەفسەری تر بووبێت ، کە لەبەرامبەر هاوکاریەکانیان پۆستی بالآیان پێسپێردرا.
لە ٣ی شوباتی ١٩٧٠ ڕادیۆی کوردەکان ڕایگەیاند کە ئومێدەکانی هەردو گەلی عەرەب و کورد بۆ بەدەستهێنانی چارەسەری ئاشتیانە بەدیهات، وە لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژوی عێراقی هەڵدرایەوە، ڕادیۆی ناوبراو هەواڵەکەی لە میانەی ئەو گفتوگۆ چڕو پڕەوە بلآوکردەوە کە لە بەغداد بەڕێوەدەچوو کە پێشبینی دەکرا لە کۆتایدا ٨ی شوبات گەیشتن بێت بە ڕێکەوتنکە و ڕابگەیەنرێت.
ڕونکردنەوەکە پێشکەوتبوو ، پاش تەنها دوو ڕۆژ شاندی کوردی بەغدادی بەجێهێشت پاش ئەوەی دەرگاکەیان بەتوندی لە پاش خۆیاندا پێوەدا ، دەرکەوت کە کاریگەری ئەوانەی دژایەتی مافی ئۆتۆنۆمی کوردەکان دەکەن ، بەبیانوی ئەوەی کە ئۆتۆنۆمی هەرێمایەتی لەوانەیە بگۆڕیت بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆ ڕوی لە زیادبوون بوو، واپێدەچوو کە لەباشترین بارودۆخدا ئۆتۆنۆمیەکی تایبەتی بدەن بە کورد.
"صدام حسین" بەهەموو قورسایی خۆی هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانی دا، لە٨ی ئازاردا بەسەرکردایەتی وەفدێکی عێراقی ڕویکردە ئەو شوێنەی کە بارزانی دیاریکردبوو ، گوندی "ناوپردان"ی کوردی لە ناوچەی هەولێر دەستی کرد بە دانوستان لەگەڵ شاندی کوردی بە سەرۆکایەتی "دکتۆرمەحمود" ، وە لە ١٠ی هەمان مانگدا هەردولا ئیمزایان لەسەر ڕاگەیەندراوێك بە مەفهومی عێراقی و ڕێکەوتننامەیەك بە مەفهومی کوردی کرد، کە لە ١٥ بەند پێك دێت.
بەڵگەنامەی ناوبراو مافی خۆبەڕێوەبەری"ئۆتۆنۆمی" هەرێمایەتی بەکوردەکان بەخشی و بەنەتەوەی هاوشانی عەرەب وەسفی کردن ، وە هەمو مافە یەك لە دوای یەکەکانی پێدەدرێت، لەم بارودۆخەدا وادەردەکەوت کە ئەمە دەرەنجامی

ملکەچکردنی تەواوەتی عێراقە بۆ کوردەکان، بەڵام کێشەکە لەمەرجی دەمەکی"شەفەوی"دا بوو، کەخرایە بەردەم کوردەکان کەدەڵێت: ((یاسای مافی خۆبەڕیوەبەری بۆ کوردەکان بڕیاری لەسەر دەدرێت)) و کاری پێدەکرێت تەنها لە دوای ٤ ساڵ لە دەرچونیەوە.

بەڵگەنامەکە بەتەواوەتی بڵاو نەکرایەوە ، عێراق بەپەلە مەسەلەی ئیمزانەکردنی دەستبەجێ ڕونکردەوە لە چەند هۆکارێك کەپەیوەندیان بەئاسایشی نەتەوەییەوە هەیە، هەندێ لە ڕۆژنامەکان ئاماژەیان بەجەنگی چارەنوسسازی نەتەوەی عەرەب سەبارەت بەفەلەستین دابوو ، وەزیری بەرگری جەختی لەوە کردەوە کەحکومەت دەتوانێت هەمو توانا و کەل و پەلی خۆی ، تەرخان بکات بۆ بەرەوڕوبەڕو بونەوی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم ، هەروەها جار لەدوای جار باس لەپێویستی ڕوبەڕوبونەوی سیاسەتی ئێران لەکەنداودا دەکرا، وە عێراق نرخی جەنگەکەی دەرخست وتیان کەتێچوی جەنگەکە هەتا ئیستا (٤٠) هەزار پێکراو و ، ڕێژەیەکی گەلێك زۆر لەچەك و تەقەمەنی و نزیکەی ملیارێك و دوسەد ملیۆن دۆلارە)).

بارزانی بۆی دەرکەوت کە ڕێکەوتنەکە شەرعیەتی عێراقی پێ داوە ، وەك سەرکردەی کوردەکان ، ئەمەش هەلی ئەوەی پێدا کە دوژمنەکانی تێك بشکێنێت لەناو کوردەکان.

لە ١٢ای ئازاردا عێراق ئاهەنگی گێرا بەبۆنەی ڕۆژی ئاشتیەوە ، "بەکر" لەگەڵ "د.محمود" و هەردوو کوڕەکەی بارزانی "مەسعود" و "ئیدریس" لەئاهەنگەکاندا دەرکەوت، وە بەناوی بارزانیەوە ڕایگەیاند کەکوردەکان لەگەڵ عەرەبەکاندا دەبن لەجەنگەکان دژی ئیسرائیل ، هەرچەندە بارزانی ڕەتیکردەوە کە بەشداری ئاهەنگەکان بکات، بەڵام لە بروسکەیەکدا کەناردبوی پشتگیری خۆی ناردبو بۆ خەباتی دادپەروەرانەی نەتەوەی عەرەب کە دژی دوژمنەکانی دەیکات.

له ٣١ی ئازاردا "صدام حسین" هات بۆناوچه کوردیەکان بۆ ئاهەنگگێران لەگەڵ بارزانی، سەبارەت بەو گۆڕانکاریانەی ڕویان داوە، ئەوکات نۆبەی نێرانیەکان گەیشت ، لەوتەکەی "صدام"دا کە خوێندیەوە وتی : "سەربازانی عێراقی دەتوانن دەرسی "شا" دابدەن ، ئەوەش لەم نزیکانەدا ڕودەدات".

**********************

بارزانی ڕاپۆرتیکی سەبارەت بە دانوستانەکان نارد بۆ ئیسرائیل کە باسی لەوئاشتەواییە کردوە ، کە لەدانوستانەکانەوە بەدی دێت، کە تاڕادەیەك جێی بڕوایە، وە وتی: ((پێشبینیەکانم بۆ ڕێکەوتنەکە زۆر گەورە نیە، دڵشاد نیم پێی)).

"د.جبرائیل دیناری" کە لەشوباتی ١٩٧٠ دا هات بۆ کوردستان و لەئازاری هەمان ساڵدا جێیهیشت بەرەو ئیسرائیل دەڵێت: ((شایەتحاڵی ئەوەبوم کە دڵەڕاوکێ و ڕاڕاییەکی زۆر لە ناو عێراقیەکاندا بڵاوبومتەوە ، لەچرکەساتێکدا وادەردەکەوت کە دەستێوەردانی ئیسرائیل لەکوردستان گەیشتە کۆتاییەکەی، تەنانەت قسەکرا لەسەرچۆنیەتی هەلگرتنی نەخۆشخانە مەیدانیەکە، بەڵام کوردەکان داوایان کرد کە بە کەلوپەلەکانیەوە بمێنێتەوە ، "د.دیناری" تەسلیمی پەرستیارە کوردەکانی کرد)).

ڕائیدی یەدەگ "عەبادی" لە ١٥ی ئایاری ١٩٧٠ گەڕایەوە کوردستان لەو "٥" هەفتەیەدا کە تا ٢٠ی حوزەیرانی ١٩٧٠ لەوێ بەسەری برد هەستیکرد کە جەماوەر لەپشودانێکی تەواودا دەژین ، بۆمبە ئاسمانیەکان وەستابون ، پێشمەرگە کوردەکان بە ئازادی بە هەمو "عێراق"دا دەخولانەوە ، هاوڵاتی و سەربازانی سوپای عێراقی بەئازادی بە هەمو لایەکی کوردستاندا دەخولانەوە ، ئەمە جگە لەدەستکردن بە ئاوەدانکردنەوە لە کوردستان ، ئەمەش وایدەکرد عێراقیەکان و کوردەکان پێیان وابێت کە چارەنوسی کوردستان ناگەڕێتەوە بۆ جەنگ و وێرانکاری ، بۆ ئەو شێوەیەی پێشتر تیدا بو)).

عێراقیەکان دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی ژمارەیەکی زۆر لە بەندەکانی ڕێکەوتنامەکە ، ئەو گەمارۆیەیان هەڵگرت کەلەسەر ناوچە کوردیەکان بوو، ڕێگەیان بەکڕین و فرۆشی خەڵوز و تەختە دا لە کوردستان و لەعێراق، بازاڕی کوردی دەرگاکانی خۆی بەڕوی بەرهەمە عێراقیەکاندا کردەوە ، هەروەها ئەو بڕە پارەیەی کە حکومەتی عێراقی خستبویە ژێردەستی بارزانی وایکرد بارزانی (١٥) دینار بدات بە هەر چەکدارێك لە چەکدارەکانی، ئەمەش بوە هۆی بەرزبونەوەی ئاستی بژێوی .

وە لەتێبینیەکانی دا "عەبادی" لەسەر جموجوڵەکانی سوپای عێراقی بۆی دەرکەوت کە سوپا زۆرینەی هێزەکەی لەباکور گواستۆتەوەو بردویەتی بۆ "باشوری وڵات" و جەبهەی ڕۆژئاوا بەرامبەر ئیسرائیل، بەڵام دەیزانی کە دەستپێشخەریەکەی بە دەستی عێراقیەکانە، ئەگەر بیانەوێ بەبێ کۆششێکی زۆر هێزەکانیان دەهێنێتەوە ناوچەکەو درێژە بە جەنگ دەدەن.

بارزانی کە گومان لە ڕاستگۆی عێراقیەکان هەبو، پەلەی نەکرد لە کەمکردنەوەی ژمارەی هێزەکانی وەك ڕێکەوتننامەکە باسی دەکات، وە کاری دەکرد بۆ سەرمایەپێدانی و مانەوەی لەڕێگەی ئەو پارەیەوە کە لەدەوڵەت وەریدەگرت، وە ئەو یەدەگی داراییەی کە لە خەزێنەکەیدامابوو ، سەرکردەو سەربازانی پێشمەرگە لە ناوچەکانی خۆیان مانەوە و چەکە سوك و قورسەکانی خۆیان تەسلیم نەکردەوە، "عەبادی" ترسی خۆی لەبەردەستکەوتنی چەکەکان دەربڕی ئەگەر بە شێوەیەکی باش خەزن نەکرێن.

"عەبادی" بۆی دەرکەوت کە عێراقیەکان دەستیان کردوە بە بنیاتنانی سەربازگەیەکی گەورە لەیەکێ لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی کورد، بە بەهانەی تایبەتکردنی بۆ پێشوازی گەشتە هاوینەکان و ئەو کەسانەی کەدەیانەوێ ماوەیەك بۆ پشوو لەوێ بەسەر بەرن، بەڵام "عەبادی" بۆی دەرکەوت کە سەربازگەکە لەتوانایدا هەیە کە لەکاتی پێویستدا کەتیبەیەکی تەواوی پڕچەك بەهەمو

چەکێکی پێویست لەخۆبگرێت، هەرچەندە کوردەکان دەیانتوانی کۆنترۆڵی سەربازگەکە بکەن، هەرکاتێ بیانەوێ، بەڵام دروستکردنی دەلالەت لەسەر نیازونیەتی داهاتوی عێراقیەکان ، ئەمەش گومان و دودڵیەکانی بارزانی پشت ڕاستدەکردەوە.

بە تێپەڕینی کات دەرکەوت کە عێراق ئەو کەسەی ڕەتکردۆتەوە کە کوردەکان وەك کاندید بۆ پۆستی جێگری سەرۆك دیاریان کردبوو.

"حیبیب محمد کریم" و هیچ کەسێکیان لە "ئەنجومەنی شۆڕش" دانەمەزراندوە، لەهەمان کاتدا بارزانی پێشنیارێکی عێراقیەکانی ڕەتکردەوە بەدامەزراندنی "ئازاد" وەك جێگری سەرۆك، لە هەمان کاتدا پێنج وەزیری کورد لەحکومەتی عێراقیدا دانران ، لە نێوانیاندا "سامی" کەڕێزێکی زۆری لای بارزانی هەبوو ، بارزانی لەسەر دامەزراندنەکەی وتی: ((وەزیرەکانمان پێویستیان بەڕازی بوون و ڕێگەپێدان هەیە، ئەگەر بیانەوێت پەرداخێك لەسەر مێزەکەیان بجوڵێنن ، هیچ پێشکەوتنێك لەبواری مافی ئۆتۆنۆمیدا بەدەست نەهاتوە، لە سێ ناوچەی هەولێر و سلێمانی و دهۆك)).

عێراقیەکان زۆر بەچالاکی خەریکی ئامادەکردنی ئاماری دانیشتوان بون کە ئەو ئامارە ناوچەکانی مافی خۆبەڕێوەبەری دیاری دەکرد، بەپێی جەماوەری کوردەکان دەستیان کرد بە گۆرانکاری لە لیواو سنور و قەزاکان بەبێ ئەوەی هیچ ڕێگریەکیان بێتەپێش، هەرچەندە ئەوە ئاشکرا بو کە ئەو کارە لە بەرژەوەندی کوردەکان نیە، هەمان شت لەکۆنترۆڵ کردنی ناوچەکانی نەوت و دابەشکردنی قازانج و داهاتی نیشتمانی کە ڕێکەوتنەکە باسی لێوەکردبوو ، سەرەڕای ئەوەی "عەبادی" پێی وابوو کە بەشێك لە کوردەکان هەمو ئەو زیادە ڕۆییە قبوڵ دەکەن بەرامبەر درێژەنەدان بەجەنگ.

کوردەکان لەوماوەیەدا بۆیان دەرکەوت کەحکومەت برا کوردەکانیان لەکەرکوك دەردەکات و لەجێی ئەوان عەرەب نیشتەجێ دەکات، هەروەها هیچ ڕێکەوتنێك

نەکرا سەبارەت بە بەشی ناوچە کوردیەکان لەداهاتی وولات و بەتایبەتیش قازانجی نەوت، بەڵکو تەنانەت بەشێوەیەکی ڕێك و پێك پاریزگاری لەئاگربەستەکەش نەکرا، بەهۆی ئەو هەمو بارودۆخانەوە.

بارزانی داوای لە "عەبادی" کرد کە درێژەبدات بە پەیوەندی یەکانی لەگەڵ ئیسرائیل .

"عەبادی" دەڵێت: "بارزانی پێی دەوتم "کوڕم"منیش بە "باوکە" بانگم دەکرد، من ئەوکاتە خەریکی دامەزراندنی دەزگایەکی پەخشی نوێ بووم بۆ کوردەکان ، و زۆر کاریگەربوبوم بەو زاراوانەی کە بەرکاریان دەهێنا سەبارەت بە هاوچارەنوسی هەردولا، نەدەکرا کاریگەریش نەبیت بەئەودڕندایەتیەی کە عێراقیەکان بەرامبەر ئەوان بەکاریان دەهێنا، خۆم وەك نوێنەری دەوڵەتێکی هاوپەیمان دەهاتە پێشچاو ، ئامادەبوم هەمو شتێك لە پێناویاندا بکەم ، تەنها توانیم ئەوە بکەم ، بەڵام هەستم کرد کە بەرپرسانی ئیسرائیل هەستیان دەکرد کە من زیادەڕەویی دەکەم ، هەرچەندە من پابەندبوم بەوانەی کە داوام لێکرابوو و ئەنجامم دان، شتێك هەبو لە سیاسەتی ئیسرائیل دا کە بە نیسبەت منە وە تەمومژاوی بوون هەستم کە سیاسەتێکی بەرتەسك دەکەم ، ئاشکرا بو بۆم کەپێویستە بگەڕیمەوە بۆ ئیسرائیل و بارودۆخەکە ڕون بکەمەوە، بە تایبەت کە ئازادی کارکردنی سوپای عێراق لە ناوچە کوردیەکان و ئەو بێئومێدیەی کە توشی کوردەکان بوبوو، مەترسی لەسەر ژیانی نوێنەرە ئیسرائیلیەکان دروست کرد بوو، ئەمە جگە لەوەی کە شوێنی ڕاویژکارە ئیسرائیلیەکان نزیك بوو لە سنوری ئێرانەوە لەوماوەیەدا کە پێشبینی دەکرا کە سوپای عێراق هێرشی زستانەی خۆی بکات ، تا ڕیگای سەلامەتی و ڕاکردنی خێرایان بدات بەرەو ئێران ، بەڵام لە "هاوین"دا شتەکە دەگۆڕێ ، بەجۆرێك راوێژکارەکان دەگوازنەوە بۆ ماڵی هاوینەی بارزانی کە دەکەوێتە قوڵایی ناوچە کوردیەکانەوە.

یەكێ لە پەرستیارە ئیسرائیلیەكان دەڵێت: ((لە جەژنی "نەوروز"ی كوردەكان دا لەگەڵ بەرپرسێكی باڵای كوردەكان دانیشتبوین ، هیچ شتێكی خراپمان لێ نەبیست سەبارەت بە خۆمان، بەڵام پاش ماوەیەكی كەم گوێمان لێ بو لە ڕادیۆی بەغداد قسەی دەكرد، قسەی زۆر توند و خراپی بە ئیسرائیل دەگوت، زۆر پێی سەرسام بوین، پێمان ناخۆش بوو ، بەڵام دواتر بۆی ڕونكردینەوە و وتی: "هیچ ڕێیەكی تریان لەبەردەمدا نیە جگە لە ڤاڵكردنی گوێچكەی عێراقیەكان ماوەماوە بەقسەی "كوردەكان تەسلیم نابن و نەبوون بە زایۆنیزم"")).
((كوردەكان بەشێوەیەكی گشتی شێوازی خۆیان لەگەڵماندا نەگۆڕیبوو ، تەنانەت لەسەردەمی دانوستانەكان و دواتریشدا، كاتێك خێزانە عێراقیەكان دەهاتنە، ناوچەكە جەختیان دەكردەوە لەوەی كە لەبەرچاوانیان دیارنەبین)).
لە ١٦ای حوزەیرانی ١٩٧٠ كاتێك "عەبادی" دەستی بە ئاودەگەیاند كەسێك چەقۆیەكی لێ داو ڕایكرد ، تائێستاش ئەو دۆسیەیە یەكێكە لە مەتەڵەكان ، نازانین كێ بو هەوڵی دا تیرۆری بكات، بەڵام ئەوە دەڵێت: ((ئەو كەسەی هەوڵی تیرۆر كردنی داوە لەكوردەكانی ناوچەكەیە ، گوازرایەوە بۆتاران و لەوێ بە پەلە برایە نەخۆشخانە، بارودۆخەكەی زۆر سەخت بو)).
بارزانی زۆر بێزار و خەجاڵەت دەردەكەوت ، بەڵێنی دا كە هەموو كۆششی خۆی بخاتەگەڕ لەپێناو دەستگیركردنی ئەو كەسەدا.
بەرپرسی مۆساد لە تاران دەڵێت: ((بارزانی داوای لێبوردنی بەهۆی ڕوداوەكەوە نەكردو ، ڕێگەی نەدا بەكەسیش كە بەناوی ئەوەوە داوای لێبوردن بكات)).
"كێرن"دەڵێت: (عەبادی هەڵەیەكی كرد كە بەیەكێ لە قەدەغە و هێڵەسورەكان سورەكان دادەنرێت لەكوردستان ، وێنەی سێ ئافرەتی كوردی گرت كە جلوبەرگەكانی خۆیان دەشۆری كە هیچ كوردێك بەهیچ شێوەیەك ئەوە قبووڵ ناكات ، پێ دەچێت تۆڵەی ئەوەبێت لێی كرابێتەوە)).

## بەشی بیست و دوهەم/
## ڕزگار کردنی دواهەمین جولەکەکان

کاتەکە گونجاو بوو بۆ ڕزگارکردنی دواهەمین جولەکەکانی عێراق، کە ژمارەیان دەگەشتە نزیکەی (٣٠٠) کەس، کەبارودۆخیان زۆر خراپ بوو ، بەتایبەت لەکاتی جەنگی ١٩٦٧ کە توشی ڕاوەدونان بوون ، حکومەت هەستا بەلەسەرکارلادانی هەموکارمەندە جولەکەکان لەدام و دەزگای ومزارەتە عێراقیەکان ، هەروەها جولەکەکانی کەرتە تایبەتیەکانیش بەهەمانشێوە دەرکران، وە حکومەت کڕین و فرۆشتن و بەکرێدان و هەموو زەوی و خانوبەرەیەکی لەجولەکە قەدەغە کرد لەگەڵ تۆمارکردن و گواستنەوەی موڵکایەتی هەر موڵکێك وە بانك و لایەنە داراییەکانی تر فەرمانیان پێ کرا کە لە (١٠٠) دیناری مانگانە زیاتر هیچ پارەیەك بەجولەکە نەدەن، و پاریزەر و دکتۆرە جوەکان ڕێگەیان پێ نەدەدرا چارەسەری هیچ کەسێکی غەیرە جولەکە بکەن ، وە لە ناوچەی نیشتەجێ بونیاندا خرانە ژێرمانەوەی بەزۆرەوە "دەست بەسەری" ، و هەموو تەلەفۆنێکی ماڵ و نوسینگەو شوێنی کارەکانیان بڕدرا ، و هەموو مونتەداکان بەڕویاندا داخران، کەسایەتیە دیارەکانیان دەستگیر کران و دادگایی کران و ئەشکەنجە دران، شوینە پیرۆزەکانی جولەکە دەستی بەسەرداگیرا ، ئەمەش وایکرد زۆریان بێ سەرچاوەی بژێوی بمێننەوە، وکرێکارە جوەکان زۆر ڕووبەڕوی هەڵمەتێکی تیرۆر و ئەشکەنجەی جەستەیی بونەوە، لە لایەن ئەو خاوەنکارانەوە کەکاریان بەجووەکان دەکرد، تەنانەت حکومەت دەستی کرد بەدروستکردنی ناوەندێك لەنزیك شارۆچکەی "بەعقوبە"ی بچوك لەنزیك "بەغداد" و لەوێ کۆکرانەوە، ئەم هەڵمەتە زۆربەی جولەکەکانی ناچارکرد ، لە ماڵەکانیاندا بمێننەوە و ڕوونەکەنە شوێنە گشتیەکان. "نەسیم القزاز" کەجولەکەیەکی عێراقیە دەڵێت:((نزیکەی (١٠٪)ی ڕۆڵەکانی تایەفەی جولەکە هەتا سەرەتای ساڵی ١٩٦٩ لەزیندان بون، زۆریان نزیکەی (٤٠٪) یان کوژران بەخنکاندن یان لە ژێر ئەشکەنجەدا، دەڵێت : زۆربەیان بەبێ دادگایی

کوژران ، و بەبێ هیچ ڕونکردنەوەیەك جەستەیان تەسلیمی خاوەنەکانیان کراوەتەوە)).

بۆ هەموان ئاشکرابوو کە ڕزگارکردنی پاشماوەی جولەکەکان ناکرێت تەنها لەڕێگەی ناوچە کوردیەکانی نزیك لەسنوری ئێرانەوە نەبێت ، ئارامبونەوەی جەنگ بووە هۆی ساناکردنەوەی هەندێ لەو کۆت و بەندانەی کە خرابووە سەر ڕێگای گەیشتن بە ناوچە کوردیەکان، هەرچەندە تەنها چونەدەرەوە لەشوێنی نیشتەجێ بونی جولەکەکە تاوان بوو ، پێشیلکردنی یاسا بوو)).

دەبوا ئەوانەی کەدەیانەوێت ڕاکەن، ڕوبکەنەناوچە کوردیەکان کە وەك شوێنی سەیران و پشوودان و مانەوە بەکاردێت کە دیمەنێکی بێتاوان و جوانی هەیە، زۆرینەی عێراقیەکان لەهاویندا ڕویدتێدەکەن ، وەك ناوچەی "صلاح الدین" و"شەقلاوە"و "دەربەند" و لەوێوە ڕێگاکە بەرەوسنوری ئێران کورتە.

یەکێ لەڕاکردوە سەرەتاییەکان کەناوی "ماکس فوئاد سۆدای" پیشەوەرێکی عێراقی بوە، لەوکتێبەدا کە دواتر بەناونیشانی "هەموان چاوەڕێی پەتی سێدارەن" نوسیبووی دەڵێت: ((ئەوسا ژیان لەوێ وەك ڕۆژانی کۆتایی "بۆمبای" وابوو جگە لەوەی کە من پابەندبوم بەبەها پیرۆزەکانەوە و ملکەچ بون بۆ ڕێگا خاپورکەرە شەیتانیەکان ڕەتدەکەمەوە لەلایەن حکومەتی عێراقیەوە)).

((بەڵی ... سەرم قاڵ بوو بەوەی چی بەسەر "سەعیدە"ی خێزانم و دوکچەکەم دێت ، ئایا بەپێستی خۆمەوە ڕابکەم و وەك پارویەکی ئاسان بۆ عێراقیەکان بەجێیان بهێڵم تا لەتۆڵەی ڕۆشتنی من تۆڵەیان لێ بکەنەوە یان لەگەڵ خۆمدا بیانبەم ، وە توشی سەرکێشییەکیان بکەم، کە لەوانەیە بەمردن کۆتایی بێت، لەلایەکی ترەوە دەموت بۆچی هەلی زێرین لەدەست بدەم بەهۆی ئەو ئارامییە ڕێژەییەی کەباکوری گرتۆتەوە هەوڵی ڕزگاربوون بدەم، چی دەدۆڕێنم؟ تەنها ژیانم نادۆڕینم ئەگەر بێنمەوە ئایا گرەنتی ژیانی خۆم و خێزانەکەم دەکەم؟ ئەم

هەلەی ئێستا ڕەخساوە تا دەرەخسێتەوە بۆمن و ڕۆڵەکانی خێزانەکەم، کەواتە یان دەبێ ئیستا ڕابکەم یان دەبێ بۆهەمیشە لێرە بمێنمەوە)).

لە ٢٧ی ئازاری ١٩٧٠ "سۆدای" لەگەڵ هاوڕییەکی کە ڕێزان بوە ئەو ڕیگایەی بڕی کە هەتاسنوری ناوچە کوردیەکان دەگاتەنزیکەی ٥٠٠ کیلۆمەتر ناچاربون چوار جار پێناسەکانیان دەربهێنن ، هەتا لەچوار پێگەی چاودێری دەرچن، تاگەیشتنە گوندی "صلاح الدین" ، لەوێوە ڕوی کردە "حاجی ئۆمەران" ، لەوێ زۆر هەوڵی دا کە "بارزانی" یان "ئیدریس"ی کوڕی ببینێ ، لەکۆتایدا بازرگانیکی بینیبوو ئارەزوی خۆی بۆ گەیشتنە تاران پێ ڕاگەیاندبوو ، بەڵام ئەو گوێی پێ نەدابوو ، بەدڵشکاوی و ترسەوە گەڕابوەوە بەغداد ، تا بەرەوڕوی واقیعە زانراوەکە ببێتەوە.

لە ١ی حوزەیرانی ١٩٧٠ ئاماژەیەکی لەبازرگانی ناوبراوە پێگەیشت کەوتبوی دەتوانێت ڕابکات ئەگەر هاوکاری لەشێخێکی کوردی وەربگریت کە لەناحەزەکانی بارزانی و هاوکاری لەگەڵ حکومەتی عێراق دا دەکات و ئیستا لەبەغدایە.

سۆدای لەگەڵ کوردە ناوبراوەکە لە ماڵەکەی ئەو لەبەغداد کۆبوەوە ، بەڵێنی دا نهێنیەکەی بپارێزێت ئەگەر هاتو دەستگیرکرا، وە ناوی شێخەکە نەبات ئەگەر ئازاریش بدرێت ئەمەش لەبەرامبەر بڕی هەزاردیناردا، سۆدای دەیزانی کە لەدوای خۆی باوك و دایکی و براکەی و ژنی براکەی و برازاکانی بەجێ دەهێڵیت وە لەوانەیە عێراقیەکان دەستگیریان بکەن کاتێك هەواڵی ڕاکردنی ئەو و ژنکەی و دو کچەکەیان پێدەگات.

لە٩ی حوزەیران دا هەرچواریان بەڕیکەوتن بۆ ناوچەی "صلاح الدین" بەسەیارەیەکی کرێ ، لەوێ هەرچواریان لەشوقەیەکی بەتاڵ دابەزین کەچاوەڕێی ئەوان بوون تا سەرۆکخێڵی ناوبراو، هات تادواهەمین ڕێنماییەکانیان پێ بدات ، لەئێستا بەدواوە تۆ ناوت "ئەحمەد"ە و ئەفسەریت لەسوپای عێراقی ، تۆ و ئەندامانی خێزانەکەت حەز دەکەن بچنە سەر سنوری ئێرانی ، ناوی خێزانەکەت "لەیلا"یە ناوەکەت و جولەکەبونت نادرکێنیت هەتا دەگەیتە یەکەم ویستگەی

ئێرانی ، و لەو سێ ڕینوێنەی لەگەڵیاندا بون ، جگە لەیەکێکیان ئەوانی تر بەناسنامەی ڕاستەقینەی ئەوانیان نەدەزانی.
چوارکەسەکەو ڕێنمایەکان بەڕێکەوتن تاگەیشتنە گوندێکی بچوك بە ناوی "حریر" پاشان بۆ "گەلی علی بەگ" و لەوێوە گەشتە ڕاستەقینەکەیان بۆ سنوری ئێران دەستی پێکرد لەسەرپشتی ٥ وڵاخ ، ڕێگاکە سەخت و درێژبوو بەسەر لوتکەی چیاکاندا ، کە ئەمەش بوە هۆی بەربونەی ژنکەی و دوو منداڵەکەی و بریندار بونیان، سەرەڕای ئەوە ڕاکردوەکان بەردەوام بون لە ڕاکردنەکانیان بە شێوەیەکی بەردەوام ، لەکاتژمێر ٦ی سپێدە تا کاتژمێر ٣ی دوانیوەڕۆ ، پاش شەش ڕۆژ لەڕێڕۆشتن بە پێ و لەسەرپشتی وڵاخ گەیشتنە سنورەکانی ئێران، لەئێرانەوە خێزانی "سۆدای" چوون بۆ "ئیتالیا" لەوەیوە بۆ "بەریتانیا" و لەوێ مانەوە.

************************

ڕاکردنی "سۆدای" هانی زۆربەی جولەکەکانی تریدا ڕابکەن لە عێراق، یەکەم گەشتی گەورەی ڕاکردنی جولەکە بەهاوکاری کوردەکان لەمانگەکانی تەموز و ئابی ١٩٧٠دا بوو، و لە مانگەکانی ئەیلول و تشرینی یەکەمی هەمان ساڵ گەیشتە لوتکە، بەجۆرێك ڕۆژانە پەنجا جولەکە سنوری ئێرانیان دەبڕی.

* ******************** *

لەئەیلولی ١٩٧٠ دوسەدو پەنجا جولەکە دەستگیرکران لە باکوری عێراق کە بەنیازی ڕاکردن بوون ، لە ١٤ای ئەیلولدا پۆلیسی عێراقی ١٣٧ هاوڵاتی جولەکەی شەقلاوەو صلاح الدینی دەستگیرکرد ئەوەش بەهۆی مردنی یەکێکیانەوە لەکاتی خواردنی نانی ئیوارەدا ، ئەمەش دانیشتوانی ناوچەکەی ناچار کردبو بە پۆلیس ڕابگەیەنن ، کەڕاکردوەکانی دۆزیەوە و گەڕاندنیەوە بۆ بەغداد و لەوێ لەدوانگەی "بەهائیەکان"دا دەستگیرکران کە وەك بارەگای هەوالگری عێراقی بەکاردەهات و ناچارکران بڕی ٥٠٠ دینار بدەن بۆ هەر تاکێك تاجاریکی تر نەوێرن ڕابکەنەوە ،

دەستگیر کردنی ئەوان بوە هۆی وەستاندنی پرۆسەی ڕاکردنی دوەم کە لەناوەڕاستی کانونی یەکەمی ١٩٧٠ دەستی پێکردبوو بۆ شوباتی ١٩٧١.

لەنیسانی ١٩٧١ حکومەتی عێراقی ڕایگەیاند کە دوو گروپ لە ڕاکردوانی دەستگیرکردوە کە ژمارەی هەر گروپێکیان گەیشتۆتە ١٦ کەس ، بەشێکیان بەپارەو دزین تۆمەتبار کران ، چونکە ٣٥٠ جونەیهی زێر و ٧٣ هەزار دینار لەگیرفان و کەلوپەلەکانیاندا دۆزرانەوە.

یەکێ لەئەندامانی ئەو دوو گروپە کەکەناوی "سمیر شمتۆف"ە دەڵێ: کەسانی جولەکە هەبون لەعێراق ڕزگاریان دەکردن بەرامبەر بڕێك پارە کە لەنێوان ٢٠٠ تا ٤٠٠ دینار بۆ یەکسەر بوو، ئەو پارەیەش بۆگیرفانی خۆیان بو، بەڵێ جولەکەکان خۆیان خیانەتیان لێ کردین.

((ئەو جولەکانە کەئێستا یەکێکیان دکتۆریکی ددانی ناسراوەلە ئیسرائیل ، ئەو پارەیان برد بۆخۆیان و ئێمەیان تەسلیمی چەند چەتەیەك کرد تا بمانگەیەنن بە "حاجی ئۆمەران" و لەوێشەوە بۆ سنوری ئێران، لەڕێگا هەوڵیاندا خوشکەکانم لاقە بکەن، دایکم و دو ئافرەتی تر کەلەناو گروپەکەدا بون، هەرگیز دیمەنی باوکمم بیرناچێتەوە کە لەسەرئەژنۆ دانیشتبوو لێیان دەپارایەوە تا لاقەیان نەکەن، لەکۆتایدا ڕازی بون لاقەیان نەکەن بەرامبەر بەوەی کاتژمێرەکانی دەستمانیان بەینی)).

★ ★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★ ★

بارزانی شانازی دەکرد بەپرۆسەی ڕاکردنی جولەکە لەعێراق ، و ئەو ڕۆڵەی کە لەتەواوکردنیدا دەیگێڕێت، و لەو وتارەیدا کە ڕۆژنامەنوسی ئەمریکی "جاك ئەندەرسۆن" لەڕۆژنامەی "واشنتن پۆست" لە١٧ی ئەیلویی ١٩٧٢ نوسیویەتی هاتوە: ((زامیری سەرۆکی مۆساد بیرۆکەی هاوکاریکردنی جولەکەکانی عێراقی بۆ ڕاکردن خستۆتە بەردەم بارزانی)).

چەند کەسێکی نزیك لە بارزانی دەڵێن: ((بارزانی بیرۆکەکەی زۆر بەدڵ بوە ، لەبەرئەوەی جولەکە کاریان بۆ ئێمە کردوە)).
پرۆسەی ڕاکردنەکە کوردەکانی دەخستە خەتەرەوە ، بارزانی کوڕەکانی خۆیان چاودێری پرۆسەی ڕاکردنی جولەکەکانیان دەکرد، "لفکۆف" دەڵێت: ((بارزانی لە دانیشتنیکماندا پێی وتم من هۆکاربووم لە کوژرانی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك، چ لە کاتی شەڕدا ، چ بەنەخۆشی و هتد، بەڵام لەشۆڕشدا دەژین ، ئەوە ژیانی ئێمەیە بەڵام دوێنی هەستم کرد کەبەشێکی زۆری هەڵەکانم بەخشراون ، ژنێکی جولەکەی ڕاکردوو هات بۆلام و وتی: عێراقیەکان مێردەکەمیان لە سێدارەداوە، بەڵام من و منداڵەکانم دەتوانین بەهۆی تۆوە ڕابکەین ، ئەوکات هەستم کرد کەفرمێسك بەچاومدا دێتەخوارەوە و بەشێك لەهەڵەکانم بەخشراوە)).
لەقۆناغێك لەقۆناغەکاندا ئیسرائیلیەکان تێبینی ئەومیان کرد لایەنێك هەیە کەکاردەکات بۆ لەکارخستنی ڕاکردنی جولەکە لە عێراق ، ئەوەبو "دێڤید فتال"ی ئەندامی پێشوی کنێست سەردانی عێراقی کرد، هاتن داوای سەفەر بکەن بۆ ئیسرائیل نەك بۆ ئەوروپا و ئەمریکا، ئەو کات زانی کە کوردەکان دەستیان هەیە لە دواخستنی ڕاکردنی جولەکەکان لەعێراق، عێراقیەکان بەهۆی ونبونی ئەو خێزانە جولەکانەی کە بەتەواوەتی دیارنەمابون ، پاش ئەوەی کە ڕوویان کردبووە ناوچە کوردیەکان بۆ سەیران ،کەوتنە گومانەوەو وەزیری ناوخۆ شکایەتی لای بارزانی کرد بەهۆی ئەو هاوکاریانەوە کە پێشکەشی ڕاکردوانی دەکات، بارزانی ڕەتی کردبوەوە کە کوردەکان ڕۆڵیان هەبێت لەوەدا، بەڵام لە هەمان کاتدا فەرمانی دا بەپیاوەکانی کە پرۆسەی ڕاکردن لە کار بخەن.
"فتال" دەڵێت: ئەو فەرمانەی بارزانی دەریکرد ڕاکردنەکانی نەوەستاند، چونکە شۆفێرێکی کوردی نزیك لەبارزانی کە ناوی "یونس" بوو بەردەوام بو لەهاوکاری جولەکەکان بەرامبەر برە پارەیەکی باش کاتێك بارزانی بۆی دەرکەوت پرۆسەی ڕاکردن بەردەوامە، "یونس"ی دەستگیرکرد کە دوو جولەکەی لەگەڵدا بوو.

هەموو ڕاکردوەکان حەزیان نەدەکرد ڕوبکەنە ئیسرائیل ، هۆکارەکەش دەگەڕیتەوە بۆئەوەی وەك "فتال" وتی بۆ ئەونامانەی کەخزمەکانیان لەئیسرائیلەوە بۆیان ناردبون کەپێشتر ڕایان کردبوو بۆ ئیسرائیل پێیان وتبون کەبارودۆخی ئابوری لەوێ سەختە ،جگەلەوە ڕۆڵەکانی تایەفەی خۆرهەلآت مامەڵەیەکی خراپ دەکران لەچاو ڕۆڵەکانی تایەفەی خۆرئاواوە، جگەلەوە ئەو کەسەی کە دەچوو بۆ ئیسرائیل نەیدەتوانی لێی دەربچێت، ژنێك بە"فتال"ی وتبو: ((مێردەکەم لەبەغداد لەسێدارەدرا ئەو دوو کوڕەم بۆ ماوەتەوە کاتێك دەگەمە ئیسرائیل لەمنیان دەستێنن و دەیانخەنە ناو جەنگەکانەوە)).

سەرەڕای ئەوەش زۆرینەی ڕاکردوەکان چوون بۆئیسرائیل ، سەرۆکوەزیران "گۆڵدا مائیر" بەخێرهاتنی کردن، بە"کرۆن"ی وتبوو: ((کێ پێی وابوو کە کوردەکان هاوکاری جولەکەکان دەکەن بۆ ڕاکردن لەعێراق بەرەو ئیسرائیل)).

پرۆسەکانی ڕاکردن سەرکەوتو بوون لە بەتاڵکردنەوەی عێراق بەنزیکەیی لەجولەکە، لەکۆتایدا تەنها ژمارەی ٥٠٠ تا ١٥٠٠ کەس لەجولەکە لەعێراقدا مابونەوە ، پاشان ژمارەیان کەمبووەوە، هەتا چەند کەسانێك مابونەوە، ئەوانەی مانەوە تالآوەکەیان چێشت و شوێنەواریان نەما، پاشان بەکوژراوی جولەکەیەك لە ماڵەکەیدا دۆزرایەوە پاشان لەماوەی نیوان شوبات بۆ نیسانی ١٩٧٣ "٩" جولەکەی تر ڕفێنران، پاشان لەکاتی ڕاکردنیاندا پێنج کەس لە یەك خێزان بون کوژران.

عێراقیەکان دەیانزانی چی ڕودەدات، بەڵام ئاگاداری هەموشتێك نەبون، لە ٣ی کانونی دوەمی ١٩٧٣ دا ڕۆژنامەی "الثورة"عیراقی نوسیویەتی: ((لەبەرامبەر ئەو هاوکاریانەی کە ئیسرائیل پێشکەشی کوردەکانی کردوە ، کوردەکانیش هاریکاری جولەکەکانی کردوە بۆ ڕاکردن بۆ ئیسرائیل)).

لەڕاستیدا بارزانی ئەو کەسایەتیە ناوەندیە بوو، کەسەرپەرشتی پرۆسەی ڕاکردنی دەکرد لەعێراق ، پاش ٢٢ ساڵ "مستەفا قەرەداغی" کەئەوسا لەشەستەکان سکرتێری بارزانی بوە دەڵێت: ((بارزانی فەرمانی دا بەرزگارکردنی جولەکەکان و پێشکەش کردنی هەمو هاوکارییەکی پێویست پێیان)).

لۆژیکی دروست جەختی لەوەدەکردەوە کە بارزانی حەوجێی بە ئێمەیە ، وە بونی ئێمە بۆ ئەو گوزارشتە لە هێز، جگە لەوە ئێمە بەنیسبەت ئەوە پردێکین بۆجیهانی دەرەوە تا ڕادەیەك ، چونکە پردی ڕاستەقینە بۆ ئەو ئێرانیەکانن کەگومان لەوەدانیە، بەهەر جۆرێك بێت پاریزگاری لەداوی "معاویە" دەکەن لەگەڵ بارزانی.

بەلام زوو دەرکەوت کە ئەو بۆچونەی پێشتر زۆر گەشبینانە بوە لە دوایی ڕیکەوتنی عێراقی – کوردی، پەیوەندیەکانی کورد و ئیران ئالۆزی تێکەوت، ئیسرائیل هەولی دا بارودۆخەکە ڕێك بخاتەوە لە نیوانیاندا، دوو پێشنیاری خستە بەردەم بارزانی بۆ درێژەدان بە گفتوگۆ.

## بەشی بیست و سێهەم /

## عێراقیەکان هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانی دەدەن

سەرەڕای رێکەوتننامەی ١١ی ئازار ، حکومەتی عێراقی بەردەوام بوو لە رێگری و راوەدونانی سەرنوسەرانی رۆژنامە عێراقیەکان، جەستەی وەرگێڕێکی "فەرەنسی" کەلەرۆژنامەی "التاجی" سەربەکوردەکانە ، لەقەراخ شەقامێکی بەغداد دۆزرایەوە.

وە لەشەوی ٦ی کانونی دوەمی ١٩٧٠ هەوڵێك درا بۆ تیرۆرکردنی "ئیدریس"ی کوری بارزانی کە وەك نێردراوێك لە لایەن باوکیەوە هاتبو بۆ بەغداد ، بەو ئۆتۆمبیلە گرانبەهایەی کە حکومەتی عێراقی پاش رێکەوتننامەکە وەك خەڵات پێشکەشی باوکی کردبوو، هاتنەکەی بۆنەوەبوو کەپیرۆزبایی بگەیەنێت بە سەرکردەکانی پارتی دەسەڵاتدار، کاتێك ئۆتۆمبیلەکە لەنزیك یەکێك لەئوتێلەکان دەوەستێت ، بەتفەنگیکی ئۆتۆماتیکی سەللەیەکی لێ دەکرێت، بەڵام "ئیدریس" شەوێك پێشتر بەنهێنی گەڕابووەوە کوردستان، بەمەش لەمردن رزگاری بوو.

"مستەفا بارزانی" وتی: کە پێنج لەوانەی هەوڵی تیرۆرکردنی کوڕەکەیان داوە سەر بەگروپەکەی "تاڵەبانی"ن، حکومەتی عێراقیش دواتر رایگەیاند کە بکەرەکان دەستگیرکراون و دەدرێنە دادگا.

لە ٧ی کانونی یەکەمی ١٩٧٠ بارزانی لەو چاوپێکەوتنەدا کە رۆژنامەی "نیوزویك"ی ئەمریکی لەگەڵیدا ئەنجامی دا ووتی: ((زۆرلایەن هەن کەئارەزووی تێکدانی ئاشتیەکە دەکەن لە نێوانماندا ژمارەیەك لەپیاوانی رژیمی بەعس لەبازرگانی جەنگ ئەوانەی کەسوود لەجەنگ وەردەگرن و ژمارەیەك لە سەربازیەکان)).

لەپاش ئەو هەوڵە سەرنەگرتووە حکومەتی عێراق بەپەلە دەستی کرد بە جێبەجێکردنی هەندێك لەوبەندانەی کە لەرێکەوتننامەکەدا هاتبون، لەنێوانیاندا پێدانی قەرەبوو بۆ هەریەکێ لەوخێزانانەی کە رۆڵەکانیان لەجەنگەکانی چارەکە

سەدەی پیشوو لەدەست داوە، و برە پارەیەکی مانگانە دابینکرا بۆ هەر پێشمەرگەیەك چەك دادەنێت، و سەرچاوەیەکی بژێوی نیە ، وەزۆرترپێدانی ئەرك بەکوردەکان لەدامودەزگا حکومیەکاندا، هەروەها حکومەت بڕی "چوار ملیۆن دینار"ی تەرخانکرد بۆ پەرەپێدانی باکور، بەڵام ئەم چاکسازیانە لەچاو پێداویستیەکانی کوردەکاندا شتێکی ئەوتۆ نەبوو.

لە کانونی یەکەمی ١٩٧٠ دا و لەو دیدارە ڕاشکاوانەی لەگەڵ "ناحیك" ئەنجامی دا بارزانی ڕەخنەی توندی لە ئیسرائیل گرت کە یارمەتی نادات بۆ دەستخستنی هاریکاری و پاڵپشتی ئەمریکا ، هەروەها "دکتۆرمەحمود" باسی ئەو پەشۆکانەی کرد کە سەرکردایەتی کوردی گرتۆتەوە سەبارەت بەوەی ئەگەر پێویست بێت لەسەر ڕێگای ئاشتی بڕی چەندیان لەسەربکەوێت یان درێژە بەجەنگ بدەن، هەردوکیان ئارەزوی خۆیان دەردەبڕی لەسەر بەردەوامی دان بەپەیوەندی لەگەڵ ئیسرائیل و پێکەشکردنی هاریکاری پێیان، وە بەردەوام بوون لەپەیوەندی لەگەڵ ئێران.

هەرچەندە (ناحیك) پێی وابو کە کوردەکان دەیانەوێ دەست بە ناوەڕاستی گۆچانەکە بگرن، بەڵام پێشنیاریکرد بۆ بەرپرسە ئیسرائیلیەکان کەهاریکاری زیاد بکەن بۆکوردەکان، بەڵام بەرپرسەکان رەتیان کردەوەبەوەی وتیان : ((ئیسرائیل ناتوانیت کێشە ئابوریەکانی بارزانی چارەسەر بکات، دەستی هاوکاریمان بۆ خۆی گەلەکەی درێژ کرد ، تا هەستکردن بەبەهێزیی پێ بدەین لە ڕێی هاوکارییە سەربازی و سیاسی و ئابوریەکانەوە، هاوکاریمان کرد لەبەرئەوەی پێمان وایە کە مافی کەمینەکانیشە لەناوچەکە نەك تەنها عەرەب کە تێیدابژین، و لەبەرئەوەی پێمان وایە ئەرکی ئێمەیە کە هاوکاری گەلێکی لاواز و بچوك بکەین بۆ ئەوەی بژی ، لەبەرئەوەی دەمانەوێ ببین بەلایەنێك لەلایەنی خۆرهەڵاتی ناڤین، وە چالاکی بونمان لە کوردستان بەشێکە لەیاری سیاسی نێوچەکە، جا چ

لەچوارچێوەی هەوڵدانماندا بێت بۆ لاوازکردنی عێراقیەکان یان لەچوارچێوەی هاوکاری ئێرانیەکان بێت)).

لە ٢٦ی کانونی دووەم "دکتۆرمەحمود" بە"ناحیك"ی وت: ((بارزانی ناتوانیت هەمووشتێك بکات خەریکە توانای کارکردن لە دەست دەدات ناتوانێ ڕووبەڕووی حکومەتی عێراقی ببێتەوە بەتەنیا کەپێدەچێت لەوانەی پێش خۆیی زیرەکتر بێت، ئەگەر پەلە نەکەین لەدەستگیرۆیی کردنی بارزانی هەمونەوە لە دەست دەدەن کە تائیستا کردوتانە ، بەدورستی چییەتی ئەو هاوسۆزی یە نازانین کە ئیسرائیل پیشکەشمان دەکات و دەری دەبڕیت، بۆچی هاوکارمان نابن تا ببینەبەشێك لەسەربازگەی ڕۆژئاوا لە خۆرهەلاتی ناڤین دا ئەگەر بنەما لە

ناحیك لە وەڵامدانەوەی ئەو ڕەخنانەدا وتی: ((هەمو ئەوەی کە ڕویداوە لەئازاری ١٩٧٠ەوە پێویست دەکات گەشتێك بکەی بۆ ئیسرائیل تا هەمو کارتەکان بخەیتە سەرمێز ئەو کات ڕاستیەکان وەك خۆی دەبینین و دەزانین کە پێویستە چی بکەین)).

"ناحیك" ئەوکاتە تەواوی هەوڵی خۆی دەدا بۆباشترکردنی پەیوەندی نێوان کوردەکان و ئێرانیەکان.

پەیوەندیەکان لەنێوان کورد و عێراقیەکاندا ئاڵۆزبوون لەئاياری ١٩٧١ بارزانی شکایەتێکی نارد بۆ "بەکر" وتی: ((عێراق هەوڵ دەدات ناوچە دەوڵەمەندەکان بەنەوت، بکات بەناوی عەرەبەکانەوە تا لەئاماری دانیشتوانی ناوچەکەدا بیسەلمێنێ بەپێی خاڵەکانی ڕێکەوتننامەکە کەزۆرینەی ئەو ناوچانە کوردنین)).

پاش ئەوە بارزانی بانگەوازیکرد بۆبەستنی کۆبونەوەیەکی بەپەلەی سەرکردەکانی حیزبەکەی بەو وەزیرانەشەوە کە لە حکومەتدا بوون ، ئەومبوو بڕیاردرا کە بەردەوامی بەگفتوگۆکان بدرێت بە ەواوی و هۆشدار و ئاگاداربن، کەهیچ ئالۆزبونێك لە پەیوەندیەکاندا ڕونەدات.
"صدام" بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەوڵی ڕێککردنەوەی جیاوازیەکانی دەدا، بەڵام لەناکاو لە تەموزی ١٩٧١ یەکەیەکی سوپای عێراقی ڕێگەی "بارزان"ی داخست ، هێزی ئاسمانی عێراقی بۆردومانی ناوچەکەی کرد.
لەوەڵامدانەوەکەی "بەکر" بۆ نارەزاییینامەی بارزانی وتی: هۆکارەکە دەستپێشخەریەکی تایبەتی چەند ئەفسەرێك بوە بەبێ ئاگاداری ئەو ، تەنانەت هەندێ پروپاگەندە بلاوکرانەوە ئاماژەیان بەوەدەدا کە کارەکە پلانێك بووە کە دواتر ئاشکراکراوە مەبەست لێی دەستگیرکردنی "بەکر" و گەورە سەرکردەکانی ڕژیمی بەعس بوو لەکاتی جەژنی ساڵانەی دامەزراندنی حیزب دا.
بەڵام بارزانی ئەو ڕونکردنەوەی ڕەتکردەوە و وتی: حکومەتی عێراقی دەستی کردۆتەوە بەهەوڵدان و تەڵەکەبازی.
لە٢ی ئەیلولی ١٩٧١ دا ناحیك لەڕۆژانەکەی خۆیدا نوسویەتی: ((ناکۆکی دروست بووە لەنێوان بارزانی و وەزیرە کوردەکانی حکومەتدا ئەمەش شتێکی لەناکاو نیە، بارزانی و هەموان ئەوەیان دەزانی کەوەزیرەکان لە کارەخراپەکانی حکومەتی عێراقیەوە تێوەدەگلێن، لەبەرئەو هۆیە ڕازی نەبوو بەوەی کە "د.محمود"یش ببێتە وەزیر ، شیاوی وتنە "د.محمود" زۆرچالاك بوو لەو پەیوەندیانەدا کە لەگەڵ حکومەت ئەنجام دران، و لەبواری پێکهینانی لیستە وەزاریەکان، ومۆرکردنی ڕێکەوتننامەکە سەرەڕای ئەوە هیچ کورسییەکی وەزاری پێ نەدرا، هەروەها پۆستی سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردیشی پێ نەدرا، چونکە ئەو پۆستە هی "حبیب محمد کریم"بو، کەپاڵیوراو بوو بۆپۆستی جێگری سەرۆکی حکومەت، بارزانی لەخیانەتی "کریم" نەدەترسا لەبەرئەوەی لە تایەفی

"فەیلی"بوو، کە نەتەوەیی بونەکەی جێگەی پرسیارەو عێراقیەکان نایانەوێت و ڕقیان لێیەتی )).

بەم شێوەیە سەرکردایەتی کورد ئەرکی "کریم" و "محمود"ی بە خاوێنی هێشتەوە، لەگەڵ زۆرینەی هەرەزۆری سەرکردایەتی سەربازیش ، بەڵام ئەوانەی کە هەڵگەڕانەوە لەبارزانی لەسەر ئاستی نێوخۆیی کوردەکان زۆر گرنگ نەبوون.

بەڵام "ئیدریس" سەرەتا یەکێ بوو لەوانەی کە لەسەرکردایەتی دەسەڵاتداری "بەغدادگ زۆرنزیك بوو، لەهەمان جەبهەی "کریم" و "سامی" بوو ، بەڵام لەپاش هەوڵی تیرۆر کردنەکەی ، بارزانی وردەوردە گێرایەوە باوەشی خۆی.

جێی وتنە "محمد حبیب کریم" هەتاکۆتایی ڕێگا دڵسۆزی خۆی بۆ بارزانی پاراست، ئەو یەکێ بوو لەوانەی کە "صدام" بەبەرنامە پاکسازی کردن.

"کریم" لەساڵی ١٩٨٠ لەسێدارە درا.

بارزانی زۆر تووڕەبوو بەهۆی ئەو پلانانەی کە حکومەتی عێراقی ڕێکی دەخست دژی کوردەکان، توڕەبونەکەی زیادیکرد تا ئەوپەڕی کاتێك ڕژێم کەواکەی لەشانی داکەند و کردی بەبەر "عبیداللە"ی کوڕیدا ، کەگەشتی کرد بۆ "بەغداد" و دەستیکرد بەهاوکاری کردنی "صدام".

لەیادەوەریەکانیدا "ناحیك" نوسیویەتی: ((ئەوە خیانەتێکە لێ خۆش بونی نیە، گومان لەوەدانیە لەمەودوا بارزانی بەهیچ کارێکی ئاشتەوایی ڕازی نابێت ، بۆیە گەڕایەوە تا هەوساری سەرکردایەتی بخاتەوە ژێردەستی خۆیی، لەمەودوا ڕێگاناداات سیاسیە کوردەکان ئازادانە کاربکەن، پێدەچێت قۆناغی ئەو چالاکیانەی سیاسەتمەدارە کوردەکان ئەنجامیاند دەداگەیشتبێتە کۆتاییەکەی)).

سەرەڕای ئەوە "عبیداللە" وازی لەخراپەکاری بەرامبەر باوکی و ناوزڕاندنی نەهێنا، لەوچاوپێکەوتنەدا کە پەیامنێری ئاژانسی دەنگوباسی ئەمریکی "هلیگر جۆنسۆن" لەگەڵی ئەنجامی داوە لەڕێکەوتی ٣ی نیسانی ١٩٧٥ دەڵێت : ((باوکم سەرکردەیەکی دیکتاتۆرە، وەك هۆزی سەرەتایی مامەڵە لەگەڵ کوردەکان دا دەکات

، "مەسعودی" برام باڵی ڕاستیەتی ، کەباڵی تیرۆرەکەی بەڕێوە دەبات، وای کردبوو تەنانەت منیش لەژیانی خۆم بترسم لێی ، ناچاربووم لەزیندانی باوك ڕابکەم، و پەیوەندی بکەم بەحکومەتی عێراقیەوە، دەمزانی ئەگەر بەردەستی باوکم بکەوم دەمکوژێت)).

******************

عێراقیەکان پلانیان بۆ شتێکی لەوە فراوانتر دەکێشا کە ڕویدا، دەیانویست ئاگری شەڕ بخەنە نێوان کوردەکان و ئێرانیەکانەوە، بەڵام بارزانی زوو تێبینی پلانەکەی کردو ڕوداوەکانی ڕاگرت و نەیهێشت ئاڵۆزبێت.

پاشان "صدام" بیری بۆلای پلانێکی تر ڕۆیی ، لەکۆتایی ئەیلولی ١٩٧١ بارزانی میوانداری "زامیر"ی سەرۆکی مۆساد و "ناحوم ئەدمۆنی" سەرۆکی پۆلی "تیبل" —جیهان — ی کرد کە ئەو پۆلەیە کێشە جیهانیەکان چارەسەر دەکات.

لە ٢٩ی ئەیلول "زامیر" و "ئەدمۆنیگ ڕویانکردە ناوچەی ڕەواندوز ، کەزۆربەی هێزی نێوچەیی عێراقی لێ مۆڵ بووبوو، لەناو ئۆتۆمبیلە "جیب"ەکەدا "میرخان" و "ئازاد" هاوڕێیەتی یان دەکرد ، لەپاش ئەو گەشتە فراوانەی کە ئەم چوارە کردیان کە ئیسرائیلیەکان لەمیانەیدا لەسروشتی دابەشبونی سەربازی عێراقیەکانیان کۆڵیەوە، لەنزیك "حاجی ئۆمەران" کۆبونەوەیەکی گەورەیان دیت لەسەر ڕێگا بیستیان هەوڵی تیرۆرکردنی "مەلا مستەفا" دراوە ، بەڵام بە پەرجوو"معجیزە" ڕزگاری بووە.

پاش کەمێك گێڕانەوەکەیان لەخودی بارزانیەوە بیست کەوتی: "نۆ زانای ئاینی کە هەموویان شێخ بون، لە "بەغداد"ەوە هاتن بۆلام، بۆ "حاجی ئۆمەران" تا گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن، لەچادری میوانداری لەگەڵم کۆبونەوە ، کاتژمێر "پێنج"ی ئێوارە ، کاتێك ئەو خزمەتکارەی قاوەی بۆمیوانەکان دەهێنا هاتەژورەوە لای میوانەکان ، بۆمبێك بەربوەوەو بەسەرقاچی کەوت و دەستبەجێ کوشتی پێدەچوو بۆمبەکە لە جلوبەرگی یەکێ لە زانائاینیە ناوبراوەکان

بەربووبێتەوە ، پێش کاتی دیاریکراوی پرۆسەی تیرۆرکردنەکەو ،بەمەش هەمو پرۆسەکەی تێك دا، پاسەوانەکانی بارزانی بەپەلە هاتنە ناو چادرەکەوەو هەموو زاناکانیان کوشت ، و دوو لەپاسەوانەکانی کوژران "دە" دیکەش بریندار بوو، بەلام "دکتۆرمەحمود" کە لەتەنیشت بارزانیەوە دانیشتبوو ، هیچی لێ نەهات لە کاتێکدا بارزانی روومەتی چەپی برینداربو و جلەکانیشی سوتابون.

بارزانی دەڵێت: ((هیچ گومانێك لەوەدا نی یە کە پرۆسەکە بۆ تیرۆرکردنی من بووە)) ، بەلام "ئەدمۆنی" کە دواتر بووە سەرۆکی مۆساد دەڵی: ((ئەم پرۆسەیە یەکەم نمونەبوو بۆ پرۆسەی خۆکوژی شیعە))، بارزانی دەیگوت کەپلانەکە پێش ١٥ رۆژ دەستی پێکردوە کاتێك چوار نوێنەر لەحیزبی بەعسەوە هاتون بۆ لای کە هەمویان پیاوی ئاینی بون ، تا گفتوگۆ بکەن لەگەڵی و دانوستانەکان لەگەڵ حکومەتی عێراق بەرەوپێش ببەن ، بارزانی بێزاری و نارەزایی خۆی دەربڕیوە لایان ، چونکە حکومەتی عێراقی رێکەوتنەکانی لەگەڵ کوردەکان جێبەجێ ناکات، چوار کەسەکە بەڵێنیان داوە شکایەتەکە بگوازنەوە بۆ بەغداد و بەردەوامی بدەن بەدانوستان ، پاش چەند رۆژێك ٥ زانای تر زیاد کراون بۆ ٤ زاناکە و پێشتر لیستی ناوەکانیان دراوە بەبارزانی ، بەلام لەهیچیان گومانی نەبووە.

لەو وتارەدا کەدواتر رۆژنامەی "الحیاه"ی لوبنانی بلاویکردەوە لە ٢٤ی تشرینی دوەمی ١٩٧١ سەبارەت بەپرۆسەکە دەڵێت: ((تیرۆرستەکان پرۆسەی راهێنانیان تێپەڕاندوە لەسەردەستی باڵێکی سەربازی کەزانیارییەکی فراوانی هەیە ، و راهێنەرەکان هەڵیانخەڵەتاندون بەوەی کەپاش تەواوبونی پرۆسەکە بەفڕۆکەی هیلیکۆپتەر رزگار دەکرێن)).

((نۆ کەسەکە بە دوو ئۆتۆمبیلی جۆری "تویوتا ستەیشن" وە ئۆتۆمبیلێکی تری جۆری "شۆفرلێت"هاتبوون و بەپشتێنێکی بۆمبڕێژکراو بەکێشی ٢٥ کگم دەستی بەسەردا گیرا ، و چەند موشەکێکی ئامادەکراوە بۆ کارکردن لەبەشی پێشەوەو بەشی دواوەی ئۆتۆمبیلەکە، چەند بۆمبێکی دەستیش ، هەمو ئەم کەل و پەلانە

بۆ لەناوبردنی سەرکردایەتی کوردی بوو لەدوای بارزانی، وە قۆناغی دووەم بریتی بوو لەداگیرکردنێکی لەناکاوی پێگەکانی کوردەکان ، و سوپای عێراقی لەئامادەیی تەواودا بوو بۆپرۆسەکە ، بە هاوکاری هێزی ئاسمانی)).

حکومەتی عێراق زوو ئەو چارەنوسەی بۆدەرکەوت کە بەهۆی ئەو پرۆسەیەوە توشی دەبێت ، بۆیە سەرۆکی عێراق نوێنەرێکی پلەبەرزی خۆی نارد بۆلای بارزانی ئەویش وەزیری معارف "پەروەردەی ئیستا" "دکتۆر احمد عبدالستار عبدالقادر الجوبری" بوو تا پەژارەی خۆی بۆ ڕوداوەکە پێ ڕابگەیەنێت و داوای شیفای خێرای بۆ بکات ، هەروەها لقی هەرێمایەتی حیزبی بەعس دەستی کرد بەبلاوکردنەوەی ڕونکردنەوەیەك پەژارەو خەفەتی خۆی تیدا دەربڕیبوو، لەڕونکردنەوەکەدا هاتبوو : ((ئەنجامدەرانی کارەکە نێردراوی لایەنە پلانگێری وئیمپریالیستەکانن و دەیانەوێ ڕێکەوتننامەی ١١ی ئازار لەکەدار بکەن)).

بە بارزانی وترا کە لیژنەیەکی تایبەت پێکهێنراوە بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕوداوە ناخۆشە بەسەرۆکایەتی جێگری وەزیری ناوخۆ و ئەندامیەتی دادوەری سلێمانی و دادوەرێك لە بەغداد و بەڕێوەبەری ئاسایشی هەولێر و شارەزایەکی تەقەمەنی، بارزانی سوپاسی هیواخواستنی ئەوانی کرد بۆ تەندروستی خۆی ، بەلام بە یەك وشەی کە پێیوترا باوەڕی نەکرد ، جەختی لەوەکردەوەکە هەمو بەلگەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە پیاوکوژەکان لە بەغدادەوە هاتون.

وە لەڕیگادا بەو ئۆتۆمبیلانەیانەوە کەئامێری کاولکەر و تەقینەوەی تێدابووە دەیەها بەربەست و خالی پشکنینیان بڕیوە ، بەلام سەرەرای ئەوە ئێمە کاری پشکنین بۆ نوێنەرانی دەولەت بە جێدەهلێن لە هەولێر و سلێمانی)).

لیژنەی لێکۆلینەوە نەگەیشت بەهیچ دەرەنجامێك و هیچ ڕاستیەکی ئاشکرا نەکرد بەلکو تەنها لەناو چەند خەملاندنێکدا دەخولایەوە، سەبارەت بەهۆکارەکانی ڕوداوەکە ، کە لەوانەیە هۆکارەکەی لە زەمینەی ناکۆکیە نێوخۆییەکانی عێراقدا بێت یا لەوانەیە "صدام حسین" وایزانی بێ کە ڕێکەوتننامەی ١١ی ئازار چیتر

خزمەت بەئامانجەکانی ناکات ، بۆیە هەوڵی داوە هەمو سەرکردەکانی یاخیبونی کورد بکوژێت ، دەستبەجێ هێرش بکاتە سەر کوردستان.

رۆژنامەیەکی بەیروتی کە بە ئینگلیزی دەردەچێت بەناوی "النهار عرب ریپۆرت" لەژمارەی رۆژی ١١ی تشرینی یەکەمی ١٩٨١ وتویەتی "صدام حسین" لەم کارەدا "عوبیدولا"ی کوڕی بارزانی تێوەگلاند کەرۆحی هاندەری جێبەجێکردنی کارەکە بوو، کارەکە دەیویست چەند ئامانجێك بەدی بهێنێت لەوانە لەناوبردنی چەند کەسایەتیەکی رژێمی عێراقی کە "صدام حسین" حەزی بە چارەیان نەبوو، تۆمارکردنی دەستکەوتێك بۆ سوپای عێراق لە رێگای تیرۆر کردنی بارزانیەوە ، لەدڵی ناوچە کوردیەکاندا ، بەم شێوەیە بارزانی هیچ گومانی لەوە نەما کە (.....................)کە بە ئەندازیاری ئۆتۆنۆمی ناونرابوو لێیان هەڵگەڕاوەتەوە.

*** **************** ***

لەپاش هیوبونەوەی خۆی بەهۆی پرۆسەی تیرۆرکردنەوەکەوە بارزانی ویستی لەگەڵ "زامیر" کۆببیتەوە تادەربارەی بەردەوامی پەیوەندی لەگەڵ عێراق ڕاویژی پێ بکات، ئەوەبو کوڕەکانی و دکتۆرمەحمود و نزیکەکانی بانگکرد بۆ کۆبونەوە، لەگەڵ "زامیر" تا بەڕاشکاوی ڕای خۆیان بڵێن، بەڵام کەسیان پێشنیاری ڕاگرتنی گفتوگۆ و قسەکردن بەزمانی گوللەیان نەکرد.

پاش ئەوە بارزانی پرسیاری لە"زامیر" کرد سەبارەت بەڕای ئەو "زامیر"وتی: ((ئەوەی کەپێویستە بیکەین ئەوەیە کە لە بەرژەوەندی خۆتاندایە و نەبن بەپاشکۆی عێراقیەکان ، لەبەرئەوەی ئەو ڕوداوەی کە ڕویدا ، دەستپێشخەرییەکی عێراقیە ، نابێت ئەم پرۆسەیە هۆکارێك بێت وابکات ، کەبڕیارێکی گشتی بدرێت)) ، ئەمە ئەو قسەیەبوو کەبارزانی دەیویست گوێی لێ بێت، بۆیە بە ئامادەبوانی وت: ((چاك گوێ بۆ ڕای میوانەکە ڕادێرن)).

* ****************** *

لەگێرانەوەیەکی تردا بارزانی لە بەردەم "تسوری"دا کە لەسەر ئەو کورسیە دانیشتبوو کە خەریك بوو ئەم گیان بدات لەسەری دەڵێت: ((لەسەر ئەو کورسیە دانیشتبوم تەماشای پشتینەکەی بکە کە بچڕاوە، ئەو خوێنەی کە دەیبینت ئەوە خوینی ئەو پیاوە ئاینیەیە کە بۆمبەکانی پێ بوو ، ئەم وەسفەی بارزانی بۆ ڕوداوەکە ، وایکرد تسوری جەخت لەوە بکاتەوە کە هەڵەیەك ڕویداوە وایکردوە کە تەقینەوەکە بەر لەکاتی دیاریکراو ڕوبدات ، پێدەچێت هەمو زانا ئاینیەکانی تریش ئامێر تۆمارکەری مینرێژکراویان پێ بوبێت بەبێ ئەوەی بزانن، ئەوئامێرانەش لەکاتێکی دیاریکراودا ، دەتەقینەوە یان لە دورەوە بەو ئۆتۆمبیلانە دەتەقینرانەوە کە لە دەرەوە ڕاگیرابون.

ڕاستی هەرچۆنیك بێت دەوربەرەکەی بارزانی هەوڵیاندا کە وەڵامی ڕوداوەکە بەڕوداوێکی هاوشێوە دژی "صدام حسین" بدەنەوە تا پرۆسەکەیان سەربگرێت و ئامانجەکەی بپێکێت ، بەڵام پلانەکەیان جێ بەجێ نەکرا.

* ******************** *

بارزانی زۆر باش گوێی بۆ ئەو دەنگانە دەگرت کە لە بەغدادەوە هاتبون، وەئەو دەنگانە جەختیان لەوە دەکردەوە کە بڕوانامەیەکی نوێ خەریکی ئامادەدەکرێ ، تێکست دەکات لەسەرڕاگرتنی ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار لە تشرینی دوەمی ١٩٧١ دا.

لەو نامەیەدا کە بارزانی بۆ سەرۆکی عێراقی نارد ، و ڕۆژنامەی "النهار"ی لوبنانی بڵاویکردۆتەوە سەرۆکی عێراقی بەپێشیلکردنی ڕێکەوتنامەکە تۆمەتبارکردوە و هەموو بەندەکانی لەسەر دیوارەکە فڕێداوە ، و شوێنی کورد لەحکومەتی عێراقی پێچەوانەی ئەو بەڵێنانەیە کەپێیان دراوە، و جێ پێیەکی ڕاستەقینەیان لە سەرکردایەتی سوپادا پێ نەدراوە)).

لەوەڵامی بارزانی دا "بەکر" لەوکۆنگرە ڕۆژنامەوانیەی بۆی سازکرابوو ، تۆپەکەی هەڵدایەوە گۆڕەپانی بارزانی و تۆمەتباری کرد بەئاڵۆزکردن و تێکدانی پەیوەندی نێوان کوردەکان و عێراق و ئامازەی بەوەدا کەهەر لایەنێك بیەوێت پەل بهاوێژێت

له ڕیزکانی سوپای عێراقیدا بۆ پڕۆپاگەندەکردن و هاندانی دژایەتی ئەوە توشی شکستێکی گەورە دەبێتەوە.

بارزانی وتی: ((کە زۆر بەڵگەهەن ئاماژە بەوە دەکەن کەحکومەتی عێراقی دەستی کردوە بە کۆکردنەوەی هێزەکانی بۆ درێژەدان بە هێرشەکانی بۆسەرکوردەکان ، ئەمە لەکاتێکدا عێراقیەکان جەختیان لەوەدەکردەوە کەسیاسەتی ئەوان بەرامبەر بەکوردەکان ڕوو لەدانوستانە، لەکاتێکدا سیاسەتی ئەوان بەرامبەر ئێران بەرەو ڕوبەڕوبونەوە دەچێت.

له ۳۰ی تشرینی دوەمدا ئێران دەستی بەسەر سێ دورگەدا گرت کە دەکەونەسەر دەرچەکانی کەنداو، ئەمەش پێگەیەکی کونترۆڵی ستراتیژی پێ بەخشی، عێراق بۆی دەرکەوت کە هەمو لایەنەکان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیش هیچ گرنگیەك بەو هەنگاوە دوژمنکارانە نادەن، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوەیە، ئەمریکا دەستی کرد بە پاڵپشتی کردنی ئێران و پێشکەشکردنی چەك وتەقەمەنی پێی، هەروەها وڵاتە عەرەبیەکان وەڵامی داواکاری و هاوارەکانی عێراقیان نەدایەوە ، کەداوای وەڵامدانەوەی هەنگاوەکانی ئێرانیەکانیان دەکرد.

لە١ی کانونی یەکەمی ۱۹۷۱ عێراق پەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی لەگەڵ ئێراندا بڕی و ئێرانیەکانیش هەمان هەنگاویان گرتە بەر ، وەزیری دەرەوەی ئێران وتی: ((ئێمە هەتا ئێستا هاوکاری سەربازی کوردەکانمان نەکردوە ، بەڵام ئێمە ئەوە دەکەین ئەگەر جەنگێکی ئاشکرامان لەدژ بکرێت)).

بارزانی ئەمریکای بەو چارەنوسە دادەنا کەهەوڵی بۆ دەدا، تا هەموو کێشەکانی بۆ چارەسەر بکات، ویستی وەزیری بەرگری ئیسرائیل "موشێ دەیان" بکات بەنێوەند لە ۲ی شوباتی ۱۹۷۱ نامەیەکی بۆ نارد کە تێیدا هاتوە : ((گومان لەوەدانیە کە جەنابت ئاگاداری هەڵوێستی ئەمریکایت بەرامبەر بەدۆسیەی کورد ، وە شوینی ئەو کێشەیە لەسیاسەتی ئەمریکا لەخۆرهەڵاتی نافین دا زۆر بەداخەوەم کە ئەو هەڵویستە هیچ نەگۆڕاوەو باوەڕ ناکەم بەم نزیکانەش گۆڕانکاری بەسەردا بێت)).

"دەيان" لەڕێی سەرچاوەکانیەوە دەیزانی کەئەمریکا لە ئیمکانیەتی پێشکەش کردنی هاریکاری بە کوردەکان دەکۆڵێتەوە بەڵام وای نەکرد ، لەهەمان کات دەیان بڕیاری دا بەردەوام بێت لەهاوکاری کردنیان، بەنامەیەك وەڵامی بارزانی دایەوە کە تێیدا هاتوە : ((من دڵنیام کە نوێنەرەکانمان پەیوەندیان پێتەوە هەیە، وە ئاگاداری سروشتی ئەو کێشانەن کە توشی بوویت، ئێمە سورین لەسەر ئەو هەڵویستانەمان کەجەخت دەکەنەوە لەسەر پێشکەش کردنی هاریکاری پێتان لە چرکەساتە سەخت و کاتی نارەحەتیدا)).

لەگەڵ ئەوەشدا (دەیان) هەستا بە ناردنی چوار تۆپهاویژی ۲۰ ملم لەگەڵ راهێنەرێکدا ، بەڵام تۆپهاویژەکان درەنگ گەیشتنە ئامانج بەهۆی کەڵەکەبونی بەفرەوە ، چەند شاندێك هاتن لە لایەن "حکومەتی سۆڤیەت"ەوە لەمانگی ئازاری ۱۹۷۲ بۆ لای بارزانی ، "یەکیتی سۆڤیەت" ئەوکات هەوڵی دەدا کە پەیمانامەی دۆستایەتی لەگەڵ عێراق مۆربکات ، وە دەیزانی کە خەباتی کورد رێگرە لەکۆششەکانی ، کوردەکان هەواڵی دانوستانەکانیان بۆ مۆرکردنی ئەو پەیمانامە دۆستانەیە بیستبوو ، دەیانویست نهێنیەکانی بزانن بەر لەئیمزاکردنی.

ئیسرائیلیەکان لەهۆکاری راستەقینە دەگەڕان کە وا لەسۆڤیەت دەکات ،دڵی کوردەکان ڕابگرێت لەپاش ئەو کۆبونەوە نهێنیەی کە لەنوسینگەی سەرۆکی حکومەت سازکرا، بڕیاردرا سەرنجی ئەمریکا ڕابکێشرێت بۆ ئەگەری دەستتێوەردانی سۆڤیەت.

ئیسرائیلیەکان دەستیان کرد بە هەوڵدان بۆ ڕازیکردنی بارزانی تا دڵ ڕاگرتنەکانی سۆڤیەت وەلا بنێت.

لە ۳۱ ی ئازار کەسایەتیەکی پلەبەرزی ئیسرائیلی هەڵویستی خۆی بەم شێوەیە بەبارزانی ڕاگەیاند: ((ڕووتێکردنی سۆڤیەت لەتۆ تەنها هەڕەشەیەکە بۆخزمەتی بەرژەوەندیەکانی سۆڤیەت، سۆڤیەت دەیەوێت جێ پێیەکی دەست بکەوێت بۆ بەشداری کردن لەیاری نێوخۆیی عێراق، جگەلەوە هەرووجودێکی سۆڤیەت

دەبێتە هۆی لاوازکردنی هێز و خەباتی ئێوە . دەگونجێ گرنگی پێدانی سۆڤیەت بەئێوە ببێتەهۆی گرنگی پێدانی زیاتری ئەمریکا بە دۆسیەکەتان، ئەوە ئەگەر لە بەرامبەر ئەو کۆششە سیاسیە خۆتان ڕاگرت، وەك چۆن تا ئەمرۆ خۆتان ڕاگرتوە، هیچ گومانێکمان لەوەنیە کەئەمە تاقیکردنەوەیەکی ڕاستەقینەیە بۆتۆو سەرکردایەتیەکەت و بۆبزوتنەوەی یاخیبونی کوردیش بە گشتی، ئێمە لەو کاتەوەی کە بەو ئازارانەمان زانیوە کە توشتان بوە لەگەڵ ئێوەدا وەستاوین و بەتایبەت لەڕۆژانی جەنگە سەختەکاندان ئومیدمان وایە هاوکاریەکانی ئێمە و ئەو چەکانەی ئیمە پیمان داون و ئەو ڕاهێنانەی ئێمە پێمان کردوون ببنەهۆی سەرکەوتنی خەباتە سەربازیەکەتان ، ئەو خەباتەی کە ئەو سوپایەی توشی شکست کرد، کە هەوڵی دەدا لەناوتان بەرێت.

کەسایەتیە پلەبەرزەکە بەردەوام دەبێت : ((ئەوەی کە لە ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازار بەدەست هات لەئەنجامی خەباتە بەردەوامەکەتان بوو، سەرەڕای ئەوەی کەدوژمن دانی نەنا بەبونی ئەو میللەتە سەربەخۆیە، سەرەڕای سنورداری سەربەخۆیەکەش)).

((ئیسرائیل کەهێشتا ساوایە بەرامبەر ئەمریکا و یەکیتی سۆڤیەتیش ڕاوەستاوەتەوە ، ئەو گەلە بچوکانەی کە سورن لەسەر خەبات توانای ڕوبەڕو بونەوەی ناخۆشیەکانیان هەیە)).

نوسەرەکە مژدەی بە بارزانی داوە : ((حکومەتی ئیسرائیل جگە لە هەڵویست و هاریکاریەکەی بۆئێوە و بۆگەلەکەتان توانای خۆی بەکاردەهێنێت تا لای ئەمریکا و لایەنی تریش گرنگی پێدانی ئەوان بەوە زیاد بکات کە لە وڵاتەکەی ئێوەدا دەگوزەرێت، دەبێت جەخت لەوەبکەینەوە کە ئەم ئەرکە ئاسان نیەو کاتی زۆری گەرەکە، سەرەڕای ئەوە ئێمە لەگەڵ ئێوەداین بڕیارتان هەرچیەك بێت بەپێی بەرژەوەندیەکانتان ، باوەڕمان وایە بەرژەوەندی هەردوگەل وادەخوازێت)).

له ٩ی نیسانی ١٩٧٢ یەکیتی سۆڤیەت و عێراق ڕێکەتنامەیەتی دۆستایەتیان مۆرکرد، کوردەکان لەڕاگەیاندنەوە ئەو هەوالانەیان بیست داخوازی زانینی پوختەی ڕێکەتنەکەبوون بەرلە ڕاگەیاندنی بەلام ڕەتکرایەوە ، سەرەڕای ئەوە سۆڤیەت بەڵێنی به وەزیرە کوردەکانی حکومەت دا، کە کێشە کورد لای حکومەتی عێراق دەخاتە ڕوو.

بەلام ئەم خستنە ڕوە هیچ سودێکی نەبو، بارزانی ڕێکەوتنامەکەی بە دژایەتی خۆی لە قەڵەم دا.

لەو دیدارەدا کە لە ٢١ی نیسان لەگەڵ رۆژنامەی"لۆفیگارۆ"ی فەرەنسی ئەنجامی دا وتی: ((نزیکایەتی عێراق و سۆڤیەت لەسەر حسابی ئێمەیە، ئەو چەکە زۆرەی سۆڤیەت دەیدا بەعێراق دژی ئێران بەکارنایە کەپەیوەندی توندو تۆڵی لەگەڵ سۆڤیەت هەیە، و دژی ئیسرائیلیەکانیش بەکارنایەت کە هەرگیز بەغداد هێرشیان ناکاتەسەر ، سەرەڕای لێدوانەکانی لەوبارەیەوە ، عێراقیەکان ئەو چەکانە دژی ئێمە بەکاردەهێنن)).

له لێدوانێکدا لەسەر ڕیکەوتننامەکە "وانلی" وتی: ((ئەو ڕێکەوتننامەیە وایکرد کوردەکان بەپێوە وەستابن و پشتیان لە دیوارەکە بێت)).

## بەشی بیست وچوار / نامەیەکی نهێنی لە "شا"وە بۆ عێراق

لە ٣٠ ئایاری ١٩٧٢ پاش مانگێك لەمۆرکردنی ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی سۆڤیەت – عێراق ، "شا" لەگەڵ سەرۆکی ئەمریکا "ریچارد نیکسۆن" کۆبوەوە ، ڕێکەوتننامەی هاوکاری "عیراقی – سۆڤیەتی" بەجوڵەی "کەماشا = گاز"[1]ێك وەسفکرا بۆ ئابلۆقەدانی ئێران لەباکور و ڕۆژئاواوە بەتایبەت کەڕێکەتنەکە چەکدارکردنێکی گەورەی عێراقی لەلایەن سۆڤیەتەوە لەخۆدەگرێت.

لە٩ی نیسانی ١٩٧٢ ڕادیۆی تاران ئاماژەیەکی دوانەیی بۆ بەغداد نارد کە ڕژێمی عێراق ئامادەنیە بۆجەنگ بەڵام ئەگەر "صدام" باس لەجەنگ دەکات هیچ کێشەیەك نیە لەسزادانی لایەنگرانی دا ، لەبەرامبەر هەڕەشەکەی سۆڤیەتدا "شا"بینی کەپێویستە پاڵپشتی ئەمریکا بۆخۆی بەدەست بهێنێت، بێگومان هاوپەیمانی لە نێوانیاندا بەهێزبوو ، سەردانەکەی بۆ "واشنتن" بۆ بەهێزکردنی زیاتر بوو ، "شا" هیچ چارەیەکی لەبەردەمدانەمایەوە ، جگە لەدروستکردنی هێزێکی بەرگری و هێرشبەر کەتوانای ڕوبەرووبونەوەی ئەگەری هێرشی سۆڤیەتی هەبێت ، هەتا ئەمریکیەکان دێنەناوەوە.

لەوکتێبەدا کە "هێنری کیسنجەر" لەژێر ناونیشانی "ساڵەکانم لە کۆشکی سپیدا" نوسیویەتی دەڵی: (("شا" هەوڵی دا پشتگیری ئێمە دەستەبەر بکات تەنها بە دەرخستنی پێویستی زۆری وڵاتەکەی بە پارێزگاری و پاراستن و خستنەڕووی ڕادەی گرنگی ئێران بۆ ئەمریکا ، لەسەرئاستی ستراتیژی ، بەڵکو لەڕێگەی وەستان شانبەشانی ئێمەو پیشاندانی دۆستایەتی لەکاتێکدا کە ئێمە دەمانتوانی ڕۆڵی تەماشاکار ببینین، لەژێرسەرکردایەتی "شا" ئەو پردە وشکانیەی کە ئاسیا بە ئەوروپا دەبەستێتەوە ئەو پێگەیەی کە لەمێژوی جیهاندا زۆر جێی باس بووە لایەنگر و ژێردەستی ئەمریکیەکان دەبوو بەبێ هیچ گومانێك)).

---

[1] الکماشا ، دو ئامێر هەیە گاز کە بۆ هەلگەندنی بزمار بەکاردێت و هەر چوار دەوری دەگری و ڕایدەکێشی . وە کەشا یان خرناشە کە بۆ پاککردنەوەی کێلگە لە وردە بەرد بەکاردێت وەك خاکەناز درێژە. –وەرگێر–

((جگه له"ئیسرائیل"یش، ئێران تاکه وولآت بوو لەناوچەکەدا، که دۆستایەتی لەگەڵ ئەمریکا خاڵی وەرچەرخانی سیاسەتە دەرەکیەکانی بوو ، جگه لەوەی کەبینشی "شا" بۆکێشە سیاسیەکانی جیهان زۆر لەگەڵ بینشی ئەمریکادا یەکی دەگرتەوە)).

((ئێران لەژێردەسەلآتی "شا"دا یەکێ لەباشترین هاورێکانی ئەمریکا بوو، لەهەموشیان دڵسۆزتر ۆ گرنگتر بوو ، لەسەر ئەو بنەمایە فەرمان بەوەزارەتی بەرگری کرا ، کەئێران هەرجۆرە چەکێکی دەوێت پێی بدرێت ،جگە لەچەکی ئەتۆمی)).

** ******************** **

هەر لەدیداری "شا"و سەرۆکی ئەمریکایدا دەستپێشخەریەکی نوێ خرایە ڕوو، پێشکەشکردنی چەك بەیاخیبوە کوردەکان بەوەی ئەم جۆرە هاوکارییە دەتوانێت گورزێکی قورس لەعێرایەکان بدات ، بەبێ ئەوەی لەگەڵیدا بکەونە شەڕێکی ڕاستەوخۆوە ، یان توشی هاندان و پەلگرتنی کوردە ئێرانیەکان و عەرەبەکانی "خوزستان" ببن.

سەرۆکی ئەمریکا و کیسنجەر دەستبەجێ ڕازیبونیان دەرنەبڕی جەختیان لەوەکردەوە کەسەرەتا لێیدەکۆڵنەوە ، سەرۆك چەند لایەنێکی ئەمریکی ڕاسپارد تا لێکۆڵینەوە لەدۆسیەکە بکەن ، کە لە کۆتاییدا گەیشتنە دەرەنجامێك کەبەلگەنامەیەکی ناوازەی لێ لەدایکبوو ، ئەو بەلگەنامەیەی کە لەڕاپۆرتی لیژنەی کاروباری هەواڵگری سەر بەکۆشکی سپی خرایە ڕوو، لە ١٩ی کانونی دووەمی ١٩٧٦ کە زریانێکی گەورەی لە"کۆشکی سپی" و "کۆنگرێس" پەیداکرد ، سەرۆکایەتی لیژنەکە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران "ئۆتیس بییگ" دەیکرد.

بەلگەنامەکە لە ٣٣٨ لاپەڕەپێك هاتبو وە ناوەڕۆکەکەی بەزوویی دزەی کرد ، هەرچەندە داواکرابوو بەنهێنی بهێلرێتەوە.

بەلگەنامەکە کە بەشەسەرەکیەکانی لەرۆژنامەی "فێلگ فایس"ی ئەمریکایدا بلاوکرایەوە لەرێکەوتی ٢٦ی کانونی دووەمی ١٩٧٦ باس لە(هاوپەیمانیەکەمان "ئیران") و دوژمنەکانی هاوپەیمانەکەمان "عێراق" و گروپی ئەتنی "کورد"دەکات.

بەلگەنامەکە ئەوە دەدرکێنێت کە دۆسیەی کورد بەرلەوەی کە "شا" بیخاتەڕوو لەلایەن "واشنتن"ەوە چارەسەرکراوە لەمانگی ئابی ١٩٧١ خراوەتەڕوو لەئازاری ١٩٧٢ "کیسنجەر" بۆجاری دوەم لەگەلْ کارمەندێکی بالاّی وەزارەتی دەرەوە تاوتوێی کردوە ڕێکەوتون لەسەردواخستنی چارەسەرەکەی لەوکاتەدا هۆکارەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وەك لەبەلگەنامەکەدا هاتوە "نامانەوێت دەست تێوەردەین لەدرێژکردنەوەی تەمەنی یاخیبونەکەدا ئەگەر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێت کەهانی ئارەزوی جیابونەوە بدات، وە هەلی هەمان شت بۆ یەکیتی سۆفیەت بڕەخسێنێت کە هەمان کار دژی دوو هاوپەیمانەکەمان ئێران و ئیسرائیل ئەنجام بدەن".

بەلگەنامەکە زۆر لەوقسانەی کردوە کەبالْویزی ئەمریکا گەیاندونی بەتاران ، کە دژایەتی هاوکاری کوردەکان دەکات ، و دەلْێت: ((ئەوەم پێ باش نیە تەنها هۆکاری سیاسی "ڕق بە ڕق هەبێت" من ئاگام لێی نەبێت دەمەوێت لەم حالْەتە ئاماژە بەوەبکەم کە هاوکاری ئێمەش لەئێستا و پاشان پاشگەزبونەوەمان شیکار و شیکردنەوەی نادروست هەلْدەگرێت کەکاردەکاتە سەرپەیوەندیەکانمان لەگەلْ ئێران بەشێوەیەکی سلبی)).

"کیسنجەر" لەکتێبەکەیدا دەلْێت: ((بەلاّم دوومانگ تێ نەپەڕی کە "نیکسۆن" ڕازیبوو بەهاوکاریکردنی "شا" لەپێدانی هاوکاری و پالْپشتی بۆ مافی خۆبەڕێوەبەری کوردەکان لەعێراقدا لەگەلْ ئەوپەڕی نهێنیپارێزی لەناو حکومەتی ئەمریکی دا ، بەلاّم لیژنەی "چلەمین" کەلیژنەی نهێنی پەیوەندیدار

بەئاسایشی نەتەوەیی یەوەیە بڕیار لەسەر هەموو پرۆسە نهێنیەکان دەدات، خۆی لەبەردەم ڕاستیە ئامادەکراوەکاندا دیتەوە.
دەرکەوت کەکۆشکی سپی لە دزەکردنی ئەو زانیاریانە ناترسێ کە لەوانەیە زیان بە ئێرانیەکان بگەیەنێت، بەڵکو سووربوو لەسەر دزەکردنی زانیاریەکان بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی ، کەدژایەتی ئەو سەرکێشیانەی دەکرد لەناوچەکەدا ، داوا لەئەندامانی لیژنەکە کرا کە ئیمزا لەسەر ووشە سەرەتاییەکانی بەڵگەنامەکە بکەن، تەنانەت ئەو هەڵسەنگاندنانەی کە کۆشکی سپی داوای لەهەوالگری ئەمریکی کرد، دایان نابێت، و پەیوەندی نەبوو بەوەوە کە ئایا ئەتوانرێت بکرێت؟ بەڵکو بەوەوە کە "چۆن ئەنجام بدرێت؟".
بەرلەوەی لیژنەکە بەڵگەنامەکە پەسەند بکات سەرۆك "نیکسۆن" نێردراوێکی تایبەتی نارد بۆلای "شا" تا ڕازیبونی داواکاریەکەی سەبارەت بەهاریکاریکردنی کوردەکان پێ ڕابگەیەنێت، ئەو نێردراوەش تەنها و تەنها "جۆن کۆلی" سکرتێری وەزارەتی دارایی پێشوو بوو ، سەرۆك خەریك بوو لەئەرکێکی بەرزدا دایبنێ تا سەرکردایەتی هەڵمەتی بانگەشەی سەرۆکایەتی بکات ، ئەمەش ئاستی ئەو گرنگی پێدانەی پیشان دەددا، کە "نیکسۆن" بە مەسەلەکەی دەدا.

** ** **************** ** **

بڵێی ئەو هۆکارانە چی بووبێت کە وای لەئەمریکا کرد وەڵامی داخوازیەکەی "شا" بداتەوە ، هەرچەندە پێشتر ڕەتیکردبوەوە ، "بێیك" لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێت: ((هۆکارەکە تەنها ئارەزووی ئەوەبوو کەچاکەیەك لەگەڵ هاوپەیمانەکەمان ئێران بکات، کەهاوکاری هەوالگری ئەمریکایی دەکرد، وە ئیستا هەست دەکات کەتوشی هەڕەشە بووە لەلایەن عێراقەوە)).
لەپاش بڕیارەکەی ئەمریکا بارزانی بانگکرا بۆ کۆبونەوە لەگەڵ "شا" کە لەدیدارەکە هاتە دەرەوە زۆر دڵخۆش و ڕازی دیاربوو، وە لەحوزەیرانی ١٩٧٢ دا

شاندێکی کوردی بەدەستپێشخەری ئەمریکا ڕویان لەوێ کرد، بەئامانجی تاتوێکردنی چییەتی ئەو هاوکاریانەی کە کوردەکان حەوجێیان پێیەتی)).
لەڕێگایاندا بەرەوە ئەمریکا شاندەکە لە ئیسرائیل وەستا ، وە "ئیدریس" و "دکتۆرمەحمود" داوایان لە ئیسرائیلیەکان کرد ئامۆژگاری و پێشنیاری خۆیانیان پێ بلێن.
لە١٩ی کانونی یەکەمی ١٩٧٧ ڕۆژنامەنوسی ناوداری ئەمریکایی "ولیەم سافیر" لەڕۆژنامەی "نیۆرك تایمز" پەردەی لەسەر ئەوە هەڵدایەوە کەئەندامانی شاندەکە لەگەڵ سەرۆکی هەواڵگری ئەمریکی "سی ئای ئەی" "ڕیچارد هۆڵمز" و عقید "ڕیچارد کەنەدی" یاریدەدەری (کیسنجەر) لە کۆشکی سپی کۆبونەتەوە.
ئەمریکیەکان داخوازیەکانی کوردەکانیان بەهاوسۆزیەکی زۆرەوە پێشوازی لێ کردوە ، و بەڵێنیان پێداون کە لەچەکی سۆفیەت کە دەستیان کەوتوە بەبڕی ٥ ملیۆن دۆلار هاوکاریان بکەن ، لە کۆتاییدا بەئەندامانی شاندەکە وترا کەنابێت ناوەڕۆکی ئەو دیدارەی کەباسکرا بۆ ئیسرائیلیەکان بگێڕنەوە کاتێك کە ئەندامانی شاندەکە جەختیان لەوەدەکردەوە کە ناتوانن زانیاریەکان لەسەرۆکی مۆسادی ئیسرائیلی بشارنەوە، ئەمریکیەکان لەهەڵویستەکەیان پەشیمان بونەوە، و ئامێریکی پەیوەندی نوێیان بە"ئیدریس" بەخشی و کەل و پەلی پزیشکیش بە "دکتۆر مەحمود".
"شا" دواتر پەیمانی دا بەکوردەکان کە ئەگەر ئەمریکیەکان وەفایان بۆبەڵێنەکەیان نەبێت کەدابویان تاپارەی پێویستیان بدەنێ، ئەوە شا خۆی پیداویستیەکانیان بۆ جێبەجێ دەکات.

* ** ******************** ** *

لە١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ عێراقیەکان ٥٥ بیرەنەوتەکەی کەرکوکیان خۆماڵی کرد ، کە لەکەرکوك و دەوروبەری بون کوردەکان نەیانتوانی نارەزایی لەسەر ئەوهەنگاوە دەربڕن کە تێکستی دەکردەوە لەسەرلێسەندنەوەی سەرچاوەی سروشتی، گرنگ

لەچەند کۆمپانیایەکی تایبەت، بەڵام لێسەندنەوەکە کە مافی دەستپێگەیشتنیانی بەبەشێك لە قازانجی نەوت لێ سەندەوە، چونکە ئیستا ڕاستەوخۆ دەچوە نێوخەزێنەی گشتی دەوڵەتەوە.

لەپاش خۆماڵی کردنەکە ڕوداوی تێکدەرانەی خویناوی ڕوویان دا، هێزی ئاسمانی عێراقی بۆردومانی چەند گوندێکی کوردی کرد لەهەمان کاتدا عێراقیەکان وازیان لەهەوڵەکانیان نەهێنا بۆ تیرۆرکردنی بارزانی.

سەرچاوەیەکی کوردی دەڵێت: ((کەسێك هات بۆ بارەگای بارزانی لە ڕێکەوتی ١٥ی تەموزی ١٩٧٢ وتی کە من پەیامنێری "ئاژانسی دەنگوباسی عێراقی"م هەوڵی دا کە لەکاتی ئەو دیدارەدا کە لەگەڵی ئەنجامی دا تیرۆری بکات، کاتێکیش دەستگیرکرا لەکاتی لێکۆڵینەوەدا دانی بەوەدا نا کە وەزیری ناوخۆ و بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی لە وەزارەتی ناوخۆی عێراقی ناردویانە بۆ تیرۆرکردنی بارزانی.

"محمد حبيب كريم"ئەو پیاوە کە بەپیاوی دوەمی پارتی دادەنرا لەدوای بارزانی ، کە ئومێدی لەمافی ئۆتۆنۆمی زیاتری بۆ کورد هەبوو، یان بە مانا ڕاستەقینەکەی دەوڵەتێك بۆ کوردەکان ، لە خاکی عێراقیەوە دریژدەبێتەوە بۆ خاکی کورد لەسوریا و ئێران وتورکیا، و ١١ ملیۆن کورد لەخۆبگرێت، لەچاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی "اخبار اليوم"ی میسری لە٢٦ی ئابی ١٩٧٢ دەڵێت: ((هیچ شتێك نەماوەتەوە لەپەیوەندی نێوان کوردەکان عێراقیەکان، وە ژمارەیەکی زۆر لەبەندەکانی ڕیکەوتننامەی ١١ی ئازار عێراق جێبەجێی نەکردون، و پێچەوانەیان جوڵاوەتەوە ، لەوانە بەعەرەبکردنی ناوچەکوردیەکان ، و هەوڵدان بۆ تیرۆرکردنی بارزانی "ئیدریس"ی کوڕی، و هیچ نوێنەرێکی کورد دانەنراوە لەسەرۆکایەتی ئەنجومەنی شۆڕش و حکومەت و هەیئەی ئەرکانی گشتی بۆ دەزگا ئەمنیەکان، و ڕۆڵ و پێگەی کورد لەو ڕێکەوتننامانەی عێراق لەگەڵ وڵاتانی تر ئەنجامی دەدات پشت گوێ خراوە.

لەوەڵامدانەوەی دا "صدام حسين" بەڕۆژنامە میسریەکەی وت :

(( عێراق نزیکەی ٩٠٪ ی ڕێکەوتننامەکەی جێبەجێ کردوە، وە لە ١٠٪ کەی تریشی دواتر جێبەجێ دەکرێت)).

لە١٣ی ئابدا کوردەکان وتیان کەعێراق بۆردومانی گوندە کوردیەکان دەکات بەفڕۆکەو دەیانڕوخێنێت، و دانیشتوان ڕادەگوێزێت و عەرەب لەوگوندانەدا نیشتەجێ دەکات، وە لەو دیدارانەدا کەبارزانی لەگەڵ ئەو پەیامنێرانەدا ئەنجامی داوە کە سەردانی بارەگاکەیان کردوە : دەردەکەوێت کەبارزانی خەریکە ئامادەکاری پێویست دەکات بۆدرێژەدان بەجەنگ.

"یەکێتی سۆڤیەت" لەهەوڵەکانی خۆی بەردەوام بوو بۆ نێوەندگیری لەنێوان کوردەکان و عێراقدا و لە١٩ی ئابدا لەسەرداوەتی سەرکردەکانی سۆڤیەت دوو بەرپرسی باڵای کورد سەردانی "مۆسکۆ"یان کرد کە یەکێکیان "سامی" بوئەوکەسەی کە بەرپرسی گورزوەشاندن بوو ، لە کێڵگە نەوتیەکانی کەرکوك، و لە ڕێکەوتنامەی ١١ی ئازارەوە کرابوو بە وەزیر، لەڕاستی دا داوەت نامەکە بۆ بارزانی هاتبوو ، بەڵام ئەو ڕەتیکردەوە لەبەرئەوەی لەسەرۆکی سۆڤیەت توڕە بوو ، چونکە لەکاتی مۆرکردنی ڕێکەوتن نامەکەدا لەبارەگاکەی خۆی سەردانی نەکردبوو، و لەبەرئەوەی گومانی لەدروستی نیازەکانی سۆڤیەت هەبوو لە پێشکەش کردنی هاریکاری بەکوردەکان ، و لەترسی توڕەکردنی ئەمریکیەکان کە لەوماوەیەدا هاوکاریان بۆ کوردەکان زیادی کردبوو.

سۆڤیەت لە هۆکارێك دەگەڕا بۆ ڕازیکردنی بارزانی بۆیە لەسەر ئەو بنەمایە پلانی ئاڵوگۆڕکاری لەدایکبوو کەتێکست دەکاتەوە لەسەرئەوەی کە سۆڤیەت ئامادەکاری بدات بەعێراق بۆ دروستکردنی کارگە لەناوچە کوردیەکان ، لەبەرامبەر ئەوەدا عێراق نەوتی بداتێ.

ئەم بۆندە کەخرایەنێو ڕێکەوتننامەی ئابوریەوە لەنێوان عێراق و یەکیتی سۆڤیەت بووە هۆی دوبارەدەستپێکردنەوەی گفتوگۆ لە نیوان عێراق و کوردەکاندا، کە ئەمەش بووەهۆی هەڵکردنی گڵۆپی سوور لە"تاران".

"شا" جار لەدوای جار پەیام و ئاماژەی دەدا بەعێراقیەکان کە ئامادەیە گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات، و ئاشتی لەنێوان دوو وڵاتەکەدا بەرقەرار بکات، بەمەرجێك حکومەتی عێراق ڕازی بێت بە هەڵوەشاندنەوەی ئاشکرای ڕێکەوتننامەی کۆنترۆڵی تەواوەتی عێراق بەسەر"شط العرب"دا.
لەو ڕاپۆرتەدا کە ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکایی "سی ئای ئەی" پێشکەشی سەرۆکی وڵاتەکەی کردوە هاتوە کە "شا" پێشنیارەکەی گواستۆتەوە بۆعێراقیەکان لە ڕێگەی وەزیری دەرەوەی وڵاتێکی سێهەمەوە.
بارزانی ئاگاداری هەوڵەکانی "شا" نەبوو ، بەهەمانشێوەش "شا)" هیچی بە "نیکسۆن" و "کیسنجەر" نەوت سەبارەت بەکۆششەکانی.
بارزانی پێی وابو کە کاتەکە زۆر گونجاوە بۆ توندکردنی پێگەکەی لەسەر ئەو بنەمایە داوای لە ئیسرائیل کرد کە لەوتانکانەی کە دەستکەوتی جەنگی ١٩٦٧ بۆی بنێریت وپێی بدات، لەوگفتوگۆیەدا کە لەوبارەیەوە سازکرا، لە١٤ی ئابی ١٩٧٢ لە نوسینگەی وەزیری بەرگری "دەیان" وتی: ((هیچ ڕێگریەکی سیاسی نابینم بۆ پێدانی تانکی جۆری"تی - ٣٤ "بەکوردەکان تاکەترسێك کە هەمانە ئەوەیە کە ئەو تانکانە لەبارودۆخێکی باشدا دانەنرێن و چاککردنەوەیان بەشێوازی تانکی ئیسرائیلی بۆ نەکرێت)).
لە ٢٤ی ئەیلولی ١٩٧٢ "دەیان" فەرمانی دا بەنهێنی ڕاهێنان ، بە سێ دەستەی تانك بەڕێوەبردنی کوردەکان بکرێت، بۆ ئەم مەبەستە "عقید جەدعۆن جۆلەر" ڕاسپێردرا کەلەپاش جەنگی ١٩٦٧ لیوایەکی تایبەت بەتانکی لەدەستکەوتە سۆڤیەتیەکان دروست کردبوو ، پێی وترا کەدەبێت سەردانی کوردستان بکات بۆدیاریکردنی فێرخوازەکانی لەژێرسەرپەرشتی نوێنەری مۆساد، پاشان ٣ تانك لە ئیسرائیلەوە بە ڕێگای دەریایی دەگوازرێنەوە بۆ ئێران و لەوێشەوە بۆ کوردستان.

وابڕیاربوو کوردەکان هێرش بکەنەسەر کەتیبەیەکی عێراقی کە لەنزیك ڕەواندز مۆڵ بووبوون ، بردنی ئەو دەبابانە بۆ پێکهێنانی سرییەیەك بوو.
لەکوردستان "جۆلەر" لەگەڵ بارزانی کۆبوەوە، پاش ئەوەی دیاریەکی لە "کرۆن" وەرگرت ، سروشتی ئەو ڕاهێنانەی بۆ خستەڕوو کەفێری قوتابیەکانی دەکات ، و ئەو هێز و چری ئاگرینەی (الكثافة النيرانية) کە سرییەکی تانك دەیبەخشێت بە تۆپهاوێژی ١٠٠ ملم بەکوردەکان.
پاش ئەوە ئەفسەرە ئیسرائیلیەکە گەشتێکی بەو ناوچانەدا کرد کە شەڕەکانی لێ دەگوزەرێت، چەند پردێکی دیاریکراوی پشکنی تا بزانێت تا چەند توانای هەلگرتنی تانکیان هەیە ، لەگەشتێکی تردا لەشێوازەکانی گەیشتن و هێرشکردنەسەر ئەو هێزە عێراقیەی لە ڕەواندز بو کۆڵیەوە ، و چاودێری هێزەکەی کرد.
"جۆلەر" لە داوی ٢٤ ساڵ دەڵێت : ((ئەو بڕوایەم بۆ دروست بوو کە پردەکان توانای هەلگرتنی تانکیان هەیە و پرۆسەی هێرشبردنیش دەگونجێت)).
"جۆلەر" لەگەڵ قوتابیەکانیدا کۆبوەوە کە سەرکردەکانیان وتبویان ، توانا و کەفائەیەکی هونەری باشیان هەیە، پشکنینی چاوی بۆکردن و لەتوانای جیاکردنەوەی ڕەنگەکانی کۆڵینەوە پاشان گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل و دەستیکرد بەئامادەکاری بۆ دروستکردنی سەربازگەیەکی ڕاهێنان بەهاوکاری دو ڕاهێنەری زرێپۆش کە زمانی عەرەبیان دەزانی.
"جۆلەر" دەڵێ : (( شاگردەکان گەیشتن پاشان بەگەشتێکی ئاسمانی گوازرانەوە بۆ سەربازگەیەکی بیابانی و لەهەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بەئەرکی تانکەوە هەیە ، زانیاریان پێ دراو خوێندیان لەکۆتایی خولەکەشدا ، ڕاهێنراوەکان ئەوەی فێری بووبوون و تواناکانی خۆشیان لەمانۆڕیکی هێرشبردنی نهێنی دا نیشان دا ، کە سەرۆکی هێزی زرێپۆش "ئەبراهام ئایدن" ئامادەی بوو لەگەڵ چەند

ئەفسەریك و نوێنەرەكانی مۆساد ، شاگردەكان بەڕاستی سەلماندیان كە توانا و زیرەكیەكی باشیان هەیە بۆ فێربون و پاش ئەوەی بڕوانامەیان پێ درا، گەڕانەوە بۆ كوردستان بەلام بەبێ ئەوەی هەلی ئەومیان بۆبڕەخسیت كە لەمەیدانی جەنگی ڕاستەقینەدا تواناكانی خۆیان بسەلمێنن، بارودۆخەكە وای لێهات ئیسرائیل نەیتوانی زرێپۆشەكان بنێرێت، و كوردەكانیش هێرشیان نەكردەوە سەر كەتیبەی تانكە عێراقیەكان و هیچیان دەستگیرنەبوو.

** ** ************************ ** **

لە٢٣ی ئەیلولی ١٩٧٢ حیزبی بەعس نامەیەكی نارد بۆ "پارتی دیموكراتی كوردستان" كە زیاتر لەلیستی تۆمەتبار كردن دەچێت لەبەرئەوەی باسی لەوەكردوە كەگوایە كوردەكان پاپەندنەبون بە خاڵەكانی ڕێكەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠وە بەلگەنامەكە جەختی لەسەرئەوە كردۆتەوە كەدەبێت كوردەكان پاپەندبن، بە ڕێنماییەكانیانەوە ، سەرەڕای ئەوەی كە هەڵەیەك لێرە یان لەوێ ڕوبدات ، هەروەها پەنجەی تۆمەتی بۆ كوردەكان ڕاكێشابوو بەوەی لەپەیوەندیەكانیان لەگەڵ ئێرانیەكان بەردەوامن، ئەمەش زیانێكی زۆر بەیەكبوونی نیشتمانی عێراق و سیادەی عێراق دەگەیەنێت، سەرەڕای ئەوە هێشتا عێراق ئامادەیی تەواوی تیدایە ، بۆ بەردەوامبونی گفتوگۆكان.

"پارتی دیموكراتی كورد" وەلامی نامەكەی بەوەدایەوە كە ئامادەیی جێبەجێ كردنی بەندەكانی ترمان تیدایە، بەلام داوای لەسەركارلابردنی وەزیری نێوخۆ و سەرۆكی دەزگاری ئاسایشی كردبوو، كەتێوەگلاون لەو هەوڵە نەزۆكەی كە لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٧٢ بۆ تیرۆر كردنی بارزانی درا، بەلام ڕوداوەكان بەتەواوی جیاواز بون ، بارزانی سەبارەت بەو جیاوازیە لە كانونی یەكەمی ١٩٧٢ بەپەیامنێری ڕۆژنامەی "لۆفیگارۆ" فەرەنسی وت: ((ئەوەی عێراقیەكان دەیڵێن تەنها درۆیە ، كارەكان هەرگیز بە ئاراستەیەكی ماقوڵانەدا ناڕۆن ، بەڵكو بارودۆخەكە زۆر ترسناكە ، حكومەتی عێراق هیچ پلانێكی بۆچارەسەری كێشەكانمان دانەناوە، ئەو

عێراقیانە نیازێکی خراپیان هەیە و ئەگەر لە پەیڕەوکردنی ئەو سیاسەتەیان بەردەوام بن ، ناچار دەبین درێژە بەجەنگ بدەین)).

((دەتوانین ئەو ئاشتیەی ئەوان دەیکەن بەم شێوەیە کۆبکەینەوە : هەوڵدان بۆ تیرۆر کردنی "ئیدریس"ی کوڕم لە بەغداد، هەوڵدان بۆ تیرۆکردنی من لەم شوێنە کە "صدام حسین" ڕێکی خست، دەرکردنی ٤٠ هەزار کورد لە ناویاندا ٨٠٠ کەس لەحیزبەکەی من لەباشور بەتۆمەتی شۆڤاری ِ کردن بۆ ئیران ، و هەڕەشەکردن بە دەرکردنی هەموو کوردەکانی تری سەرسنوری تورکیا بەتۆمەتی جاسوسی کردن بۆ تورکیا)).

((ئەمە لەلایەکەوە لە لایەکی ترەوە سەرەڕای هەموو ئەو بەڵێن و پەیمانانەی پێمان دراون هیچ سەلاحیەتێکمان پێ نەدراوە، یەك کوردێك لە"ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش"دا نیە کە وەك حکومەتی ڕاستەقینە وایە ، نە لە"هەیئەی ئەرکان" و نە لە "وەزارەتی دەرەوە" یان لەهێزەکانی ئاسایش ، پۆلیس ئەم وڵاتە بەڕیوەدەبات بەفەرمانی "صدام حسین" ، وەزیری بەرگری کوشت، "عماش"ی وەزیری ناوخۆی کوشت پاشان جێگری سەرۆکی حکومەت "التکریتی" هەوڵی دا ئەمیش لەناوبەریت ، بەدڵنیایەوە سەرۆك "بەکر"یش دەکوژێت ، دوومانگ لەمەوپێش هیچ خەمێکی نەبوو ، جگە لەناشرینکردنی سوریا و میسر نەبیت، کەچی لەناکاو پێشنیاری یەکگرتن لەگەڵ میسر و سوریا دەکات، ئەو دەڵێت: ئێران دەیەوێت هێرش بکاتە سەرعێراق ، ڕۆژنامەنوسان دەبا بۆسەرسنور تا بەحسابی خۆی سەربازگەگەلی ئێرانی ببینن کە لەوی کۆبونەوتەوە سەرەڕای ئەوەی کە لەوێ هیچ سەربازێکی ئێرانی لێ نیە)).

**** ********************** ****

بارزانی ئاگاداری هەمووشتێك نەبوو ، بۆنمونە نەیدەزانی کە "صدام حسین" دووجار دەستپێشخەری کردوە بۆ دانوستان لەگەڵ ئێران لەکانونی یەکەمی ١٩٧٢ و

نەیدەزانی کە بەردەوام بوە هەتا نیسانی ۱۹۷۳ بەبێ ئەوەی هیچ پێشوەچوونێکی بەخۆوەدیبێت.

سەرۆکی نوێ بۆ دەستە ئیسرائیلیەکە گەیشتە کوردستان ، ئەویش "شبتای شبیط" بوو کە لەحەفتاکاندا بەسەرۆکی مۆساد دیاری کرا، "شبیط" دەڵێت: ((ئەو ماوەیە هێمنیەکی ڕێژەیی باڵی بەسەردا کێشابون ، زۆرکەس لەوباوەڕەدابوون کەمافی خۆبەڕێوەبەری دەگۆڕێت بۆ واقیع، لەسەر ئەو بنەمایە ناوچەکە ئارام بویەوە ، فڕۆکە عێراقیەکان بۆردومانی ناوچەکەیان نەدەکرد، بەروبوم گەشەی کردبوو ، خۆراك باش بووبوو ، ڕاهێنراوە کوردەکان بەردەوام بوون لەبەشداریکردن لە خولە سەربازیەکانی سوپای ئیسرائیلی دا)).

هاریکاری ئەمریکیەکان بەسەربارزانی دا هەڵرژا، ئەمەش وەرەی ئەوی بەڕادەیەکی زۆر بەرزکردەوە، وایلێکرد کە ئەو شتانەی شاراوەو نهێنی بون بگۆڕێت بۆ مەسەلەیەکی ئاشکرا، لەو دیدارەدا کە لەگەل ڕۆژنامەی "واشنتن پۆست" لە ۲۲ی حوزەیرانی ۱۹۷۳ سازیکردوە ، داوای لە ئەمریکا کردوە کە هاوکاری مرۆیی و سەربازی پێشکەش بکات.

هەروەها بیرکردنەوەی ئیسرائیل بەرەوپەرەپێدانی کشتوکاڵی لە کوردستان دەچوو ، ئەوەبوو "یەجئال ئەدمۆنی" بەڕێوەبەری پۆلی نیشتەجێکردن لەئاژانسی جولەکە نێردرا بۆکوردستان تا ڕاوێژکاری پێشکەش بکات سەبارەت بەپەرەپێدانی هێلکەی پەلەوەر ، ئەدمۆنی لە ساڵی ۱۹۹٦ دا دەڵێت: ((بڕوایەکم بۆ دروست بوو کەبەرهەمهینانی کشتوکاڵی سەرەڕای گرنگیەکەی بۆ گەلی کورد بەلام پێگەیەکی گرنگی لەبیرکردنەوەی سەرکردایەتیدا نیە، چونکە تاکە مەسەلەیەك کە بارزانی بیری لێدەکردەوە ، هاوکاری سەربازی و سیاسی ئەمریکایەکان بوو بۆی)).

لەلیداونیکدا بارزانی وتی: ((ئەگەر هاوکاریەکانی ئەمریکا بە ڕادەی پێویست و زۆر گەورە بێت دەتوانین سەرپەرشتی نەوتی کەرکوك وەربگرین و بیدەین

بەکۆمپانیایەکی ئەمریکی ، گومان لەوەدا نی یە کە ئەم لێدوانە تەحەدایەکی ئاشکرای "صدام حسین" بووکە زوو ڕایگەیاند: ((پێویستە لەسەرهەموان کەدرك بەوەبکەن ئەم نیشتمانە لەچوارچێوەی جوگرافیەی ئێستایدا دەمینیتەوە بۆ هەتاهەتایە)) .
بارزانی ئاگاداری ئەوە نەبوو کە چەند لایەنێك هەن لەناو ئیدارەی ئەمریکیدا کەدژایەتی هاوکاریکردنی کوردەکان دەکەن، لەهەمان ئەو ڕۆژەدا کە "واشنتن پۆست" دیدارەکەی بڵاوکردەوە "ولیەم رۆجەرز" وەزیری دەرەوە داوای گفتوگۆیەکی لەسەرئاستی باڵای حکومەت کرد، سەبارەت بەو هاوکاریانە ، لەژێر ڕۆشنایی سیاسەتی ئەمریکادا کە نایەوێت ئومیدی وەرگرتنی پشتگیری و دانپیادانی ئەمریکا لەناو کۆمەڵە و کەمینە"ئەتنی"ەکاندا شین بکات.
کوردەکان دواتر بۆیان دەردەکەوێت کەهاوکاریەکانی ئەمریکا کە زۆر پشتیان پێ بەستبوو ، لەڕاستیدا زەردەخەنەیەك بوو بۆ دڵخۆش کردنیان.

** ** ****************** ** **

لەکۆتایی حوزەیرانی ١٩٧٣ زەوی لەبەغداد دەتوت بەوانەشەوە کە لەسەرنی ڕۆدەچێت ، "صدام حسین" هەوڵێکی سەرنەکەوتوی دا بۆ لەسەرکارلادانی "بەکر" بەهەمان عادەتی جاران لەمجۆرە حاڵەتانەدا ، دۆسیەکە بە لەسێدارەدان و زیندانیکردنی چەند کەسێك کۆتایی دێت، بارزانی دڵخۆش بو بەوەی ڕویدا چونکە لەنێو ئەو کەسایەتیانەدا کە لەسێدارە دران ، ژەنەراڵ "نازم گزار"ی بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشی لەوەزارەتی ناوخۆ تێدابوو، کە پێشتر هەوڵێکی سەرنەکەوتوی دا بۆتیرۆرکردنی بارزانی.
لەکاتێکدا کە"صدام حسین" لەهەلێکی لەبارتر دەگەڕا بۆ لەسەرکارلادانی "بەکر" شەڕوپێکدادانی خوێناوی لەنێوان کوردەکان و عێراقیەکان بەرپا بوو.

له ١٩ای ئابدا سوپای عێراقی بۆمبارانێکی خەستی دەست پێکرد، جگەلەوەش بە فرۆکە بۆردومانی "شەنگار"ی کرد، ئەمە وەك وەلامدانەوەی چالاکیە فراوانە تێکدەرانەکانی کوردەکان ، هەروەها چەند سیاسەتمەدارێکی کوردیشی لەسێدارەدا.

لەئەیلوی ١٩٧٣ بارزانی بۆ جاری دووەم سەردانی ئیسرائیلی کرد ، "دیڤید جبای" پێش دوومانگ لەسەرداوای خۆی لەمانگی تەموزی بەهاوکاری مۆساد سەردانی کردبوو ، کاتێکیش گەڕایەوە بۆ ئیسرائیل بڕێکی زۆر دیاری لەگەڵ خۆی هێنابووەوە ، لەوانە بڕێکی زۆر توتن و جگەرە.

لەسەردانەکەیدا بارزانی بوە میوانی وەزیری دەرەوە و لەگەڵ وەزیری بەرگری و سەرۆکی حکومەت کۆبووەوە ، بارزانی لەوە دڵنیابوو کەهەرگیز ئیسرائیل پشتی تێناکات ، و خۆشی و ئیسرائیلیەکانیش پێیان وانەبوو کە کاتێك ئیسرائیل پێویستی بە یارمەتی کوردەکان بێت ئەوان ڕەتی بکەنەوە.

## بەشی بیست و پێنج

### ١٩٧٣: پێشبینیمان دەکرد کوردەکان شتێ بکەن ...

لە ٢٦ی تشرینی دوەمی ١٩٧٣ ئیسرائیل توشی شۆك بوو، بەو جەنگەی کە "میسر" و "سوریایی"ەکان کردیانە سەری ، پاش ئەوەی زۆر بەباشی پلانیان بۆ دارِشتبوو، کە زەرەرو زیانی مرۆیی گەورەیان پێ گەیاند، کەوایکرد لە ڕۆژانی سەرەتایی جەنگ دا بە قووڵی هەردوو جەبهەکە کشایەوە دواوە.

عێراقیەکان ئاگاداری پلانی "میسری-سوریایی" نەبوون، ئەوانیش سەریان سورِما بەهەڵگیرسانی شەرِەکە ، بەڵام وەك هەمیشە پاش چەند ڕۆژێك پاش چەندرِۆژێك برِیاریاندا بەشداری بکەن وئامادەیی ناردنی هێزیان دەربرِی ، بێگومان جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنە ئاسان نەبوو ، چونکە سوپاکەی بەشوێنی ترەوە سەرقاڵ بوو، بەدرێژایی سنوری عێراق – ئێران و ناوچە کوردیەکان.

گومانی عێراقیەکان لە نیازەکانی بارزانی ، و پێشبینی کردنی ڕودانی شەڕ لەگەڵی لەهەر چرکەساتێك و دەستپێکردنەوەی پێکدادان لە باکور ، سەرکردایەتی عێراقی ناچارکرد کەنزیکەی (٧٠٪)ی هێزی پیادەو (٣٠٪)ی هێزی زرێپۆش بنێریت بەرەو سنوری ڕۆژهەڵات و باشوری ناوچەی کوردی.

بەڵام بارزانی لەم کاتەدا هیچ هەڕەشەیەکی نەکردەسەر یەکپارچەیی عێراق ، بەڵکو پاڵپشتی خۆی بۆ وڵاتە عەرەبیەکان دەربرِی ، و فەرمانی دەرکرد بۆ سەربازەکان کە وازبهێنن لە هێرشبردنە سەر سوپای عێراق، تەنانەت نامەی نارد بۆ "بەکر" و ئامادەیی خۆی دەربرِی بۆدرێژەدان بەدانوستانەکان لەگەڵی.

"بەکر" ڕوتێکردنەکانی کوردی پشتگوێ خست و بارودۆخی ناوچەکەی بەکارهێنا بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی لەگەڵ ئێران لەسەر "شط العرب" تاکەمەرج کە خستبوویە بەردەم ئێران ، دەرچونی بوو لەبازنەی هاوکاریکردنی کوردەکان.

لەسەروبەندی هەلگیرساندنی جەنگی ١٩٧٣ دا عێراق بەئێرانی ڕاگەیاند کەدەخوازێت دریژە بەپەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی نێوان هەردوو وڵاتەکە بەرێت ، دەستبەجێ "ئێران"یش سەرەڕای پەیوەندیە تایبەتیەکانی لەگەڵ ئیسرائیل ، و ڕێگری لەڕۆشتنی هێزی سەربازی عێراق بەئاراستەی جەبهەی ئیسرائیل سوریا نەگرت.

لەکاتێکدا بۆی هەبوو لەوقۆناغەدا ، عێراقیەکان سازش لەسەر "شط العرب" بکەن .

هەواڵگری ئیسرائیل بەپەیوەندیەکانی نێوان عێراق و ئێرانی نەدەزانی ، لەهەمان کاتدا پشتگیری ئاشکرای کورد بۆ وڵاتەعەرەبیەکان مەسەلەی حەتمی بوو ، نەدەکرا ڕەخنەی لێبگیرێ ، بەڵام پێیان وابوو کوردەکان سوود لەهەڵی ناردنی هێزە عێراقیەکان بۆ ئەو جەبهەیە وەردەگرن ، تا گورزی گەورە لەهێزە عێراقیەکان بوەشێنن و سەرکردایەتی عێراقی ناچاربکەن دان بەمافی "خۆبەڕیوەبەری" دا بنێت، تەنانەت زیاد لەو مافەش سەرەڕای ئەوەی کەکوردەکان لەو دەترسان ئەم هەنگاوە ببێتە هۆی ڕوتستۆکردنیان ، لەلایەن هەردو جیهانی عەرەبی و ئیسلامیەوە بە گشتی.

لە٧ی تشرینی ١٩٧٣ فرۆکە "عێراقی" و "میسریەکان" بەیەکەوە بۆردومانی چەند ئامانجێکی ئیسرائیلیان کرد، وە بە پێی ئۆمارە فەرمیەکانی عێراق سەبارەت بەبەڕیوەبەری جەنگ، عێراق سێ لەسەرچواری هێزە ئاسمانیەکەی و دو لەسەر"سێ"ی هیزی زرێپۆش و یەك لەسەر پێنجی یەکە وشکانیەکانی ناردیو بۆ شەرگەکە ، بێگومان عێراق نەیدەتوانی کە ئەو هەموو هێزە بنێرێت بۆ شەرگە بەبێ ڕازیبونی ئێرانیەکان و پەیماندانیان بەوەی کەهیچ جوڵانەوەیەکی سەربازی ئەنجام نادەن لەجەبهەی "عیراقی – ئێرانی" ئەم بارودۆخە بەس بوو بۆترساندنی کوردەکان.

"زەفی زامیر" دەڵێت: ((داوام لەنوێنەری مۆساد لە"ئێران" کرد کە نامەیەك بنێریت بۆ بارزانی داوای لێ بکات کەچالاکی هەڕەشەئامێز لەعێراقیەکان بکات ، بجولێن تا وەڵامیان بدەنەوە و تەقەیان لێ بکەن هەرشتێك لەپێناوئەوەی سوپای عێراقی ڕابکیشن بۆ لای خۆیان)).

((من دەمزانی کە جوڵانەوەی کوردەکان شۆڕش دروست ناکات ، ئەو بارودۆخەی کەتێیدابوون لەوە ڕێگەی نەدەدان لەوە زیاتر بکەن کە تائیستا کردویانە، بەڵام کوردەکان لەکۆتایدا هیچیان نەکرد)).

نوێنەری مۆساد لە"تاران" دەڵێت : ((بەکوردەکانی نەووتووە ، کە دەبێت چی بکەن ، بەڵام بەناراستەوخۆ ئینتیباعی ئەوەی لا دروستکردوون کە پێویستە چالاکی سەربازی بکەن ، کە نەیاندەتوانی پەیوەندیان پێوەی ڕەتبکەنەوە ، بەڵام بەچەندەها بەهانە و ئەملاولا ڕەتیان کردەوە)).

"ئەدمۆنی" دەڵێت: ((پێشبینیمان دەکرد کوردەکان شتێك هەر دەکەن ، هەرچەندە زۆر کەمیش بێت ، چونکە نەهێشتنی هەر هێزێکی عێراقی لەڕۆشتن بۆ شەڕگەکە سودێکی خۆی دەبوو ، بەنیسبەت ئێمەوە بەڵام کوردەکان بێئومێدیان کردین ، هیچ هەنگاویکی لەو شێوەیەیان نەنا)).

لە هەمان کاتدا ئیسرائیل هەمان داوای لە"ئێران" کرد ، لەو کتیبەدا کە "ئەمیر أسدالله علام) وەزیری کۆشك لەسەردەمی "شا" و سەرۆکی پێشوی حکومەت نوسیویەتی دەڵێت: ((ئیسرائیلیەکان لە ئەمریکیەکانیان پرسیوە کە ئایا گونجاوە هێرشیکی کوردی لە عێراق ڕێکبخرێت، "ڕیچارد هۆڵمز" باڵویزی ئەمریکا لەئێران کە ماوەیەکی کەم بوو ئەرکەکانی وەك سەرۆکی هەواڵگری ئەمریکی کۆتایی پێ هینابوو وتبوی کە بڕوای وایە پرۆسەی لەو شێوەیە باش نیە، چونکە کوردەکان هۆکاری پێویستیان لا نیە کەڕیگەیان بدات و هەلیان بداتی بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ و پێکدادانی دور لە چیاکان ئەنجام بدەن کەکردویانە بەقەڵفان)).

عەلام ئەڵێت : (("شا" هەڵوێستی باڵوێزی ئەمریکای جێبەجێکرد و وتی: بە"هۆڵمز" بڵێ: کە من تەواو لەگەڵیدا هاوڕام و نامەوێ کوردەکان وەك ئامرازێك ببینم بەدەست ئەمریکا یان ئیسرائیلەوە)).

باڵوێزەکە پاش وتووێژکردن لەگەڵ بەرپرسەکانی لە "واشنتۆن" ڕای خۆی دەربری بوو، پێدەچێ خودی بارزانیش داوای لە ئەمریکا کردبێت، بەڵام سەرۆکی نوێی هەواڵگری "ولیەم کۆڵبی" داوا کردوە وەڵامی داواکەی نەدرێتەوە ، "نیکسۆن"و"کیسنجەر" بە هەڵویستە خۆپارێزیەکەی "کۆڵبی"ڕازی بون.

لە ١٦ی تشرینی یەکەمدا "کیسنجەر" بروسکەیەکی بۆ "هۆڵمز" نارد کە تێیدا هاتوە: ((سەرۆك هاوڕایە لەگەڵتدا ، بۆیە دەبێت ئەمە بە کوردەکان بڵێیت: ئێمە لەو بڕوایەداین کە زیرەکی نیە ئەو هێرشە جێبەجێ بکەن ، کەوڵاتیکی تر"ئیسرائیل" پێشنیاری بۆ کردوون ، دەمانەوێت پێتان بڵێین کە ئێمە ڕاوێژمان لەگەڵ ئێران کردوەو ئەوانیش هەمان ڕایان هەیە)).

"کیسنجەر" لەوکتێبەدا کەنوسیویەتی دەڵێت : ((ئەو بڕیارە تایبەتیە کەڕێگری لەکوردەکان کرد لەکاتی جەنگی ١٩٧٣ جەنگ لە دژی عێراقیەکان بکەن لەسەربنەمای ڕێکەوتنی بیروڕاکان بوو لەنێوان دەزگای هەواڵگری ئەمریکی و دەزگای هەواڵگری ئیرانی، و "شا" ، لەبەرئەوەی کوردەکان تێکدەشکان ، هەمووڵایەنەکان لەسەر ئەو هەڵویستە کۆك بون)).

((دروستی ئەو بڕیارەی کەدابومان پاش تێپەڕبونی ساڵێك بەسەریدا دەرکەوت کاتێك زانیمان تەنها یەك فیرقەی زرێپۆشی عێراقی بەشداری جەنگی ١٩٧٣ ی کردوە)).

لیوا "موشێ بارکۆخبا" ڕایەکی پێچەوانەی کیسنجەری هەیە ئەو کە سەرکردایەتی جەنگی دژی عێراقیەکان دەکرد، لە بەرزایەکانی جۆلان لە ساڵی ١٩٧٣ لە کتیبەکەیدا "سوارڕەوە پۆڵاینیەکان" دەڵێت: ((هێزی هێرشبەری عێراقی لە فیرقەی زرێپۆشی (٣) و (٦) دو لیوای پیادەو چەند یەکەیەکی کۆماندۆ

پێکهاتبو، هێزەکە نزیکەی ٥٠٠ تانك دەبوو ، لەگەڵ (٧٠٠) گوێزەرەوەی سەربازی "ناقله الجنود" و (٣٠) هەزار سەرباز ، ئەگەر ئەو هێزە درەنگ بگەیشتایە لەنیوان (١٢) کاتژمیر بۆ (٢٤) کاتژمیر ، ئەوا هیزە ئیسرائیلیەکان دەیانتوانی کۆنترۆڵی ناوچەگەلێکی فراوانتر لە قولایی خاکی سوریا بکەن بەرەو "دیمەشق" ، هێزی عیراقی توانیان پێشقەچونی هێزە ئیسرائیلیەکان ڕابگرن)).

پێدەچێت ئەگەر کوردەکان هێرشیان بکردایەتە سەر عێراقیەکان ڕێگردەبون لەوەی کەهێزی عێراقی ڕوبکاتە بەرزاییەکانی "جۆلان" یان بەلایەنی کەمەوە بۆماوەیەك ڕێگریان لێ دەکرد.

لە ١٤ی نیسانی ١٩٧٤ دا "د.محمود" بەڕۆژنامەی "لۆمۆند"ی فەڕەنسی دەڵێت: ((ئەگەر کوردەکان جەنگێکی گشتگیریان دژی عێراق بکردایە لەوکاتەدا ، ئەوا بەرژەوەندیەکە دەچووە باخەڵی دوژمنانی کوردەوە ، بەوەش دەیانسەلماند کە کوردەکان ئامادەن لە پشتەوە چەقۆ لە میللەتی عەرەب بدەن)).

پاش ٢٢ ساڵ زامیر دەڵێت: ((بەرژەوەندی کوردی- ئیرانی ئەوکاتە لەوەدابووکە کوردەکان هێرشی گشتگیر نەکەنەسەر عێراقیەکان)).

کاتێك مۆساد نیگەرانی ئیسرائیلی لەهەمبەر هەڵویستی سلبی کوردەکان گەیاندە بارزانی، ئەو نەجولان و بێ هەڵویستیەکەی بۆ هەڵوێستی ئێران گێڕایەوە.

"زامیر" دەڵێت: ((ئێرانیەکان هەستیان بەبێئومێدیەکی تاڵ کرد بەوڕوداوانەی لەڕۆژانی سەرەتای جەنگ رویان دا، ئەوان وایان دەزانی کە ئێمە لەجەنگەکەدا دنیا ژێرەوژور دەکەین، بەڵام زو ڕوون بووەوە کە ئێمە هێندە ڕەشیش نین وەك ئەوان بیری لێدەکەنەوە)).

## بەشی بیست و شەشەم / مانۆڕێکی هەزەلی ئەمریکایی

عێراق لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٣ دا سەرکەوتو بو لە بەدەستهێنانی پاڵپشتی سێ کەسایەتی دیاری کورد ، دوان لەوان "عزیز رشید العقراوی" و "هاشم حسین رشید العقراوی" بون کە ئەو دوانە ناسراوی ئیسرائیل بوون ، "عزیز العقراوی" ساڵی ١٩٦٢ لە سوپای عێراقی رایکرد و پەیوەندی کرد بەیاخیبوانەوە ، وە سەردانی ئیسرائیلی کرد ، و ئاگاداری هەموو ئەو پەیوەندیانە بوو کەئیسرائیل لەگەڵ کوردەکاندا هەیبوو ، و ئەو هاوکاریی ڕاوێژکارییەی پێشکەشی دەکردن ، بەڵکو تەنانەت لە پلاندانانەکانیان دژی عێراق بەشداری کردوە ، و لەهەڵمەتەکانیاندا دژی سوپای عێراقی ، گومان لەوەدانیە کە بۆ گەورە نوێیەکانی "عێراقیەکان" پەردەی لەسەر هەمووشتێك لاداوە، لەسەر زۆربەی لایەنی نهێنیەکانی دەستێوەردانی ئیسرائیل لەسەر یاخیبونی کورد.

بەڵام ئەمە زۆر سوودی نەبوو بۆی پاش ئەوەی کەڕۆژنامەیەکی نزیکی لەعێراق دەرکرد و بەوەزیری بێ وەزارەت دەستنیشان کرا لەحکومەتی عێراقدا ، لەشوباتی ١٩٧٦ دەستگیرکراو ، لە مەیدانی سیاسەت بزربوو ، دەڵێن ئیستا لە "دیمەشق" دەژی .

بەڵام "هاشم العقراوی" کەدانرا بە وەزیری کاروباری شارەوانی حکومەتی عێراق سەردانی پاریسی کرد ، وەك ئەندامی حکومەتی عێراقی تا مامەڵەی گونجاوی حکومەتی عێراق لەگەڵ کوردەکان ڕونبکاتەوە و بەپەیامنێر ئاژانسی هەواڵی "ئەسیوشێتد پرێس"ی وتبوو کە بەچاوی خۆی ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکانی لە سەرکردایەتی بارزانی بینیوە و بارزانی دوو جار سەردانی ئیسرائیلی کردوە.

"صدام حسین" هەر سێ سەرکردەکەی وەك بەرپرس لەحکومەتەکەی سەبارەت بەکاروباری کوردەکان دامەزراندن ، وە هەرسێکیان بە نەخشەی مافی ئۆتۆنۆمی بە مەفهومە عێراقیەکەی ڕازی بون.

سەرەتا وا دەرکەوت کە عێراق بەپێی پلانی مافی خۆبەڕیوەبەری کار دەکات، کە لە ڕێکەوتننامەکەدا بڕیاری لەسەر دراوە، بەڵام پاش چوار ساڵ واتە لە ١١ ئازاری ١٩٧٤ کاتێ بڵاوکردنەوەی یاسای دەسەڵاتی خۆجێی کورد هات ، دەرکەوت کەجیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ناوەڕۆکی ئەو یاسایە و ئەوبەڵێنانەی کە عێراقیەکان بەکوردیان داوە.

"صدام حسین" بەو یاسایە دەیویست شێواز و جیاوازیەکانی کوردەکان، کە لەعێراقیەکان جیاوازن ، بخوسێنیت و کاڵبکاتەوە ، بۆیە پێشنیازی دروستکردنی چەند دەزگایەکی بێتوانای کرد کە "صدام" بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەرپرسەکانیان هەڵدەبژێرێت، پێدەچو کە بیەوێت لە ڕێگەی دروستکردنی ئەو دامەزراوانەوە یاخیبونی کورد تۆمەتبار بکات، و پرۆسەی ڕاگواستنێکی گەورە و فراوانی کوردەکان بۆ ناوچەی باشور جێ بەجێ دەکات، ئەمە هەمو بە دەستخۆشانەی سێ سەرکردەی ناوبراوەوە و دووکەس لە بنەماڵەی بارزانی کە ئەوانیش (عوبیدوڵا"ی کوڕی و هەروەها کوڕەکەی" شێخ احمد" کە ناوچەی بارزانی بێ لایەنی بە دەستەوە بوو.

لە١٣ی ئازاری ١٩٧٤ "عوبەیدوڵا" بروسکەیەکی بۆ حکومەتی عێراق نارد وتی: ((پێویستە لەسەر گەلی کوردمان کەمافی ئۆتۆنۆمیەکەی ڕەگ پێدابکوتێ و بەهێزی بکات بەهاوکاری لەگەڵ کەسایەتیە خانەدان و پاکەکان، لەڕۆڵەکانی گەلی عێراقی وە لەگەڵ هەمو ئەو هێزە نیشتیمانیانەدا کە جگە لەخەمی یەکپارچەیی و کامەرانی عێراق هیچ خەمێکی تریان نیە)).

وە لەو دیدارەدا کە لەگەڵ ڕۆژنامەی "الرسالە"ی کویتی دا ئەنجامی داوە "عوبێدوڵا" باس لەسەردانی باوکی و دو براکەی "ئیدریس و مەسعود" بۆ "تەل ئەبیب" دەکات، و باسی بوونی ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکان لەسەرکردایەتی باوکی ئەوهاوکاری و ڕاوێژکاریانەی کەپێشکەشی دەکەن دەکات، ئەمە جگە لەو

ڕاهێنانەی کە سەربازە کوردەکان لەسەردەستی ئەوان کردویانە، وە ئەو پرۆسانەی کە ئیسرائیلیەکان دژی هێزەکانی عێراق پلانیان بۆ داڕشتوە.

دەڵێت: ((باوکم بەشێوەیەکی ڕەها پشتی بەئیسرائیلیەکان بەستوە ، هەمیشە بەپێی پیوستی ئەفسەری ئیسرائیلی لەگەڵدایە، باوکم خیانەتکارە ، وە "ئیدریس و مەسعود"ی براشم "گەمژەن" ، ڕینماییەکانی باوکە پیرەکەم بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەکی سەربەخۆ جێ بەجێ دەکەن)).

"صدام" "عوبیدوڵا"ی کرد بە وەزیر و ئەندامی پەرلەمانی عێراقی لە کاتی ڕاگەیاندنی جەنگی دژی ئێران لە ساڵی ١٩٨٠ دا و پێدەچێت ساردی نواندبێت ، بانگەوازەکەی سەرۆکی عێراقی بۆ گەل کە داوای پێشکەشکردنی قوربانی کردبوو بۆ کۆششی جەنگ لەکاتێکدا کێشەی کورد جێ بەجێ نەکراوە ئەم ساردی نواندنانەو پێداگریە "صدام حسین"ی توڕەکردوە ، پاش چەندڕۆژێك ، شەوێك "پۆلیسی نهێنی عێراق" ، هاتبوو بۆماڵەکەی داوایان لێ کردبو بەپەلە بچێت بۆ بینینی سەرۆك ، بەژنەکەی وتبو: "واپێدەچێت هەرگیز نەگەڕێمەوە" ، وابوو لەو شەوەوە ئیتر نەگەڕایەوە ئەوەبو لەسێدارە درا.

بەختی "لوقمان"ی برای هاودایکی "عوبێدوڵا"ش لە خۆی باشتر نەبوو، "فەرهاد"ی کوڕی دەڵێت : ((باوکم ڕۆڵیکی باشی لە سەرکردایەتی شۆڕشدا هەبوو ، بەشداری لەپرۆسەی پاکسازیکردن لەدژی لایەنگرانی "ئەحمەد" و "تاڵەبانی" کرد ، کەژمارەیەکی زۆر لەو لایەنگرانەی تێدا کوژران ، ئەمەش وایکرد کەباوکم لە ماڵەکەی خۆیدا دەستبەسەر بکرێت ، ئەمەش توشی کەئابەی کردبوو، وایلیکرد لە یاخیبونەکە بکشێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ کشتکاریکردنی زەوی خێزانەکەی)).

لە دوای هەرەسی یاخیبونەکە لە ساڵی ١٩٧٥ "عوبیدوڵا"ی برای بانگی کرد بۆ بەغداد ، بەڵام باپیرم ڕەتی کردەوە ورێی لێ گرت، داوای لێکرد دەستبەجێ داواکاریەکەی بۆبنێرێتەوە ، ئەمەش توڕەیکرد وایلێکرد ڕوبکاتە باڵوێزخانەی عێراقی لە تاران ، کە فڕۆکەیەکی تایبەتی بۆ نارد و گەڕاندیەوە بۆ بەغداد)).

لەئەیلولی ۱۹۸۰ دوای دیارنەمانی "عوبێدولاّ" باوکم کەوتە گەڕان بەدوای ی براکەیدا ، عێراقیەکان هۆشداریان دایە کە واز بێنێت لەگەڕان بەدوای ئەودا ئەگینا چارەنوسی وەك هی براکەی دەبێت، بەلاّم وازی نەهێنا ، ئەوەبو پۆلیسی عیراقی دەستگیری کرد وە شوینەواری نەما)).

** **************** **

مستەفا بارزانی یاسای مافی خۆبەڕێوەبەریەکەی ڕەتکردەوە و داواکاری عێراقی کەکردبوی تا کوردەکان لە ماوەی ١٥ ڕۆژدا قبولّی بکەن ڕەتکردەوە ، و لەڕادیۆی کوردەکانەوە کەچوار سالّ بوو بێدەنگ بووبوو ، بلاّویکردەوە بۆ گەلی کورد تا دەستبکەنەوە بە چەکهەلگرتن ، بۆ رزگارکردنی خاکی کورد لە دەستی عێراقیەکان ، وەك نەریتی خۆیان ئێرانیەکان هەمیشە پشتگیری پێدانی کەمترین جۆری مافی ئۆتۆنۆمیان دەکرد بۆ کورد، لەو وتەیەدا کە "شا" پێشکەشی کارمەندانی وەزارەتی ڕاگەیاندنی ئێرانی کرد ووتی: ((ئێمە پشتگیری دەوڵەتیکی سەربەخۆی کوردی ناکەین لە عێراق، بەڵکو ئێمە گرنگی بەمافی کوردەکان دەدەین لە عێراق، کوردەکان نەك عەرەب)).

لەڕاپۆرتێکدا بۆ ئاژانسی هەوالگری ئەمریکا لە ٢٢ی ئازاری ١٩٧٤ دا هاتوە: ((ئێمە پێمان وایە "شا" حکومەتێکی خۆجێیی فەرمی تەواو وەك ئێمەی ناوێت ، "شا" پێی وایە کە واباشترە بارودۆخ وەك خۆی بمێنیتەوە ، بەجۆرێك عێراقیەکان بە شێوەیەکی جەوهەری زیانبار ببن، بەهۆی سازشنەکردنی لەسەر بیرۆکەی مافی ئۆتۆنۆمی ، ئێمە لەگەلّ (شا) هاوڕاین کە پێوستە بارودۆخی کوردەکان بەملا یان بەولادا یەکلایی نەبێتەوە)).

بارزانی پێی وانەبوو کەئەوە ئاڕاستەی بیرکردنەوەی ئەمریکایەکانە سەبارەت بەدۆسیەی کورد، لەدوای مۆرکردنی ڕێککەوتنامەی ئێراقی - ئەمریکی ، "کیسنجەر" بوبوە پیاوی خەونەکانی بارزانی ، ئەمە لەکاتێکدا کە هەڵویست و بیرکردنەوەی ئەمریکا بەرامبەر بەکوردەکان وەك مانۆڕیکی هەرزلی وابوو.

لەوماوەیەدا ژمارەی هێزەکوردیەکان زۆر زیادی کردبوو لەبەرئەوەی کوردەکان باوەڕیان وابوو کە لە ماوەی شەش مانگدا یان مافی ئۆتۆنۆمی یان کوردستانی سەربەخۆ دێتە دی، لەناو ئەوانەدا کە پەیوەندیان بە یاخیبونەکەوە کرد ، ٦٠ دکتۆر و ٤٠٠٠ مامۆستا و ٥٠٠٠ ئەفسەری پۆلیس و ٣٠٠ ئەندازیار و ١٠٠ ئەفسەری سوپای لەخۆگرتبوو ، لەکاتێکدا ژمارەی سەربازە نیزامیەکان نزیکەی ٤٠ تا ٥٠ هەزار کەس دەبوو، ئەمە جگە لە ٦٠ هەزار لەپیاوانی میلیشیا و یەدەگ، شیاوی وتنە کەنیوەی سەربازەکان پێویستیان بەڕاهێنانی سەربازی بنەڕەتی هەبوو، بڕی چەکەکان چەند ئەوەندەی پێشووبوو، بەڵام هیشتا بۆ جەنگی پارتیزانی دەستیان دەدا نەك بۆ سوپایەکی ڕێکخراو.

کۆمەکی کردنیان بەچەك بەخواستی ئێرانیەکانەوە بەندبوو، سەرەڕای ئەوە بارزانی شانازی بەوەوە دەکرد کە ئێرانیەکان چەند یەکەیەکی تۆپخانەیان خستۆتە ژێردەستی ، بۆ هاوکاریکردنی لە کاتی پێویست ، چ لە خاکی ئێراندا یان لەناو سنوری عێراقدا.

عێراقیەکان ئامادەبون بۆ ناردنی ٥٨ هەزار سەرباز بۆ شەرگەی کوردەکان ئەمە جگە لە٢٠ هەزار جاش بەئاستی ڕاهێنانی جۆراوجۆرەوە لەگەڵ ٦٠٠ تانك و دوسەود فڕۆکەو فڕۆکەی ستونی، ئەم هێزە بەکەرتێکی گەورەی سوپای عێراق دەژمێردرا کە ئەوکات بە١٠٠ هەزار سەرباز و ١٣٩٠ تانك و ١٢٨ فڕۆکە دەخەمڵێنرا.

سوپای عێراق ئەوکات زۆر دڵنیابوو لەوەی کە دەتوانێت پاکتاوی کوردەکان بکات و دۆسیەی کورد دابخات ، کە ٣٠ ساڵ بوو جەستەی عێراقی داڕزاندبوو لەکاتێکدا کەسوپا و حکومەتی عێراقی دودڵ بون لەهەڵگیرساندنی جەنگ ، بارزانی بڕیاری دا دەستپێشخەری بکات لە هێرشبردن.

بارزانی لەدوای هەرەسی یاخیبونەکە بە"لیلیست ئاکۆڵس"ی چالاکوانی بزوتنەوەی مافەکانی مرۆڤ لە "نیۆرك" سەبارەت بە هۆکاری بڕیارەکەی دەڵێت: ((دەمزانی کەکڕینی ئەم هەموو فڕۆکەیە لەیەکیتی سۆڤیەت لەلایەن عێراقەوە

دژی ئێمە بەکاردێت، لەوکاتەدا بەرپرسیکی ئاژانسی هەوالگری ئەمریکی هات بۆ بارەگاکەم وە پێی وتم ئیمە پشتگیری لەئامانجەکەت دەکەین ، پێدەچێت حکومەتی عێراقی بەڵێنەکانی بشکێنێت و پلان دادەنێت تاهێرشێکی توندتان بکاتە سەر، حکومەتی ئەمریکا لە ئامادەگی تەواودایە بۆپاڵپشتی کردنت، ئەگەر ئێستا هێرش بەریت بە هەموو هێزیکیەوە پشتت دەگرێت)).

((کاتێك پرسیارم لەوبەرپرسە کرد ، چۆن هاوکاری ئەمریکیەکانمان پێ دەگات وتی: لەرێگەی ئێرانەوە وتم بەلام ئێرانیەکان هاورێی کورد نین ، پێی وتم لەهیچ مەترسە کاروبارەکانی ئێران لەژێر کۆنترۆڵی خۆماندایە، من هێرشم نەدەکرد و خۆمم بۆ ئامادەنەدەکرد ، ئەگەر ئەوئامادەیی دەربڕینەی بەرپرسەکەی ئاژانسی هەوالگری ئەمریکی نەبوایە، بە کردار هاوکاریەکانمان پێدەگەیشت بەلام هەمیشە زۆر کەم بوو، وە زۆر درەنگ دەگەیشت ، سەرەتا باوەرم وابو کە هۆکارەکە لۆجستیە، بەلام دواتر زانیم کە بەئەنقەست و تەکبیر بوە)).

دکتۆر نجم الدین کریم لەدواتردا دەڵێت: ((بارزانی کۆبونەوەی بە سەرکردایەتی یاخیبوان کرد و وتی عێراقیەکان دەیانەوێت چەکی کیمیایی دژی ئێمە بەکاربێنن، هەڵسابون بەکۆکردنەوەی دەمامکە پاریزەرەکان ، هەمویمان لە نزیك سەرکردایەتی کۆکردەوە ، بەلام پێی وتین: "لە هیچ مەترسن ئەگەر ئەوان چەکی کیمیایان بەکارهێنا ئەوا ئێمەش هەمان چەك دژیان بەکاردەهێنین، هەماش شت دەکەین ئەگەر تانك یان فرۆکەیان بەکارهێنا ، پێدەچێت ئەو بروای وابوبێت کە ئەمریکا ئەو کارەی بۆ دەکات)).

رۆژنامەی "کریستیانساینس مۆنیتۆر" لەراپۆرتیکی دا دەڵیت کە ئەمریکا پشتگیری لەبارزانی کردوە تاجەنگەکە هەلایسێنێت، تا وابکات کە "یەکیتی سۆڤیەت" نەتوانیت لەرێی کەنداوەوە دزە بکاتە عێراقەوە، و عێراق نەتوانێت لەرێی کەنداوەوە دەستی یارمەتی بۆ هێزە یاخیبوەکانی کەنداو بەشێوەیەکی گشتی درێژ بکات بەتایبەت بۆ ئێران، وە رێگربێت لەوەی کە عێراق رێرەوە سیاسیەکانی خۆرهەلاتی ناڤین تێك بدات، وە سنوردانان بۆ توانای بەشداریکردنی لەجەنگی عەرەبی – ئیسرائیلی لەداهاتودا.

## بەشی بیست و حەوتەم /

## ڕۆژانەی جەنگ ١٩٧٤ کەمینی دوانەیی

لەلێدوانەکەیدا بۆ ئاژانسی دەگوباسی عیراقی "صدام حسین"وتی: ((کەمترین شت کە لەبارزانی قبول بکەین ئەوەیە کەئالای سپی بەرز بکاتەوە)) ، بەلام بارزانی هەرگیز نەیدەویست ئەوە بکات ، ئەوەبوو لەنێوان ٥ بۆ ٢٧ نیسان سالی ١٩٧٤ جەنگێکی گەورە هەلایسابوو بەدەستپێشخەری هێزەکانی بارزانی لەوشەڕەدا کوردەکان توانیان کۆنترۆلی ڕوبەری ٧٢٥ کیلۆمەتر چوارگۆشە بە درێژایی سنوری تورکیا و ئێران بکەن.

هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکی بلاویان کردەوە کە دامەزراوەی پێشمەرگە لە ٧ پێگەی گرنگەوە گەمارۆی هێزە عێراقیەکانیان دا و نزیکەی ١٢ هەزار سەرباز لەنێو گەمارۆکەدان، کوردەکان کە تا ئەو کاتە هیچ شارێکی گەورەیان کۆنترۆل نەکردوە ڕایانگەیاند: کە "ڕەواندز"یان داگیر کردوە.

لە ٥ی ئازار[1] وەزیری کۆشکی ئێرانی لە یادەوەرینامەی ڕۆژانەیدا تۆماری کردوە : ((مەزاجی "شا" باش نەبوو بەهۆی پێکدادانەکانی سەر سنوری ئێران عێراق)).

لە ٦ی ئازار[2]دا "شا" خوانێکی ڕێکخست کە چەند سەرۆکخێلێکی کورد تێیدا بەشداربوون باسی ئەویان کرد کەشکستێکی گەورەیان بەهێزە عێراقیەکان کردوە ، توانیویانە نزیکەی ٥٠ سەربازی عێراقی بکوژن، وە دوو گویزەرەوەی سەرباز (ناقلە) تێك بشکێنن.

لە ١١ی نیسانی ١٩٧٤دا دوو نوێنەری کورد لەگەل سکرتێری نەتەوە یەکگرتوەکان کۆبونەوە و باسی ئەو بارودۆخە ترسناکەیان کرد کەڕۆلەکانی گەلەکەیان تێیدا دەژین ، هەروەها لەگەل سەرۆکی کۆنگرەی سەرۆکایەتی ڕێکخراوەی جولەکە ئەمریکیەکان "حاخام ئیسرائیل میلەر" و سکرتێری گشتی کۆنگرەکە "یهودا

---

[1] پێدەچێت هەمان هەلەی چاپ بێت ئەگینا شەڕ و پێکدادان لە ٥ی نیسان دەستی پێکردوە. -وەرگێر-

[2] هەمان تێبینی سەرەوە

هۆلمان" کۆبونەوە ، بەبیریان هینایەوە کە جولەکە لەسەرەتای حەفتاکاندا بەهاوکاری کورد توانیان لەعێراق هەڵبێن ، ئەمانە ئەو هەولانە بوون کە دەدران بۆ ئەوەی وابکەن کەرێکخراوە جولەکەکان کار بۆ بەرژەوەندی کوردەکان بکەن، دواتر لە دیدارێکی رۆژنامەوانیدا رونیان کردەوە : ((کە دوژمنێکی هاوبەش هەیە بۆ کورد و ئیسرائیل کە هەوڵ دەدات نەگەن بەسەربەخۆیی)).

★ ★ ★ ★★★★★★★★★★★★★★★★★★★★ ★ ★ ★

عێراقیەکان خۆیان ئامادەدەکرد بۆهێرشی بەهارە کاتێك کە بەفرەکان دەتوێنەوە ، ١٥ی نیسانیان بۆ ئەورۆژە دیاریکردبوو، ئەوە هەمان ئەو رۆژە بو کە "صدام حسین" دیاریکردبو بۆ ئەوەی کوردەکان مافی خۆبەڕێوەبەری قبوڵ بکەن لە ١٤ی نیساندا عێراقیەکان ١١ کوردیان لەهەولێر لەسێدارەدا ، پاش ئەوەی فەرمانیان دەرکرد بەدەستبڕین یان چاودەرهێنان پێش لە سێدارەدان، هێرشەکە بەم شێوە بەردەوام بوو:-

- ١٢ - ٣٠ نیسان شارۆچکەی "زاخۆ"یان بەفڕۆکەو تۆپخانە بۆردومان کرد، کە بووە هۆی کەوتنەوەی ئاگرێکی گەورە.
- ٢٣- ٢٧ نیسان ناوچەی "باڵەك"ی بۆردومانکرد بە گوندی "گەلاڵەی گەورە"وە ، کەبووەهۆی کوژرانی ٤٠ کەس و برینداربونی ٥١ کەس.
- ٢٤ نیسانی شاری "قەلادزێ"ی بۆردومان کرد کە بوە هۆی کوژرانی ١٣١ کەس و برینداربونی ٣٠٠ کەس .
- ٢٥-٢٦ نیسان بۆردومان کردنی شاری "دهۆك" .
- ٢٨ی نیسان بۆردومانی شاری "هەڵەبجە" و تێکدانی نزیکەی ١٠٠ خانو ، بووەهۆی کوژرانی ٤٢ کەس و برینداربونی ١٠٠ کەس.
- ١ی ئایار سوپای عێراق چووە ناو زاخۆوەو بەبێ جیاوازی دەستڕێژی لەخەڵك کردو ٦٣ کەسی کوشت و ١٥٠ کەسیشی بریندار کرد.

تا ئەوبەرواره ژمارەی کورژراوی کوردەکان بەپێی ئاماره کوردیەکان گەیشتە ۷۰۰ کەس و دووهەزار بریندار ، ئەو ئامانجەی کە سوپای عێراقی هەوڵی بۆ دەدا بریتی بو لەشکاندنی گەمارۆی سەر هێزە عێراقیە گەمارۆ دراوەکان ، و چوونەناو ئەوپێگانەی کە پێشمەرگە کۆنترۆڵی کردون لەئاداری ۱۹۷٤ موە دوای ئەوشەڕە گەورەیەی کە کردی ، سوپای عێراق توانی کۆنترۆڵی شاری زاخۆ بکاتەوە، کە بەمەش کۆنترۆڵی ڕێگای سەرەکی درێژکراوەی ڕێگای عێراق بۆ تورکیا دەکات لەگەڵ چەند شوێنێکی نیشتەجێبونی تر ، بەڵام نەیتوانی "عقره"و "ڕەواندز" و "قەڵادزێ" داگیربکاتەوە.

لە۲۵ نیسان "صدام حسین" فەرمانی دەکرد بەسەپاندنی گەمارۆیەکی زۆرتووند بەسەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی نزیك لەسنوری تورکیا، شیاوی وتنە ئەوگەمارۆیە بەردەوام بوو هەتا تشرینی یەکەمی ۱۹۷٤ کەوایکرد نزیکەی نیوملیۆن کورد توشی برسێتیەکی ترسناك ببن ، بەپێی ئەو زانیاریانەی بڵاوکراوە نێودەوڵەتیەکان داویانە بەدەستەوە هێزی ئاسمانی عێراقی نزیکەی (۲٤۰۰) هێرشی ئاسمانی کردۆتە سەر ناوچەی نیشتەجێ بوونی کوردەکان، ئەمەش وایکرد دیاردەی کۆچبەر و ئاوارەکان زۆر گەورە بێت، وە بە ۱۵۰ هەزار کەس دەخەمڵێنرا.

عێراقیەکان کاریان دەکرد بۆئەوەی سنورێك بۆ یاخیبونی کوردەکان دابنێن بەشێوەیەکی کۆتایی لە ۱۹ی ئابی ۱۹۷٤ توانیان "قەڵادزێ" داگیر بکەن ، بەمەش کوردەکانیان لەوناوچەیە بێبەش کرد کە هەڕەشەی لەسەر "هەولێر" و "سلیمانی" و "کەرکوك" دروست کردبوو.

لە۲۲ی هەمان مانگ "ڕەواندز"یان داگیرکردەوە.

لەکۆتایی ئەیلویی ۱۹۷٤دا سوپای عێراق بەشێکی چیای "زۆزگ"ی کۆنترۆڵ کردەوە ، بارزانی بۆی دەرکەوت کە لەدەستدانی "زۆزگ" بەمانای لەدەستدانی "هەندرێن"یشە ، لەو حاڵەتەش ڕێگای هاوکاری سەرەکی کوردەکان دەگیرێت ئەمەش دەبێتە هۆی هەرەسی هەموو یاخیبونی کورد.

بارزانی هیچی بۆ نەمایەوە کەدەنگی هاوکاری بگەیەنێتە تاران و ئەوانیش وەلامیان دایەوە ، هێزی تۆپخانەی ئێران لەخاکی ئێران و کوردەکانیشدا دەست بەکاربوون ، بەمەش هێرشی یەکلاکەرەوەی بۆسەر دواهەواری کوردەکان لەکارخست و ماوەیەکی تر تەمەنی یاخیبوونی کوردەکانی درێژکردەوە.

لەهەمان کاتدا بارزانی پەیوەندی کرد بە مۆسادەوە و داوای کرد کە "تسوری ساجی" بۆ بنێرن ، ساجی لەوماوەیەی دوای جەنگی ١٩٧٣ سەرکردایەتی لیوایەکی دەکرد، "زامیر" داواکاریەکەی بارزانی پێراگەیاند و ئەو بارودۆخە خراپەی بۆباسکرد کە کوردەکانی تێدان و پێی وت: ((یاخیبونی کورد پێدەچێت لەسەر لیواری هەرەس بێت)).

""تسوری" جانتاکانی کۆکردنەوەو پەیوەندی کرد بەشارەزای تەقەمەنی "نەتان ڕاهیب"ەوە کە لەجەنگی پێشویدا دژی عێراق لەناوپیزی کوردەکان هاوبەشی بوەو پێی وت: "پاسپۆرتەکەت بهێنەو بەیانی وەرە بۆنوسینگەکەم، بەیانی بە یەکەوە سەفەر دەکەین" ، بەر لەسەفەرەکەیان ئەو دوانە ڕێنماییەکانیان لە مۆساد وەرگرت، پاشان لەڕێگاکەیاندا بەرەو تاران کەوتنە ڕێ.

لەتاران "ص" یەکێ لەکۆنترین ئەندامانی دەزگای ئاسایشی گشتی مۆساد کە ئەوسا سەرۆکایەتی دەستە ئیسرائیلیەکەی دەکرد پێشوازی لێ کردن و هەرسێکیان ڕۆشتن بۆ کۆبونەوەلەگەڵ بارزانی لەیەکێ لەو ئەشکەوتانەدا کە"ڕاهیب" جاری پێشو لەکاتی مانەوەی لە عێراق فراوانی کرد، تا ڕادەیەك کردبوی بەماڵێکی سادە.

"ڕاهیب" دەڵی : ((بارزانی لەبارودخۆیکی زۆر نائومێدا دەردەکەوت ، پیێ وتم : ئێستا هاتن؟ هەمو شتێك تەواو هەموو سوپای عێراقی کار لەدژی من دەکات ، هیچ ئومێدێکم نەماوە)) ، سەرەتا تسوری هەوڵیدا بارزانی هێوربکاتەوە تا کوڕەکانی بارزانی و هەندێك سەرکردەی تری کوردی هاتنە لایان ، بارزانی وتی هێرشی کوردەکان لە ١٢ی ئازاری ١٩٧٤ بەدەستپێشخەری ئێران بوە، سەرەتا کوردەکان توانیان دەستکەوتی تازە دەستەبەربکەن، بەلام دەستی سوپای عێراقی

بەرەبەرە بەسەریاندا زاڵ بوو ، کە بوە هۆی دروستبوونی بارودۆخێك وێکچوو بەبارودۆخمان لە ساڵی ١٩٦٦

"تسوری" وتی: ((شیوەی بارودۆخەکە سەختە بەڵام هیشتا هەر لە دەست نەچووە ، تابارودۆخەکە دەمەونخون بکەینەوە ، "تسوری" نەخشەیەکی بەناوی فیرقە عێراقیەکانەوە دارشت ، داوای لە "ئازاد"ی بەرپرسی هەوالگری کوردەکان کرد کە لەسەر نەخشەکە شوینی هیزە عێراقیەکانی بۆ دیاری بکات، بەڵام ئازاد نەیتوانی شوێنەکانیان دیاری بکات ، "تسوری" بۆی دەرکەوت کە سەرکردایەتی کوردی تەواو ئیفلیج بووە ، ئەو بارودۆخە سەختەی کوردەکانی تێیدا دەژین ، وادەکات کەسەخت بێت بۆ ئەوەی بریاری پێویست بدات)).

لەسەرپێشنیاری "ص" فەرماندەی کەرت و ناوچەکان بانگکران تا لەوانەوە لەبارودۆخەکە ئاگادار ببینەوە، پاشان بریار بدەین، لەو راپۆرتانەوە کە پێشکەش کران دەرکەوت کەهۆکاری سەرکەوتنی عێراقیەکان شێوازی وەڵامدانەوەی کوردەکان بووە ، کەوایکردوە عێراقیەکان شوێنی تەقەکان بدۆزنەوە و بەسەریدا زاڵ ببن و هێرشی بکەنەسەر.

ئەوەش روون بووەوە کەکوردەکان لەکاتی پاشەکشەیاندا پردێکیان لەسەر "گەلی عەلی بەگ" تەقاندۆتەوە ، عێراقیەکان دوو هەفتەیان دەوێ تاچاکی بکەنەوە ، بەڵام عێراقیەکان کۆششێکی لەرادەبەدەریان کرد و توانیان رێگەی خۆڵ لەسەربەردەکانی چیای "کۆرەك" دروست بکەن و سرییەی زرێپۆشیان گەیاندە دەشتایی "رەواندز" ، هێزەعێراقیەکان پێکهاتبوون لە فیرقەیەکی زرێپۆش کە ٣ لیوای تانك و ٤ لیوای هێزی زرێپۆشی پیادەی لەخۆگرتوە، ئەمە جگە لە ٥ لیوای پیادە و ٥ سرییەی کۆماندۆ و٢ کەتیبەی هێزی تایبەت و ٥ هەزار جاش .

بەڵام هێزە کوردیەکە باشتر و چاکتر بو لە چاو هێزە کوردیەکانی ساڵی ١٩٦٦ ، ژمارەیەکی زیاتر تۆپهاوێژ و راجیمەیان لابوو سەدەها قازیفەی "بازۆکا" و دۆشکەی روسی و چەند کۆگایەکی تەقەمەنی ، هەروەها ٧ هێزی پیادە ئامادەبوون

لەكاتی پێویست دا بێنە پێشەوە ، هەروەها دو كەتیبەی تۆپخانەی ئێرانی پڕچەك كراو بەتۆهاویژی جۆری "هۆبیچەر و موشەكی زەمین – زەمین" بەتەواوەتی ئامادەبوون بۆ كاركردن.

"ساجی" كاتێك ئەم ڕاپۆرتەی بیست وای دانا عێراقیەكان دوو ڕۆژیان دەوی بۆچاككردنەوەی پردەكە تابەتەواوەتی هێزەكانیان بخەنەوەكار ، بۆیە "ساجی" نەخشە كارێكی داڕشت كە ئەم چوار خاڵەی لەخۆگرتبوو :-

- داگیركردنی چەند پێگەیەكی پیادە لەبەردەم هێزی پیادەی عێراقی لەسەرلێوارەكانی چیاكان و ئەو ناوچانەی بەسەر "هەندرێن" و "زۆزگ" و "هۆمەرعێرە"دا دەڕوانن.
- بەووردی هەموو قازیفەكانی بازۆكا و تۆپهاوێژە ناجێگیرەكان ، لەئەملاو لادا وەك كەمین ئامادە بكرێن لە جەبهەی دواوەی كوردەكان.
- دەسترێژیكی چڕ لەتانكە عێراقیەكان ، هەركاتێك گەیشتنە لایەنی ڕۆژهەڵاتی كەرتەكە كەتوانای خولانەوە یان پاشەكشەیان نیە.
- ئامادەكردنی حەوت كەتیبەی كوردی بۆ دژەهێرش.

بارزانی گوێی لەقسەكانی "تسوری" ڕاگرت پاشان مەترسی خۆی پیشاندا لەوەی كوردەكان توانای خۆڕاگرتنیان لەبەرامبەر تانكە عێراقیەكاندا نیە.

"تسوری" پێی وت : ((سەربازە ئیسرائیلیەكانیش مرۆڤن و لە تانكەكان دەترسن ، بەڵام فێربوون چۆن لە كاتەسەختەكاندا هەڵسوكەوت دەكەن، دەتوانین سەربازە كوردەكان ئامادە بكەین ، كە بە هەمانشێوە هەڵسوكەوت بكەن)) ، بەڵام بارزانی ڕازی نەبوو.

بارزانی بە "تسوری" وت: ((تۆ باش لەپلانی عێراقیەكان تێ ناگەیت پێم وتراوە كەكۆششی سەرەكی عێراقیەكان ڕووەوبەنداوی دوكانە، ئەمەش لەپێناوئەوەی كەناوچەی "ڕەواندز" لەباشورەوە هێزە كوردیەكان گەمارۆ بدەن، داوای لە"تسوری" كرد پلانی بلاوبونەوەكەی بگۆڕیت.

"تسوری" دەڵێت: ((بۆچونەکانی بارزانیم بەدڵ نەبوو ، و تا لێیبکۆڵمەوە دەبوو لەشوینی مۆڵبونی هەموو هێزە عێراقیەکان و سەرکردەکانیان بکۆڵمەوە ، لەڕاپۆرتەکانەوە دیاربوو کە ئەو شوێنەی بارزانی ئاماژەی بۆ دەکرد لەباشوور دەشێ فیرقەیەك و لیوای ٤ی پیادەی لێ بێت جگە لەوە ئاشکرابوو کە گەمارۆدانی ئەوناوچەیە هێزێکی زۆر لەوهێزە عێراقیە گەورەتری دەوێت، وەك ئەوەی لەڕەواندزە، هیچ ئاماژەیەکیش نەبوو بۆئەوەی کە هێزەکەی ڕەواندز دەجوڵێت بۆ یەکگرتنەوەی هێزەکەی باشور)).

لەکۆتاییدا "تسوری" توانی قەناعەت بەبارزانی بکات سەبارەت بە ڕاستی هەڵسەنگاندنەکانی.

بارزانی پێی ووت: ((من پشت بەتۆ دەبەستم ئەگەر چوویتە گۆرەپانی جەنگ هەمووشتێك بەچاوی خۆت دەبینیت چ بڕیارێك بدەی من قبوڵمە)).

سەرۆکی مۆساد "ص"ی لابرد و "کرۆن"ی خستەوە شوێنەکەی ، بەهۆی ئەو ماندووبونەی کە "ص" لەماوەی ڕابردودا توشی هاتبوو ، پاش چەند ڕۆژێك "کرۆن"و"تسوری"و "ئازاد" و "ب" کە لەتارانەوە هاتبوو لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی کورد گەشتێکی فراوانیان لەسەرپشتی وڵاخ بەناوچەکانی دوژمندا کرد، لە هەموو ئاراستەکان ٤٠ی کیلۆمەتر بەنێوکەوتن ، دڵنیابوون لەوەی کە بەبێ هیچ گومانێك پێشبینیەکانی "تسوری" ڕاستن، دوای گەڕانەوەیان جەختیان لەوەکردەوە لای بارزانی کە هەموهەڵسەنگاندنەکانیان سەبارەت بەجوڵەو نیازەکانی عێراقیەکان ڕاست دەرچوە.

* * * * ************************ * * * *

عێراقیەکان پردەکەیان تەواوکرد ، سەرەڕای ئەوە هێرشە چاوەڕوانکراوەکە دەستی پێنەکرد ئەمەش جێگەی پرسیار بوو بۆ "تسوری" چەند دەستەیەکی بۆ قووڵایی ناوچەی عێراقیەکان نارد ، کاتێك گەڕانەوە پێیان ووت کەپردەکە لەژێر قورسایی یەکەم تانگ ویستویەتی بپەڕێتەوە داڕوخاوە، پێدەچوو هێزی

ئەندازیاری عێراقی کۆڵەکەی ناوەڕاستی بۆپردەکە دانەنابێ بەهۆی پەلەکردنەوە ، بەمەش کوردەکان مۆڵەتی دوو هەفتەی تریان دەستکەوت ، بەکاریان هێنا بۆ ڕاهێنان ، و هەندێ سەرکردەی کورد پێشنیاریان کرد کەکاری پردەکە بشێوینن و دوای بخەن، بەڵام زوو ڕون بووەوە کە عێراقیەکان لەئەوپەڕی ئامادەباشیدان بۆ هەر هێرشێك کەبکرێت بۆسەر پردەکە ، بەهەمانشێوە "تسوری" پێشنیارێکی تری ڕەتکردەوە بۆ دەست بەسەراگرتنی بەنداوی دوکان و تەقاندنەوەی ، ووتی جارێ زووە بۆ ئەو کارە.

عێراقیەکان پردەکەیان دروست کردەوەو دەستیان بە هێرشکردن کرد، لەکاتێکدا کوردەکان لەکەمینەی خۆیاندا لە ئامادەباشیدا بوون بۆیان ، تەقەیان نەکرد هەتا "تانکە عێراقیەکان" کەوتنە ناوچەی پشت بڵاوبونەوەیان ، "تسوری ساجی" دەڵێ: ((کوردەکان توانیان لەماوەی٣٠ دەقیقەدا نزیکەی ٦٠ تانك تێك بشکێنن، ڕاپۆرتە عێراقیەکان دەریان خست کە ٢٩٠ تانك لەجۆری (T- ٥٤ و T-٥٥) تێك شکاوە لەپێکدادانەکەدا ، ئەمەش وورەی کوردەکانی زۆر بەرزکردەوە ، چونکە تانکەکان تاکەترسی ئەوان بون، کاتێك دیتیان وادەبن بەخۆراکی ئاگر بێئومێدیان بوو بەئومێد )).

عێراقیەکان بەردەوام بوون لەهێرش ، سێ لیواپیادەکە بەرەو پێشەوە هاتن، لە ناوچەبەردین و بارزاییەکانی "چرۆ عمر عره"، لەکاتێکدا هەشت لیواکەی تر لەباشورەوە لەناوچەی "هەندرێن" و "زۆزگ" هێرشیان برد ، کوردەکان لەحاڵەتی بەرگریدا لەنزیك "چرۆ عمر عره" ، چاوەڕێیان بوون ، کاتێك لیواکان کەوتنەناو سێرەی تفەنگەوە دەستڕێژی ڕەشاش و دۆشکەو تفەنگەکانیان بە شێوەی چڕ ڕووتێکردن، ئەمەش بووەهۆی وەستاندنی عێراقیەکان لەوکاتەدا کوردەکان دژەهێرشیان کرد بەجۆرێك لەباکورەوە کەتیبەیەکی کوردەکان بەپاڵپشتی تۆپهاویژ هێرشی برد و چووە ناو لیوا عێراقیەکانەوە و زەرەرێکی زۆر گەورەی لێدان ، سەربازە عێراقیەکان پاشەکشەیان کرد و کوردەکانیش ڕاوەدویان دەنان.

فەرمان دەکرا بۆهێزە عێراقیەکان کەخۆیان کۆبکەنەوە بۆ هێرش بردن، بەر لەهێرشەکە تۆپبارانیکی خەستیان کرد پاش ئەوە هێرشیان بردە سەر هێزە کوردیەکان و گەیشتنە دوری هەشتا مەتر لەپێگەی کوردەکان لەوکاتەدا کوردەکان هێرشیان کردە سەریان عەرەب وتەنی "إختلط الحابل بالنابل"[1] ئەمەش عێراقیەکانی تەواو توشی شۆك کرد ، وای لێهات هەندێکیان لە ناو خۆیاندا تەقەیان لەیەکتر دەکرد.

عێراقیەکان سێ جار هێرشیان کرد ، هەمو جارێکیش دەستپێك بە تۆپبارانێکی خەست دەستیان پێ دەکرد بەڵام نەیانتوانی هێڵی بەرگری کوردەکان ببەزێنن ، سەرەڕای ئەوە بارزانی هێشتا هەر ترسی هەبوو.

*** **************** *********** ***

ئیسرائیلی و کوردەکان ژمارەی کوژراوی عێراقیەکانیان بە٧هەزار کوژراو خەملاند ، لەکاتێکدا ڕاپۆرت و خەملاندنە عێراقیەکان باسیان لە"٦٥٠٠" کوژراو دەکرد، کاتێك لە "عبدالجبار" ی سەرۆك ئەرکانی سوپای عێراقیان پرسی سەبارەت بەژمارەی کوژراوەکان وتی : "١٦٤٠" کوژراو و "٧٩٠٣" بریندار لەکاتێکدا ڕۆژنامەی "الثورة"ی عیراقی بەناوی "صدام حسین"ەوە بلاویکردبوەوە کە١٦هەزار سەرباز کوژراون یان برینداربون لەو پێکدادانەدا .

ئەم شکستەی عێراقیەکان نەبووەهۆی ڕاوەستانی جەنگ ، عێراقیەکان لەشوێنیکی ترەوە دەستیان بەهێرشکردن کرد، دوو سریەی "کۆماندۆ" فەرمانیان پێدرا بەداگیرکردنی ناوچە بەرزاییەکانی ڕۆژئاوای چیای "زۆزگ" ، هاوکاری لەچەند یەکەیەکی زۆر گەورەی هێزی تۆپخانە و هێزی ئاسمانی عێراقی وەرگرت ، ئەوەبوو لەکۆتایدا و لەتشرینی دووەمدا گەیشتنە ئامانجەکەیان و ئالای عێراقیان لەسەرهەڵکرد.

---

[1] هەندێك کە ماناکەی کاتێك دوکەس شەڕیکی خەستیان دەبیت یەکیکیان تیر وکەوانی پێ یە تیرەکەی ڕاکیشاوە نەویتریان بە دەستی دەسکی کەوانەکەی گرتوە دوری دەخاتەوە. - وەرگێر -

"علام"ی وەزیری کۆشکی ئێران لە١٠ای تشرینی یەکەمی ١٩٧٤ نوسویەتی: ((خاوەنشکۆ "شا" دەخوازێت بارودۆخی کوردەکان باشتربکات ، کاتێك تۆپهاویژی دوورمەودا ، و موشەکی دژە تانکیان دەداتێ)).

لە٤ی کانونی یەکەمی ١٩٧٤ "علام" لەڕۆژانەکەیدا نوسویەتی (("شا" داوای لێکردم کەپێویستە بەسەرۆکی ئەرکان بڵێم کە تۆپهاوێژە دوورمەوداکان لەشەڕگەکە بکشێنێتەوە تانەهێڵرێت عێراقیەکان دەستی بەسەردابگرن، ئەگەر پێی وایە کوردەکان ناتوانن خۆیان ڕابگرن لەبەرامبەر هێرشی عێراقیەکان)).

لەسەرداوای کوردەکان ڕاهێنەرە ئیسرائیلیەکان دوبارە ڕاهێنانیان بە گروپە کوردەکان کردەوە، کەپێشتر وەك دەستەی تانك بەڕێوەبردن ڕاهێنانیان پێ کرابوو، لەئەیلولی ١٩٧٢ هەروەها کوردەکان داوایان لێ کردن کەتانکی جۆری "T-٥٥"یان پێبدەن لەوکاتەدا دوو سەربازی هێزی ئاسمانی ئیسرائیل گەیشتنە کوردستان بۆ ڕاهینانیان لەسەر موشەکی سەرشان لەجۆری "ستریلا" و چاکردنەوەی تۆپهاویژی دژەفرۆکە و دوو ئەفسەری تری سەر بەسەرکردایەتی هێزی پەرەشوتەوانیش کە"عیبری" زمان بوون ڕاسپێردران بۆپێکهینانی یەکەیەکی هێرشبردنی کاریگەر و پێشکەوتوو، و دو تۆپهاویژ لەعیاری ١٥٥ ملم لەگەڵ ڕاهێنەرێك بەپلەی ڕائید نێردرابون بۆ کوردستان تا دوو دەستە ڕابهێنێت بۆ بەکارهینانی ، وە ئەفسەرێکی تر نێردرا تاکوردەکان ڕابهێنێت لەسەرچۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ چەك و تەقەمەنی و پرۆسەی خەزنکردنی.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٥ خولێك ڕێکخرا کە٢٣٣ کاتژمێری خایاند ، باس لەهەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان بەچەکی دژەتانك کرا، لە هەمان کاتدا باڵویزی ئیسرائیل لە"واشنتن" دەستیکرد بە پەیوەندیکردن لەگەڵ "هێنری کیسنجەر"ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ، سەبارەت بەپێدانی چەکی تۆپهاویژ و دژەتانکی قورس بەکوردەکان ، پرۆسەی چەکدارکردنەکە جەختی دەکردەوە لەسەر گۆڕینی

پێشمەرگە بۆسوپایەکی بچوك ، هەرچەندە بڕی چەکەکان کەم بوبونەوە ، بەڵام ئەو بڕەی کە دەدرا بەکوردەکان هاوکاریەکی زۆر گەورەبوو بۆئەوان.

ئەمریکا بەڵێنی بەئیسرائیل دا کەچەکی نوێتر بدات بەئیسرائیل "دینیتس" دەڵێت: ((ئەمریکا بەکردار ئەوچەکانەی دا بەئیسرائیل)).

ئەوکاتە تانکەعێراقیەکان لەقەمچی تفەنگی کوردەکان دورکەوتبونەوە و بڵاوبوبونەوە و بەردەوام بون لەبۆردومانکردنی پێگە کوردییەکان، کوردەکان هەوڵیان دا بەتۆپهاویژ وەڵامیان بدەنەوە بەڵام سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهینا.

لەسەر بنەمای ئەوبارودۆخە "ساجی" ڕوویکردە ئیسرائیل بۆ ڕازیکردنی بەرپرسە ئیسرائیلیەکان کەڕاهێنانی جەنگاوەرە کوردەکان لەسەرتەقاندنی موشەکی "ساگر"ی دژەتانك لەو چەکانەی کە لەجەنگی ١٩٧٣ دەستمان کەوتوە ، ڕاهێنانەکان لە دەرەوەی کوردستان ئەنجامدران و کاریگەریەکی باشیان لەزەمینەی واقعدا هەبوون ، ڕاهێنراوەکان بۆمبەکانیان لەتانکە عێراقیەکان گرت لەدەشتی "ڕەواندز" و بووە هۆی دەستبەجێ پاشەکشە کردنیان لەناوچەکە.

*** **** ****************** **** ***

حکومەتی ئیسرائیلی بەسەرۆکایەتی "ئیسحاق ڕابین"دەستی بە کارەکانی کرد لەحوزەیرانی ١٩٧٤ دا ئەمەش لەدوای ئەو زریانەی بەهۆی ڕوداوەکانی جەنگی ١٩٧٣وە دروست بوو ، بووە هۆی دەستلەکارکیشانەوەی سەرۆکی حکومەت خاتوو "گۆڵدا مائیر" سەرۆکی حکومەتی نوێ کەپەیوەندی بەبارودۆخی کوردەوە هەبوو، لەکاتی کارکردنیدا وەك سەرۆکی ئەرکان لەسەرهەمان سیاسەتی گۆڵدا مائیر ، هەروەها وەزیری بەرگری نوێ "شەمعۆن پێریز"یش هەمان هێڵی گرت ، لە٤ی کانونی دوەمی ١٩٧٥ "پێریز" "تسوری" بانگکرد بۆ نوسینگەکەی و ئەم دیدارە لەنێوانیاندا ڕوویدا:

پێریز : دواجار کەی لەلای کوردەکان بوی ؟

تسوری : پێش هەفتەیەك گەڕامەوە بەدرێژایی هاوین لەوکاتەوە شەڕەکان دەستیان پێ کردوە لەوێ بوم، بارزانی کەمێك زمانی عیبری دەزانیت ، وتەکانم وەردەگێڕدرێن بۆ زمانی عەرەبی و من سەرکردایەتی جەنگ دەکەم لەوێ.

پیریز: ئایا ئەو "بیانی - گۆی – "ە زیرەکە؟

تسوری : ئەو کەسێکی نائاساییە و زانیارییە سەربازییەکەی زانیاری سەرۆکی هۆزیکە پەرەی سەندووە بۆسەرکردەیەکی نەتەوەیی ڕۆحانی کەتوانای پێشبینی کردنی هەیە ، پیکهاتەی سەربازی لەکوردستان پێکهاتەی چەند هێزێکی خێڵەکی هەرێمایەتیە، بەهەمانشێوەی ئەوەی کە لە"تەورات"دا هاتووە ، ئەو وابیردەکاتەوە کە گەلی ئیسرائیلی لەهەموو گەلێ ڕاستگۆتر و جددی ترە ، بەڵام ئەو هێزێکی تەواو کامڵی پێ نیە ، پێی وایە تاکەهێز کەدەکرێت پشتی پێ ببەسترێت ئەمریکایە ، ئەو ئومیدی ئەوەیە کە ئێمە سوریا داگیر بکەین و ئەویش عێراق داگیربکات، بەیانی و ئیوارە باس لەپێویستی ئەو ڕوداوە دەکات، کاتێك لێی دەپرسیت چۆن سوریا داگیردەکرێت کەچەندەها شارەزایی ڕوسی تیدایە دەڵێت: ((واز لەبڕوبیانووهێنانەوە بهێنن، ئێوە "دیگۆل"ی سەرۆکی فەرەنساتان لەسەرکارلادا ، لەپاش دۆڕاندنی لەڕاپرسی میللی سەبارەت بەگۆڕانکاری لەیاسادا ، هەروەها سەرۆکی ئەمریکی "نیکسۆن"تان لەکارخست کە لەئابی ١٩٧٤ دەستی لەکارکێشایەوە بەهۆی تیوەگلانی لە"ئێران – گێت")) ، ئەوەی کە ئەو تێیدا لاوازەو کەمایەسی هەیە پێدراوە سەربازیەکانە ، کەوای لێبکات بتوانێت هەڵسەنگاندنی بۆبارودۆخەکە هەبێت، لە ئازاری ١٩٧٤ جەنگی هەڵگیرساند بەبێ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی سەربازی ، عێراقیەکان لەدوو پێگەی سەرەکیەوە هێرشیان کردەسەری ، ڕێکەوتنیك لەنێوان کوردەکان و حکومەتی عێراقیدا هەبو، سەبارەت بەو ناوچانەی کە کوردەکان تێیدا دەژین بەبێ مافی ئۆتۆنۆمی ، عێراقیەکان پێشنیاری ئۆتۆنۆمی بەبێ نەوت "واتە بێ کەرکوك"یان بۆ کردن ، دەستیان کرد بەگەمارۆدانی عێراقیەکان بەبێ هەڵسەنگاندنی بارودۆخ ،

عێراقیەکان ڕێگەیان بڕی وە گەیشتنە جەبهەی پشتەوەی کوردەکان ، بارزانی داوای منی کرد کاتێك گەیشتم وتی: درەنگ هاتن داوای دەستەی تانکی ئیسرائیلی و دەزگای ئێرانی نوێی دەکرد، پاشان داوای دەستەی دژەتانکی دەکرد، وتم من دژایەتی ئەوە دەکەم ، کەدەستەی ئیسرائیلی کاربکەن دژی عێراقیەکان ئەگەر مەسەلە ترسە ، ئیسرائیلیەکانیش دەترسن ، مەحاڵیشە جورئەت لەدەوڵەتێکەوە بۆ یەکێکی تر بگوازیتەوە ، لەگەڵ ئەو و لەگەڵ "میرخان" و "ئازاد" دانیشتم ، و هەڵسەنگاندنمان بۆ بارودۆخەکە کرد ، بۆم دەرکەوت کە مەسەلەکە نەبونی پێدراوە لای ئەوان ، بڕیارم دا بڕۆم بۆ گۆڕەپانەکەو زانیاری کۆبکەمەوە و تەماشای بارودۆخە بکەم ، بۆم دەرکەوت کوردەکان پردێکیان لەسەردۆڵێك تەقاندۆتەوە ، کە وادەکات عێراقیەکان ماوەیەك بەدەوریەوە گیر بخۆن ، بۆم دەرکەوت کەترسی ئەوان لەتانکە عێراقیەکانە، هەرچەندە چەکی دژەتانك دابەشکراوە بەسەریاندا ، بڕیارمدا کەکەمینێك بۆ تانکەکان بنێمەوە داوای قازیفەی بازۆکام کرد ، بیستم کوردەکان دابەشیان کردوە ، هیچ لەتەرکیزی کۆششەکانی چڕی تەقەکردن نازانن ، کوردەکان نیشانشکێنیکی چاکن بۆخۆیان تەکنیکیی کاری تایبەتیان پەرەپێداوە دەتوان بەیەکەم تەقە ڕاجیمەکان بپێکن ، فەرمانم کرد هەموو قازیفەکانی "بازۆکاگ کۆبکرینەوە هەمو ئازاو تایبەتمەندەکانیانم بۆ بانگبکەن، چەند سەنگەرێکمان وەك کەمین دروست کرد، کە پڕچەك کرابون بە "بازۆکا" و "تۆپهاویژی جێگیر".

پێریز: ژمارە جەنگاوەرانیان چەندە؟

تسوری : نزیکەی ١٠٠ هەزار جەنگاوەر ، ئەوانەی کە بۆ جەنگ دەست دەدەن لەچارەگی ئەو ژمارەیە تێناپەڕیت، لەمەوە چەند دەرەنجامێکمان دەستکەوت ، داوام لێ کردن کەهەوڵ بدەن چەند سەربازێکی عێراقی دەستگیربکەن ، توانیمان زانیاری هەوالگری زۆرگرنگیان لێ دەربهێنین ، زانیم کەدوژمن سێ فیرقەی پیادەی هیناوە بە کۆماندۆ و جاشی کوردەوە ، لەگەڵ فیرقەیەکی زرێپۆش کە بە٣٠٠ تانك

ئامادە كراوە، لەگەڵ دو لیوا كە بۆی هەیە بێن، كاتێك شەڕ دەستی پێكرد توانیمان ٢٨ تانك تێك بشكێنین بەمەش ورەی هێزە كوردیەكان بەرزبووەوە ، یەك تۆپهاویژ توانی ٦ تانك تێك بشكێنێت، ژمارەی كوژراوی عێراقیەكان ژماردمانن، گەیشتە ٦٠٠ كوژراو لەكاتێكدا لەكوردەكان تەنها ١٤ كەس كوژران، پاش ئەوە سێ جار هێرشمان كردە سەرعێراقیەكان لەنێوان هیرشەكاندا سێ ڕۆژ یان دوان هەبون، لەكۆتایدا عێراقیەكان توانیان سەركەوتنیكی گەورە بەدەست بهێنن بەنرخی شەش هەزار كوژراو، من بەرپرسم لەكوژرانی سێ هەزار لەوان.

لەكۆتایدا "پێریز" داوای زانیاری كرد سەبارەت بەوەی لەناو كوردەكان و ناو عێراقدا هەیە.

پێریز: قەبارەی سوپای عێراق چەندە؟

تسوری: سێ فیقرەی زرێپۆش و چوار یان پینج فیرقەی پیادە.

پیریز: ئایا ئەو زەرەرەی كە سوپای عیراقی كەوتوە گەورەیە؟

تسوری: زرێپۆشە عیراقیەكان زیانەكانیان هیندە نیە، كە ئەو هیزە دەتوانریت بنێردرێت بۆ شەڕگەی ڕۆژهەلات بەرامبەر ئیسرائیل، بەلام هێزی پیادە زەرەرمەندی سەرەكیە ، زانیاری ئەوە لەگۆڕێیە كە سوپای عێراق واز لەكوردەكان دەهێنیت وە ڕودەكاتە شەڕگەی ڕۆژهەلات ، ژمارەیەكی زۆر ئەفسەری عێراقی لەسەر كارلادراون ئەمەش سوپاكەی لاوازكردوە.

پێریز: ژمارەی كوردەكان لەعێراق چەندە؟

تسوری: سێ ملیۆن .

پێریز: هاوكاری ڕاستەقینەی ئێرانیەكان چی یە؟

تسوری: هاوكارییەكی جدديە نزیكەی ٢٠٠ هەزار ئاوارەیان لەخۆگرتووە جگەلەوە "شا" برێكی زۆرپارەی داوە بەكوردەكان بارزانی جەختی لەوەكردۆتەوە كەسەركەوتن بەدەست دەهێنیت ئەگەر دو تۆپهاویزی بدرێتێ كە بۆماوەی ٣٠

کیلۆمەتر کاربکەن، ئێستا داوای ٨ تۆپهاوێژ دەکات ، هێزێکی ئێرانی پێکهاتوو لەسێ کەتیبە لەکۆتایی جەنگەکە گەیشتن.

پێریز: ئەو گوندە کوردیە چی لێ بەسەردێت کە عێراقیەکان داگیری دەکەن؟

تسوری: کوردەکان هەڵدێن ، چونکە عێراقیەکان ئاوارە بەجێ ناهێڵن "واتە ئەوەی بمێنێتەوە دەیکوژن – وەرگێر- ".

پێریز: ئایا کوردەکان هێرش دەکەنە سەر گوندە عێراقیەکان؟

تسوری: نەخێر منیش داوای شتی وام لێنەکردون چونکە ئەوکارە کات بەفیڕۆ دەدات.

پێریز: ئەگەر بارزانی بمرێت کێ شوێنی دەگرێتەوە؟

تسوری: لەسەرئاستی سەربازی هەر ئەو وورەیان بەرز دەکاتەوە و لەدەوری کۆدەبنەوە، بەڵام لەڕووی کردەییەوە ئەو زۆر ڕۆڵی نیە ، پێم وایە "دکتۆرمەحمود" شوێنی دەگرێتەوە، ئەوپیاوە پیاوێکە عەقڵیەتێکی کراوەی هەیە.

پێریز: ئێرانیەکان پارەدەدەن بەکوردەکان؟

تسوری: ساڵانە ٢٤ ملیۆن دۆلار.

پێریز/ هەموان ئاگادارن لە دەستتێوەردانی ئیمە؟

تسوری/ سەرکردایەتی کورد دەیەوێت بیشارێتەوە ، بەڵام زۆربەی خولە سەربازیەکان لەئیسرائیل ئەنجام دراون ، بەڵام لەوبارەیەوە قسە ناکەن.

پێریز: ئومێدی ئەوەیە هەیە کوردەکان کۆنترۆڵی عیراق بکەن؟

تسوری: ئەوە کردەیی نیە ئەگەر قبوڵی ئەوەش بکەن کە لەچیاکان دابەزن من پێشنیار دەکەم تانکیان پێ بدەن، لەوبارەیەوە بیروڕای من لەگەڵ سەرۆکی مۆساد جیاوازە ، ئێرانیەکانیش حەزناکەن کوردەکان بەهێزبن، هەروەها لاوازیش نەبن ، لەبەرئەوەی لەوە دەترسن کە ئەو پێنج ملیۆن کوردەی سەرخاکی ئێرانیش ئارەزوی سەربەخۆیی بکەن.

"زامیر" دەڵێت: ((کاتێك بارزانی سەبارەت بەباشترین بارودۆخ لێی دەپرسیم ، پێم وت لەسەرئاستی کوردەکان باشترین بارودۆخ کە پێم وایە زۆر قورس دەبێت لەسەر کوردەکان ، لەدورستبوونی یەکیەتیەکی کۆنفیدراڵی عێراقیدایە لەنێوان عەرەب و کورددا، واتە هەردوگەلەکە مافی خۆبەڕێوەبەریان هەبێت لەسەرئاستی زمان و ڕۆشنبیری ئەوناوچانەی تێیدا دەژین، بەڵام بارزانی متمانەی بە"صدام حسین" نەبوو ، بارزانی بە دودڵیەوە دەیگوت : هاوکاری هەرحکومەتێکی عیراقی دەکەین کەڕومان تێبکات، توانیمان پەیوەندی لەنێوان ئەو و چەند کەسایەتیەکی عێراقی و کوریدا دروست بکەین ، کەپێگەی باڵایان لەدەسەڵاتدا هەبوو ، بەڵام متمانەی بەکەس نەبوو، جا چ سوننی بێت یان شیعەی عێراقی)).

بارزانی بیری لەجەنگی داهاتوو دەکردەوە کە لەبەهاری ١٩٧٥ پاش توانەوەی بەفری چیاکان هەڵدەگیرسێت، بەڵکو هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی ئەو شوینانەی کەعێراقیەکان لەساڵی ١٩٧٤ دا داگیریان کردبون ، دڵنیابوو لەوەی کەدەتوانیت ڕێگە لەهێزە عێراقیەکان بگرێت لەسەر ئەوبنەمایە داواکاریەکی تایبەتی پێکەشکرد بۆ ناردنی ئەفسەریکی پلەبەرزی ئیسرائیلی بۆ کوردستان ، زۆر بەڕونی داوای "تسوری ساجی" کردبوو.

"ئیسحاق حۆفی" لەهاوینی ١٩٧٤ شوێنی "زامیر"ی گرتەوە لە سەرۆکایەتی مۆساد بەکردار "تسۆری"و"ڕاهیب" ڕوویانکردە کوردستان و کاتی گەیشتنیان بۆئەوێ پێیان وترا کەسوپای عێراقی دەستیکردوە بە لێکدابڕینی ناوچە کوردیەکان و زانیان کە "صدام" پرۆسەی پاکسازی گەورەی لەناو سوپادا کردوە، سەرکردە پلەبەرزەکانی گۆڕێ و لەسەر کاری لادان، و ٢١ ئەفسەری لە سێدارەدا ، و چەند گۆڕانکاریەکی لەسەرکردایەتی عێراقدا کرد، ئەمانە هەموو ئاماژەیان بەوە دەکرد کە"صدام" پێگە و هێزی خۆی زیاد دەکات.

"صدام" بۆی دەرکەوت کە ئێران لەم جەنگەی دواییدا جێپەنجەی خۆی لەبەرامبەری دەرخستوە ، زیاتر لەوەی کە لەجەنگەکانی ڕابردوودا کردویەتی،

پێویستی بەبیرکردنەوەی زۆر نەبوو تا درك بەوە بکات ، پەیوەندی پەرە سەندوی ئەو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بۆ بەرژەوەندی ئەو نیە.

لەسەر ئەو بنەمایە "صدام" دەستی کرد بەگۆرینی ئاراستەکە بە شێوەیەکی پلەبەند ، دەستیکرد بەپەرەپێدانی پەیوەندیە ئابوریەکانی لەگەڵ ئەمریکا ، و پەیوەندیەکانی لەگەڵ بەریتانیا پەرەپێدا ، چەندەها رێکەوتننامەی لەگەڵ فەرەنسا مۆرکرد ، دەستیکرد بە نزیکبونەوە لە دەوڵەتەعەرەبیە لایەنگرەکانی رۆژئاوا ، وەك "سعودیە" و "ئەردەن" و "میسر" تا متمانەی ئەو دەوڵەتانە بەدەست بهێنێت لەبەهای ئەو هاوپەیمانیەتیەی کەمکردەوە کە لەگەڵ "یەکێتی سۆڤیەت"دا ئەنجامی دابوو ، چەند پروپاگەندەیەکی بلاوکردەوە کە گوایە ناکۆکی و جیاوازی لە نیوان ئەو و یەکیتی سۆڤیەتدا هەیە ، ئەمەش سروشێکی ناراستەوخۆ بوو بۆئێران.

## بەشی بیست و هەشتەم /

## ئەو هیوایانەی هەرەسیان هێنا

عێراق و ئێران گەڕانەوە بۆسەر مێزی دانوستان لەپێناو چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی کە زەمەنێکی زۆرە لەنێوانیاندا هەیە، و لەماوەی نێوان ١٢-١٨ی ئابی ١٩٧٤ نوێنەرانی هەردولا لە"ئەستنبوڵ" چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەسەر کۆنترۆڵ کردنی "شط العرب" تاوتوێ کرد ، هەمولایەك دەیانزانی کە ئێران سازشی خۆیان لەسەرحسابی کوردەکان پێشکەش دەکەن.

بەڵام بارودۆخەکە بەو شێوەیە نەدەگوزەرا کە"صدام" ئارەزووی دەکرد لەماوەی دانوستانەکاند چەند پێکدادانیك لەسەرسنوری هەردولا ڕویاندا ، عێراق ئێرانی بەوەتۆمەتبار کرد کەدەستپێشخەریان کردوە لەڕودانی ئەو دزەکردن و کێشانەدا تا لەلایەکەوە فشار بخەنەسەر عێراق بۆئەوەی کە سازشی زیاتر بکەن و لەلایەکی ترەوە پێشکەش کردنی هاوکاری بە "مستەفا بارزانی" بەکرێگیراوی ، وە لە ٣٠ی ئابدا ڕادیۆی بەغداد داوای لە ناوبردنی کوردە خیانەتکارەکانی کرد.

عێراق دانوستانەکانی وەستاندن و شکایەتی کرد لای نەتەوە یەکگرتوەکان لەسەرکۆکردنەوەی سەربازی بەدرێژایی سنوری عێراق ، سەرەڕای ئەوە عێراق پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئێران دانەبڕی ، لەکۆبونەوەی لوتکەی عەرەبی لەتشرینی یەکەمی ١٩٧٤ ئەرکی نێوەند گیری "وساطة"ی نێوان ئێران و عێراق خرایە سەرشانی "ئەنوەر سادات"ی سەرۆکی "میسر" و "حەسەنی دوەم"ی شای مەغریب و "شا حسین"ی شای ئەردەن.

"شا" لای هەموو ناوبژیوانە پلەبەرزەکان پێداگری لەسەر یەك مەرج دەکرد، ئەویش سازشکردنی عێراق لەسەر سەروەری نیشتمانی "شط العرب"بوو ، دەستی بەپێدانی نرخەکەی کە کوردە بەشیوەیەکی پلەبەند کرد ، بۆئەمەش

بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ"صدام"ی ئاگادارکرد کەوتی : ئەوپشتگیری سەربەخۆیی کوردەکان ناکات ، بەڵکو داوای ئۆتۆنۆمیەکی دیاریکراویان بۆ دەکات.
لەماوەی نیوان ٦ تا ١٢ی کانونی یەکەم "شا" سەردانی هەریەکە لە"ئەردەن" و "میسر"ی کرد، کێشەی سەنتەری کەباسی لێوەکرد لەگەڵیاندا مەسەلەی ناکۆکی لەگەڵ عێراق بوو.
لەماوەی نیوان ١٤-١٨ کانونی یەکەم دانوستانەکان لە "ئەستەنبوڵ" درێژەیان پێدرا ، لەسەرئاستی وەزیری دەرەوەی هەردو وڵات ، بەڵام کێشەکان چارەسەر نەکران، کەئەمەش بوە هۆی تاکبونەوەی جەبهەی لەگەڵ کوردەکان ، و گۆڕین و تۆمەتی توند لەنێوان عێراق و ئێران.
لە١٦کانونی دوەم بارزانی نامەیەکی نارد بۆ "واشنتن" تێیدا پێشنیاری ئەوەی کرد کەکوردستان بکەنە ویلایەتی ژمارە ٥١ی ئەمریکا ، ئەمریکیەکان بۆیان دەرکەوت کە نامەکە گوزارشت لەترسی ئەو دەکات لەوەی کەدەستی لێ بشۆن.
لەهەمان کاتدا "صدام" هێرشەکانی بۆسەر "شا" کەمکردەوە و تەرکیزی خستەسەر بارزانی ، لەو دیدارەدا کە لەگەڵ رۆژنامەی "ئەهرام"ی میسری لە٢١ شوباتی ١٩٧٥ سازدراوە ، "صدام" دەڵێت: ((کوردەکان بەرەبەرە خەریکە واز لەبارزانی دەهێنن ، ئەو تەنها ماوەتەوە لەگەڵ ڕاوێژکارە ئیسرائیلیەکانی)) ، لەو دیدارەدا صدام باسی لەوهاوکاریانە نەکردوە کە ئێران پێشکەشی بارزانی دەکات، وە ئاماژەی داوەبەوەی کە ئەو ئارەزوی دراوسێیەتیەکی باش لەگەڵ ئێراندا دەکات، وە باسی لەمافی عێراق لەسەرومەری نیشتمانی بەسەر "شط العرب"دا نەکردوە.
لە٢٦ی شوبات بارزانی ڕویکردە ئێران بەڵام نەیتوانی لەگەڵ "شا" کۆببێتەوە ، ئێرانیەکان هەوڵیان نەدا کە ئەگەری ڕێکەوتن لەگەڵ عێراقی لێ بشارنەوە، بەڵام هەوڵیان دا لەوەدڵنیای بکەنەوە کە "شا" پشتی تێ ناکات.

دانوستانی عێراق و ئێران بەناڕوونی مایەوە تەنها ئەوەندەی لێ بڵاوکرایەوە کە ئێران بەدرێژایی کاتە داوای دەستکاریکردنی هێڵی سنوری کردوە تاببێتە ناوەڕاستی "شط العرب" لەگەڵ یەکسانی هەردولا لەئەو مافانەی کەلەوێوە دەست دەکەوێت ، لەبواری کەشتیەوانی و گومرگ و ڕێ وشوێنە کەشتیەوانەکانی تر.

نوێنەرە عێراقیەکان نەیانتوانی ئەو حەبەتاڵە قوت بدەن کە ئێرانیەکان پێکەشیان دەکردن ، چەند چارەسەرێکی جێگرەوەیان بۆ ئەو داواکاریە پێشکەش کردن بەڵام ئێرانیەکان لەسەر هەڵوێستی خۆیان سووربوون، یان دەستکەتنی مافێکی هاوسەنگ لەگەڵ عێراقیەکان لە"شط العرب" یان هێڵانەوەی بارودۆخی ئێستا وەکو خۆی، واتە پێشکەشکردنی هاریکاری بەکوردەکان ، ئەمەش بەمانای زەرەرلێدانی گەورە لەئابوری عێراق.

"صدام حسين" گرنگی کۆنترۆڵکردنی "شط العرب"ی دەزانی لەسەرئاستی ئابوری لەهەمان کاتدا دەیزانی هەتا هاوکاری ئێران بۆ کوردەکان بەردەوام بێت ئەوا ئەو ناتوانێت سنورێك دابنێت بۆ یاخیبونی کوردەکان، کە زەرەری ساڵانە بەبڕی ٤ ملیار دۆلار لە عێراق بدات ، ئەمە جگە لەلاوازکردنی سوپای عێراق.

لەوکاتەدا "شا" بووبوە پیاوە بەهێزەکە لەکەنداودا ، جورئەتی کرد کە دو کەتیبەی تانك لەسەرخاکی عێراق بڵاوبکاتەوە کە چەکدار کرابون بە تۆپهاویژی عیار ١٣٠ ملم ، و موشەکی جۆری "هۆك" هەروەها ڕێگەی بەیەکەکانی تۆپخانەی ئێران دابوو ، کە لەناو خاکی ئێرانەوە پاڵپشتی کوردەکان بکەن ، تەنانەت کوردەکانی چەکدارکردبوو بە موشەکی دژەتانك، ئەم بارودۆخە پێشبڕکێیەکی خۆچەکدار کردنی لێکەوتەوە کەوایکرد عێراق ڕو لە یەکیتی سۆڤیەت بکات کە موشەکی "زەمین – زەمین"ی پێ بدات، بەڵام ئەو چەکە زۆر لاوازو بچوك بوو لەئاست چەکەکانی ئێران ، و سوپای ئێران کەژمارەکەی بەدووئەوەندەی سوپای عێراقی مەزەندە دەکرێت.

هاوپەیمانی ئێران لەگەڵ ئەمریکا وای لە"شا"کردبوو بیروبۆچونی خۆی سەبارەت بەدابەشکردنی عێراق بۆ سێ دەوڵەت بخاتە ڕوو، "سونی -شیعی- کوردی" بەڵام ئەو لەسەرەتادا ئارەزوی دەستبەسەراگرتنی "شط العرب"ی دەکرد.

**********************************

وەزیری کۆشکی ئێرانی لەڕۆژانەکەیدا لە٢ی ئازاری ١٩٧٥ نوسویەتی : (("هاواری بومیدیەن"ی سەرۆکی جەزائیر کە ناوبژیوانی نێوان عێراق و ئێرانی دەکرد بە"شا"ی ڕاگەیاند کە "صدام حسین" پێی وتوە لە کۆنگرەی ١٣ ولاتەکە پێشەنگی نەوت کە بڕیارە لەپایتەختی "جەزائیر" ببەسترێت لەمانگی ئازار سود وەردەگرێت بۆ گەیشتن بەڕێکەوتن لەگەڵ ئێران)).

کاتێك "شا" لە٤ی ئازار لە"جەزائیر" نیشتەوە، "بۆمیدیەن" داوای لێ کرد بەتەنها لەگەڵیدا کۆببێتەوە، کۆبوونەوەکە دوو کاتژمێری خایاند کاتێك "صدام حسین"ی سەرۆکی عێراقیش هات بۆ کۆنگرەکە "شا" لەگەڵیدا کۆبوەوە.

لە٦ی ئازاردا پاش دو کۆبونەوەی تری نیوان "صدام حسین" و "شا" سەرۆکی جەزائیر ڕایگەیاند کە ناکۆکی نێوان عێراق و ئێران کۆتایی هات ، "صدام" و "شا" بەئاشکرا باوەشیان بەیەکدا کرد، وە سوپاسی سەرۆك "بومیدیەن"یان کرد.

لەبەردەم ئەندامانی نۆپیك "بومیدیەن"وتی: ((عێراق و ئێران بڕیاریان دا کۆتایی بەناکۆکیەکانیان بهێنن ، هێڵی سنوری نیوان دوو ولاتەکە بەناوەڕاستی "شط العرب"دا دەڕوات ، عێراق واز لە داواکردنەوەی ناوچەی "خوزستان = عەرەبستان" دەهێنێت، کە دەوڵەمەندترین ناوچەی ئێرانە لەنەوتدا، لەبەرامبەردا عێراق دوسەد کیلۆمەتر چوارگۆشە لەخاکی ئێران بۆخۆی دەبات ، لیژنەیەك بۆ دیاریکردنی ئەو ناوچەیە پێك دەهێنرێت)) ، جێی بیرخستنەوەیە صدام لەساڵی ١٩٨٠ ئەم خاڵی ڕێکەوتنەکەی کرد بەبەڵگە بۆ هێرشکردنەسەر ئێرانی دوای "شا".

هەروەها ڕێكەوتنەكە خاڵێكی لەخۆگرتبوو كەدەڵێت: ((هەردولا بەڵێنیان دا بەڕێگریكردن لەهەر دزەكردنێك لەخاكی خۆیانەوە بۆ خاكی ئەوی دی ، كە بەمەبەستیكی پلانگێڕانە بێت)).

بەمانایەكی تر پاكتاوكردنی یاخیبونی كورد كە بەبێ ئێران نەیدەتوانی بەردەوام بێت.

لە١٣ی حوزەیرانی ١٩٧٥ ڕێكەوتننامەكە بو بەبۆندێكی نوسراو لەسەركاغەز و وەزیری دەرەوەی هەردوو وولات بەئامادەبونی شایەتێكی تر كە وەزیری دەرەوەی جەزائیر بوو مۆریان كرد.

(*****) ********************* (******)

لە ٢٩ی تشرینی یەكەمی ١٩٩٠ "تەها یاسین رەمەزان"ی یەكێ لە گەورەبەرپرسانی حكومەتی عێراقی بەڕۆژنامەی "گتادمۆن"ی لەندەنی وت ((ئیمزاكردنی ڕێكەوتننامەكە لەبارودۆخێكدا بوو ناچاری كردین خۆمان یەكلایی بكەینەوە لەنیوان ئەوەی كە عێراق جەنگی بەرامبەر كوردەكان بدۆڕێنێت كەهەرگیز كۆتایی نایەت، یان نیوەی "شط العرب" لەدەست بدات، بەرژەوەندی عێراق وای لێخواستین كەڕێكەوننامەكە مۆربكەین)).

"صدام" هەوڵی دەدا بگات بەسەرۆكایەتی عێراق ، پێی وابوو كە دەبێت سەرەتا لەدەستاری كورد ڕزگاری ببێت ، كەسوپای عێراقی دەهاڕی، سازشكردنی لەسەر "شط العرب" بەسازشیكی كاتی دادەنا ، كە پاش ماوەیەك دەتوانێت بیگێڕێتەوە، بە فیعلی ئەوە ڕویدا لە ساڵی ١٩٨٠ دا كاتێك ئەو وەك سەرۆكی عێراق فەرمانی دا بە هێرشكردنەسەر ئێران پاش ئەوەی وەك سەرۆكێكی "نەرمڕەو" ناسراوە كە بەپیی بارودۆخ كاردەكات.

ڕۆژنامەنوسی میسری "محمد حوسنین هەیكەل" دەڵێت: ((صدام پێی وتم كاتێك ڕومكردە جەزائیر ئەندامانی ئەنجومەنی شۆڕشی عێراق سەرپشكیان كردم لەهەر

سازشێك كەدەیكەم بەمەرجێك ئەو سازشە ناوچەی هەرێمایەتی نیشتمانی یان ئاسایشی شۆڕش نەگرێتەوە)).

***********************************

وەزیری دەربار "كۆشك"ی ئێران لەیادەوەریەكانیدا دەڵێت: ((بەرەبەیانی ٧ی ئازار "شا" لەجەزائیر گەڕایەوە ، زۆر گەشبین دیاربوو وتی: كارەكان لەكۆنگرەی ئۆپیك بەباشی ڕۆشتوون ، هەروەها لەئاستی ناكۆكی لەگەڵ عێراقیش پێویست بوو لەسەرم كە ڕوبەڕوی دووكێشەی زۆر قورس ببمەوە ، كە لەباوكمەوە بۆم ماوەتەوە، یەكەم فراوانكردنی ڕێكەوتننامەی نەوت لەگەڵ كۆمپانیای "ئەنگلۆ — ئێرانیەكان" كە ڕێڕەوەكەی درێژكرایەوە ، لەساڵی ١٩٣٣ بۆ ١٩٩٣ ، بەچەند مەرجێك كە پێدەچێت زۆر سادە بن بەنیسبەت ئێرانەوە ، وە دوەمیش ئەو ڕێكەوتننامە بوو كە ساڵێ ١٩٧٣ (؟)[1] ئیمزایكردبو، وە مافی كۆنترۆڵكردنی تەواوی "شط العرب"ی دابوو بەعێراق ، توانیم ئەم دو كێشەیە لە بەرژەوەندی ئێران چارەسەر بكەم)).

سەبارەت بەچارەنوسی كوردەكان (علام) نوسیویەتی : (("شا" فەرمانی دەركرد بۆ سەرۆكی ساواك كە بیرۆكەی ڕوكردنە ئێران بخاتە بەردەم كوردەكان ، وە لە وەلأمی شادا سەبارەت بە دۆسیەی پێدانی ئۆتۆنۆمی بەكوردەكانی عێراق وتی: ئەو بیرۆكەیە قسەیەكی پڕوپوچ و بێمانایە ئەوان بەبێ هاوكاری ئێمە تەنانەت ١٠ ڕۆژ لەبەرامبەر عێراق و سوپاكەی خۆیان پێنەدەگیرا، چوار كاتژمێرونیو لەگەڵ "صدام حسین" دانیشتین لەجەزائیر دانی بەوەدا نا كە بوونی تۆپخانەی ئێرانی بۆتەهۆی ئەوەی كە سوپای عێراقی سەركەوتن بەدەست نەهێنێت.)).

---

[1] (؟) ئەمەش دیسان پێدەچێت هەڵەی چاپ بێت ڕاستەكەی ١٩٣٧ -وەرگێر-

"علام" دەڵێت: ((عێراقیەکان لەوماوەیەی دواییدا خەریك بوون پێشنیارەکانی کوردەکانیان قبولّ دەکرد، بەڵام کوردەکان قبولّ کردنەکەیان ڕەتکردەوە بەهۆی ئەو هاوکاریانەوە کە ئێران پێشکەشی دەکردن)).

لە٢ی ئەیلولی ١٩٧٥ "محمد حوسنین هیکل" چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ شادا ئەنجام داوە و لەڕۆژنامەی "الوطن"ی کوێتی دا بڵاویکردۆتەوە ، شا لەویدا دەڵێت: ((ڕاستە هاوکاریمان پێشکەش بەکوردەکان کردوە، لەکۆتاییدا تەنها ئێمەبووین کەدەستی یارمەتیمان بۆ کوردەکان درێژدەکرد، کاتێك دەستمان لێ بەردان یاخیبوونەکە هەرەسی هێنا)).

لەوە زیاتر دەڵێت: ((کێشەمان بۆ عێراقیەکان دروست دەکرد ، ئەوانیش تورەیان دەکردین بەو پڕوپاگەندەو هەوڵانەی بۆ زیان گەیاندن بەخاکەکەمان دەیانواند، هێزێکم لەیاخیبونی کوردەکاندا دیت کەدەتوانریت سودی لێ وەربگیرێت بۆیە بڕیارم دا هاوکاری بکەم)).

پ/ چەند کاتی دەوێت تا لەوبارەیەوە بڕیار بدەیت؟

شا: یەك کاتژمێر..........

((نەمدەویست هێندە بەهێز وەڵام بدەمەوە کەعێراقیەکان ناچار بکات کوردەکان بەکاربهێنن ، لەبەرئەوەی ئێمەش کەمینەی کوردمان هەیە لەئێران، بەڵام من تەنها ویستم زللەیەك لە عێراقیەکان بدەم، کاتێك وازیان لەگێچەڵ کردن بەپاسەوانەکانمان هێنا، ئێمەش وازمان لە تەنگەتاوکردنیان هێنا بەئەو باردۆخە بڕی ٣٠٠ ملیۆن دۆلارمان لەسەرکەوت، کە ئەمە بڕێکی زۆرە بەڵام واقیع وای لێخواستین)) .

****** ************************ ******

ڕێکەوتننامەی جەزائیر کتوپڕ بوو تەنانەت بۆ وەزیرەکانی "شا"یش ، باڵویزی ئەوسای ئەمریکا لەتاران "ڕیچارد هۆڵمز" بە پەیامنێری ڕۆژنامەی "میدل ئیست

كواترلى" وت : ((من چاوەڕێی "شا"م دەكرد كاتی گەڕانەوەی لەجەزائیر لە فڕۆكەخانە بە هاوڕێیەتی ژمارەیەك كەسایەتی ئێرانی لەڕێكەوتی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ بینیم وەزیرەكان واقوڕمان بەڕوخساریانەوە دیارە، كاتێك فەرمانی دا بەڕاگرتنی هەموو هاوكاریەك بۆكوردەكان دەستبەجێ ، و داخستنی سنورەكە لەنێوان ئێران و كوردستانی عێراق بە زوترین كات)).

((بەیانی ڕۆژی دواتر لەگەڵ "شا" كۆبومەوە وەك بینیبوم پێشتر دیكتاتۆرانە دەركەوت هیچ داوای لێبوردنی لەهەنگاوە كتوپڕەكەی نەكرد كە بووەهۆی پچڕاندنی پەیوەندیەكانی ئەمریكاش لەگەڵ كوردەكان، بێگومان ئەو دەبوو بەتایبەت داوای لێبوردن لەئەمریكا بكات ، چونكە ئەو بیرۆكەی هاوكاریكردنی كوردەكانی خستەڕوو، "شا" بەهانەی بۆ هەنگاوەكەی خۆی بەوەهێنایەوە كەوتی هۆكاری هەنگاوەكەم ئەوەبوو كەبارزانی جەنگێكی ڕاستەقینەی هەڵگیرساند لەگەڵ عێراق ، لە جیاتی خۆی ئەوە بكات ، هێزەكانی خۆی لە پشتەوە كۆكردبوەوە داوای دەكرد خەڵكی تر لەجیاتی ئەو شەڕ بكەن لەگەڵ عێراق)).

"هۆڵمز" دەڵێت: ((ئەو ڕێكەوتننامەكەی وەك هەنگاوێكی ئەرێنی وەسف كرد كەئارامی بۆ ناوچەكە دەگەڕێنێتەوەو ، ئیدارەی ئەمریكاش بەخۆشحاڵیەوە پێشوازی دەكات بەڵام زوو بۆی دەركەوت كە هەڵسەنگاندنەكانی هەڵەبون)).

"كیسنجەر" زۆر بەتوندی توڕەی وەڵامی هەنگاوەكەی دایەوە كە ئەمەش بووە هۆی واقوڕمانی ، "كیسنجەر" پێی وابوو كوردەكان بەردەوام دەبن لەشەڕەكەیان و ناهێڵن عێراق داو بۆئیسرائیل بنێتەوە ، بۆیە بەم هەنگاوەی شا دڵخۆش نەبوو ، بەڵام ئەمریكا نەیدەتوانی هیچ بكات ، "شا" كۆڵەكەیەكی بنەڕەتی سیاسەتی ئەمریكا بوو لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ، ئەمریكا وەك هێمای ئارامی و ژیاری ناوچەكە لێی دەڕوانی ، ئیسرائیلیەكانیش ڕێكەوتنامەكە بۆیان زۆر كتوپڕ بوو، تەنانەت بۆ"ساواك"ی ئێرانیش.

"علام" دەڵێت: ((عێراقیەکان لەوماوەیەی دواییدا خەریك بوون پێشنیارەکانی کوردەکانیان قبوڵ دەکرد، بەڵام کوردەکان قبوڵ کردنەکەیان ڕەتکردەوە بەهۆی ئەو هاوکاریانەوە کە ئێران پێشکەشی دەکردن)).

لە٢ی ئەیلولی ١٩٧٥ "محمد حوسنین هیکل" چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ شادا ئەنجام داوە و لەڕۆژنامەی "الوطن"ی کوێتی دا بڵاویکردۆتەوە ، شا لەویدا دەڵێت: ((ڕاستە هاوکاریمان پێشکەش بەکوردەکان کردوە، لەکۆتاییدا تەنها ئێمەبووین کەدەستی یارمەتیمان بۆ کوردەکان درێژدەکرد، کاتێك دەستمان لێ بەردان یاخیبوونەکە هەرەسی هێنا)).

لەوە زیاتر دەڵێت: ((کێشەمان بۆ عێراقیەکان دروست دەکرد ، ئەوانیش تورەیان دەکردین بەو پروپاگەندەو هەوڵانەی بۆ زیان گەیاندن بەخاکەکەمان دەیانواند، هێزێکم لەیاخیبونی کوردەکاندا دیت کەدەتوانریت سودی لێ وەربگیرێت بۆیە بڕیارم دا هاوکاری بکەم)).

پ/ چەند کاتی دەوێت تا لەوبارەیەوە بڕیار بدەێت؟

شا: یەك کاتژمێر..........

((نەمدەویست هێندە بەهێز وەڵام بدەمەوە کەعێراقیەکان ناچار بکات کوردەکان بەکاربهێنن ، لەبەرئەوەی ئێمەش کەمینەی کوردمان هەیە لەئێران، بەڵام من تەنها ویستم زللەیەك لە عێراقیەکان بدەم، کاتێك وازیان لەگێچەڵ کردن بەپاسەوانەکانمان هێنا، ئێمەش وازمان لە تەنگەتاوکردنیان هێنا بەئەو باردۆخە بڕی ٣٠٠ ملیۆن دۆلارمان لەسەرکەوت، کە ئەمە بڕێکی زۆرە بەڵام واقیع وای لێخواستین)) .

****** *********************** ******

ڕێکەوتننامەی جەزائیر کتوپڕ بوو تەنانەت بۆ وەزیرەکانی "شا"یش ، باڵویزی ئەوسای ئەمریکا لەتاران "ڕیچارد هۆڵمز" بە پەیامنێری ڕۆژنامەی "میدل ئیست

كواترلی" وت : ((من چاوەڕێی "شا"م دەكرد كاتی گەڕانەوەی لەجەزائیر لە فڕۆكەخانە بە هاوڕێیەتی ژمارمیەك كەسایەتی ئێرانی لەڕێكەوتی ٦ی ئازاری ١٩٧٥ بینیم وەزیرەكان واقوڕمان بەڕوخساریانەوە دیارە، كاتێك فەرمانی دا بەڕاگرتنی هەموو هاوكاریەك بۆكوردەكان دەستبەجێ ، و داخستنی سنورەكە لەنێوان ئێران و كوردستانی عێراق بە زوترین كات)).

((بەیانی ڕۆژی دواتر لەگەڵ "شا" كۆبومەوە وەك بینیبوم پێشتر دیكتاتۆرانە دەركەوت هیچ داوای لێبوردنی لەهەنگاوە كتوپڕەكەی نەكرد كە بوومهۆی پچڕاندنی پەیوەندیەكانی ئەمریكاش لەگەڵ كوردەكان، بێگومان ئەو دەبوو بەتایبەت داوای لێبوردن لەئەمریكا بكات ، چونكە ئەو بیرۆكەی هاوكاریكردنی كوردەكانی خستەڕوو، "شا" بەهانەی بۆ هەنگاوەكەی خۆی بەوەهێنایەوە كەوتی هۆكاری هەنگاوەكەم ئەوەبوو كەبارزانی جەنگێكی ڕاستەقینەی هەڵگیرساند لەگەڵ عێراق ، لە جیاتی خۆی ئەوە بكات ، هێزەكانی خۆی لە پشتەوە كۆكردبوەوە داوای دەكرد خەڵكی تر لەجیاتی ئەو شەڕ بكەن لەگەڵ عێراق)).

"هۆڵمز" دەڵێت: ((ئەو ڕێكەوتننامەكەی وەك هەنگاوێكی ئەرێنی وەسف كرد كەئارامی بۆ ناوچەكە دەگەڕێنێتەوەو ، ئیدارەی ئەمریكاش بەخۆشحاڵیەوە پێشوازی دەكات بەڵام زوو بۆی دەركەوت كە هەڵسەنگاندنەكانی هەڵەبون)).

"كیسنجەر" زۆر بەتوندی تورەی وەڵامی هەنگاوەكەی دایەوە كە ئەمەش بووە هۆی واقوڕمانی ، "كیسنجەر" پێی وابوو كوردەكان بەردەوام دەبن لەشەڕەكەیان و ناهێڵن عێراق داو بۆئیسرائیل بنێتەوە ، بۆیە بەم هەنگاوەی شا دڵخۆش نەبوو ، بەڵام ئەمریكا نەیدەتوانی هیچ بكات ، "شا" كۆڵەكەیەكی بنەڕەتی سیاسەتی ئەمریكا بوو لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ، ئەمریكا وەك هێمای ئارامی و ژیاری ناوچەكە لێی دەڕوانی ، ئیسرائیلیەكانیش ڕێكەوتنامەكە بۆیان زۆر كتوپڕ بوو، تەنانەت بۆ"ساواك"ی ئێرانیش.

"ئیسحاق حۆفی" سەرۆکی مۆساد لە٩ی ئازاردا لەبەرامبەر حکومەت وتی: ((پێم وایە ئەو بەرپرسانەی ساواك پەیوەندیمان پێیانەوە هەبوە ئاگاداری ڕێکەوتننامەکە نەبون )).

لە ٨ی ئازار یەکێ لە گەورە پیاوانی ساواك "ب"ی بەرپرسی دەستەی مۆساد لە تاران بانگ دەکات وە بەکورتی پێدەڵێت "شا" لە کۆنگرەی جەزائیردا گەیشتۆتە ڕێکەوتن لەگەڵ عێراق ، بۆیە چالاکیەکانمان لە کوردستان ڕادەگیرێت ، لەسەر ئەوبنەمایە دەبێت تۆش هەموو پیاوەکانت لەکوردستان بکێشیتەوە هەتا ڕێکەوتی ڕۆژی سێ شەممەی ١١ی نیسان .

"ب" دەڵێت: ((کەهەستی بەسەرسوڕمانیکی زۆرکردوە ، بەرپرسەکەی ساواك پێی وتوو ە: (پێدەچێت کەئێوە لە بەریتانیەکانەوە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆریەت فێر نەبووبن ، دەبێت لەگەڵ کوردەکان وەك بەکرێگیراو مامەڵە بکەیت، کاتێك ئەرکەکەی تەواو بوو ، چیرۆکەکەشی تەواو دەبێت)).

((باشتر وایە کە ئیسرائیل پشتگیری لەڕێکەوتننامەکە بکات، چونکە کێشەی سەرەکی ئیسرائیل عێراقە ، بۆیە بەرژەوەندی ئەو وا دەخوازیت کە پشتگیری لەو دەستکەوتە بکات کە ئێران لە "شط العرب" بەدەستی هێناوە)).

کاتێك "ب" بروانەبونی خۆی بەقسەکانی پێ ڕاگەیاندبوو ، پیاوەکەی ساواك وتبوی ((لاوازی ئیسرائیل لەوەدایە هەست و سۆز و سیاسەت تێکەڵ دەکات، یارمەتیدانی کەمینە نابێت خۆی وەك ئامانج سەیربکرێت ، بەڵکو هۆکارێکە بۆ سازشکردن بە زۆرینە ، لەم حاڵەتەی ئێمەدا وەك عێراق)).

((سیاسەتی باش ئەو سیاسەتەیە کە بزانرێ کەی دەست ڕادەگیرت لە یارمەتیدانی کەمینە تا زۆرترین سازش بە زۆرینە بکەیت)).

"ب" بەپەلە پەیوەندی دەکات بەسەرۆکی شاندی ئیسرائیلی لە کوردستان ، فەرمانی پێدەکات خۆی و ئەندامانی تاقمەکەی بگەڕێنەوە بۆ تاران پاشان پەیوەندی بە "حۆفی" سەرۆکی مۆسادەوە کردو پێی وت کە چی ڕویداوە.

"ناحوم ئەدمۆنی" کەئەوکات جێگری سەرۆکی مۆساد بوو دەڵێت: ((هەواڵەکە وەك هەورەبروسکە وابوو بەرمان بکەوێت، سەرۆکی مۆساد زوو "ئیسحاق رابین"ی سەرۆکی حکومەتی لەمەسەلەکە ئاگادارکردەوە ، ئەویش لە٩ی ئازار لەبەردەم حکومەتی ئیسرائیل دا ڕایگەیاند "ئێران و عێراق گەیشتونەتە ڕێکەوتنێك بۆ دەست بەردار بون لەکوردەکان")).

** ** ** ********************** ** ** **

لەڕاپۆرتەکەی "بێیك"دا هاتوە ((کوردەکانیش واقیان وڕما بە ڕێکەوتنەکە لەکاتی ئیمزاکردنی ڕێکەوتننامەکەدا بارزانی لە تاران بوو، لەوێ "ناسیری" سەرۆکی ساواك لەڕێکەوتننامەکە ئاگاداری کرد ، کەبەمانای داخستنی سنوری ئێران لەگەڵ کوردستان و چۆڵکردنی دەستبەجێی هێزە ئێرانیەکانە و پێدانی ڕێوجێ بە جەنگاوەرە کوردەکان لە ئێران.

لەو بروسکەیەدا نوێنەری ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکا "سی ئای ئەی" ناردویەتی بۆ بەرپرسەکانی لە واشنتن وتویەتی ((نوێنەریکی ساواك چونە سەرکردایەتی کوردەکان و پێیان وتون :

- سنوری دادەخرێت بەڕووی هەمواندا ، دوبارەی دەکەوە بە ڕووی هەر جوڵەیەك .
- نابێت کوردەکان چاوەڕوانی هیچ هاوکاریەك بن لە ئێرانەوە .
- دەبێت کوردەکان بگەنە ڕێکەوتن لەگەڵ عێراق ، جا مەرجەکانی عێراق هەرچیەك بن.

- ڕێ و شوێن بۆجەنگاوەرە کوردەکان دابیندەگرێت لە ئێران بەمەرجێك بە شیوەی کۆمەڵی بچوك بچوك بێت و هەمو چەکەکانیان تەسلیمی سوپای ئێران بکەن.

سەرکردە واقورماوەکانی یاخیبون ، کۆبونەوەیەکیان بە ئامادەبونی "مەسعود" و "ئیدریس" گرێ دا کە دوو ڕۆژی خایاند ، جامی غەزەبی خۆیان بەسەر جیهانی ڕۆژئاوادا ڕژاند کە وازی لێ هینان و سەرنەوی کردن، سەرەتا بڕیاریان وابوو کە بەردەوام بن لەجەنگ ئەگەر پشتیشیان لەدیوار بێت، بەڵام بڕیاریان دا چاوەڕێ بکەن تا بارزانی لە تاران دەگەڕێتەوە.

لە١٠ی ئازار سەرکردایەتی یاخیبون ئەم بروسکەیەی بۆ "کیسنجەر" نارد : ((بێئومێدیەکی تەواو لەنێو هێزەکانماندا بڵاوبۆتەوە مەترسیەك کە پێشتر وێنەی نەبووە بەسەر گەلەکەماندا دێت و دەچێت ، ویرانکاری گشتگیر چاوەڕیمانە ، هیچ هۆکارێك نیە بۆ ئەوە ، ئێمە ڕوو لە تۆ و لەحکومەتەکەت دەکەین تا تەداخول بکەن لەسەربنەمای ئەو پەیمانانەی کە پێت داوین ڕێگەنەدەن کوردی هاوپەیمانتان هەرەس بهێنێت، ژیان و شەرەفی خێزانەکانمان ڕزگار بکەن ، هەوڵبدەن چارەسەرێکی سەربەرزانە بۆ کێشەکانمان بدۆزنەوە)).

نوێنەری ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکی "سی ئای ئەی" لەتاران بروسکەیەکی بۆ بەرپرسانی لەئاژانسەکە ناردوە تێیدادەڵێت: ((ئەگەر ئەمریکا بەزوویی ئەم دۆسیەیە چارەسەر نەکات ئەوا کوردەکان پێیان وادەبێت ئێمە دەستبەرداریان بوین ، لەوانەیە هەرچی ڕویداوە ئاشکرای بکەن ، هەنگاوەکەی ئێران تەنها ئومێدە سیاسیەکەی نەڕوخاندون بەڵکو ژیانی هەزارانیشی خستۆتە مەترسیەوە)).

بارزانیش بروسکەیەکی لەتارانەوە بۆ "کیسنجەر" نارد کە پێ دەچێت لە کاتی یەکێ لە گەشتەکانیدا بۆ خۆرهەڵاتی ناڤین کە بەمەبەستی ناوبژیوانی نێوان میسر و ئیسرائیلی دوای جەنگی ١٩٧٣ ئەنجامی دەدا، بەدەستی گەیشتبێت، بارزانی

له بروسکەکەدا دەڵێت: ((هەمیشە باوەڕم بەچارەسەری ئاشتیانە هەبووە بۆ ناکۆکیە نێودەوڵەتیەکان بەناکۆکی نێوان عێراق و ئێرانشەوە بەڵام دڵمان خوێنی لەبەردەڕوات دەبینین کە ئەنجامی ئەو ڕێکەوتنە لەناوبردنی گەلەکەمانە، و توانای بەرگری لە خۆکردنی نیە، لەبەرئەوەی ئێران سنورەکانی بە ڕوماندا داخستوە، لەکاتێکدا کە عێراق توندترین و دڕاندانەترین هێرش دەکاتە سەرمان، ئازادیەکەمان و میللەتەکەمان دەکوژرێن لەکاتێکدا هەموان بێدەنگ بون ، ئێمە پێمان وایە ئەمریکا لەڕوی ئەخلاقیەوە بەرپرسە لەئاست گەلەکەمان ، کەپاپەندە بە سیاسەتی وڵاتەکەتانەوە)).

((لەسەر ئەوە بنەمایە ئێمە داوا لە ئەمریکا دەکەین کە هەنگاوی بەپەلە بهاوێژێت و بەخێراترین کات لەم دۆسیانەدا :

- وەستاندنی ئەو هێرشەی دژمان بەردەوامە، و کارکردن بۆ دروستبوونی گفتوگۆ لەنێوان ئێمە و عێراقیەکان تا بە لایەنی کەمەوە ئاسایشی پیاوەکانمان بپارێزرێت.
- هەمو فشارەکان بخرێتەسەر ئێران تا وای لێ بکرێت یاریدەی پیاوەکانمان بدات لەم چرکەساتە مێژوییە کارەساتیەدا ، بەنیسبەت ئێمەوە بەجۆرێك کە توانای خۆبەڕێوەبردنیان هەبێت ، پاڵپشتیمان بکەن لەسەر خاکی خۆمان تاکێشەکەمان چارەسەرێکی بۆ دەدۆزرێتەوە لەچوارچێوەی ڕیکەوتنێکی گشتگیردا ، ئێمە بەترسەوە چاوەڕێی دەکەین، لەوەدڵنیاین کە ئەمریکا لەم قۆناغە یەکلاکەرەوەو کارەساتبارەدا ڕۆڵی تەماشاکەر ناگێڕێت)).

"شا" ڕازی بوو بارزانی ببینێت لە١١ی ئازاری ١٩٧٥ هات بۆلای "شا" لەگەڵ "دکتۆرمەحمود" و باڵویزی کورد لە ئێران "شفیق القزاز" سێ کەسی ئیهانەکراو و سەرسوڕماو تا سەر ئێسقان.

"دکتۆرمەحمود" دواتر بە "قزاز" دەڵێت: ((شا زۆر توندبوو وتی: کەزۆر قووڵتر لەوەی پێشبینی دەکرد لەجەنگدا ڕۆچوە، کاتێك هاوکاری کوردەکانی قبوڵ کردوە ئەو جەنگە کۆڵ و بارێکی قورس بوە پێویست بوو کە بگاتە ڕێکەوتن لەگەڵ عێراق ، ئەو نازانێت کەعێراقیەکان پابەندی ڕێکەوتننامەکە دەبن یان نا، بەڵام پێی وایە کە ئەرك نیە لەسەری هاوکاری کوردەکان بکات)).

شا بەردەوام بوو : ((سنوری ئێران ۳ ڕۆژ والآدەبێت لەبەردەستاندا بۆ ئەو کوردانەی کەئارەزو دەکەن پەنابەرنە بەر ئێران لێرە بە گەرمی پێشوازیان لێ دەکرێت و کاریان پێ دەدرێ بەوێنەی هاوڵاتیە ئێرانیەکان پاشان سنور دادەخرێت)).

"دکتۆرمەحمود" بەتوڕەییەوە وتی : ((ئایا خەباتی کەسانێك کە بەخۆیان و ماڵ و منداڵیانەوە قوربانیان داوەو قوربانی دەدەن ، لای تۆ وەك ئیمزاکردن یان ئیمزانەکردنی ڕێکەوتنیك بۆئەو یان ئەملایان وایە و یەکسانن، کاتێك بەڵێنی هاوکاریت پێداین بە یەك وشە چیە باسی پاشەکشەت نەکرد؟)).

"شا" بەتوڕەییەکی زیاترەوە قسەکەی پێ بڕی : ((من بڕیاری خۆمت پێ دەڵێم هیچ بوارێك بۆ مشتومڕ و گفتوگۆ نیە)).

بارزانی بەبێ دەنگی گوێی لەقسەکانی "شا" و "دکتۆرمەحمود" گرتبوو ، بەبێ دەنگیش لەگەڵ هاوڕێکانی شوێنەکەی بەجێ هێشت ، بێئومێدی و تاسانەکەی زۆر لەوەگەورەتربوو، کە توانای ئەوەی هەبێت قسەیەك بکات یان داوا لە "شا" بکات کە بەبڕیارەکەیدا بچێتەوە.

هەندێك ڕاپۆرت ئاماژە بەوەدەکەن کە "شا" هەڕەشەی لە بارزانی کردوە کە ئەگەر کوردەکان تا ١ی نیسان چەکەکانیانَ دانەنێن ئەوە ئێران خۆی هێرش دەکاتە سەریان.

وەزیری دەربار لەڕۆژانەکەیدا دەڵێت: (("شا"م بینی ڕۆژێك لە دوای بینینی بارزانی لەبارودۆخیکی دەروونی باشتردا بوو ، چونکە لەبەرامبەر سەرکردەکانی

یاخیبووندا هەستی بەخەجاڵەتی دەکرد بەتایبەت کە لەگەڵ سەرکردەی یاخیبوان ڕووبەڕووبوەوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەگەر هاوکاریەکانی ئێران نەبوایە دەمێك بوو یاخیبونی کورد کۆتایی پێهاتبوو)).

((ئێرانیەکان نزیکەی ١٠٠ تۆپهاویژی گۆڕەپان و ژمارەیەکی زۆر موشەکی "سام"یان خستبووە خزمەتی جەنگی کوردەکانەوە ، دەبوو ئێرانیەکان هەموو ئەو چەکانە لەناوبەرن چونکە نەدەتوانرا بیگێڕنەوە)).

((کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تۆمەتبارمان دەکات بەئەو چارەنوسەی کوردی تێ کەوتوە ،بەڵام کۆمەڵگا نازانێت چارەنوسیان چی دەبوو ، ئەگەر هاوکاری ئێمە نەبوایە ، بەهەرحاڵ سەربەخۆیی کورد لەگەڵ بەرژەوەندی ئێمەدا نەدەگونجا)).

** ************************ **

بارزانی لەئێران گەڕایەوە لە١٦ی ئازاردا لەگەڵ سەرکردایەتیەکەی کۆبوەوە ، لەگەڵ گەورەبەرپرسان و ڕێکەوتننامەی ئێرانی لەگەڵ عێراق وەك دواکەوتنێکی کاتی لەئامانجەکانی کورد وەسفکرد و وتی: کە لە٩٠٪ متمانەی هەیە کە بارودۆخەکان زۆر لەجاران باشتر دەبن ، بەڵکو هەندێك کەس دەڵێن کەبارزانی باسی لە هێرشکردنەسەر ناوچەی "ڕەواندز" کردوە.

ئەو تێبینی و ئاماژانەی کەبارزانی خستنیەڕوو بەنیسبەت واقوڕمان و تاسانی ئەندامەکانی سەرکردایەتیەوە کتوپڕ بوو، کاتێك بارزانی چووەدەرەوە لەدەوری "قەزاز" کۆبونەوەو پرسیاریان لەسەرچاوەی گەشبینیەکەی بارزانی کرد ، قەزاز نەیتوانی وەڵامیان بداتەوە دەرکەوت کە بارزانی یان شتێکی زانیوە و بە هاوڕێکانی نەوتوە ، یان تەنها ویستویەتی گەشبینیان بکات و وورەیان بەرز بکاتەوە لەو چرکە ساتە ناڕەحەتەدا.

بەڵام گەشبینی تەواو بوو ، وردبوو بۆ چەندەها پارچە پاش تێپەڕینی دوو ڕۆژ لە ١٦ ئازار دووبارە بارزانی لەگەڵ هاوڕیکانی کۆبوەوە پێی وتن: ((ئێمە تەنها

ماینەوە بەبێ هاوڕێ .... من لەمەودوا ناتوانم سەرکردایەتی یاخیبوون بکەم ..... دەڕۆم بۆ ئێران)).

((ئێران لە٣٠ی ئازار سنورەکانی لەگەڵ ئێمەدا دادەخات، تورکیا سنورەکانی داخستووە سوپای عێراق ڕێگا بەرەو باشور و خۆرئاوا دەگرێت، باوەڕناکەم هیچ ئومێدێك مابێت، بەڵام ئەگەر هەرکەسێکتان دەیەوێت لەجیاتی من سەرکردایەتی خەبات بکات ، تەواوی هاوکاری و پشتگیری خۆمی پێ دەدەم)).

هەندێك لەسەرکردەکانی داوای مۆڵەتێکیان لەبارزانی کرد تا وتەکانی ئەو لەگەڵ جەنگاوەرەکانیان تاوتوێ بکەن لەکاتێکدا زۆرینەیان بەوپەڕی بێئومێدیەوە شوێنەکەیان بەجێ هێشت، کاتێك وتەکانی بارزانی بڵاوبووەوە ، فەوزایەکی گەورە لە ناوپێشمەرگەکاندا دروست بوو، هەندێك چەکەکانیان شکاند ، هەندێکی تر هەڵیاندایە شیو و ڕوبارەکانەوە ، هەندێکی تریان هەڕەشەی خۆ کوشتنیان دەکرد.

بارودۆخ زۆر خراپ بوو، جەختی لەوە دەکردەوە کە نومیدەکان هەرەسیان هێناو خەونەکان بەباچوون ، ئەو دوو ئەگەرەی کە مابوونەوە یان ڕاکردن بوو بۆ ئێران یان مانەوە لەعێراق بەئومێدی ئەوەی کەحیزبی بەعس لێبوردنیکی گشتی دەربکات واتە ڕاگواستن یان بەندینخانە یان کوشتن.

بڵێێ چی بووبێت کەگەشبینی بارزانی لە١٦ی ئازارەوە هەڵگەڕایەوە بۆ بێئومێدیەکی ڕەها لە ١٨ی ئازار؟

هەندێك کەس دەڵێن : هۆکارەکەی ئەو ڕوداوانە بوون کە لە ١٧ی مانگ ڕویاندا کەهەردوو وەزیری دەرەوەی ئێران و عێراق کۆبونەوەو لەسەر شێوازەکانی جێبەجێبکردنی ڕێکەوتنەکە ڕێکەوتن ، وەزیری عێراق بۆ وەزیری ئێرانی ڕون کردبووەوە کە دەبێت کوردەکان چەك دابنێن کاتێك ئێرانیەکان ئەوەیان بۆ کوردەکان ڕونکردەوە و ئاگاداریان کردبوون ، کەئەگەر وانەکەن ئەوا جەبهەی

عێراق ئێران لەدژی ئەوان کاردەکات ،هەندێك کەس دەڵێن کە ئەمریکیەکانیش لەو بارەیەوە نامەیەکیان بۆ بارزانی ناردوە.
لە٩ی ئازار "بەکر" و "صدام حسين" بەنامەیەك وەڵامی داخوازیەکی کوردەکانیان دایەوە کەداوایان کردبوو عێراق دانوستانیان لەگەڵدا بکات ، بۆ چارەسەری کێشەکان ، تێیدا هاتووە ((بۆئەوانەی کە ناویان لەخۆیان ناوە "مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کورد" ئێمە سورین لەسەر خاوێن کردنەوەی عێراق لە خیانەتکار و ڕاکردوان ، ئەوانەی کەزیانی مرۆیی گەورەیان لە عێراق و گەلی عێراقی داوە ، کەمەحاڵە مێژوو بیری بچێتەوە)).
تاکە ئومێد کەدرا بەکوردەکان ئەوەبوو کەحکومەتی عێراق لە ١ی نیسان لێبوردنێك دەردەکات.
کارەکان زۆر بەخێرایی دەڕۆشتن فەرمان بۆهێزە ئێرانیە جێگیربوەکانی ناوچەکوردیەکان دەرچوو کە بەهەموو چەك و پێداویستیەکانیانەوە بکشێنەوە بۆ ناوخاکی ئێران، ئیسرائیل و کوردەکان بڕوایان بەچاوی خۆیان نەدەکرد ئەوان هاوبەشەکانیان لەجەنگدا دەبینی کەجانتاکانیان کۆدەکەنەوەو ناوچەکە جێ دەهێڵن، پاش ٨ کاتژمێر لەئیمزا کردنی ڕێکەوتننامەکە ئێران ٤٢ تۆپهاوێژی مەیدانی بەتەقەمەنی و خۆراکەوە لەمەیدانی جەنگ کشاندەوە.
** ******************************** **
لەڕاپۆرتێکی نهێنی دا "ئیسحاق ڕابین" دەڵێت: (("کیسنجەر" ئەوکاتە لە ئیسرائیل بوو بەدرێژی لەگەڵی دانیشتم پێی وتم کە ئەوان ڕاگەیاندنی فەرمی ڕێکەوتنەکەیان لە٨ی ئازار پێگەیشتووە.
** ******************************** **
جێی بیرخستنەوەیە زۆر لایەن ڕێکەوتننامەی عێراق و ئێرانیان بەڕێکەوتننامەی میسر وئیسرائیلەوە دەبەستەوە ، چیرۆکی پەیوەندی نێوان ئەم دو ڕێکەوتننامەیە لەوگرفتانەوە دەست پێ دەکات کە لەبەردەم وەزیری دەرەوەی ئەمریکایی "هێنری

کیسنجەر" پەیدادەبون لەگەشتە بازنەییەکان ، کە بەخۆرهەڵاتی ناڤین دا دەیکرد لەنێوان میسر و ئیسرائیل دا ، تائەوەی ناوی نابوو ڕێکەوتننامەی سینای دووەم بەدەست بهێنێت، یەکێ لە لایەنەکانی لەو گەشتانەدا ئاماژەی بەئۆپۆزسیونی سووری کردبوو ، ئەمەش وایکرد کە "کیسنجەر" بیر لەئیمکانیەتی سەرقاڵ کردنی سوریا بکاتەوە ، بەمەسەلەیەکی ترەوە بۆ نمونە عێراق کە بە سەرسەخترین دوژمنی سوریاییە سەرسەختەکان دادەنرێت، کە لەو ماوەیەدا دوژمنایەتیکردنی سوریای خستبووەلاوە بەهۆی ڕووبەڕوبونەوەی ئێرانی و کوردەکان)) .

لەوانەیە "کیسنجەر" بیری لەوەکردبێتەوە کەئێران و عێراق ڕێك بکەون لەسەرنەهێشتنی ناکۆکیەکانیان ، ئەمە خۆڵ لەسەر کێشە سیاسیەکانی نێوان عێراق و سوریا لادەبات و وەدەریان دەخات، هاوڕێ خۆشەویستەکەی "کیسنجەر"یش "ئەنوەر سادات"ی سەرۆکی میسر چاك دەیزانی ئەو ڕێککارییە چۆن دەکرێت بە تایبەت کە ناوبژیوانی دەکرد لەنێوان عێراق و ئێران.

جێی بیرخستنەوەیە کە سوریا بەخراپترین و ناشرینترین وەسف وەسفی عیراقی کرد لەپاش ڕێکەوتننامەی نێوان عێراق و ئێران ، "الاسد"ی سەرۆکی سوریا بەپلانیکی نهێنی ئیمپریالیزمی وەسف کرد کە بریتیە لەتەسلیمکردنی خاکی عەرەب "عەرەبستان" بە دەستێکی بیانی و خیانەتە لەشۆڕش و بەمەش ناکۆکیەکانی نێوان عێراق و سوریا دەستی پێکردەوە ، لەئەیلولی ١٩٧٥ دا میسر و ئیسرائیل ڕێکەوتننامەی "سینای دووەم"یان مۆرکرد.

** ****************************** **

ئێرانیەکان بەئیسرائیلیەکانیان وت: کە چەند هەڵبژاردنێکیان خستۆتە بەردەم کوردەکان: ڕاگرتنی شەڕ یان مانەوە لەخاکی عێراق و گەیشتن بەڕێکەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراق سەبارەت بە بارودۆخیان ، و گواستنەوەی ٣٠ هەزار جەنگاوەری کورد بۆ ئێران ، ئەم هەڵبژاردنەی دواییان بەبڕوای سەرۆکی مۆساد ئامانج لێی

دروستکردنی هەڕەشەیەکی هەمیشەیی بوو لەسەرعێراقیەکان بۆ گرەنتیکردنی پابەندبونیان بە ڕێکەوتننامەکانەوە.

لە٢٠ی ئازار وەزیری دەرباری ئێران "علام" لەیادەوەریەکانیدا نوسیویەتی : ((کوردەکان داوای ماوەیەکی زیاتر دەکەن تابتوانن خێزانەکانیان بپەڕێننەوە سنوری ئێران ، بارزانی لەچارەنوسی خێزانی کوردەکان دەترسێ ، "شا" سووربوو لەسەر ئەوەی کە هیچ زیانێك بەخێزان و منداڵی کوردەکان نەگات، عێراقیەکان دەبیت پابەند بن بەم داواکاریانەوە ، بەڵام گرانە کە باوەڕ بەکوردەکان بهێنی کەعێراقیەکان پابەند دەبن ، "شا" پێشنیاری کردوە کە خیزانەکان بخرێنەژێر پارێزگاری "خاچی سور"ەوە و پەیمانی داوە بەڕێکخستنی ئەو بارودۆخە لەبەرئەوەی هیچ ڕێیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو ئەگەر کوردەکان بیانەوێت ڕێز لە ڕێکەوتننامەی ئێرانی و عێراقی بگرن.

((باڵوێزەکەمان لەئەردەن لە ٢١ی ئازار هاتبووە تاران و نامەیەکی لە "شا حسین"ی شای ئەردەنەوە هێنابوو کە لیستێکی بەناوی چەند ناسیۆنالیستیکی کوردەوە تێدابووکە خەریکی پلانێکن دژی "شا")).

** ******************************** **

بارزانی دەبوو یەکێك لەم سێ ڕێگایانە هەڵبژێرێت کە شیرینترینیان لە هەمویان تاڵ تر بوو:-

یان بەردەوام دەبێت لەشەڕ و پشتی بەدیوارەوە بێت یان تەسلیم ببێت بەعێراق یان وەك پەنابەر ڕوبکاتە ئێران ، ئەوەی کۆتایی هەڵبژارد ، ئەو کوردانەی کەلەگەڵیدا هاتن دوای خۆیان ئاگریان لە ماڵەکانیان بەردا لەکاتێکدا هەندێچکی تریان خۆیان کوشت ، هەندێکی تریان سەرکردەکانی خۆیان کوشت کە پێی وتبون خەباتەکەت گەیشتە هێلی کۆتایی ، لەکاتێکدا ١٠ هەزار جەنگاوەر بڕیاریان دا هەتا مردن بجەنگن.

## بەشی بیست و نۆهەم / بینینی گەلێك كە دەمرێت

عێراقیەكان ڕایانگەیاند كە (١٣٥) هەزار كورد سنوریان بڕیوە بۆ ئێران و چوونەتە ئەو وڵاتە، بەرلەوەی حكومەتی عێراق لێبوردنی گشتی بۆكوردەكان ڕابگەیەنێت، وە (٩٠)هەزار كورد خۆیان تەسلیم كردەوە دوای ئەوەی عێراقیەكان لێبوردنەكەیان دەركرد.

"د.محمود" كەسنوری بڕی بەرەو توركیا دەڵێت: ((نزیكەی (٥٠٠٠) منداڵ و ژن و پیرەپیاوی كورد مردن لەكاتی ڕاكردنیان بەشاخەكاندا لەباكوری عێراق بەهۆی بارودۆخی سەختی ئاوهەواوە كەپلەی گەرمی هاتبوە ژێرسفرەوە، ئێستاش هەزاران پەنابەر لێرەولەوێ لەسەرسنوری ئێران وتوركیا دەژین ، چاوەڕێی ئەوەن یەكێ لەو وڵاتانە ڕێگەیان بدەن ، بەڵام ئەو دوو وڵاتە سنوریان بەڕوودا داخستون.

** ****************************** **

سوپای عێراقی زۆر بەخێرایی بەبێ هیچ بەرەنگاربونەوەیەك ناوچەكانی كۆنتڕۆڵ كرد بەڕێرەوە شاخاویەكانی نێوان عێراق و ئێرانیشەوە ، و چەند ئەفسەرێكی عێراقی بەڕازیبونی ئێران چونە ئەودیو سنور بۆ ناو ئێران تا بەتەواوی لەوە دڵنیابن كە سنور داخراوە، و لە (٣) نیسانی ١٩٧٥ لە ڕێگای "حاجی ئۆمەران"ەوە ئەو ڕێگایەی كە هاوكاری پێدا دەهات بۆ كوردەكان گەڕانەوە.

لەلێداونێكیدا سەرۆك "بەكر" وتی: ((ئەمە ڕوداوێكی مێژویی گەورەیە ، بزوتنەوەی ترسناكی یاخیبونی كۆنەپەرستمان بەتەواوی سەركوتكرد و لە ناوبرد كە لەچەند بەشیكی باكوری عێراقدا ڕەگیان داكوتابوو)).

وە لەو دیدارەدا كە هەردو پەیامنێری ئاژانسی "UBI" و "ڕۆیتەرز" لەگەڵی ئەنجامیان داوە ، بارزانی دەڵێت: ((پێكدادانەكان تەواوبوون ، و ئێمە بەبێ هاوڕێ ماینەوە ، مژدەی زەمەنێكی ڕەش بەسەرماندا باڵی كیشاوە، مەترسی كوشتن هەڕەشە لە نیوملیۆن ڕۆڵەی گەلەكەم دەكات ، تەنها مەگەر بەرلەوەی بكوژرێن بتوانن ڕاكەن بۆ ئێران)).

((سەربازەکانمان بەبێ دۆڕان گۆڕەپانیان چۆڵ کرد ، ئێمە لە گۆڕەپانی سیاسەتدا دۆڕاین ، ئەمەش بۆدەوڵەتیکی بیانی دەگەڕێتەوە،لەوانەیە ئەمریکا)).
لەودیدارەدا داوای لە جەنگاوەران کرد کە ڕابکەن تانەبنە نێچیری سوپای عێراق کە زۆر بەپەلە بەرەو باکور دەهات و ، سنوریش بەرمبەرە بەڕویاندا دادەخرا.
بارزانی دەستیکردەوە بەتۆمەتبارکردنی ئەمریکا و ئێران ، و وتی: ((پەیمانیان پێداین هاوکاری نافەرمیمان پێ بدەن ، جەختیان لەوە کردەوە کە لەکاتی کێشەدا بەجێمان ناهێڵن ، بەلاَم ئێران لە ڕێکەوتننامەکەدا مەسەلەی کوردی بەعێراق فرۆشت ، پێدەچێت هەردوو دەوڵەت کەبەرژەوەندی تایبەتیان لەوەدابێت، ڕێکەوتنی ئەوان لەسەر حسابی ئێمە بوو)).
ئەو پزیشك و کارمەندانەی کە سەردانی ناوچەکەیان کردوە دەڵێن: ((برسێتی لەوگوندانەدا زۆرە ، ژمارەیەکی زۆر منداڵ مردون، هەزارانی تر لە(١٥) ڕۆژی داهاتوودا بەهۆی کەمی خۆراکەوە دەمرن ، هەزاران پەنابەری کوردمان بینیوە لەڕێگا بەرەوسنوری ئێران ، سەدان جەنگاوەری بارزانی کە لەسەر خاڵە سنوریەکان چەکەکانیان تەسلیم دەکرد بەرلەوەی بپەڕنەوە بۆخاکی ئێران)).
حکومەتی تورکیا ڕەتی کردەوە ڕێگە بدات بەپەنابەران بچنە ئەو دیو سنورەکان بەبیانوی ئەوەی عێراق لێبوردنی گشتی دەرکردوە، لەلایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە ئێران سنورەکانی خۆی والاَکردوە، بەلاَم لەڕاستیدا تورکیا لەوپەیوەندیە دەترسا کە لەنێوان کوردەکانی دوو جیلی داهاتوو کەدەهاتن لەگەڵ کوردەکانی تورکیا دا دروست بووبوو ، دەترسا لەوەی ئەم پەیوەندییە لەبەرژەوەندی کورد بێت.
لەڕاپۆرتەکەی "بێیك"دا هاتوە ، کەزیاتر لە (٢٠٠) هەزار پەنابەری کورد سنوری ئێرانیان بڕیوە ، کاتیکیش لەسەربازگەکان کۆکراونەتەوە ، ئەمریکا و ئێران هاوکاری پێویستیان نەکردون، پاشان ئێران (٤٠) هەزار کەسی بەزۆر ناردونەتەوە بۆعێراق.
"ئەمریکا"ش ڕەتیکردۆتەوە هیچ کەسێك لەوان وەك پەنابەر یان پەنابەری سیاسی بچێتە خاکەکەیەوە ، هەرچەندە مەرجی یاساییان تیدایە.

## بەشی سییەم / مەرگی ئەفسانەیەك

بارزانی و شوێنەکەوتوەکانی لە٢٦ی ئازاری ١٩٧٥ سنوری ئێرانیان بڕی لەکێلگەیەکی دابڕاو لە "نەغەدە" نیشتەجێ کران، کە ٨٥ کیلۆمەتر لە "ڕەزاییە"وە دورە لەژێر چاودێرییەکی توندی ساواك دا.

ڕۆژنامەنوس "جۆن کرافت" کە لەکێلگەکەدا سەردانی بارزانی کردوە دەڵێت: (( بێگومان شوێنەکە فراوان و خۆشە و حەوزێکی مەلەکردنی تێدایە ، لەگەڵ ئامێری تەلەفزیۆن و پیانۆ و سەندەڵی پڕ لەگویزو فستەق و پرتەقاڵ و سێوی لێیە)).

هەر لەڕاپۆرتەکەیدا کە لە٢٥ی چواری ١٩٧٥ لە ڕۆژنامەی "دافار"ی ئیسرائیلی دا بڵاویکردۆتەوە دەڵێت: (( بارزانی لەژێر پاسەوانیەکی توندی ئێرانیەکاندایە ، وە جلوبەرگە کوردیەکەیان گۆڕیوە بە قات و بیجامەیەکی هەرزانی ڕەساسی ، کە زۆر فشە لەبەریدا ، سەرەتا لێپرسراویەتیەکەی خستەسەر سیاسەتی جیهانی ، پاشان لێپرسراویەتیەکەی کورتکردەوە لەسەر یەکیتی سۆڤیەت کە چەك و فرۆکە و تانك و ڕاهێنانی بەعێراقیەکان کردوەو فرۆشتوە)).

((بارزانی دانی بەوەداناوە کە لەم ساڵانەی دوایدا ئێرانیەکان قورساییەکی زۆریان هەڵگرتوە وتی: ئەگەر بەردەوام بوینایە لەگەڵ جەنگ ئەوە ژن و منداڵەکانمان تێدادەچون، جەنگ بە هیچ ئەنجامیکی باشی نەگەیاندین جگە لەکوشتنی هەزاران کەس ، وە لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا کە ئایا یاخی بونی کورد بۆ هەمیشە کۆتایی هات؟ یان بۆی هەیە گەلی کورد سەر لەنوی بژێتەوە؟ ووتی: من ناوچەکەم جێ هێشتوەو باوەڕناکەم هەرگیز بگەڕیمەوە بۆی)).

** ******************************** **

بەمشێوە لە ٧٢ هەم ساڵی تەمەنیدا بارزانی بۆی دەرکەوت کە ڕۆمانی ژیانی تەواو دەبێت ، لەماوەی مانەوەیدا لەتاران ٣ هەوڵی سەرنەکەوتو بۆ تیرۆرکردنی درا، بەڵام ئیتر هیچ ئومێدێکی نەمابوو بە دوبارەگەڕانەوە بۆ کوردستان و ئەنجامدانی

گەشتە درێژەکانی بەچیا بەفرینەکانیدا ، کۆتایی بە چیرۆکەکە هێنا بەرلەوەی دیاری بکات کە کێ لە دوای ئەو بەردەوامی پێ دەدات.

سەبارەت بەو هۆکارانەی کە بارزانی بۆچی میراتگرێکی بۆ بەردەوامی خەبات دەستنیشان نەکرد ، "دکتۆر کریم" دەڵێت: ((بارزانی دەیویست دەستکەوتێك بۆ گەلەکەی دەستەبەر بکات بە مەرجێك خۆی خاوەنی بێت، خۆپەرست بوو تەنانەت لەئاست منداڵەکانی خۆشیدا ، پێی وابو کە تەنها خۆی دەتوانێت ئەو دەسکەوتە دەستەبەربکات، دەیویست بۆخۆی بیبات و بەناوی ئەوەوە بێت، بەم هۆیەوەبوو لە١١ی ئازاری ١٩٧٥ بەملکەچی خۆی لەبەردەم "شا" دیتەوە هەرچەندە لەو گەورەتریش بو، نازانم بەردەوام دەبێت یان نا، ئەو پێی وانەبوو هیچ لایەنێکی تر بتوانێت دەست بەو گۆچانی سەرکردایەتیەوە بگرێت ، کەخۆی ساڵانێکی درێژ بەدەستیەوە بوو)).

بارزانی بەرەبەرە هەستی بەئازاری سنگ دەکرد لەلای ڕاستیەوە، پیشکنینەکان دەریان خست کەئەو توشی شێرپەنجەی سیەکان بوە، "دکتۆر کەریم" ئامۆژگاری کرد کە خۆی پیشانی دکتۆریکی ئێرانی بدات و تیشك بگرێت، بەڵام بارزانی ڕەتیکردەوەو پێی باشتر بوو سەردانی ئەمریکا بکات و لەوێ چارەسەر وەربگرێت بەنومیدی ئەوەی دۆسیەی کوردەکان لای "کیسنجەر" بخاتەڕوو، بەڵام "شا" و "کیسنجەر"یش حەزیان بەئاشکرابوونی نهێنیە شاراوەکە نەدەکرد و نەیاندەویست هەموو چیرۆکەکە ڕابگەیەنرێت و دۆسیەی هاوکاری بۆ کوردەکان و پاشان دەستبەردار بونیان بەو شێوەیە بڵاو ببێتەوە.

لەو گفتوگۆیانەدا کە لەنێوان "شا" و "کیسنجەر"دا بەڕێوەچوو، بڕیاردرا بارزانی بگوازرێتەوە بۆ ئەمریکا بەومەرجەی کە هیچ دیدارێك لەگەڵ کەسایەتیە باڵاکان و ڕۆژنامەنوسان ئەنجام نەدات، ساواك بەهاوکاری "سی ئای ئەی" بلیت و ڤیزای سەفەر و مانەوەو چارەسەریان بۆ دابین کرد.

له‌٣٠ی حوزه‌یرانی ١٩٧٥ فرِكه‌كه‌ی بارزانی له‌فرِۆكه‌خانه‌ی "كه‌نه‌دی" له‌ "نیۆرك" نیشته‌وه‌ له‌وێ دوكه‌س به‌ جل و به‌رگی تایبه‌تی پیاوانی كاری ساده‌ چاوه‌رِێیان ده‌كرد، خۆی و سێ هاوه‌ڵه‌كه‌ی خرانه‌ دوو ئۆتۆمبێله‌وه‌ له‌ده‌ره‌وه‌ی فرِۆكه‌خانه‌ ده‌ستیان كرد به‌رِۆیشتن.

بارزانی هاورِێكانی شه‌وه‌كه‌یان له‌ ئوتێلیك له‌نیۆرك به‌رِێكرد ، به‌یانی رِۆژی دواتر فرِۆكه‌یه‌ك هه‌ڵیگرتن به‌ره‌و ویلایه‌تی "مینیسۆتا" بۆ نۆرینگه‌ی "مایۆ پرۆجسته‌ر" بارزانی له‌وێ چاره‌سه‌ری پێویستی به‌مادده‌ی كیمیایی بۆكرا كه‌ بووه‌ هۆی وه‌راندنی تووكی سه‌ری.

له‌پاش وه‌رگرتنی چاره‌سه‌ره‌كان ، پیاوه‌كانی ئاژانسی هه‌واڵگری بردیان بۆ واشنتن، هاورِێیه‌تی گه‌شته‌كانی خۆی و ده‌ست و پێوه‌نده‌كه‌یان كرد به‌بێ ئه‌وه‌ی رِێگه‌ بده‌ن له‌گه‌ڵ هیچ كه‌سایه‌تیه‌كی ئه‌مریكیدا كۆببێته‌وه‌ یان دیداریك له‌گه‌ڵ رِۆژنامه‌وانان ئه‌نجام بدات، پاشان به‌رپرسانی ئاژانس پێداگربوون له‌سه‌رئه‌وه‌ی ده‌بێت بگه‌رِێته‌وه‌ بۆ ئێران ، به‌ڵام بارزانی رِایگه‌یاند ناگه‌رِیته‌وه‌ بۆئێران له‌به‌رئه‌وه‌ی له‌وێ باش چاره‌سه‌ر ناكرێت، پێی باشه‌ گه‌شت بكات بۆ "سویسرا" یان "سوید" تا گره‌نتی چاره‌سه‌ر كردنی بكرێت ، به‌ڵام هه‌مووجارێك رِووبه‌رِوی ئه‌م وه‌ڵامه‌ ده‌بووه‌وه‌ (("شا" ده‌یه‌وێت تۆ له‌ ئێران بیت)).

بارزانی له‌وه‌ ده‌ترسا به‌رده‌وام بونی له‌سه‌ر رِه‌تكردنه‌وه‌ی ببێته‌ هۆی ئازاردانی خێزانه‌كه‌ی و لایه‌نگرانی له‌ ئێران ، بۆیه‌ داوای كرد هه‌رهیچ نه‌بێت رِێگه‌ی بده‌ن له‌گه‌ڵ "كیسنجه‌ر" كۆببێته‌وه‌، دڵنیابوو له‌وه‌ی له‌و دیداره‌دا ده‌یتوانی رِێگاچاره‌یه‌ك بۆ مه‌سه‌له‌ی كورد بدۆزیته‌وه‌، "كیسنجه‌ر" بۆی ده‌ركه‌وت كه‌ناتوانیت ، به‌ شێوه‌یه‌كی كۆتایی سه‌ركرده‌ كورده‌كه‌ وه‌لابنێت ، بۆیه‌ داوای له‌ "ژۆزیف سیسكۆ"ی جێگری وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ بۆ كاروباری په‌نابه‌ران كرد له‌گه‌ڵی دا كۆببێته‌وه‌و وه‌ پێی وت: ((گوێ له‌بارزانی بگره‌و لێگه‌رِێ هه‌رچی له‌هه‌گبه‌كه‌یدا هه‌ڵیرِێژێت، ته‌نها ئه‌وه‌نده‌و به‌س)).

"سیسکۆ" لەمەسەلەی پێشکەشکردنی هاوکاری بۆ کوردەکان ئاگادارنەبوو کە وەستێنرابوو، لەژێربالی تاریکیدا گەیشتە ئەو شوێنەی کەبارزانی لێی دەحەوایەوە ، بارزانی وتاریکی پڕ لە ئازاری دا بەگوێی گوێگرانی دا ، بەئامادەبونی "مەسعود"ی‌کوڕی‌و

"قەزاز" ، هەرچی هەبوو سەبارەت بەپەیوەندی کوردی ئەمریکی درکاندنی ، ڕونیکردەوە کە ئەو متمانەی بە "شا" نەبوە تاقە ڕۆژێکیش بەلام لەوە دلنیابووە کەهەرگیز ئەمریکیەکان پشت گوێی ناخەن، ئەگەر وانەبوایە شەڕی لەدژی عێراق نەدەکرد، سیسکۆ کە ئاگاداری هیچ یەکێك لەو شتانە نەبوو پیشتر کە بۆی باسکرا وەلامی دایەوە ((هاوکاریەکان لەسەرداخوازی "شا" پێشکەش بەکورد کرا، هەرلەسەر داخوازی ئەویش وەستینرا)) ، لەبەرئەوەی دەبوو بەرێنماییەکانی کیسنجەرەوە پاپەند بێت نەیتوانی هیچ ئومێدێك بدات بە بارزانی .

لەکۆتایی تشرینی یەکەمی ۱۹۷۵ سەردانەکەی بارزانی بۆ ئەمریکا کۆتایی هات لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا ئاژانسی هەوالگری داو دەرمانی بەشی شەش مانگ بۆ دابینکرد و پێیدا ، دکتۆرەکەش بە "قەزاز"ی وتبو ئەو شێرپەنجەیەی کە توشی بارزانی بووە ، لە بەشی سەرەوەی جەستەی دا بلاوبۆتەوە لەوانەیە ماوەی ۸ مانگ بۆ سالێکی تر بژی ، بەلام بارزانی سێ سال و نیو دوای ئەوە ژیا.

** ******************************** **

بارزانی بە کەنارگیری لە تاران دەژیا ، دور لەپیاوەکانی کە زۆربەیان گەڕانەوە یان ناچارکران بگەڕێنەوە بۆ عێراق بەلام ئەوانەی کە مانەوە زۆربەیان خرانەژێر چاودێریەکی سەختەوە لە سەربازگەکانەوە ، بەبێ کار ڕۆژانە چەند ژەمێکی دیاریکراو خۆراکیان پێ دەدرا ، هەمیشە هەڕەشەی ئەوەیان لێ دەکرا، کە دەنێردرێنەوە بۆ عێراق ، یان لەناوچە دورەدەستەکانی ئێران بلاودەکرێنەوە، ئەوان کە لە ڕابردودا بەچاوی زیت و وریاوە لە پشت بارزانیەوە دەڕۆشتن ، بەلام ئیستا ڕقیان لێی بوو بەهۆکاری ئەو کارەساتەیان دادەنا کە توشی هاتون.

بارزانی بەردەوام لەڕێی "قەزاز" و ئەوانی ترەوە داوای گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا دەکرد تادەرباز بێت لەوزیندانەی تێیدایەتی ، وە هەڕەشەی ئەوەی دەکرد پەیوەندی بە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە دەکات و هەمووشتێك ئاشکرا دەکات.
پاش ماوەیەکی کورت "شا" وتی: ((کە تاران ڕێگەی دەدات بڕوات و پاسپۆرتێکی ئێرانی پێدەدات تا گەشت بکات بۆئەمریکا ، بەمەرجێ گەشتەکەی و چارەسەرەکەی ئەمجارە لەسەرگیرفانی خۆی بێت، وە بەڵێن بدات دیدار لەگەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندن سازنەکات و هیچ جۆرە لێدوانیك نەدات)).
لەحوزەیرانی ١٩٧٦ جارێکی تر لەفڕۆکەخانەی کەنەدی نیشتەوە ، ساواك زنجیرەژوورێکی لەئوتێل "شیراتۆن" لە"واشنتن" بۆ بارزانی و دەستوپێوەندەکانی بە کرێ گرت.
پاش ماوەیەك "سی ئای ئەی" هەوڵی دا ڕازی بکات بەگەڕانەوە بۆ ئێران بەڵام بەهەموو شێوەیەك ڕەتیکردەوە، ئەوەبوو لەکۆتایی ئابی ١٩٧٦ "سی ئای ئەی" هەموو جۆرە هاوکاریەکی خۆی لێ دابڕی.
لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٨ شێرپەنجەکە زۆر خێرا بەجەستەیدا بڵاودەبوەوە، دەستی زۆر بەشیوەیەکی ترسناك هەڵئاوسا، پاش ئەوەی زانی کەدکتۆرەکان هیچیان پێ ناکرێت داوای کرد بیگەڕێننەوە بۆ خاکی وڵات تا لەوێ بمرێت هەر هیچ نەبیت لە کوردستانی ئێران بەڵام هیچ کۆمپانیایەکی فڕۆکەوانی ئامادەنەبوو بیگوێزیتەوە هەتا لەدکتۆری چارەسەرکەرەوە ڕاپۆرتیکی پێ نەگات کە جەخت لەوەبکاتەوە لەکاتی گەشتەکەدا بەسەلامەتی دەگاتە جێ.
لەسەرەتای ئازاری ١٩٧٩ بارزانی تا ڕادەیەك باشتر بوو، دەیتوانی بەهاوکاری "فەرهاد"ی کوڕەزای کە لەگەڵیدا بوو خزمەتی دەکرد لەسەر جێگاکەی هەستێت و بچێتەسەر کورسیە جوڵاوەکەی.
لە٣ی ئازاری ١٩٧٩ کاتیك "فەرهاد" هەوڵی دا لەجێگا نوستنەکەیەوە بیگوازیتەوە بۆسەر کورسیەکەی بارزانی بەتەواوی هەستەوەرەکانیەوە کۆچی دوایی کرد.

له ٥ی ئازاردا تابوتەکەی بەفڕۆکەی "بۆینگ"ی ئێرانی گوازرایەوە بۆ تاران ، کوڕەکەی و ڕۆڵەکەی و هەندێك لەدەستوپێوەندەکانی کە دەستبەرداری نەبووبوون لەگەڵیدا بون ، لەوێوە گواسترایەوە بۆ گوندی "شنۆ"ی سەرسنوری لەوێ نزیکی "نیوملیۆن" کورد بۆ دواماڵئاوایی ئامادەبون.

شیاوی باسە "شنۆ" دوامەنزلگای ئەو نەبوو ، ساڵی ١٩٩٣ خێزانەکەی توانیان بەڕازیبونی عێراق و ئێران تەرمەکەی بگوازنەوە بۆ زێدەکەی خۆی "بارزان" ولەوێ نێژرا.

** ****************************** **

لە١٦ی کانونی دوەمی ١٩٧٩ "شا)"ی ئێران "محمد رەزا پهلوی" لەسەرتەخت هێنرایە خوارەوە ، کۆچیکرد بۆ میسر.

لە٢٢ی تشرینی دوەمی ١٩٨٠ "شا"یش هەر بەشێرپەنجە لە یەکێ لە نەخۆشخانە سەربازیەکانی خوارووی "قاهیرە" مرد ، بەم شێوەیە قەدەر وابوو ئەو دوانە بەهەمان نەخۆشی بمرن و لە غەریبیدا و لە خاکێکی دوور لەنیشتمانەکەیان بنێژرێن.

## بەشی سی و یەك / گێرانەوەکەمان تەواو نەبوە

ئیسرائیل هەرچی لەتوانایدا بوو کردی لەپێناو هاوکاریکردنی کوردەکاندا جگە لەڕاویژکار و ڕاهێنەر و ئەو ڕاهێنانەی کە لە خاکی خۆیدا بۆ سەربازە کوردەکانی دەکردەوە، و هاوکاری لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی مەیدانی بە هەمو دام دەزگاو پزیشکەکانیەوە ، جگە لەوە ئیسرائیل بڕێکی زۆر کەلوپەل و چەك وتەقەمەنی جەنگی پیدان تا هاوکاریان بێت لە یاخیبون و ڕوبەڕووبونەوەی ڕژێمی عێراق .

لەماوەی ساڵی کۆتایی یاخیبوندا (٣٠) تۆپهاوێژ و ٣٤ ڕاجیمە و تۆپهاوێژیکی دژەفڕۆکەو چەند موشەکێکی سەرشان لەجۆری ستریلا ، و ٢٦٠ قازیفەی بازوکا و تۆپهاویژی عەیارە ٨٧ ملم و ١٧٠ موشەك لەجۆری "ساگر" و ٨٥٠ هەزار فیشەك بۆ چەکی سوك و ٧٥ هەزار بۆمبی تۆپخانەو ٣٢ هەزار بۆمبی ڕاجیمەو ١٣ هەزار بۆمبی دژەتانك و بۆمبی دەستی و"مین"ی بۆ ناردون ، بێگومان ئەو چەك و تەقەمەنیە تێچویەکی گەلی زۆر کەوتوە لەسەر ئیسرائیل هەرچەندە هەندێك لە دەستکەوتەکانی هەردو جەنگەکە بون، (١٩٦٧- ١٩٧٣) .

لە١٣ی ئازاری ١٩٧٥ سەرۆکی حکومەت "ئیسحاق ڕابین" کۆبونەوەیەکی لەنوسینگەکەیدا گرێدا بەبەشداری وەزیری بەرگری "شمعون پێریز" و سەرۆکی ئەرکان "مۆردخای گۆر" ، و سەرۆکی پۆلی ئەرکان لیوا "هیرتزل شبیر" و سەرۆکی پۆلی هەوالگری لیوا "شلۆمۆ جازیت" و سەرکردەی هێزی ئاسمانی لیوا "بونیامین بێلت" و ڕاوێژکاری سەرۆکی حکومەت "ڕەحبعام زەئیفی" و لیوا "یەهوشفاط هەرکابی" یاریدەدەری وەزیری بەرگری بۆ سیاسەتە ستراتیژیەکان و سەرۆکی پێشوی پۆلی هەوالگری سەربازی.

لەکۆبونەوەدا "ڕابین" هەوڵی دا بزانێت کە هیچ ڕێگایەك هەیە بۆ دوبارەژیاندنەوەی یاخبونی کورد ، بەڵام هەموو ئەوانەی کە پەیوەندیان بە

کارەکەوە هەبوو نەزۆکی هەوڵەکانیان بۆ پشت ڕاستکردەوە ، تەنها دوو ڕێگا هەبوو بۆ پیشکەشکردنی هاوکاری بە کوردەکان "ئێران و تورکیا" ئەو دوو ڕێگایەش بەتەواوەتی داخرابون.

لەکۆتایی دانیشتنەکەدا "ڕابین" ووتی : چی بکەین؟ هیچ چارێکمان نیە جگەلەوەی لێرەدا بوەستین.

لە٢٠ی ئازاری ١٩٧٥ "یەهوشفاط هرکابی" بەڵگەنامەیەکی ئامادەکرد لەژێرناونیشانی "ئەو پەندانەی لە دۆسیەی کورد وەردەگیرێن" ئەو بەڵگەنامەیە پێشکەش بەوەزیری بەرگری "پێریز" کرا کە تێیدا هاتوە:-

١- ئەم دۆسیەیە نرمی پێگەی کەمینە نیشتمانیەکان لە خۆرهەڵاتی ناڤین دا نیشاندەدات ، کە ئیسرائیل دەتوانێت وەك هاوسەنگیەك بەرامبەر نەتەوەی عەرەب بەکاری بهێنێت.

٢- پێشکەوتنی ئامێری جەنگی و تەکنەلۆژی هەل بۆ کەمینەکان و گروپە تیرۆرستەکان دەرەخسێنیت زمرەری گەورەی چەند هێندەی قەبارەی خۆیان لە زۆرینە بدەن، لەهەمان کاتدا ئەو پەرەسەندنە ڕێگا بەسوپا سیستەماتیکەکان دەدات کە گورزی گورچکبڕی بە کۆمەڵ لە کەمینە هەرێمایەتیەکان بدات.

٣- دەتوانین دەستبکەین بەهاوکاریکردنی کەمینە شۆرشگێڕەکان بەبڕی کەم ، بەڵام ئەو توانایانەی سوپا سیستەماتیکەکەی حکومەتەکان هەیانە وادەکات کە هەر دەبێت ئەو هاکاریانە زۆربکرێن ، داخوازی سەربازی کوردەکان لەم داوییەدا هێندە زیادی کردبوو کەگومانی لای لایەنە هاوکارەکانی سەبارەت بەسودی یاخیبونەکە بۆیان دروست کردبوو.

٤- چەند ئاراستەیەك هەیە بۆهاوکاری کەمینەکان ئەگەر هاوکاریەکان بەشێوازێکی بەسودو کارا بەکاربهێنرێن، ڕەخنەی زۆر لەکوردەکان دەگیرا بەهۆی خراپیانەوە چونکە هەلی ڕەخساوی جەنگیان نەدەقۆستەوە .

٥- کاتێك ئەو لایەنەی داوای هاوکاری دەکات دەریدەخات کە خەریکە هەرەس بێنیت وادەکات ئەو لایەنەی کە هاوکاری دەکات سنور بۆ هاوکاریەکانی دابنێت ، چونکە وا هەست دەکات بەهەدەر بڕوات ، یان کەمینەکە پێویستی بە هاوکارییەکی زۆر زۆرە تا خۆی ڕابگرێت.

** ****************************** **

دەوڵەتی کوردی پێکنەهات.....

لەپاش هەرەسی یاخیبونەوە ، عێراقیەکان بەردەوام بون لە پاکتاوی گەلی کورد تەنانەت بەبەکارهینانی چەکی کیمیاویش قورسایی لە ملی کوردەکان بوەوە کاتێك لە ٢ی ئابی ١٩٩٠ "صدام حسین" هێرشی کردە سەر "کوێت" و داگیری کرد، ئیئتلافێکی ئەوروپی و ئەمریکی و عەرەبی پێکهات بۆ دەرپەڕاندنی لەوێ ، پاشان ئەم ئیئتلافە ناوچەیەکی گەورەی کوردستانی دیاریکرد کە فڕۆکە ئەمریکیەکان دەیپارێزن .

"جەلال تاڵەبانی" کۆنترۆڵی ناوچەیەکی کردووە ، "مەسعود بارزانی"ش ناوچەیەکی تر ، ئەم دو سەرکردە زۆر بەشیوەیەکی دڕندانە بەگژیەکداچون و شەڕ دەکەن، جارێك هاوکاری لە ئێرانیەکان وەردەگرن و جارێك لەعێراقیەکان ، هەرچەندە چاك دەزانن کە "صدام حسین" بۆئەوان و بۆ هەموو گەلی کوردیش هەمان کۆتایی ئامادەکردوە، کە لەسەردەمی بارزانی کۆچکردودا پەیمانی پێدابون.

﴿سوپاس بۆ خوا تەواو بوو﴾

# پێرســـــت

شلومو نكديمون



# موساد في العراق و دول الجوار

## انهيار امال الاسرائيلية و الكوردية




چاپخانەی زانا